رۆبەرت سنت یۆهن

# داود بنگۆریۆن

## دامەزرێنەری دەوڵەتی جولەکە

وەرگێڕانی لە هۆڵەندییەوە:
شەفیقی حاجی خدر

| | |
|---|---|
| ناوی کتێب | بنگۆردیۆن، دامەزرێنەری دەوڵەتی جولەکە |
| نوسینی: | ڕۆبەرت سنت یۆهن |
| وەرگێڕان | شەفیقی حاجی خدر |
| تایپ | وەرگێڕ |
| نەخشەسازی و بەرگ | ئەیوب محەمەد بابەکر |
| تیراژ | (٣٠٠٠) دانە |
| ژمارەی سپاردن | (      ) |
| چاپ | چاپی یەکەم ٢٠١١، چاپخانەی هێڤی |

(لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی چاپخانە گشتییەکان ژمارە سپاردنی (  ) ساڵی (٢٠١٠)ی پێدراوە)

# بەشی
# (١)

پیاوە پرچ لە گڕوزە بۆزەکە زۆر بە زەحمەت خۆی وەرسوڕاند، تا لەسەر جێیەکەی پشت لەو کەسانە بکات کە لە ژوری نەخۆشخانەکەدا بوون..

دواتر یەکێک لە ئامادەبووان گوتی ئەو بێدەنگییە بە وشەیەک شکێنرا، ئەویش دەربڕینی پەیڤی «نەحێمیا NEHEMIA» بوو.

بە گوێرەی ئەوانی دیکە ئەو هەر هیچی نەگوتبوو.

پاش ساتەوەختێکی دیکە، لە ژورەکەدا دەنگی هەنسک هات. هەمویان بە شەرمەوە سەیری یەکدییان کرد. هەندێکیان هیچ کات ئەویان وا بە پەشۆکاویی نە دیتبوو، بەڵام یەک دوانێک دەیانزانی ئەو نەوەک هەر پەشۆکا بوو بەڵکو گریاویشە؛ ئەویش ئەو کاتە بوو کە مامۆستاکەی بەرەو گۆڕی و مەنزڵگای شۆڕکرایەوە.

ئیدی هەمویان یەک لە دوای یەک بە بێدەنگی ژورەکەیان جێهێشت.

لە دواییدا ئەو هەر بە تەنها لەگەڵ خەمەکانیدا مایەوە.

برینەکانی ران و لاقی بەهۆی ئەو پارچە پلاتینیانەی کە بە نەشتەرگەری تێگیرابوون، لە هیکڕا بە ژانکەوتن. لێ ژانی دڵەکەی بە کوڵتربوو، چونکە دەیزانی کەسی دیکە لە دنیادا جێی نەحێمیای بۆ ناگرێتەوە. هەموانیش ئەوەیان دەزانی. نەحێمیا خۆیشی دەیزانی. هەرلەبەر ئەوەشە ئەوەی نەحێمیا ئەنجامیدا بوو لە سنوری تێگەیشتن بەدەربوو.

دە ساڵ پێکەوە کاریانکرد. لە هەمو ئەو ساڵانەدا نەحیمیا وەک سایەی وابوو، هاوڕێیەکی متمانەدار، برادەرێکی لەیەکدانەبڕاو، هەموکات ئامادە بوو گوێی لێبگرێ، هەمیشەش شادمان بوو کە بیتوانیبایە یارمەتیبدا. هەنوکەش بڕواناکرێ ئەو بۆ هەتاهەتایە لەپێش چاواندا ونبووبێ. ڕۆژی پێشتر- نەخێر چەند ڕۆژێک پێشتر- ئەو لەو ژورە دانیشتبوو، بیروڕای خۆی لەسەر نامەیەک دەربڕی کە گەنجەکە بۆ دایک و باوکی دەنارد، ئای کە ئەوپەڕی توانای خۆی بەکارهێنا کە ببێتە پیاوکوژ. ئێستا ئەو ڕۆیشت. ئایا بۆچی ژیانی لە دەستدا، دەستی لە خۆوەشاند، لە کاتێکدا لەو ڕۆژگارەدا ئەوان زۆریان پێویست پێبوو، ئەوان لەو دە ساڵانەدا زۆر شتیان بەیەکەوەکرد. ڕەنگبێ هێشتا چاوەڕوانی ڕۆژانی ڕەش بکەن.

نەحیمیا هیچ ڕۆڵێکی کارای لە چارەسەرکردنی کێشەکاندا نەگێڕا، کە دواتر لە

پاشی بەجێمان، هەروەها لە ئایندەشدا دەبێ بەبێ ئەو کیشەکان چارەسەر بکەن. بەڵام ئەو بیرۆکەیە، تەنها ئەو بیرۆکەیە.. کە ئەو لەو نێوەدا نەماوە و چیدی ناتوانێ قسان بکا،بەڕاستی کوشندەیە..

ئەو پیاوە پرچ لولە سپیە بە ویقارە چاوەکانی نوقاندن و یادەوەرییەکانی بۆ سەر ئەو حەفتا ساڵەی ژیانی رۆیشتنەوە تابزانێ ئاخۆ چیکرددوە.

سەرەتا لە پلۆنسک PLONSK دەستیپێکرد.

پلۆنسک لە سەردەمی قڕاڵدا شارۆچکەیەکی پیشەسازی بوو، کەوتبووە سەر روباری هاوناوی خۆی، کە نزیکەی ٦٠ کیلۆمەتر لە باکوری رۆژئاوای وارشۆ WARSCHAU ەوە دوربوو، بە کەناری هێڵی ئاسنینی رۆژهەڵاتی زێ. سەرلەزو پلۆنسک سەر بە پۆلۆنیاوە بوو،لە دوایشدا هەر بۆی گەڕایەوە. پینسک PINSK یش ٣٠٠ کیلۆمەتر لە دوری رۆژهەڵاتی پلۆنسکەوە لە دیوەکەی دیکەی وارشۆوە هەڵکەوتبوو.

لە پلۆنسک، لە رۆژێکی زستانی شومی باوبۆرانی ١٨٨٦ی شایندال گریندا SHEINDAL GREEN، کە خانمێکی نەرمونیان و خۆشەویست بوو، تەمەنی لە سەروی ٢٠ ساڵییەوە بوو شەشەمین کۆرپەی لە دایک بوو.

هەر لە هەمان ساڵیشدا لە پینسک کوڕێکی لاوازی درێژ لە گوندێکی نزیکدا بەناوی حایم CHAIM وەک قوتابییەکی قۆناخی قوتابخانەی ناوەندی وەرگیرا.

شەشەمین منداڵی شایندال و ئاڤیگدۆر گرین AVIGDOR GREEN داود بنگۆریۆن DAVID BEN-GURION ی یەکەمین سەرەک وەزیرانی ئیسرائیل بوو.

ئەو مێرد منداڵەش کە حایمی ناوبوو، حایم وایزمەن CHAIM WEIZMANNی یەکەمین سەرۆکی دەوڵەتی ئیسرائیل بوو.

بە دەگمەن وایە لە مێژودا دوو پیاوی لەیەک جودا بەو شێوەیە بەیەکدیەوە پەیوەست بن. بەڵێ هەردووکیان لە هەمان هەرێم لە دایکبوونە، لە هەمان رۆژگاریشدا گەورەبوونە و بە هەوای هەمان ئاگریش خۆیان گەرمکردۆتەوە، بەڵام هەریەکە بە شێوازی جیای خۆی سەروکاری مژارێکی خۆنەویستانەیان دەکرد. گەر ئەوان کاتی خۆیان هاتبا، حەزیان لێبوو لەسەر خاکی ئیسرائیل بە دڵنیایی سەربنێنەوە، گەر هاتباو هەولۆتەقەللای ئەوان نەبووایە، رەنگبایە لەو رۆژگارەدا ئەو ژیانە نوێیە لەسەر ئەوخاکەدا چەکەرەی نەکردبا.

داود بچوک و لەڕولاواز، کەچی کەللەسەری لە چاو باقی جەستەی گەورەتر بوو، هەر ئەوەش بووە مایەی خەمخواردنی دایکی و بردیە لای پزیشک،لەوەی پرسی ئاخۆ داود ئاساییە یان نا.

دکتۆرەکەش بەو شێوە وەڵامی دایەوە «پێویست بە خەمخواردن ناکا»، ئەوەش دوای ئەوەی بە وردی جەستەی داودی پشکنی ئەوسا زیاتر لەسەری رۆیشت «زارۆکەکە هیچی نییە، بەڵام من دەمەوێ پێشبینیەک بڵێم، ئەو گەورە دەبێ و پیاوێکی مەزنی لێدەردەچێ. ئەوەش بە ئاشکرا لە پێوەری قەبارەی کەللەکەیدا دەردەکەوێ».

ئاخۆ پێوەری قەبارەی کەللەسەری پشکی  لە هەڵکەوتنی داود بنگۆریۆندا هەبووە، ئەمەیان رون نیە. بەڵام باوکی ئەو ئاڤیگدۆر گرین لەگەڵ ئەو دیمانەی پشکهەبووندا هاوڕابوو، چونکە ئەو پشکی  لە دروستبوونی کوڕەکەیدا هەبوو، ئەوە بە دروستیدا دیار بوو، چونکە رۆڵەکەی خۆی نایابانە پەروردە کرد و بە باشی پێیخوێند و ئامادەی ئەو رۆڵە کارایەی کرد کە لە ژیانیدا گێڕای.

ئاڤیگدۆر گرین پارێزەرێک بوو. پیاوێکی هۆشمەندی پلۆنسکیش بوو، زۆر لەو پێنج هەزار جولەکەی شارۆچکەکە راوێژی قانونیانەیان پێدەدەکرد. لە پاڵ ئەوەشدا ئەو بەرهەڵستکارێک بوو، دوژمنەکان  ئەویان بە هەڵسوکەوتی گوناحەکانی دوور لە نەریتخوازی تاوانبار دەکرد. ئەو عەبای شۆڕی فڕێدا کە جلیکی نەریتیانەی جوە ئەرسەدۆکسەکانی پۆلنسک بوو. لە جیاتی عەبا ئاودامان شۆڕەکە کراس و پانتۆڵێک هەندێ جارانیش شەپقەیەکی قیتی دەپۆشی. ناوبەناویش جگەرەی دەکێشا. هەروەها هەرچی پەیوەندی بە سمێڵ و ردێنیشەوە هەبوو، نەریتیانە نەدەجوڵایەوە. ئەو مەعمیلی غەیرە جوشی هەبوون. کتێبخانەکەی تەژی بوو لەو کتێبانەی کە رابانیە خۆجییەکان کە دوور بوون لە ئەرسەدۆکسێتی نوسیبوویان. ئەو لەسەر ئەوە پێی دادەگرت کە داود و منداڵەکانی دیکەی عیبریەکی باش هەروەک زمانی روسی فێر ببن. بۆ پیاوە ئۆلدارەکانی پۆلنسک ئەوە کارێکی پیرۆزشکێنبوو، چونکە بە گوێرەی ئەوان زمانی عیبری تەنها بۆ سروت و بۆنە ئایینییەکان بەکاردەهێنرا. بە قسەی ئەوان ئەوەی لەگەڵ یەزداندا بئاخڤیبا، زمانی عیبری بەکار دەهێنا؛ بەڵام ئەوەی بەهاراتی بویستبا ئەوا دەبوایە بە زمانی جدیشی JIDDISJ بدوابا. باوکی داود وای لە منداڵەکانی کرد کە بە وردی و بە قوڵی لە مێژوی ئینجیلی کۆن ، جوگرافیای رۆژهەڵاتی ناوەڕاست بکۆڵنەوە و بخوێنن. ئەو بەدوای قوتابخانەیەکی جوانە، کە تیایدا وەک خوێندکارێکی ئازادانە، خۆی بۆ خوێندنێکی جدیانە تەرخان بکا، دەگەڕا. جارێکیان لە هیکەوە هاوپۆلەکانی وا سەرسوڕمانکرد کە بڵێ «رۆژێک دادی من دەبمە سەرکردەی ئیسرائیل».

ئاڤیگدۆر گرینی باوک فەندەمەنتالێکی دینیی نەبوو تا کوڕەکەی لەسەر رێبازەکە رابهێنێ، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا رۆڵەکەی بە گیانێکی زایۆنیستیانە پەروەردەکرد. ئاڤیگدۆر گرین لە ناخەوە هەستی دەکرد کە بە خاکی باب وباپیرانیەوە بەستراوەتەوە. پلۆنسک مەڵبەندی بزوتنەوەی زایۆنیزمی بوو لە بەشی روسیادا، بۆ ئەو مەبەستەش کاروباری گرین زۆر پێویست بوو. لە هەمو ساتەکاندا بە رۆژ و بە شەو ماڵی گرین کە لە پایەتەختەوە نزیک بوو، جمەیدەهات و کۆبوونەوەی دەستەی بەڕێوبەرایەتی لێدەگیرا. لە ژوری خوێندنەکەیدا گەرمەی گفتوگۆو مشتومڕو قسەی دوروردێژی نەبڕاوە بوون لەسەر پرسە پەیوەندیدارەکانی زایۆنیزم. هەندێ جاران داود گوێیدەگرت. بەڵام رۆژانێک هەبوو کە خۆی بۆ کتێبەکانی قوتابخانەو ئاینوئۆینەکانی گەمەی شەترەنج تەرخان دەکرد. بەهۆی ئەو گەمەوە داود  گۆشەنیگای بەرەو یەک ئاراستە دەبرد و واینەدەکرد مژاری دیکە لە چەقی بازنەی تێڕوانینەکەی لابدەن.

کاتێ داود تەمەنی گەیشتە ١٠ ساڵان، لە نەمسادا شتێک رویدا کە باندۆرێکی گەورەی بەسەر ژیانی داودو تەواوی جولەکەکانی جیهاندا هێنا. رۆژنامەیەکی ڤیەننایی راپۆرت نوسێکی خۆی بەناوی تیۆدۆر هێرزل THEODOR HERZL ناردە پاریس، تاکو دەربارەی کاروباری سیخوڕێتی بکۆڵێتەوەو و وتار بنوسی، ئەوەی شایانی باس بێ لەو گۆبەندەدا ئەفسەرێکی جو بە ناوی دریفوس DREYFUSی تێوەگلابوو. هێرزل کە بەخۆیشی جولەکە بوو، پێشتر پەرۆشی زۆری خۆی بۆ زایۆنیزم دەرنەبڕیبوو، بەڵام کاتێ لە کێشەی دریفوسدا قوڵ بووەوە، سەروسەودای لەگەڵ پرسی دژە سامیزم پەیداکرد، ئەوسا نامیلکەیەکی سیاسیانەی لەژێر ناوی «دەوڵەتی جولەکە»دا نوسی. تیایدا خوازیار بوو کۆتایی بە راوەدونانی جولەکەکانی ئاوڕوپا بهێندرێ، ئەویش لە کاتێکدا دەبێ کە جەماوەری جو وڵاتی خۆیان بکەوێتە دەست و هەموویان بۆ ئەوێ کۆچ بکەن و تیایدا جێگیر و نیشتەجێ بن. ئەو نامیلکەیە تەکانێکی نوێ بوو بۆ زایۆنیزم و تەوژمێکی بزوێنەرانەی دایە بزوتنەوەکە بەوەی:

«هەر کاتێک کە تۆ ویستت و خوازیار بووی، ئەوا ئیدی خەون نییە».

دوای پەیدابوونی هاوارنامەی هێرزل، چەندان کۆنفرانس لەماڵی گرین سازدران. ئیدی بە دەنگی بەرزتر زیاتر گفتوگۆ لەسەر ئەو باسوخواسانەدا کران. وتار بۆ رۆژنامەکان نوسران، بەشی نوێی زایۆنیزم کرانەوە، و کۆڕو کۆبوونەوە سازدران. شەش زارۆک لەو دەیانەدا کە شایندال هێنانیە سەر دنیا لە ژیاندا بوون، هێشتاش چاوەڕێی یانزەمینی دەکرد.

کاتێک تەمەنی داود گەیشتە دوانزە ساڵان دوو روداو قەومان، بە هۆیەوە ئاراستەی ژیانی داودیان گۆڕی. دایکی داود بە ژانی منداڵبوونەوە گیانی لەدەستدا و هێرزلیش بانگەوازی بۆ هەمو جوانی دنیا کرد کە لە بازلی سویسڕا کۆببنەوە، کە لەوێ بە پەلە رێڕەوێک بۆ بەرجەستەکردنی خەونی زایۆنیزم دابنێن و لەسەر زەمینی واقیعدا بیسەلمێنن.

بۆ مەرگی دایکی، داود مێردمنداڵێکی لاوازی هەستیار بوو، هەروەها هاوڕێشی کەم هەبوون. ئەو حەزی لە تەنیایی بوو.هەندێکیان پێیاندەگوت خەمگین وخاکیی. ئەو دەچووە سەر کەسایەتییە نەرمونیانەکەی دایکی. هەنوکە دەبێ باوکی سەرپەرشتی بەخێوکردن و پەروەردەکردنی بکا. بەڵام ئەو بە مشورخواردنی زارۆکە بچوکەکان، بزوتنەوەی زایۆنیزمی و کارەکەی وەک مافناسێک زۆر سەرقاڵ بوو. داود گەڕایەوە سەرخۆی، ئەو نەرمونیانەی لای داکی لەو ژینگەیەی تێیدا بوو، دادی نەدەدا. بەڵام لە ناخەوەی هەر بە دایکیەوە بەسترابووەوە. رەنگبێ داود هەر بەخۆشی نەزانیبێ کە مردنی دایکی چ کۆستێکی گەورە بوو بۆی، بەڵام برادەرەکانی بە درێژایی ٦٠ ساڵدا زۆر جاران لە نوسینەکانیدا، لە قسەو کۆڕەکانیدا، لە هەلسوکەوتی لەگەڵ ژناندا شوێنەواری برینی مردنی دایکیان پێوەدەدی. زۆر جاران ئەوەیان لێبەدیدەکرد کە لە ژندا بەدوای دایک دەگەڕێ و دایکایەتی هەمیشە بۆ ئەو هێمایەیەکی هەرە بایەخدار بوو.

کۆنفرانسەکەی بازل هەستوسۆزی زۆری وروژاند، تەنانەت لە نێو لاوەکانی پلۆنسکیشدا کاریگەریی خۆی هەبوو. ئەوە بۆ یەکەمین جار بوو دوای دوو هەزار ساڵ پەرلەمانێکی جو کۆببێتەوە. بۆ یەکەمین جار بوو لەو سەدە دورودرێژانەدا جولەکەکان باسی گەڕانەوەی خۆیان بکەن، هەروەک ئەوە وابێ کە بە ڕاستی نەخشەو پلانیان دانابێ و لایەنە بیردۆزیەوەکەیان بەلاوە نابێ. لە بازلدا باسوخواسی کردنەوەی زانکۆیەکی عیبری لە ئۆرشەلیمدا کرا، باسی پێکهێنانی فەندێکی نەتەوەییانەی جولەکە و باسی بانکێکی جیهانی جولەکە کە بەرنامەی نیشتەجێبون و کۆلۆنەکانیان لە ئەستۆ بگرێ، کرا. هەر لەوێش پرۆژەی ئالایەکی نەتەوەیی لە شین و سپی، رەنگەکانی دوگوردی سروتی نوێژەکانیان دانرا. خەڵک لەسەر سرودێکی عبرییانە کۆک بوون، کە دەبووە سرودی وڵاتێک، هێشتا نیوسەدەی مابوو سەربەخۆیی خۆی جاڕ بدا. بەڵام گرنگترین بڕیاری کۆنفرانسەکە ڕاگەیاندنێکی راشکاوانە بوو، بەوەی خەبات دەکەن بۆ «بە فەرمی ناساندن و زامنیەکی قانونیانەی ناوچەیەکی جولەکە لە فەلەستیندا». هەر جولەکەیەک لەهەر گۆشەیەکی دنیادا بێ دەتوانی یەک شێکڵ SIKKEL، یەک مارک، یەک شیلینگ SHILING یان چارەکە دۆلارێکی ئامریکایی خۆی بدات و ببێتە ئەندام.

داود لە تەمەنی چواردەساڵیدا هاوڕێ لەگەڵ گەنجەکانی دیکەی پلۆنسک بزوتنەوەی لاوانی زایۆنیزمیان پێکهێنا، بزوتنەوەکەیان بە ناوی ئێزرا EZRA کە گەورەپیاوێکی ئۆلداری بایبل بوو، نا. ئەندامەکان دەبوایە سوێندیان خواردبا بەوەی لەگەڵ یەکدا بێجگە لە زمانی عیبری نەئاخڤن و خەباتیش بۆ بڵاوکردنەوەی کلتوری عیبری لەنێو کرێکارە گەنجەکاندا بکەن.

هەرزو داود لەنێو ئەو بزوتنەوەیەدا ناوبانگی وەک دواندەر دەرکرد. ئەو بەتایبەتی هەڵوێستی توندی لە دوانەکانی دژی ئەو کەسانە بوو کە بە توندی دژی بەکارهێنانی «زمانی کتێبە پیرۆزەکە» بوون لە ئاخاوتندا. بە زویی ناوبانگی بڵاو بووەوە، کاتێکیش تەمەنی گەیشتە پانزە ساڵ، یەکەمین دوانی لە کۆڕێک لە وارشۆدا دا. کەس بەبیری نایەتەوە کە چی لە میژو لەوێ دەرهێناوە، بەڵام ئەوانەی لە کۆنفرانسەکەدا بوون دەگێرنەوە کە هەموان لەژێر کاریگەری دوانەکەی ئەو کوڕە گەنجە پرچڕەشە لولەییەی کە نێوچاوانی گەورە دیاردەکرا، بوون. ئەوکات بە تەواوی بە عیبری قسەی دەکردن، بە لێزانی و مشورخۆری وتاری لەسەر زایۆنیزم دەدا و ئاماژەی زیندوی پێدەدا.

یەکێک لە رابیە ناودارەکانی ئەوکات ئەو تێبینیەی هەبوو:

«گەر دە لاوی وەک ئەوەمان هەبێ ئیسرائیل دەگەڕێنینەوە».

زۆر لە جولەکەکانی روسیا لەسەر ئەوە یەکانگیر بوون کە ساڵی ١٩٠٣ ساڵێک بوو لە یادەوەریدا بە نەمری دەمێنیتەوە، چونکە گرکانی دژەسامیزم لەگەڵ خۆیدا تەقینەوەی دیکەی هێنا کە دەرەنجامی کارانگازی لێکەوتەوە. لە شەقامەکانی شاری کیشنیڤ KISHINV ی بیساری BESSARAB دا تەرمی جوەکان لەسەر یەک کەڵەکە

ببوون. کەس پێشبینی نەدەکرد ئاخۆ کەی تیرۆرەکە دەوەستێ. لە پلۆنسکدا جوەکان دەرکەی ماڵەکانیان کلۆمدا، هەر یەکێ بترسابا خۆی دەشاردەوە.

دوای وتووێژێکی دورودرێژ داود و زۆرینەی هاوڕێکانی هاتنە سەر ئەو بڕوایە کە بچنە ریزی پۆلای زایۆن POLAEI ZION (بزوتنەوەی کرێکارانی زایۆن). لە ریزەکانی ئەو بزوتنەوەیەدا هاوشانی هاورێیانی دیکە خەبات بۆ گەڕاندنەوەی وڵاتی بەڵێنپێدراودا بکەن کە مافی هەموانە.

لە هەمان ساڵدا درزیکی گەورە کەوتە ئاکامی ئەو خەباتەی کە هەمیشە زایۆنیزم هەوڵی بۆدەدا. خودی هێرزلیش بۆ ئەو لە یەکترازانە دەستپێشخەر بوو. نەخشەوپلانی ئەوەی فەلەستین لە ئیمپراتۆریەتی عوسمانلی بکڕێ، شکستی خوارد. ئیدی ئەو پەیوەندی بە پیاوێکی ئینگلیز کرد، ئەویش بیرۆکەیەکی هەبوو. یوسف چامبەرلاین JOSEPH CHAMBERLAINی وەزیری کاروباری کۆلۆنەکانی بەریتانیا، لە کاتی شەڕی بوردا گەشتێکی بە ئافریکادا کرد و پێشنیازێکی کرد کە شەش هەزار مایلی چوارگۆشە لە بانە بەرزەکانی کینیا بۆ جولەکەکان تەرخان بکرێ. ئەوکات هیرزل دەوڵەتێک بۆ جو لە ژێر سەرپەرشتی بەریتانیادا دابمەزرێنێ. هەرچەندە هەرێمەکە نەدەکەوتە ئۆگەندا، بەڵام لەبەر هەر هۆیەک بێ پڕۆژەکە بەناوی نەخشەی ئۆگەندا ناویدەرکرد. هێرزل لە ١٩٠٣دا ئەو پڕۆژەی خستە بەردەم کۆنگرێسی جوان، کە بۆ شەشەمین جار بوو لەبازل دەبەسترا. لەوکاتەدا هێرزل بە پەرۆشەوە لە پشت پڕۆژە پێشنیازکراوەکەدا بوو.

شتێکی دانسقە بوو کە جولەکەکان دوای ١٨٣٣ ساڵ لە ژیانی ئاوارەیی هەندەراندا بەو شێوەیە بیروراڕایان دژی یەکدی بێ. خوازیارانی پلانی ئۆگەندا هەوڵیان دەدا بە شێوەیەک بڕوا بە نەیارەکانی دژی نەخشەکە بێنن، گوایە هەرکاتێ پلانەکە جێبەجی بوو، ئەوسا ئامادەن لە ئافریکاوە لەشکرێک ئامادە بکەن و وڵاتی پیرۆز لەدەست عەرەبان دەربهێنن. لەسەر ئەو مژارە تەنانەت لەنێو جوەکانی فەلەستینیشدا بیروڕاکان یەکانگیر نەبوون.

داود و هاوڕێکانی هەر لە بەراییەوە دژی پلانی ئۆگەندا بوون. بەلای ئەوان زایۆنیزم هەر واتای وەستانەوە و زامنی بوون دژی راوەدونانی نەدەگەیاند. بۆ ئەوان ئەوەندە بەس نەبوو کە هەرێمێکیان لە دەرەوی ئاوروپا بۆ مەیسەر ببێ، کە تیایدا بە ئارامی بژین. زایۆنیزم واتای گەڕانەوە بوو بۆ وڵاتی کتێبەکە (مەبەست تەوڕاتە – وەرگێڕ)، بۆ وڵاتی باوباپیرانیان کە بەچەندان سەدە پێشتر لەوێ وەدەرنرابوون. هەمو چیرۆکەکانی بایبل، هەمو پاڵەوان و ئەفسانەکانیان کە لەنێو گەلدا بەزیندویی ماونەتەوە، هەمویان شوێنپێیان لە فەلەستین بوو.

ئەوەی مایەی ئۆخە هەڵکێشان بوو بۆ داود و هاوڕێکانی وەخراندن و دواخستنی کۆنگرەی بازل بوو کە بڕیار بوو دۆزی پلانی ئۆگەندا یەکلابکاتەوە.

کە تەمەنی داود گەیشتە هەژدە ساڵی بەرەو وارشۆ بۆ تەواکردنی خوێندنەکەی بەڕێکەوت. لەوێ ئەو بەو بڕە پارە کەمەی کە باوکی بۆی دەنارد، لەگەڵ پارەی

وانەوتنەوەکانی بە زمانی عیبری دەژیا. ئەو رۆژگارە بۆ ئەو بالکێشبوو. لە وارشۆدا وتاردەری جوی بەناوبانگ دەژیان و ئەویش گوێی لێدەگرتن.

لە بەرەبەیانیەکدا ئەو گیرا. هۆکارێکی رونی قانونیانەی گیرانەکەی لە ئارادا نەبوو. ئەو کارێکی وای نەکردبوو کە بەهیچ کردەیەکی کەتن و تاوان تۆمەتبار بکرێ. بەڵام ئەوە نابێ لە بیربکرێ کە جولەکە بوو، جولەکەیەکی بزۆز. پرچە لولە پەرشوبڵاوە رەشەکەی بەرسقی ئەوەی دەدایەوە کە هێمای پلانگێرانی سیاسیانەی بۆ پۆلیسە خۆجێیەکانی ئەوێ دەردەخست. بەو شێوە دەبوایە باجەکەی بدا.

داود ئەو رۆژە لە گرتوخانەکەدا مایەوە، ئێوارەش باوکی پەیدا بوو. ئاڤیگدۆر گرین بەخۆی و پاڵتۆ درێژەکەی و شەپقە قیتەکەی لە پلۆنسکەوە بە شەمەندەفەڕ هاتبوو. ئەو یەکەمەین گەنجێکی جو نەبوو کە پارێزەر هەوڵی ئازادکردنی بدا. باوک کارتی خۆناساندنی دایە دەست پۆلیسی کاربەدەستی گرتوخانەکە. بەرپرسەکە دوای ئەوەی تەماشایەکی پێناسەکەی کردو پرسی؛ «ناوت گرینە؟» لەسەری رۆیشت و گوتی «چ رێکەوتێکە کە منیش ناوم گرینە، ڤیکتۆر گرین».

لە سۆنگەی ئەو رێکەوتە بوو داود ، بێ ئەوەی لەبەردەم پێواژۆی دادوەری و پۆلیسیەکەدا ئامادەبێ، ئازاد کرا.

سێ لاو لە پلۆنسک هەبوون، کە هەمو شتێکیان بەیەکەوە دەکرد: شلۆمۆ زێماخ SHLOMO ZEMACH، کە دایک و باوکی بەپێی پێوەرەکانی شارەکە بە دەوڵەمەند دەژمێردران؛ شموئیل فوخ SHMUEL FUCH کە حەزی لە سەرچڵی بوو، سێهەمیشیان داود بوو. ئەوان دامەزرێنە سەرەتاییەکانی رێکخراوی گەنجانی ئەوێ بوون. بەیەکەوە لە ١٩٠٤دا شینیان بۆ مەرگی هێرزل گێڕا. بەیەکەوەش نەخشەی ئایندەیان دادەنا.

شمۆئیل یەکەمین کەسی سێکوچکەکە بوو،کۆچی کردوو رۆیشت؛ بەڵام ئەو نەچووە فەلەستین، بەڵکو بەرەو ئامریکا تێیتەقاند. لە ئێوارەیەکی پایزیشدا شلۆمۆ بەخۆی و ٣٠٠ رۆبلی باوکی بێ پرسی خانەوادەکەی بزر بوو.

داود پێش سالڕۆژی هەژدە ساڵی وازی لە خوێندن هێنابوو، ئەمەش مایەی هەراسانکردنی باوکی بوو. ئەو بە پۆلۆنیادا دەگەڕا، لەهەر شوێنێک دەرفەت هەبووایە دوانی دەدا، هانی کرێکارانی دەدا یەکبگرن سەرپەرشتی مانگرتنەکانیانی دەکرد، ئیدی زیاتر زایۆنیزمی لەگەڵ سۆشیالیزم ئاوێتە دەکرد. دوای کەمێک نامەی لە شلۆمۆی هاوڕێی پێگەیشتن. دوهەمین شەپۆلی کۆچکردن ALIYAH دەستیپێکرد. پیاوان، ژنان و منداڵان بەلێشاو خۆیان گەیاندە فەلەستین. فەلەستینیش چیدیکە وڵاتی شیرو هەنگوین نەمابوو. بەشی هەرە زۆری کاری بێسەوادانە و نیمچە خوێندەواری لە فەلەستیندا لەلایەن عەرەبە خۆجێیەکانی ئەوی بەڕێوەدەچوو، هەرچەندە گەر خاوەنکارەکانیش جولەکە بوونایە. بەڵام ئەو بەچکە زێماخە ZEMACHە ئیشۆکەیەکی لەوێ دەستکەوتبوو بڕی خۆی بە نانو خورما دەشکاند. ئیدی ئەو لە نۆبەرەکان (مارەکان) بوو.

شلۆمۆ زامیخ جارێکیان گەڕایەوە پلۆنسک. رایگەیاند ک لە ماوەیەکی کورتدا

دەگەڕێتەوە فەلەستین. ئەو دەیگوت؛ ژیان لەوێ قورسە، بەڵام پڕ واتایە. ئەندامانی ڕێکخراوی گەنجان بە سەرنجراکێشانەوە گوێیان بۆ هەڵدەخست، بەتایبەتیش کە ئەو دەربارەی وڵاتە دێرینەکە، دەربارەی ڕەوەندەکان کە بەشەو لە بیابابەوە بۆ تاڵان وبرۆ دەهاتن، دەربارەی وشتر و مزگەوتەکان، دەربارەی گردگەلی دەوروبەری ئۆرشەلیم و دیواری سکالا ، کە تاکە پاشماوە دوهەمین کۆتەڵەکەیە قسەی بۆدەکردن.

داود هەرلەوێ رایگەیەیاند کە ئامادەیە لەگەڵ شلۆمۆ هەرکاتێ بگەڕێتەوە، بڕواتە ئەوێ و ڕەنگبێ هەرگیزیش نەگەڕێتەوە. باوک بەتوندی ناڕازی بوو. باوکەکە پێی شەرمەزاری بوو، پێش ئەوەی گەنجێک خویندنی تەواو بکا، پەرەسەندنی ڕەوتی خوێندنی بقرتێنێ و بڕوا. گرین پیاوێکی زانا بوو، هیوای وابوو کوڕەکەشی وەک خۆی بێ. بەڵام گەرهاتو لە هیکەوە گەنجەکە بەڕوتوقوتی وەک کرێکارێکی کەرتی کشتوکاڵی گەیشتە سەر لمی فەلەستین، چی دەکا؟

نیو سەدە دواتر ئەو کەسەی ناوی داود گرین بوو، لە پلۆنسکەوەڕا هاتبوو، لە بەرامبەر کۆمەڵێ لە ڕۆژنامەوانە ئامریکاییەکان وەستابوو، ئەو بەڵگەوبەندانەی دەهێنانەوە کە کاتی خۆی ببونە هاندەری تا ئاوڕوپا بەجێبیلێ. ئەو بەو شێوە قسەکانی داڕشت:

«من پەنابەر نەبووم، من بۆ ئەوە نەهاتبووم کە ڕاوەدو دەنرام.. لە منداڵیەوە، لە تەمەنی پێنج ساڵیدا من هەستم دەکرد کە پۆلینیای جێژیانی من، ماڵی من نییە. من هەستم کرد ڕۆژێ دادێ ئەم وڵاتە، ئیسرائیل دەبێتە وڵاتی باوانم. ئیسرائیل دیرۆکێکی چوارهەزار ساڵەی هەیە، ئەوەش ڕەگوڕیشەی لە ناخەوەی گەلەکەمان داڕشتووە. ئەوەش دۆزێک نیە تەنها بە ڕاوەدونان گرێدراو بێ، بەڵکو پەیوەندی بە پێویستی ئۆلییەوە هەیە».

داود تەماشایەکی سەروچاوی ڕۆژنامەوان و ڕادیۆکاراننی کردو بە پەلە بە ڕویاندا مسکە بووە و لەسەری ڕۆیشت:

«من زۆر لەوە دڵنیا نیم کە ئەو ۱۰۲ کەسەی لەگەڵ (گوڵەکەم – MY FLOWER) (ناوی کەشتیەکە بوو) هاتنە وڵاتەکەتان، پەنابەر بوون. ئەوان دەیانەویست لە وڵاتێکی نوێدا دەوڵەتێکی ئازادانە ڕۆبنێن. هەر ئاواش زۆر لە خەڵکی ئێمە هاتنە ئێرە بێئەوەی ڕاوبنرێن. ئەوان بەپێی هێزی ڕاکێشەری ڕۆحی هاتن: بۆئەوەی ئازادانە و بێلەمپەر ئایینی جولەکایەتی خۆیان لەو وڵاتە دەوڵەمەندەدا پەیڕەو بکەن. ئەمەش بۆ ئێمە واتایەکی زۆروزەوەند دەگەیەنێ».

# بەشی
# (٢)

دوو گەنج ماندو و شەکەت لەسەر پشتی کەشتیەکی بارهەڵگری روسی، لە ئۆدێسیا Odessa بەرەو دەریای رەش، لەوێشەوە لەرێی دارندێلن Darendellen گەیشتنە کەنارەکانی دەریای سپی ناوەڕاست.

هـەردوو لاوەکە گرەویان لەسەر ئەوە کردبوو، ئاخۆ کامەیان پێشتر وڵاتی مەبەست دەبینێ، هەر بۆیەشە بەردەوام چاویان لەسەر ئاسۆ هەڵنەدەگرت.

گەشتەکەیان چەندان هەفتەی خایاند. ئێستا پلۆنسک زۆر لە پشتی ئەوانە و خواحافیزیان لە ژیانی ئەوێکرد.

«داود، داود تەماشاکە، تەماشاکە گەیشتین، تیژ بڕوانە، بە درێژایی تەمومژەکە بەلای چەپەوە، ئا لەوێیە، ئەوێ یافا jaffaیە».

داود زۆر بە وردی لێیدەڕوانی تا لە دواییدا شوێنەکەی بەدیکرد. گەلۆ پەڵەیەکی بۆر کە هەوا و ئاو بە یەکگەیشتون، بەڵێ ئەوە بوو وڵاتی بەڵێنپێدراو، وڵاتەکەی خۆی. ئەو جویێکی ئاوارە بوو، ئێدی لە دواییدا گەڕایەوە زێدی باب و باپیرانی. بۆ ئەو ئاوارەبوون کە نزیکەی دوو هەزار ساڵی خایاندووە، دواییهات. لەمەوپاش ئەو لێرەدا دەژی و دەمرێ. لێرەوە خەبات بۆ بەدیهێنانی خەونی خۆی و هی ئەوانی دیکە دەکا. بەروە دواوە بە لامل ئاوڕێکی لە بەلەمەکە دایەوە. تا چاوبڕی دەکرد هەر ئاسۆ بوو، زێیەکی شین بوو. بەڵام لەبەر خۆیەوە دەیگوت رۆژێک دادێ زێیەکە لەبەر پڕی ئەو بەلەم و کەشتیانەی کە ئاوارەکان دەگەڕێننەوە ماڵی خۆیان، رەش هەڵبگەڕێ.

هەنوکە کەشتیەکە نزیکتر بۆتەوە، توانیان تەلارو خەڵک لەیەک جیابکەنەوە. یافا شارێکی دیرۆکیی بوو. لە کتێبەکەدا(مەبەست تەوڕاتە) نوسراوە کە تیرەی دان Dan لێرەدا جیگیر ببوون. ئاخر خۆ نزیکەی هەمو بەشە ناوچەیەکی ئێرە رۆڵی خۆی لە مێژوی جواندا بینیوە. بایبل (تەورات) ناوی هەموانی بردووە. داود زۆر بەوە دڵشاد بوو کە باوکی فێرە مێژوو جوگرافیای رۆژهەڵاتی ناوەڕاستی کردبوو. ئەو دەیزانی کە بەلەمەکەی یونس Jounas لە نزیک یافاوە کە خودی پێغەمبەری لەسەر پشت بوو، خەریک بوو نقومببێ، نەهەنگێک هات و قوتیدان. دواتر لێرەدا کارەساتگەلی راوەدونانی ترسناک قەومان. کاتێکیش کۆتەڵی دوهەم روخێندرا، بە هەزاران جو لەلایەن هەوادارانی گریکەوە بەلیست بەرەو بەندەرەکە بردران و خنکێندران.

هەرچەند هەمو ئەو شتگەلە مێژوییانەی بەیاددا دەهاتەوە، هەستی بە بێئومێدی

دەکرد. کاتێک یافایان بەتەواوی لێدەرکەوت، شوێنەکەیان وەک ئەو دە بەندەرەکەی دیکە هاتە بەرچاوان.

تۆ بڵێی چەندان بێئومێدیی دیکەیان چاوەڕێ بکا؟

ئایا کاتێک لەگەڵ راستیدا روبەڕو دەبێتەوە، کۆپلەی خەونەکانی هەمو شتێکی لە بیر دەباتەوە؟

کاتێکیش لە کەشتییەکە دابەزین، یەکێ لە هاوگەشتەکەیان بەسەر زەویدا داکەوت و هەردو چنگی هێستریایانە لە لم گیر کرد و ماچی کرد.

داود هەستی بە پەشۆکان کرد. بەڕاستی ئێرە جیهانێکی نامۆیە، بە هیچ شێوەیەک لەگەڵ گریمانەی مێشکیدا یەکناگرێتەوە. شەقامەکان لە عەرەبی دشداشە سپی پۆشەکان جمەیان دێ. هەوای یافا بۆ کەپویەکی هەستیاری پیاوێکی ئاوروپایی زەحمەت بوو. لێرەدا خەڵک بە زمانێک قسەیان دەکرد کە لە یەکنزیکیەکی تەمومژاوی لەگەڵ عبریدا هەبوو، داود لێی تێنەدەگەیشت. بەڵام ناوبەناو دوو پیادە تێدەپەڕین کە بە جیدیشی دەئاخڤین.

لە میوانخانەیەکی هەژاری بێسەروبەر کە ناوی میوانخانەی حایم باروخ Caim Baruch بوو، لەگەڵ یەکێ لە کارگێڕانی بزوتنەوەی کرێکارانی زایۆنی کە پێشتر بە هاتنی داودیان زانیبوو، بەیەکەوە لەسەر خاکی وڵاتە دێرینەکە ژەمێکیان خوارد.

هەمویان بە یەک دەنگ لە کاتی پێکهەڵدانی پێکی شەڕابی شیرینی فەلەستینی پەیڤی لێهایم Lehayimیان دەربڕی. ئەوەش پێکهەڵدانێکی نەریتیانەی عیبریانە بوو واتای –بەخۆشی ژیانت–ی دەگەیاند.

ئەو شەوە گەنجەکان چوونە پیتاخ تیکڤاه Petach Tikvahی کۆنترین نشینگەی(کۆلۆن)ی فەلەستینی. ئەو شوێنە پێش هەشت ساڵ لە لەدایکبوونی داودەوە دروستکرابوو، هەر بۆیە بە دایکی هەمو نشینگەکان دەناسرا. نشینگەکە بە دەستپێکی زانا ئۆلدارەکانی ئۆرشەلیم کە زۆربەیان لە هەنگاریاوە هاتبوون، دروستکرابوو. پیاوە دروستکەرەکان راوێژی پزیشکی گریکیان سەبارەت بە نەگونجاوی دیارکردنی شوێنی نشینگەکە بەلاوە نابوو.

سەیرکەن، دکتۆرەکە پێیگوتبوون؛ «تەنانەت مەلەکانیش لێرە بۆ کرم و مێشومەگەز نانیشنەوە. دەزانن بۆ؟ چونکە هەواکەی پیس و بۆگەنە«.

لەگەڵ ئەوەشدا نشینگەیەکی قشت و سەرنجراکێشی لێدروستبوو. ریزە خانوی رێکوپێک، هەندێکیان لە دارو ئەوانی دیکەش لە لگبن(خشت)ی قوڕ دروست کرابوون. لە سۆنگەی کۆمەک و باربووە زۆرەکەی بارۆن ئیدمۆند رۆتشیلد baron Edmond de Rothschildی پاریسنشین، رێگاکانیان بە داری بەرزی کالیپتۆز و دەروپشتیشیان بە رەزوباخ داچاندبوو. بەڵام لە هەموشیان بایەخدارتر ئەوەبو کە لێرەدا جولەکە دەژیان، ئەو جوانە کاتی خۆیان بە چایخانە نەدەکوشت و کشتکاری وجوتیارییان بۆ حیسابی خەڵکی دیکە نەدەکرد. لێرەدا جو لەسەر خاکەکەی بەسەرکەوتوانە تێدەکۆشان.

داود گرین لە ژیانی داهاتوی خۆیدا تا کۆتایی، بە توندی داکۆکی لەو گریمانەیەی دەکرد کە گەڕانەوە بۆ زایۆن، ئاوەدانکردنەوەی ئیسرائیل و رزگارکردنی جوەکان، ئەو

کاتە ئاسان دەبێ کە جوەکانی دیاسپۆرا دەستبەرداری شێوەژیانی هەندەرانیانەیان ببن. کاری دەستی پێویستە لە ویژدانەوە هەڵبقوڵێ. کۆچکردووەکان لەسەریانە پیشەی کشتوکاڵی بگرنەبەر.

کاتێک گەنجەکانی پلۆنسک دوای گەشتە دورودرێژەکە گەیشتنەجێ، ماندو و شپرزە ببوون. بەڵام داود شەوەکەی خەو نەچووە چاوانی. لەو کاتەیدا گوێی لە دەنگە کپبووەکانی بیابان کە دەوروبەری نشینگەکەیانی گرتبوو، دەگرت؛ چەندان جۆرە پلان لە مێشکیدا گینگڵیان دەخوارد. «ئاخر کێ دەتوانێ لە شەوی یەکەمی گەیشتنی بەزێدی باب وباپیرانی بەخەو بباتەسەر». ئا بەو شێوەیەی سەرو پرسێکی ئەندێشاوی سەرهەڵدراوی لە یەکەم نامەی بۆ باوکی نوسیبوو. پاشان کە یادی نشینگەی پیتاخ تیکڤاهی دەکردەوە دەیگوت: «بیرۆکە و کەڵکەڵەی سەری منداڵیم و خەونەکانم هاتنەدی، ئەزیش پێی شادمان بووم. ئێستا من لە وڵاتی ئیسرائیلدام، لە گوندێکی جولەکاندا دەژیم ، ناوی (دەروازەی هیوا)یە».

« من بۆنی گەنمەشامی دەکەم، گوێم لە زەڕینی کەر و هاشوهوشی گەڵای رەز و باخەکانە. من لە سەروی خۆمەوە پۆلێک ئەستێرە دەبینم، کە رون و چراخانن و درێ بە تاریکی شەوەزەنگ دەدەن. دڵم لە بەختیاریدا لێدەدا، وەک ئەوەی هاتبمە ناو ماڵی خەونەکانم، بەراستیش خەونەکانم هاتنەدی».

رۆژی دواتر داود و شلۆمۆی هاوڕێی بەدەرکەوتن کە بەدوای ئیشێکدا دەگەڕان. ماندو و شەکەت لەو کێڵگەی جو بۆ ئەویدیکە دەگەڕان، ئەوان ئامادەیی خۆیان بۆ هەر کارێک دەربڕی و داخوازیشیان کرێ و مزی زۆر نەبوو. بەڵام لە هەمو شوێنێکدا هەر هەمان وەڵامی نەرێیانەیان وەردەگرتەوە. <جوتیارسالارەکان> وەک داود دواتر بۆ گاڵتەپێکردن ناوی لێنان، پێیان خۆشتر بوو کشتکارە عەرەبەکان بخەنەگەڕ. چونکە دەستی کاری عەرەب هەرزانتر بوو. عەرەبەکان ئەزمونیان هەبوو. گوایە گەنجە ئایدیالیستە جوەکان توندوبەند نین. ئەوان دەستیان زبر نیە. ئەوان ئەو پیاوە نین خۆیان لەبەر تاوی سوتێنەری هاوینی بیابان رابگرن. جوتیارە جوەکان دەیانتوانی باشتر جڵەوی کرێگرتە عەرەبەکان بگرن. گەنج و تۆلازە دلێرەکانی جو زیاتر بۆ بانگەشە نەوەک کارکردن دەستدەدەن.

ئەزمونی پیتاخ تیکڤیاە بە قوڵی باندۆری خۆی لەسەر کەسایەتی و گریمانە سیاسیانەکەی داود گریندا دانا. ئەو لەناخەوە قینی لە دەوڵەمەندە جوەکان هەڵگرت. ئەوانی بەوە تۆمەتبار دەکرد کە گوایە وڵاتی پیرۆز دەکەنە بەهەشتی تاوان و تاڵانکاران.

لە دواییدا داود و شلۆمۆ کارێکیان بە هەشت پیستەر(پارەی ئەوکات) لە هەفتەیەکدا دەستکەوت. مزەکەیان بە ئاستەم بەشی بە کرێگرتنی پێخەفێکی شەو و ژەمەخواردنێکی ئێواران دەکرد.

داود ساڵێکی بەو کولەمەرگیە لە جودا Judeaدا راکێشا. ئەو لەسەر ئیشەکەی رانەهات. لەبەر ئەوەی تێری بەزگی خۆی نەدەخوارد کزو زەبون هەڵگەڕا. کاتێکیش توشی مەلاریا بوو، بەو شێوەیە گێڕایەوە:

«هەرسێکیان، ئیش، برسێتی و مالاریا بۆمن ئەزمونی نوێ بوون. لە ماوەی چواردە رۆژدا لەگەڵ لیدانی کاتژمێر، تام دەگرت کە رۆژێک تا شەش رۆژانی دەخایاند و دواتر نەدەما.

برسێتیش میوانی هەمیشەییمان بوو. من بەهەفتان هەندێ جارانیش بەمانگان پڕ بە زگم تێرم نەدەخوارد. بە رۆژ دەکرا ئارام بگرم و زۆر بیری لێنەکەمەوە، بەڵام شەوان ژانی برسیەتی بە سعاتان بەری نەدەدام، هەناوی لول دەدام، بەرچاوی تەنگ دەکردم ، گیانی دەگوشیم ، لە نێو مۆخی ئێسقانەکانمدا ئازارێک سەرتاپای جەستەمی دادەگرت. ئیدی بە ناچاری لە کۆتاییدا خەوێکی شەپرێو دایدەگرتم.»

بە درێژایی ساڵی یەکەمی، هەندێک کات لە رەزو باخی شەراب و ژێرزەمینی شەڕاب دروستکردنی ریشۆن زایۆن Rishon Zionke کە خاوەنەکەی بارۆنی ناودار ریتشێلد بوو کە بە ملیۆنان دۆلاری لە ئیسرائیل وەبەردەهێنا، کاریدەکرد. ئەنجا روەو گوندێکی نوێی کفر سەبعە Kfar Saba بەرێکەوت. جارێکیان لە نامەیەکدا بۆ باوکی نوسی: « ئێمە لەسەر گردێک کە بە چیا دەورەدراوە دەژین. هەوا لێرە سازگارتر و تەندروستترە. ناوچەکە بە داری تو چێندراوە کە بەر لە ساڵیک لە عەرەبەکانیان کڕیوەتەوە. هێشتا خانوی لێ دروستنەکراوە. پاشای نابلوس Nablus کە دەسەڵاتداری سەر ئێرەیە تەنها بە پارە لێدەگەرێ لایدەکان لێرە خانو دروستبکەن. نرخی زەویەکان بەرەبەرە بەرز دەبێتەوە.ئێمە بەرەبەیانیان لە سعات شەشەوە بۆ سەر کار دەرۆین، لەگەڵ بەرزبوونەوەی رۆژیش ئارەقە لە لەشمان وەک ئاو جۆگەلە دەکا و دێتە خوارەوە«.

داود لە وتارو دوانەکانیدا بە ئاشکرا تورەبوونی خۆی بەرامبەر ئەو جوانەی ترسنۆک بوون، ئەوانەی کەمتر مەیلیان بەلای سەرچڵێتیدا دەرۆیشت، ئەوانەی خۆیان پەرگیرکردبوو لە بەرامبەر گەرانەوەیان بۆ فەلەستین دەردەبری. دەنگی ئەو سکاڵایەی تا لە ژیاندا بوو، کپنەبوو.

«لەسەر پشتی هەر کەشتییەک کە بۆ ئێرە دێ، پری گەشتیارە، بۆ کارانگاز بوون بە جوانی وڵاتدا دەگەرێن، بەڵام هیچ جولەکەیان لەگەڵدانین. خەڵکی ئێمە هەر بەوەندە لێگەڕاوە کە رۆژێ سێ جاران نوێژ بۆ ئیسرائیل بکەن و بۆی بپارێنەوە. لە رۆمادا کاسۆلیک دەژین، کەچی لە زایۆندا هیچ زایۆنیستێک ناژی». ساڵێک دوای گەیشتنی داود کۆنگرەیەکی بزوتنەوەی کرێکاری زایۆنیزمی لە فەلەستیندا سازدرا. هەندێک لە شاندی ئامادەبوو رایانگەیاند کە ٧٢ کیلۆمەتری نێوان ئۆرشەلیم و یافا بەپێ بڕیوە. یەکێ لە کارگێرانی کۆنگرەکە گەنجێک بوو، هەر دوو ساڵان لە داود گەورەتر بوو، ئەویش ئیسحاق شیمشەلێڤیتش Itzhak Shimshelevitch کە زۆر نابێ لە ئۆکرانیای روسیاوە گەیشتۆتە فەلەستین. ئەو کابرایەکی لاوازی روبەیەکدا قوپاوە بوو. لە روسیادا بەشداری بزوتنەوی بەرگری لەسەرخۆکردنەووەی جوان بوو، کاتێکیش ماڵیان پشکنیوە بڕێکی زۆری چەک و تەقەمەنی شاردراوەیان لە ماڵدا دۆزیوەتەوە. لە کاتێکدا ئەو لە ماڵ نەبووە پۆلیسی روسی ماڵ بەماڵی پشکنیەوە، لەسەر دۆزینەوەی چەکەکان تەواوی مالباتەکەیان گرتووە. ئیدی دایکی، باوکی و

تەواوی منداڵەکانیان بۆ سیبیریان نەفی کردوون. ئیسحاق لەوە سەرکەوتوبوو خۆی لە چنگی پۆلیسەکان دەربازبکا و بەرەو فەلەستین هەڵبێ. کاتێ ناوی خۆی لە تۆماری میوانخانەی یافادا تۆمار دەکرد، لەژێر ناوی بن زیڤی Ben –Zvi ئیمزای کرد و پاشانیش بە فەرمی هەر ئەو ناوەی بەکارهێنا.

داود هەوادارێتی خۆی بۆ ئەو لاوە ئۆکراینیە نەشاردەوە، لە زۆر پرسی سیاسیدا خۆی و بن زیڤی هاوڕابوون.

هەرچەندە داود بەهرەی زمانزانینی نەبوو، بەڵام لە ڕێی خولی چڕوپڕدا فێرە زمانی عەرەبی بوو. هەنوکە ئەو چوار زمان دەزانێ، روسی، جیدیش ، عیبری و عەرەبی، هەروەها لەگەڵ هەندێ پۆلۆنیش. لە ماوەی ساڵی یەکەمی لە جودا Judeaدا بەچڕی خەریکی لێکۆڵینەوەی جوگرافیای ناوچەکە بوو. ئەو هەمو گوندێک، هەمو دوڕیان و چوارڕیانێ، هەمو روبارە وشکهەڵگەڕاوەکانی دەناسی. بەڵام خۆی و شلۆمۆی هاوڕێکەی چیدی خولیای کاری کرێگرتەیی کشتکاریان لە جودیادا نەمابوو.

دواتر داود وا دەنوسێ:

«چیدیکە کاری لەبن نەهاتوی تەور و بێڵ رزگارم ناکا. کارەکە ماشێن ئاساییە. هەڵکەندنی خاک وام لێدەکا بیر لە کاری فابریکیانە بکەمەوە. من تامەزرۆی ئاسۆیەکی بەرفراوانم، تامەزرۆی خۆڕاوەشاندنی قەدی گەنمەشامیم، تامەزرۆی بۆنوبەرامەی گیا و گۆرانی دروێنەم؛ بۆیە بڕیارمدا بەرەو باکور بەرەو گالیلیا Galila هەڵبکشێم».

داود گرین شوێنخەونی لە شێجیرا Sejera دیتەوە. خۆی و دە کەسی دیکە هەمو نێوانەکەیان کە نزیکەی ١٠٠ کیلۆمەتر دەبوو لە پیتاختیکڤاهەوە تا باکور بە پێیان بڕی. لە ڕێگەیاندا بە بیاباندا دەڕۆیشتن، زۆر گوندی عارەبانیان دەهاتەڕێ، بە گردەکانی جودیادا تێپەڕدەبوون، وردە وردە لە باکور نزیک دەبوونەوە، بە ئاراستەی رۆژهەڵاتدا روەو گۆمی تەبەریا بایاندایەوە.

ئەوە بەڕاستی شێرجیا دەڤەرێکی جوان بوو. ناوچەکە بە شاخان دەورەدرابوو. نشینگەگە لە لاپاڵی گردەکە هەڵکەوتبوو، ریزە خانوێک لەوی دیکە بەرزتر بوو. پڕ داروبار بوو. لێرە دەتوانێ رەنج بداو تۆ بچێنێ، لێرە کەس ڕێگای کارکردنی پێناگرێ هەر لەبەر ئەوەی جولەکەیەکە.

پاشان داود رایگەیاند کە لەو شوێنەدا بۆ یەکەمینجار هەستی بەوە کردووە کە لە ماڵی خۆیەتی. ئیدی ئەوەیە وڵاتی باو و باپیرانی کە زۆر تامەزرۆی دیتنی بوو.

داود وا بۆ باوکی دەنوسێ:

«بەدەستی چەپەم ئامورم پێە و بەدەستی راستەش زەختەی گا هاژۆتن، ئەوەم بۆ دەردەکەوێ کە چۆن خاک هەڵدەکێڵم و گیاوگۆڵی لێبژاردەکەم، هەروەک ئەوە وایە جوتە گایەکە برادەرم بن و ناوبەناو هەقی پشودانیان پێدەدەم. لێرە ئەوکاتەم هەیە بیر بکەمەوە و نەخشەو پلانی خەونەکانم دابڕێژم».

کاتێ داود دەیەویست رونی بکاتەوە کە بۆچی لە شیجیا بەختەوەر بووە، دەڵێ:

«لێرەدا هیچ دوکانداریک، هیچ بازرگانێک، هیج کرێگرتەیەکی غەیرە جو، هیچ کەسێک بەسەر زگی ئەویدیکەدا بازنادا. پیاوان زەوی دەکێڵن، وەرد و شۆی دەکەن

و تۆی پێدادەکەن، ژنانیش لەباخچەکاندا گیا دەڕنن و مانگاکان دەدۆشن؛ منداڵەکانیش قازەوانی دەکەن و یارمەتی باوکیان دەدەن. ئەوانە بەڕاستی لادێیەکانن، کە بۆنی تەندروستی پەین و گەنمی پێگەیشتویان لێدێ و پێستیشیان لەبەر تاوی رۆژ رەش هەڵگەڕاوە«.

سەرلەنوێ خۆناسینی کۆچبەرەکان دەستپێکردەوە. ئەو پێواژۆیەش دەبێ خولی خۆی تەواو بکا تا لەهەمو لایەک جوتیارە جوەکان خاکەکە بە میوەجات بەرهەم دەهێنن، هەروەک ئەو رۆژگارەی کە هێشتا جو پەرشوبڵاوی وڵاتان نەبووبوون.

«گەر هاتو جەنابتان دواتر لەم وڵاتەوە جارێکی دیکە بەدەرنرای و پەڕیە وڵاتێکی ئەودیوی زێ، ئەوکات یادەوەرییە گاڵتەپێنەکراوەکانی شەوەکانی ئێرە کە نیشانەی رەوای لە دایکبونەوەی گەلێکە لەبیر ناکەی و لەگەڵ خۆتدا دەیبەی».

ئەو وشانەی سەرو هی دەربەدەرێکی جوو بوو کە لە دوایدا گەڕابووەوە. ئەو بۆ باوکی خۆی ئاشکراکرد گەر هاتو جارێکی دیکە لەلایەن، تورکەکان یان عەڕەبەکان وەک نەوەکانی پێش خۆی دەربەدەرکرایەوە، ئەوا هەرهیچ نەبێ بایی ئەوەندە لەوڵات ژیاوە کە یادەوەرییە نەمرەکانی بەتایبەتی هی شەوە لەبیرنەچووەکان، لەگەڵ خۆی بێنیتەوە.

لە هەندێ بەشێ فەلەستیندا عەڕەبەکان کۆچی جوەکانیان بە قازانج حیساب دەکرد. چونکە دەرفەتی کار زێدەتر دەبوو، کرێ و مز باشتر دەبوو و داودەرمان و چارەسەریش چاکتری لێدەهات.

بەڵام لە گالیلیا عەڕەبەکان هێشتا هەر وایان بیردەکردەوە کە دەکرێ جوەکان لەڕێی تەنگەتاوکردن دەربکرێن: گەرهاتو خانومالّیان بسوتێندرێ، مەڕو ماڵاتیان بدزرێ و پەلاماری پیادەکانیان بدرێ، ئەوا لەوناوەدا نامێنن. لە گوندەکانی دەوروبەری شێجیا هۆزە عەڕەبیەکان ئەزمونێکی زۆریان لە تاکتیکی تۆقاندندا هەبوو، چونکە بەهایان بۆ ژیانی مرۆڤ دانەدەنا. بۆیە پێویست بوو نشینگەکان ئێشگریان هەبێ. هەرچەندە لەو دەڤەرەدا بەتەواوی جولەکە ئێشیاندەکرد، بەڵام ئەوانەی بەشەو ئێشکگریان دەکرد، عەڕەبە کرێگرتەکان بوون، ئەوان عەڕەبی سیرکاشیر Circaaiers کە لە گوندی عەڕەبانی کفر کانا Kfar Kana وە هاتبوون، بە پارەیەکی زۆر ئەو کارەیان دەکرد.

بۆ ئەو سیستمەش رونکردنەوەی جۆراوجۆر هەبوون. گەر هاتو مرۆڤ عەرەبەکانی هۆزێکی دژواری وەک سیرکاشیر بەکرێ بگرێ و ئێشکی شەوانەیان پێبگرێ، ئەوا بەلای کەمیەوە شەوانە کردەی بەسەرداران رونادەن. ئەوجا وەک دەگوترێ «بەدز دز دەگیرێ». سەرباری ئەوەش جوەکان سەردەمانێکی دورودرێژە چەکیان هەڵنەگرتووە. دەکرێ کاری کشتوکاڵی بکەن بەڵام کاری سەربازی بۆ ئەوان نەشیاوە.

داود کە ماوەیەکی کەم بوو گەیشتبووە شێرجیا، خوازیار بوو سەرپەرشتی هەڵمەتێکی گۆڕان بکا. وڵاتی جوان دەبێ هەر لەلای خۆیانەوە پاسەوانی بکرێ. ئەوەش دروشمی ئەو بوو خەباتی بۆکرد تا بووە سەرەداوی بنەمایەک و دواتر بە

بنەمای کرێکانی زایۆنزمەوە ناسرایەوە.
لە ڕاستیدا سەبارەت بەو دۆزە ئەو ڕووبەڕوی نەیارانی زۆر بووەوە. دەسەڵاتدارە خۆجێییەکان سەری ڕەزامەندییان بۆ ئەو داخوازییەی نەدەلەقاند. گەر هاتو جوەکان خۆیان پاسەوانی لە خۆیان بکەن، ئەوا هەندێ هۆزی عارەبی بەرەنگاریدەبنەوە. کەسیش پێشبینی ناکا کە دواتر ڕەوتەکە چۆن دەڕوا. گەر هاتو هۆزی سیرکاشیر لەسەر کاری پاسەوانی دەربکرێ ئەوا دەرەنجامی سوتاندن، کوشتن و تاڵانوبرۆی لێدەکەوێتەوە.
داود و هاوڕێکانی چەند شەوێک نەنوستن تا بۆیان دەرکەوت کە پاسەوانەکان کاری ئێشگرێتی رایی ناکەن. پاسەوانەکان ئاهەنگێکیان لە گوندێکی عەرەبانی نزیک هەبوو، شوێنەکەیان بە پاڵپشتی ناوبانگیان گوایە هیچ تاڵانکەرێک ناوێرێ دزی بکا، جێهێشت. گەرهاتبا شتێکیش دزرابا ئەوا بەحیسابی بۆیان دەیانتوانی شوێنپێی دزەکان هەڵبگرن و کەلوپەلەکان بگەڕێننەوە، ئەمەش بێگومان بێ پاداشتی چەور نەدەبوو، کە بەسەر خۆیاندا دابەشیاندەکرد.
شەوێکیان داود و هاوڕێکانی هێستری خاوەن کێلگەیەکیان لە شوێنێکدا شاردەوە، ویستیان دەرسێک بدەنە ئێشکگرەکان. ئەنجا بە خاوەنەکەیان گوت کەوا هێسترەکەی دزراوە، ئەویش بەپەلەپڕوزێ بەرەو خۆکی ئاژەڵان چوو، هێسترەکە لەوێ نەمابوو. ئەنجا بەهەڵەداوان بەرەو لای ئێشکگرەکە ڕۆیشت، بەڵام کەس لەوێ نەبوو، پاسەوانەکە لە گوندێکی عەرەبانی نزیکیاندا لە حەفت خەوان ڕاستببووەوە. بۆ بەیانی پاسەوانە عەرەبەکە لەسەرکار دەرکرا، بەم جۆرە برادەرێکی داود جێگەی گرتەوە.
ئەوە دەستپێکێکی سادەییانە بوو. لە ڕاستیدا ئەو جۆرە کارانە ئەوانی گەیاندە سەرکەوتنەکانی ١٩٤٨ و ١٩٤٩، کە سەربازە نهێنی (ژێرزەمینی)یەکانیان بەرێکوپێکی پەلاماری لەشکرەکەی عارەبانیان دا. لە ڕاستیدا بنەمای ئەوەی دەبێ جو بەخۆی لەسەرخۆی بکاتەوە، بۆ یەکەمین جار لەسەر زەمیندا بە کردەوە سەلمێنرا. ئەوەش هەر یەکەمین جار بوو کە داود گرین سەروکار لەگەڵ کاری سەربازیانەدا پەیدا بکا. چل ساڵ دواتر بووە وەزیری بەرگری و یەکەمین سەرکردەی سوپای جولەکەکان، ئەو سوپایەی کە بەدرێژایی ئەو هەمو سەدانە پێکهات. ئەوەش ڕێگایەکی دوورودرێژ بوو، تیایدا زۆر کەس سەری لە پێناودا دانا. زۆریشی نەبرد کە یەکەمین قوربانی لێکەوتەوە.
هۆزی سیشیرێ خۆیان ڕێکخست و پەلاماری ئاکنجییەکانی شیرجیان دا و تەنگەتاویان کردن. داود خەڵکەکەی هێنایە سەر ئەو بڕوایە کە خۆیان بۆ بەرگری ئامادە بکەن و چەک پەیدا بکەن. بەڵام چۆن دەستیان بە چەک رابگا؟ بۆ ئەو گرفتە هەرگیز بەرسڤێکی دڵخۆشکەر لەبەردەستدا نەبوو. لە ١٩٠٧دا داود بەدوای باشترین ڕێگەی بەدەستخستنی چەکدا گەڕا. لە ١٩٤٧ دیسان بەدوای چەکدا گەڕا هەروەها لە ١٩٥٨یش.
سەرپەرشتکاری نشینگەی شیرجیا ئەسپ و گالیسکەیەکی نارده حەیفا. کاتێک گالیسکەکە گەڕایەوە، بە شێوەیەکی ئەفسوناوی بە تفەنگە ڕەشکەکانی راو بە کۆنە

جیفت Jift بارکرا بوو. بە ساڵان دواتر داود سەبارەت بەو بارە چەکە وەهای نوسی:
« ئێمە وەک منداڵ یاریمان لەگەڵ ئەو چەکانەدا دەکرد، هەرگیز لێمان جیا نەدەبوونەوە. بە نابەدڵی بە رۆژ بۆسەر کار دەڕۆیشتین، چونکە بەدرێژایی رۆژ دەرفەتی مەشقکردنمان نەبوو. هەر کاتێک لەکار دەگەڕاینەوە ماڵ ئەسپ و ئێسترەکانمان دەبەستنەوە، ئەوسا بۆلای چەکەبۆرە خۆشەویستەکان رابکە، تا لەکاتی نوستنیشدا لەگەڵ خۆمان دەبردنە سەرجێ. لەکاتی نانخواردن، دەستشوشتن، رۆیشتن، خوێندنەوە و قسەکردن تفەنگەکانمان هەر بەشان یان بەدەستەوە لەنێو گۆلمەمان دابوون».
بە رۆژ کاری کشتیارییان دەکرد و بە شەویش ئێشکیاندەگرت. ئەوان خاکیان دەکێلا و تفەگەکانیشیان بەشانەوە بوو.
لە دوا رۆژی جەژنی پاس (هەڵستانەوەی مەسیح)دا، پاسەوانێک رایگەیاند کەوا دوو عەرەبی نەناسراوی لە گۆڕەپانی شێرجیا بەدیکردوون، دیاربوو لەسەر گردەکەی بەرامبەر کڵێسەکە دانیشتبوون. یەکێ لە سەرنشینانی نشینگەکە بەناوی ئیسرائیل کرۆنگۆلد Israel Krongold بۆسۆراخکردن بەدوایانداچوو. دوای نیو سعات دەنگی شێلکە تفەنگێک هات. ئیسرائیل هەر لەرێگادا گیانی لەدەستدا.
ئەمەیان یەکەمین جار بوو ئەو گەنجەی لە پلۆنسکەوە ڕاهاتبوو، تەمەنی گەیشتبووە نزیکەی ٢٢ساڵان، مردویەک لەباوەشدا بگرێ. بێگومان دواجاریشی نابێ.
هەمان شەو داود لەگەڵ دەستەیەک لە خەڵکی نشینگەکە بەرەو نەزارەت Nazareth بەرێکەوتن. ئەوان بەرەو ئەو شوێنەیان دەڕوانی کە کابرای لێکوژرا بوو. یەکێ لە هاتووەکان شیمۆن مێلمەد Shimon Melamedی هاوڕێی داود بوو، دارتاشێکی کارامە بوو زۆر نەبوو بۆ کارکردن هاتبووە شێرجی. نها ئەو سێیەکی پێشانیشی دەستکەوت نەبوو، کەچی ئەو تێبینیە لای داود پەیدا بوو کە بەختەوەرترین پیاوی نشینگەکەیە. ئەو خەونەی کە ئەو بۆی دەژیا بەڕاستی هەڵگەڕا.
لەو کاتەی ئەوان تەماشایان دەکرد، سێ عەرەبیان بەدیکردن، دیاربوو بەدوایاندا هاتبوون. داود و یەکێکی دیکە بەرەو ئەو لایە رۆیشتن کە ڕێی گەڕانەوەیان لێبگرن. هەرزو شەڕ دەستیپێکرد، بەڵام هەمو گوندە عەرەبنشینەکە بەشداری تێداکرد. لە کۆتاییدا دەبووایە دیسان داود کۆمەکی ئەو کوژراوە بکا و بیگەیەنێتەوە ماڵ. ئەو جارەشیان برادەرەکەی خۆی، شیمۆن میلمەد بوو.
ئەوان زانیان ئیدی یەکەمین هەنگاوی زەحمەتیان بەرەو زایۆنیزم هاویشتووە. گەڕانەوەش داد نادا. دەبێ خوێنی جولەکەی زۆرتر برژێ تا کیکڵگەکانیان بپارێزرێ و ململانێی لە نۆژەن ژیانەوەی ئیسرائیل ببەنەوە.
کاتێک داود گەیشتە شیرجیا، دیمەنی دڵفرێنی دەڤەرەکە لەناخەوە هەژاندی. لە نامەکانیدا باسی> خونچە گوڵی زێرین، ئاسمانی شینی کاڵ، و هەیڤی ئەفسوناوی روناککەرەوەی ئاسمان و چیای کریستالی> دەکرد. بەڵام بە تێپەڕبوونی رۆژگار کەمتر شیعرئامێزانەی نامە دەنوسین. چونکە تادەهات رەقیتی راستەقینەی ژیانی بۆ

دەردەکەوت.

شلۆمۆ زیماخ کە پێش داود هاتبووە نشینگەی شێجاریا، دژی بیرۆکەی بەرەنگاریانەی جولەکە بوو. ئەو لەگەڵ داودا لە یەک ژور دەخەوتن، تا قولایی شەو مشتومڕیان بوو. شلۆمۆ دەیگوت ئێمە بۆیە هاتوینەتەوە وڵاتی کتێبە پیرۆزەکە تا سادەییانە و بە ئاشتی بژین. گەر هاتو بەرەنگاری عەرەبان ببینەوە ئەوا هەرگیز ئاشتی(شالۆم Shalom) پەیدا نابێ.

وەلێ داود رای وابوو کە پێویستە راستیەکان بە جوانی ببینرێن. ئەوان هەنوکە لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاست، نەوەک ئاوڕووپادا دەژین. قانونی بیابان تاکە قانونە کە عەرەبەکان لێیحاڵین. بەگوێرەی ئەو قانونە پێویستە پیاو لە ئامادەباشیدابێ، داکۆکی لەخۆی بکا. لەچاوی هۆزە دەرونەخۆشە تاڵابەرەکان ئەوەی دەربازدەبێ و دەیباتەوە پاڵەوانە. کوشتنی کەسی لایدە و زێڕ دزین لە فەلەستیندا بێڕەوشتی نیە. بەکردار دەسەڵاتی تورک لێرەدا نەماوە. پیاوکوژەکان بەدەگمەن سزادەدرێن، دزەکان بە ئاشکرا وەک بازرگانانی زەیتون پیشەکەیان رایی دەکەن و وەک بەرزەکی بانان لێیدەردەچن.

هەرچەندە داود بەگوێرەی روانینی مێژویەکەی خۆی هەر گەنجی جاران نەمابوو. دواجار کە جوەکان شەڕیان لەسەر شەرەفی خۆیان، مافەکانی خۆیان لەو وڵاتەدا کردووە لە کۆتایی سەدەی یانزەهەمدا بووە، کاتێک لەشکری تانکرێد Tancredو هێزی دەریایی ڤێنسی(بندەقیە) پەلاماری حەیفایان دا. هەشت سەد ساڵی بەدوادا هات جو لەشکری خۆی نەبوو. هەر لەبەر ئەمە بوو کە جیهانی غەیرەجو ئەو سەرنجەیان لادروست بوو گوایە جوەکان ترسنۆکن، ئامادە نین داکۆکی لە مافەکانیان بکەن. لە هەندەراندا بەتەواوی پابەندی قانونی ئەو وڵاتانە بوون کەلێی دەژیان، بەڵام نوێنەرانی ئەو قانونانە زۆر جاران کاری ڤێزەونیان دەکرد و چاویان لە باندەکانی دژەسامی بۆ کوشت و بە تاڵانبردنی ماڵوحاڵی جوەکان دەپۆشی، لەبریتی ئەوەی بیانپارێزن.

ئەوکاتەش کە جوەکان پەرۆشی خۆیان بۆ نەخشەی گەڕانەوە بۆ وڵاتی دێرین ئیسرائیل دەربڕی، ئەوا دەبێ گۆڕانکاری بەسەرخۆیاندا دابێنن. ئەم جیهانە جیهانێکە کە هەر بەتەنها هێز دەیخوا و هەر هێز وادەکا رێزی بگری. تا ئەوکاتەی مرۆڤایەتی لەوەدا سەردەکەوی کە ماف و رەوایەتی بەسەر هێزدا زاڵ ببێ، پێویستە جوەکانیش بەهێز بن. داود توانی ئەوانی دیکە بەو بەڵگەوبەندانەی سەرو بهێنێتە سەر بڕوای خۆی، بەڵام شلۆمۆ زامیخ هەر نەهاتە ژێربار. شلۆمۆ دواجار بەرەو پاریس بۆ تەواوکردنی خوێندنی بەڕێکەوت، پاش چەندان ساڵ ئەوسا گەڕایەوە.

داود لە خەباتی بێوچانیدا بۆ داکۆکیکردنی جولەکەکان پشتیوانی لە کرێکارانی زایۆنیزم بەدەستهێنا. لەژێر رابەرایەتی بن زیڤی رێکخراوێکی نهێنیان پێکهێنا. رێکخراوەکەیان بەناوی هاشۆمەر Hashomer (ئێشکگرەکان) بوو، کە مەشقی بە جوەکانی سەرتاسەری وڵات دەکرد.

هەر بن زیڤیش بوو پێی لەسەر ئەوە دادەگرت کە دەبێ بەزوترین کات داود بچێتە ئۆرشەلیم. داود بە شێوەیەکی گشتی حەزی لە ژیانی شار نەبوو، ئەو چەند

دانەیەکی وەک وارشۆ، ئۆدێسا و کۆستانتیناپۆل Konstantinopel(ئەستەمبۆلی ئێستا) دیتبوو.

بەڵام ئۆرشەلیم شتێکی دیکە بوو. ئۆرشەلیم شاری داود بوو. شا داود ناوبانگی ئۆرشەلیمی بە هەمو دنیادا بڵاوکردەوە. سالۆمۆ Salomo (سلێمان) یش کۆتەڵەکەی لە سەوزایی لوبنانەوە هێناو بە ئاڵتون نەخشاندی. رۆژگارێکی درێژ بوو لە ئۆرشەلیمدا ئاشتی و خۆشگوزەرانی بۆ جولەکان مەیسەر ببوو. بەڵام شالۆم (ئاشتی) درێژەی نەکێشا. میسرییەکان، ئاشورییەکان، گریکەکان، عارەب، رۆمانی و تورک هەمویان هاتن. هەنوکە ئۆرشەلیم شارێکە لەژێر دەسەڵاتی تورکاندایە، بەڵام هێشتا جوی لێدەژین، یەکێکیشیان ئەو بن زیڤییە کە داوای لە داود کردووە«بە پەلە وەرە».

بزوتنەوەی کرێکارانی زایۆنی کۆنگرەیەکیان بەست و بن زیڤی داوایکردووە کە هەفتەنامەیەک بەناوی ها ئاخدوت Ha`achdut (یەکێتی) دەربکەن. ژنێکی گەنج بەناوی راشێلیانایت Rachel Yanait کە تازە لە ئاورۆپاوە هاتبوو (دواتر دەبێتە خانمی بن زیڤی) دەبێتە یاریدەدەر. بەڵام ژنەکە هیچ عیبری نەدەزانی. جوتیارە گەنجەکەی گالیلیا رایگەیاند ئەو بۆ ئەوە گەڕاوەتەوە زەوی بکێڵێ. بەڵام بن زیڤی هانیدا ئەرکی نوێی بەجێبگەیەنێ. لە دوایدا گەیشتنە چارەسەرێک. داود سەرەتا دەبێ بچێتە روسیاو هەندێ کاری فەرمیانە ئەنجامبدا، تاکو وا دەربخا کە کاری راژەی سەربازییانەی تەواوکردەوە، بۆ ئەوەی چیدیکە باوکی تەنگەتاو نەکەن. دواتر ئەو گەشتێک بەهەمو نشینگەکانی جولەکاندا بکا. ئەوسا کارنامەی رۆژنامەوانی دەستپێدەکا.

ئەو بەرنامەیە سەریگرت و داود هاتە شاری پیرۆز. وەک زگورتییەکی بزوتنەوەی کرێکارانی زایۆنیزم و ئەندامێکی دەستەی نوسەرانی هەفتەنامەی <یەکێتی> دەستبەکاربوو. لە یەکەمین وتاریدا ئامانجەکانی هەفتەنامەکەی رونکردەوە. ئەو بە واژۆی بنگۆریۆن Ben –Gorion ناوی خۆی نوسی. ئەوەش یەکەمین جار بوو کە ئەو ناوە بەکاربهێنێ، ئیدی هەمو جیهان بەو ناوەی ناسی. ئەو پاشناوەکەی لەبەر ئیقاعە بایبلیانەکەی هەڵبژارد. <بن> بە عیبری واتای کوڕ، <گۆریۆن>یش واتای شێرێکی خورت دەگەیەنێ. ئیدی هەنوکە ئەو بووە داود کوڕی شێرە خورتەکە. بەهۆی ئەو ناوەوە لە ڕوی هێماییەوە هەمو پەیوەندییەکی بە هەندەرانەوە پچڕی. ئێستا ئەو داود بنگۆریۆنی هاوڵاتی ئیسرائیلە، ئەو وڵاتەی کەلە کەلکەڵەی ئەندێشاوی جوە ئایدیالیستەکاندایە.

داود ئێستا تەمەنی نزیکەی بیست وچوار ساڵانە، گەنجێکی رێکوپیکی پرچڕەش. سمێڵە رەشەکە لەسەر دوا مۆدێلی تورکی چاکردبوو. ئەو قاتێک، کراسیکی سپی و بۆینباخێکی خەتخەتی پۆشی. دەکرا ئەو رۆژنامەنوسێکی ئینگلیزی یان ئامریکایی بووایە.

لە وتارەکانیدا راشکاوانەوە هیچی تێدانەدەهێشتەوە. ئەو داوای یەکگرتنێکی زیاتری نێو ریزەکانی جولەکەکانی دەکرد، داوای زیاتر بەکارهێنانی زمانی عیبری، پشتگیری سیاسەتی سۆسیالیزمیانەی بزوتنەوەی کریکارانی زایۆنیزمی دەکرد. لە دوایشدا داوای ئابۆنەی زیاتری هەفتەنامەکەی دەکرد.

لەو سەردەمەدا سەدهەزار جو لە فەلەستیندا دەژیان. تیراژی هەفتەنامەکە دوسەدو پەنجا دانەی بۆ ناو فەلەستین و سەد دانەشی بۆ دەرەوە بوو. (زۆر لە جوەکانی فەلەستین دژی بەکارهێنانی عیبری بوون وەک زمانی ئاخاوتن). لە بەرامبەر کارەکەیدا داود بنگۆریۆن وەک نوسەر هەفتانە ٢,٢٥ دۆلاری وەردەگرت.

داود بۆی دەرکەوت کە ژیانی جوتیارانەی باش لێدەهات. هەنوکەش ئەوەی بۆ ساخ بۆتەوە کە ژیانی رۆژنامەنوسیانەی وەک پیشە بۆ ئاسانترە. لە ماوەی ژیانیدا بنگۆریۆن هەمو چاکەی ناوبانگی وەک سیاسەتوان، دەوڵەتمەدار، سەرباز، ستراتیژدانەر و سەرۆکی حکومەت هەمیشە لە چاوی رۆژنامەنوسیەوە دەزانی. کاتێک کە بووە سەرەک وەزیر، کۆمەڵێ لە پەیامنێران داوایان لێکرد هەندێ زانیارییان سەبارەت بە وڵاتەکە بۆ وتارەکانیان بداتێ. لە بەرامبەردا گوتی:

«من شتە ناوازەکان بۆ ئەو وتارە هەڵدەگرم کە بەتەمام بینوسم» ئەنجا بە متمانەوە پێیگوتن «لەبیرتان نەچێ ئەزیش رۆژنامەوانم».

# بەشی
## (٣)

گەر هاتباو گەنجەکە پێش چەند ساڵێک نەوەک لە ١٩١٣ پێی نابایە سەر وشکانی خاکی سالۆنیکی Saloniki،رەنگبو بهاتایە سەر ئەو بڕوایە کە هەڵەیەکی کوشندەی کردووە و دەستبەجێ بگەڕابایەوە. بەڵام داود بنگۆریۆن نەیدەزانی کە ماوەیەکی زۆر ناباو جەنگی جیهانیی هەڵدەگیرسێ، لە ئاکامی جەنگەکەدا ئیمپراتۆریەتی عوسمانی لە باریەک هەڵدەوەشێ، بەمەش گۆشەی باشوری رۆژئاوای ئاوڕوپا و بەشێکی زۆری رۆژهەلاتی ناوین، لەنێویشیاندا فەلەستین لە چنگی تورکەکان رزگاریان دەبێ.

دەستپێشخەرییەکی نوێ ختوکەی بنگۆریۆنی جوتیار- پاسەوان- رۆژنامەوان- سیاسەتوانی دا، بەوەی لە رۆژگاری نوێدا ئەرکێکی نوێی لێچاوەڕوان دەکا. هەرچەندە تەمەنی نەگەیشتبووە بیست و حەوت ساڵان، بەڵام هەستێکی گەرمی لا گەلاڵە ببوو. کە خۆی بۆ سەرکردایەتییەک ئامادە بکا.

لەو ساڵانەی لە ئۆرشەلیمدا بووە،دەرفەتی خوێندن و لێکۆڵینەوەی باری سیاسیانەی بۆ هەڵکەوتبوو. جوەکانی فەلەستین لەنێو ئاکنجییەکانی وڵاتدا کەمینەیان پێکدەهێنا.

«ئێمە بەگویرەی قانونی دەستوری، بەواتای تەواوی وشەی کۆمەڵایەتی و سیاسییانە هیچ رەگوڕیشەمان لەو خاکەدا رانەهێشتووە، کە بەهۆیەوە بەپێی راگەیاندنی خۆمان بمانەوێ ماڵێک (نیشتمانێک)ی جولەکان دروست بکەین.»

«من بۆیە بڕیارم دا بچمە قوستەنتینە (ئەستنبول) تاکو قانونی تورکی یان عوسمانی بخوێنم و ببمە پارێزەر، ئەوسا ژیانی قانونیانەی خۆم بۆ داکۆکیکردن لە مافی هاوڵاتیی و کۆمەلایەتیەکانی خەڵکی جو لە ئیسرائیلدا تەرخان بکەم».

بنگۆریۆن ئەو نەخشەیەی لەگەڵ بن زیڤی تاوتوێ کردبوو. بن زیڤیش دەیویست بڕوا.

«رەنگبێ لە داهاتودا بەیەکەوە وەک نوێنەری جولەکەکان بچینە نێو پەڕلەمانی تورکان».

لەسەر ئەوە رێککەوتن کە بنگۆریۆن سەرەتا بڕوا، ئەوسا بە دوایدا بن زیڤیش بچێ. هەنوکە «یەکێتی» دەستەی تەواوی بەڕێوەبردنی خۆی هەیە. ئەوانی دیکە دەتوانن جێی بنگۆریۆن و بن زیڤی بەباشی پڕبکەنەوە.

بنگۆریۆن سەرەتا پێیخۆشبوو بچێتە سالۆنیکی چونکە زۆر جولەکەی لێدەژیان و بزوتنەوەی کرێکارانی جولەکەیشی لێ کارابوو. ئەوسا بەرەو قوستەنتینە بەڕێکەوت

و لەوێ ناوی خۆی لە خوێندنگەی قانونی عوسمانیدا تۆمارکرد. هەر ڕێکەوت ئەوەی خواست کە هاوپۆلێکی عەبدوڵلای بن حوسێن بێ کە کوڕی حوسێنی بن عەلی بوو، ئەو عەبدوڵلایەی لە ١٩٤٦دا بووە شای ئوردن و ساڵی دواییش کوژرا.

هەر زو بن زیڤی لە قوستەنتینیە خۆی گەیاندە بنگۆریۆن. گەشتیارە بێگانەکان ئەوانیان وەک دوو تورک تەماشا دەکردن. ئەوان فێسێکی سوریان لەسەر دەنا و چاکەتێکی ڕەشیان لەبەر دەکرد و بۆینباخیکی ڕەشی سادەشیان دەبەست. هەردوکیان سمێڵیان وەک تورکێکی ڕەسەن هێشتبونەوە. ماوەیەکی زۆر برادەرەکانیان بەجمک ناویان دەهێنان.

ئیدی بەدوای ئەواندا برادەرەکانی دیەکەشیان هاتن، موشێ شێترۆک کە دواتر بووە شارێت Sharett، ئەوکات گەنجێکی تەمەن نۆزدە ساڵان بوو کە تازە قوتابخانەی دواناوەندی تەلئەبیبی تەواو کردبوو، هات. تەلئەبیب ئەوشارەی سەر کەناری یافا بەخڕی شارێکی جولەکان بوو، هەڕمێنی پەرەسەندنی بوو. شێرتۆک و بنگۆریۆن لە ماوەی دورودرێژی چل ساڵدا بەیەکەوە کاریان کرد.

یوسف ترومپێلدۆر Yoesph Trumpeldorیش بۆ خوێندن هاتە قوستەنتینیە. بەلای بەراوردکاری ئەودا بنگۆریۆن بە کورتەباڵا (قەزەم) دەچوو. هەردوو پیاوەکە هەر زوو بۆ یەک هەواداری دڵسۆزبوون. ترومپێلدۆر لە سیبیریاوە تا دەریای ڕەش لەسەر ئاستی سەربازییانەدا بە نمایشکەرێکی (نمایشکارێکی) ناودار ناسرابوو. لە سەردەمی شەڕی روس و ژاپۆندا ئەو تاکە ئەفسەرێکی جولەکە بوو لە سوپای قڕاڵدا. لە ئابلۆقەدانی بەندەری ئارسور Port Arthurدا کە حەوت مانگی خایاندن، باسکی خۆی بەتەواوی تا ملی لەدەستدا. هەنوکەش بۆتە جوتیارێک لە فەلەستین؛ ئەو لە دێگانیا Deganyaدا دەژیا. تەنانەت بە تاکە باسکێکیشەوە ئەو لە هەمو ئاکنجیانی نشینگەکەی بەکارتر بوو. خۆی خۆی فێرکردبوو کە چۆن بەدەستێک ردێن بتراشێ، هەروەها هەمو شتێکی دیکەی بێ یارمەتی خواستن دەکرد، خواردن، جل لەبەرکردن، تفەنگ تەقاندن و سواری ئەسپ بوون. ئەو ئامادەی کۆنگرەی جولەکەکانی ڤیەناش ببوو، ئێستاش گەڕاوەتەوە دێگانیا.

کاتێک هەردوکیان بۆ یەکەمجار بەیەکگەیشتن، بنگۆریۆن بەهەندێ ئێرەییەوە سەیری قۆڵەهەڵدراوەکەی ترومپێلدەرسی کرد. ئەوە جوێکە کە قۆڵێکی کردۆتە قوربانی، ئەوە پاڵەوانێکی شەڕی جولەکەکانە.

ترومپەلدۆرس زۆری حەز لەبەکارهێنانی پەندی عیبری ئاین داڤار Ein Davar(جا قەیدی چییە) هەبوو. شێوەگوتنی جا قەیدی چیە، هاوڕێیەکی خۆی بە ناوی ڤلادیمیر ژابۆتنسکی Vladimir Jabotinsky خستە سەر ئەو ئەندێشەیەی کە پەندەکە والێکبداتەوە: «ئەرێ، فەلسەفەیەکی شێوەژیانی تەواو لەبن دەربڕینی جا قەیدی چییەدا هەیە: پێ لێهەڵمەبڕە، هیچ مەترسییەک مەبینە کە لەڕاستیدا هەونەبووبێ، ئەوکەسەی کە ئەرکەکەی خۆی ڕاییدەکا بە پاڵەوانی مەزانە، چونکە مێژو بەردرێژە، گەلی جو نەمرە و ڕاستیش پیرۆزە، بۆ ئەو زەحمەتی و خەم و ژانانەی دیکەش؛ جا چ قەیدییە».

ترومپێلدۆر وەک سۆشیالیستێک، روەکخۆرێک (ڤیجەتاری) هەرچەندە لە ژیانی خۆیدا زۆر جەنگاوە، بەڵام لە ناخەوەیدا پاسیفیستیک بوو.

بەیەکەوە بنگۆریۆن و ترومپلدۆر بە کوچە و کۆڵانەکانی قوستەنتینیەدا دەڕۆیشتن. بە شێوەیەکی سەرەکی باسی شەڕیان دەکرد. تۆ بڵێی پیاوە نەخۆشەکەی ئاوڕوپا (مەبەست ئیمپراتۆریەتی عوسمانیە-وەرگێڕ-) خۆی پێ بپارێزرێ؟ ئایا گەر هاتو جەنگی جیهانیی بەرپابوو، جوەکانی فەلەستین چییان بەسەردێ؟

رۆژ هاتو چو تورکیش بووە شەشەمین زمان کە بنگۆریۆن فێری ببوو، لەگەڵ فێربوونی تورکیدا خەریک بوو ئەو کەمە پۆلۆنیەی لەبیردەچووەوە.

خوێندکارە جوەکان رژدبوون لەسەر فێربوونی زانستە قانونییەکان، بەڵام لەژێر هەوری ئاسمانی ئەو ساڵانەدا هەورەتریشقە هەبوون.

هەرچەندە دەوڵەتە سەردارەکان یاداشتی تورەییان ئاڵوگۆڕ دەکرد، بنگۆریۆن و هاوڕێکەی بن زیڤی ئەو کاتەیان هەبوو بە زمانی عیبری کتێبێک لەسەر شێوە بەرێوەبردنی پارێزگاکان لەلایەن دەوڵەتی عوسمانییەوە بنوسن. پاش یەک دوو ساڵان ئەو کارەیان لە رووی مێژووییەوە زۆر گرنگ بوو. نە بنگۆریۆن، نە بن زیڤی و نەئەوانی دیکەش نەیاندەزانی چۆن ئاوا خێرا شەڕ کۆتایی بە دەسەڵاتی تورکان دەهێنێ. ئەوان کەلوپەلەکانیان لەپاش خۆیان بەجێهێشت و بەرەو ئۆرشەلیم گەڕانەوە، بەدوای ئەوەدا چوون ئاخۆ لەدوای ئەوان کارەکان لە وڵات چۆن بەڕێوەچوون.

لە شاری پیرۆز بۆیان دەرکەوت کە کار ئاوەژو دەڕوا، هیچی دیکە نە پارە نە پێداویستیەکانی ژیان لەدەرەوە نانێردێنە وڵات. جوەکان لەبارێکی شپرزە و تۆقێنەرانەدا دەژیان. تورک پاڵی بە ئاڵمان داوە و دژی روس دەجەنگێ. دەسەڵاتدارانی تورک فەرمانیان داوە هەر پیاوێک دەستی تفەنگ بگرێ، پێویستە بچێتە ریزی لەشکر؛ هەرکەسێ فەرمانەکە جێبەجێ نەکا دەگیرێ یان نەفیدەکرێ. شیرتۆک وەک ئەفسەرێک چوە ریزی لەشکری تورک. ترومپێلۆر بزربوو، لە دێگنیا دەنگۆکان وا بڵاوبوونەوە گوایە لە بەرەیەکی دیکەدا شەڕ دەکا و گەر پێویستیش بێ خوێن بۆ دۆزی روسیا دەڕێژێ.

لە ئینگلستان حایم وایزمەن داکۆکی لەو هەڵوێستە دەکرد کە دەبێ زایۆنیزم پشتی ئینگلیز بگرێ. ئەوەش بووە مایەی یەکێ لە یەکەمین جیاوازییە مێژووییەکانی بیروڕای لەگەڵ بنگۆریۆندا. وایزمەن بە نابەدڵی بنگۆریۆن ببووە جێگرەوەی تیۆدۆر هێرزل.

بەریتانیای گەورە و روسیا هاوپەیمان بوون. گەر هاتباو ئینگلیزەکان شەڕەکەیان بردبایەوە، کەواتە روسەکانیش دەیانبردەوە. بەڵام بنگۆریۆن و زۆر لەوانی دیکە کە لەژێر نیری چەوساندنەوەی قڕاڵەکان ناڵاندبوویان، راونانی جولەکانیان دەهاتەوە یاد، لە دڵەوە حەزیان دەکرد شەڕەکە بە شێوەیەک لە شێوەکان بە ئاکامێکی دیکە کۆتایی پێبێ. بیرۆکەی وایزمەن کە دەبێ زایۆنیزم هاوپەیمانی بەریتانیای گەورە بێ،کەواتە دەبوایە هاوپەیمانی قڕاڵەکانی روسیاش بوونایە، پێیان قوتنەدەدرا. ئەو هەلومەرجە هەمو رەگەزەکانی تراژیدیای گریکدا لەخۆگرتبوو.

بنگۆریۆن لە وتارێکیدا کە لە «یەکێتی» بڵاویکردەوە داوای لەو جولەکانە کرد کە

نەچوونەتە ریزی سوپای تورکان، پێویستە لەسەریان بەتالیۆنێکی تایبەت بەخۆیان بۆ بەرگریکردن لە فەلەستین پێکبهێنن.
ترومپێلدۆر سەری لە ئەلکسێندەریە دەرهێنا. ژابۆتینسکی کە رۆژنامەنوسێکی روس بوو، بە شەش ساڵ لە بنگۆریۆن گەورەتر بوو، وەک نوێنەر لە زۆربەی کۆنگرەکانی جوان ئامادەبوو، شوێنپێی ژابۆتینسکی هەڵگرت.
ژابۆنیتسکی دەقاودەق دەیزانی چیدەوێ. ئەویش لەهەمبەر روسەکان هاوهەستی بنگۆریۆن بوو، بەڵام زیاتر قینی لە عوسمانییەکان دەبووەوە. «لەهەر کوێیەک تورک حوکمڕان بێ، نە رۆژی لێهەڵدێ و نە گیاشی لێدەڕوێ».
ئەو لەسەر گریمانەیەک سوربوو؛ لەباریەکهەڵوەشاندنەوەی دەوڵەتی تورک دەبێتە مەرجی یەکەم بۆ ژیانەوەی نیشتمانی دایکی جوەکان.
ئەو و ترومپێلدۆر  قسەیان لەسەر پێکهێنانی بەتالیۆنێکی تایبەتی جولەکان کرد. ئەوان لەسەر ئەوە یەکانگیربوون کە ئەو رۆڵەی جو لەو شەڕەدا دەیگێڕن، هۆکارێکی بڕیاردەر دەبێ لەسەر بەختیان لە فەلەستیندا. ئەوان حەزیان دەکرد بەشداری رێیگواستنەوە بن بەناو تورکاندا بۆ وڵاتی پیرۆز. بەڵام تاکە شت کە لەلایەن لەشکری دەسەڵاتداری بەریتانی لە میسردا رێگەیان پێدرا، پێکهێنانی بەتالیۆنێکی ئێسترسوار بوو بەناوی هێزی ئێسترەوانی زایۆن Zion Mule Corrps.
ژابۆتینسکی بە توڕەییەوە هاواری کرد؛ «هەرگیزنابێ».
ناوی لەشکری ئێستران مایەی شەرمەزاری و لەکەدارکردنیان بوو.
ژەنەراڵێکی ئینگلیزی بانگی تروپێلدۆری کرد، بەڵێنی ئەوەی پێدا گەر هاتو خۆی و  هەواداره جوەکانی بێنێتەرایێ و ئامادەبن کاری دژواری کەم شەڕافەتمەند بکەن؛ بەوەی ئێسترەکان لە تەقەمەنی باربکەن و بۆ بەرەی پێشەوەی شەڕیان ببەن؛ ئەوا دوای شەڕ فەلەستینێکی جولەکانەیان دەداتەدەست. ئا بەوشێوە ئەو گەنجە جوە روسیاییە کە تەنها باسکێکی هەبوو بەخۆی و شەشسەد جولەکەی ئێستر هاژۆ بەرەو گالیپولی Gallipoli چوون، بەڕاست ئەوان سەروەرییەکی گرنگی مێژویی سەربازییان بۆخۆیان تۆمارکرد.
لەو نێوەدا بارودۆخی فەلەستین پاشاگەردانی تێکەوتبوو. هەژدە هەزار جو لە فەلەستین بەرەو میسر هەڵهاتبوون، رۆژانەش زیاتر دەڕۆیشتن. تورکەکان بەسەدان جولەکەیان گرتبوون کە رەوانەی ئۆردوگا و زیندانیان کردبوون.
رۆژیکیان پۆلیسی تورک هەڵیکوتایە سەر بارەگای رۆژنامەی یەکێتی، بنگۆریۆن و بن زیڤیان خستە گرتوخانەی ئۆرشەلیم.
یەک دو رۆژ پاشتر پێانگوترا دەبێ وڵات بەجێبهێڵن چونکە دەستیان لە پیلانگێڕیدا هەیە و بەتەمان دەوڵەتێکی جو دابمەزرێنن. لەناو گرتوخانەکەدا هاواریان بردە بەر جەمال پاشای پارێزگار.
مانەوەیان لەگرتوخانەدا لە گاڵتەئامێزی بەدەر نەبوو. ئەوان گرتوخانەکەیان بە میوانخانەیەکی پلە سێ دادەنا. ئەو کات بەقەد خوێندکارانی خوێندنگەیەکی بەکرێ ئازاد دەبوون. بنگۆریۆن دەیتوانی ئامادەی کۆبوونەوە سیاسییەکان بێ و لەهەندێ

وادەبەڵێنەکانی خۆشیدا بچێ.
رۆژێکیان کە لە شەقامەکانی ئۆرشەلیمدا دەڕۆیشت، توشی جەمال پاشای پارێزگار هات. پارێزگار پێیگوت «من داواکەتم رەتکردۆتەوە، من تۆ دەردەکەم».
کاتێک بنگۆریۆن و بن زیڤی گەیشتنە ئەلکسەندەرییە، سەرلەنوێ گیرانەوە، بەڵام ئەمجارەیان لەلایەن ئینگلیزەکانەوە. ئەوان بە بێگانە تەماشادەکران، ئەو لایدانەی پەیوندییان بەدوژمنەوە هەیە، واتە پەیوەندییان بە تورکانەوە، بۆیە دەبێ لەوڵات وەدەربنرێن. پاش ئەوەی خەڵکی جۆراوجۆر کەوتنە نێوانیان لە کۆنسولخانە و باڵوێزخەنەکان بۆیانپاڕانەوە، گەشتنامەیەکیان بۆ دروستکراو ڤیزای ئامریکاشیان بۆلێدان.
ئەو دووانە هاوینێکی زویی ١٩١٥دا گەیشتنە نیۆرک. ژوریان لە سیڤنتیس Seventies لە رۆژهەڵاتی برۆدوێی Brodway دەستکەوت. یەکەمین شتکڕینی بنگۆریۆن کتێبێک بوو، کتێبێکی ئەستور کە فەرهەنگێکی تەواوی زمانی ئینگلیزی بوو، لە نێوەڕاستی ژورەکەیدا مێزێکی تایبەتی بۆدانابوو.
لە مانگە بەراییەکانی مانەوەی لە ئامریکادا، ئەو گەنجەی پلۆنسک وڵاتی ئامریکای پێخۆش بوو. لەهیچ شوێنێکی دیکەی دنیادا وەک ئێرە جولەکە ئازاد نەبوونە، جولەکەکانی ئێرە بەگشتی وەک مرۆڤێکی ئاسایی هەڵسوکەوتیان لەگەڵدا دەکرێ. بەڵام ئەو کەمتر رای لەرەفتاری زۆر لە جوەکانی ئامریکا بوو. لەچاوی بنگۆریۆنی سۆشیالیستخواز ئەوان زۆر بێباکانە زۆر هاوڵاتیانەش هەڵسوکەوت دەکەن. ئەو زاتی ئەوەیکرد لەگەڵ ناسیاوە نوێکانی بکەوێتە دەمەقاڵێ، بەوەی پێیان بڵێ ئێوە بەشی هەرە خراپ نەوەک بەشە باشەکەی کلتوری بەجێماوتان بۆ جیهانی نوێ گواستۆتەوە.
ئەوەی زۆریش بایەخی پێدەدا ئەوە بوو کە زمانی عیبری لە ئامریکادا بێجگە لە سیناگۆگەکان تا ڕادەیەک لە هێج شوێنێکی دیکەدا ناسراو نەبوو. جوەکانی نیۆیۆرک هەستێکی وایان دەربارەی زمانەکەیان نەبوو، ئەوان هەر وەک پێڵاوێکی دڕاو فڕێبدەن زمانی جیدیشیان بەلاوە نەناوە چونکە بۆیان ئاسانە و فڕێینادەن.
یەکێتی جوەکانی ئامریکا بە ڕادەیەکی زۆر لە گۆڕێدا نیە. ئەوان بەسەر چەند کۆمەڵگەیەکی بچوکی لەیەکدابڕاودا دابەش بوونە، هەر دەستە و کۆمەڵگەیەکیش ناوی خۆی و دەستەی بەڕێوەبردن و کۆمیتەی پارەکۆکردنەوەی خۆیان هەیە.
دوای ئەوەی بنگۆریۆن و بن زیڤی دەرفەتی ئەوەیان بوو متمانەیان بە ئامریکا پەیداکرد، ئیدی کەوتنەخۆ؛ هەردوکیان هەمو وڵاتەکەیان بۆ بانگەشەکردن بۆ ژیانی فەلەستین تەیکرد. ئەوان دنەی گەنجە بەهێز و ئایدیالیستە زایۆنیستەکان دەدا کە کۆرس و مەشقی خوێندنی کشتوکاڵی لە ئامریکادا ببینن. لەکاتی خوێندنەکەشیاندا پێویستە شارەزاییش لە زمانی عیبریدا پەیدا بکەن.
ئەوان لەم ولایەت بۆ ئەو ولایەت دەڕۆیشتن، پەیام و هەڵوێستەکانی خۆیان روندەکردەوە. کۆنفرانسیان سازدەدا، کۆڕیان دەبەست، لە رۆژنامەکاندا دەیانوسی. زۆری نەخایاند تا جوگرافیای ئامریکایان لە زۆر ئامریکاییەکان باشتر دەزانی.

لەو سەردەمەدا بۆ ئەو جوە دواندەرانەی کە بەڕاستی لە وڵاتی پیرۆزەوە هاتبوونە جیهانی نوێ، چارەنوسساز بوو؛ بەوەی زۆر لە کەسانی زانیاریویست دەهاتنە کۆبوونەوەکان. هەزاران کەس پەیوەندییان بە ڕێکخراوەکەیان کرد کە بەناوی هێخالوتز Hechalutz (نۆبەرەکاة-دەستپێکەکان) بوو، چونکە هیوایان وابوو دوای شەڕ تەوژمی کۆچکردووان زیاتر بکاو نشینگەی نوێ دروست بکرێ.
ئەوان دوو کتێبیان نوسین. یەکەمیان سەبارەت بە بزوتنەوەی نۆبەرەکان و چۆنیەتی لەسەرخۆکردنەوە، دوهەمیشیان کە کارێکی گرنگ بوو دەربارەی دیرۆک و جوگرافیای فەلەستن بەناوی «وڵاتەکەی ئیسرائیل» بوو.
لە کۆتایی ساڵی ١٩١٥دا بنگۆریۆن ئاشنایەتی لەگەڵ کچێک بەنای پاولا Paula پەیداکرد. هەردوکیان لە ئاهەنگێکدا لە مانهاتن Manhattan لەلایەن باروخ زوکەرمان Baruch Zuckermanی زایۆنستێکی نیۆیۆرک بەیەکدی ناسێنران.
پاولا مونوایس Paula Munweis کچێکی بیست و سێ ساڵان، لە بنگۆریۆن گەنجتر بوو. ئەو چوارەمینی نۆ منداڵەکەی دایک و باوکی کە لە مینسک Minsk لەدایک ببوو. ئەو لە بنەماڵەیەکی دەوڵەمەندی ناوداری مینسکی روسیا بوون.
لەو سەردەمدا ڕێسای سنورداركردنی ڕێژەی خوێندکارانی لەسەردەستی قڕاڵەکانەوە دەرچوو، بەگوێرەی ڕێساکە نەدەبووایە ڕێژەی خوێندکارانی جو لە قوتابخانەکانی میرییدا لە ١٠٪ی تێکڕادا تێپەڕاندبا. مونویسی باوکی پاولا کێشەکەی بەوە چارەسەرکرد کە منداڵەکانی بۆ خوێندن بنێرێتە وڵاتەکانی دەرەوە.
پاولا سێنزە ساڵان بوو کە باوکی ناردییە نیۆیۆرک. پاولا دەیویست ببێتە پزیشک. بەڵام ئەو لە نیوەی ڕێگای بەجێهێنانی ئاواتەکەیدا باوکی دەمرێ، ئەو بڕە پارەیەش کە بۆی دەنێردرا،دەوەستێ. ئیدی پاولا وەک خوێندکارێکی قوتابخانەی برینپێچی سەرەتا دەچێتە نەخۆشخانەی جوان لە بروکلین Brooklyn پاشان لە نەخۆشخانەی بێت ئیسرائیل لە نیوجێرسی کاردەکا.
بە گوێرەی باسکردنی خۆی، پاولا ئەوکات کیژێکی سەرنج ڕانەکیشی ناپێشچاو بوو، ئەوەش نمونەیەکی خوێندکارە روسیەکان بوو. پرچە ئاڵۆزەکەی شانەدەکرد و نێوچاوانە ئەستورەکەی بەدیار دەکەوت. بیچمەکەی لە تابلۆیەکی بۆتیسێلی Botticelli دەچوو. داود بنگۆریۆن ئەو سەردەم دیاردەمۆدە بوو. لەبۆنە فەرمیەکاندا جلی کەشخەی لەبەردەکرد. سمێڵە تورکییەکانیشی تراشیبوو.
ڕەنگبێ ئەوە سەیر بێ کە ئەو جوتە زۆر بەخێرایی یەکدیان خۆشویست. هەردووکیان هەر جو بوون، هەردوکیشیان لەیەک بەشی ئاوڕوپاوە هاتبوون، بەڵام مرۆ دەکارێ بڵێ لەیەکچونەکانیان هەر ئەوەندە بوو بەس.
دوای دەساڵان ژیان لە ئامریکادا، پاولا ببووە کچێکی نییۆرکیانە. ئەو بەهیچ شێوەیەک عەوداڵی وڵاتی پیرۆز نەببوو، پەیوەندیشی لەگەڵ زایۆنیزمدا نەبوو. پاولا خوێندکارێکی ناوازە نەبوو، ڕۆمانە ئاسانەکانی دەخوێندنەوە. ئەو خەڵکی دەوروبەری خۆی خۆشدەویست و کەسایەتییکی سادەییانەی هەبوو. ئەو هەر دەیویست بیروڕاکانی دەربڕێ بەدوای لێکدانەوەی واتا قوڵە پاشخانەییەکانی نەدەگەڕا. وەک خۆی گوتەنی

ئەو لە پاشاگەردانەکان (فەوزەویەکان) بوو. پێش ئەوەی بنگۆریۆن بناسێ زۆر بە ئێما گۆلدەمان Emma Goldeman کە جارێکیان لەسەر شەڕێک گیرابوو، کارانگاز بوو.

بە پێچەوانەی پاولا، داود بنگۆریۆن کابرایەکی لەبن بوو، حەزی لە تەنهایی بوو. شێوە ژیانی نیۆیۆرک ئەویان دردرۆنگتر کرد. وڵاتی پیرۆزر روگەی هەمو نمونە پێشەنگە ئایدیالەکانی بوو. بۆ ئەو زایۆنیزم لە خواردن، ئاسودەیی و بەختیش گرنگتر بوو. تاکە شتێک کە پارەی پێدابایە کتێب بوون. ئەو بە زۆری کتێبە قورسەرکانی دەخوێندنەوە. پێش ئەوەی بدوێ، بە قوڵی بیری لێدەکردەوە، بەلای ئەو بێدەنگی باشتر بوو لە قسەکردن. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا وەک دەگوترێ لە یەکەم نیاگاکەیاندا حەزیان لەیەککرد.

پاولا بە سەرنجراکێشییەوە گوێی لە چیرۆک و سەربردە سەرچڵییەکانی بنگۆریۆن دەگرت. ئەو گەشتی زۆری کردبوون، بەندیخانەی دیتبوون، یەک دو کتێبیشی نوسیبوون. ئەو قسەکەرێکی زمانخۆشبوو، چەند زمانێکی دەزانین کە پاولا نەیدەزانی و لەچەندان بوارەوە وەستا بوو، بە ئاستەم پاولا سەرەدەری لێدەردەکرد. ئەوەی بەلای پاولاوە سەرنجراکێشترینیان بوو، ئەوە بوو کە بنگۆریۆن پێشبینی سەرهەڵدانی دەوڵەتێکی جولەکەی دەکرد و خۆیشی دەبێتە سەرکردەیان.

جارێکیان بە کچە هاوڕێیەکی گوت: «ئەو ئەوەندە لەسەر پێشبینیەکەی مکوڕە و پێوەی پابەندە، خەریکە بڕوای پێبێنم».

«هەر دوای ئەوەی یەکدیمان ناسی، بۆم دەرکەوت کە چ مەزنە پیاوێکە. ئەو منی والێکرد بیر لە زینەر Ziener (پەیامبەرێکی بایبل) بکەمەوە».

ئەوە نیشانەی پەیوەندییەکەیان بوو، کە هەرکاتێ باسی بکردبا بە بنگۆریۆن ناوی دەبرد. ئیدی باقی ژیانی خۆی لەبن ئەوناوە بوە هاوکاری. پاشملە خەڵک زۆرجاران باسی بنگۆریۆنیان دەکرد،بەڵام وەک ناوهێنانی فەرمی بەبێ بەکارهێنانی وشە رێزدارییەکانی بەڕێز، گەورە، هەر راستەوخۆ دەیانگوت بنگۆریۆن.

بۆ ئاهەنگی گواستنەوەش هیچ قەرەباڵغیەکیان پەیدانەکرد. بن زیڤی تاکە بڕواپێکراوی جوتە هاوسەرەکە بوو. تەنانەت خوشکە تاقانەکەی پاولا کە ساڵێک پێشتر لە روسیاوە هاتبوو، هەواڵەکەی دواتر گوێ لێبوو. پەیمانی هاوسەرێیان لەلای کارمەندێکی کاروباری هاوڵاتیان لە شارەوانی مانهاتندا گرێدا. هیج باسیش لە گەشتی بوک و زاوایەتی نەکرا. دوای بەسەرچوونی بۆنەکەیان پەلەیان بوو تا بگەنە کۆبونەوەیەک و پاولاش بۆ سەر کارەکەی لە نەخۆشخانە رۆیشت.

ئاوا هاوسەرایەتیەکەیان دەستپێکرد، کە لە زۆر روەوە بێوێنە بوو. لە ماوەی ئەو چل و ئەوەندە ساڵەی بەدوایدا هاتن، ئەو کیژەی مینسک بەشێوەیەکی زۆر بایەخدارانە هەمو کارە ناگرنگەکانی لە ژیانی ئەو کوڕەی پلۆنسک ئەنجامدا، کە هەروەک لە یەکەمین چاوپێکەوتنیاندا ئەو هەستەی لا پەیدا بوو کە «پیاوێکی گەورەی» لێدەردەچێ. ئەو لەسەر ئەوە راهاتبوو کە خەڵک لەبەر خەونەکانیدا پێکەنین بیانگرێ و پێیانوابێ خەونەکانی شێتانەن. بەڵام بۆ هەر خەونێک کە بەڕاست وەردەگەڕا،

سەرکەوتوانە دەیگوت؛ «ها من وام نەگوت؟».
پینشاس روتنبێرگ Pinchas Rutenberg شۆڕگێڕی روسی کە هاوڕێی کایرنسکی Kernsky بووو، هاتە وڵاتە یەکگرتووەکان و پێشنیازێکی کرد؛ بۆ ئەوەی دەوڵەتێکی جو لە فەلەستین دابمەزرێ، دەبێ دەوڵەتەکەش لەلایەن لەشکری جوان و نوێنەرانی خەڵکی جو بپارێزرێ. ئەو بیرۆکانەی باندۆری زۆریان لەسەر داود بنگۆریۆندا دانا.
لە فێبرایردا شۆڕش لە روسیادا سەریهەڵدا. قڕاڵ لە ئازاردا لەسەر تەخت لادرا. لە نیساندا وڵاتە یەکگرتووەکانی ئامریکا جاڕی شەڕی دژی ئاڵمانیدا. ئیدی ئاماژەیەکی گۆڕانی بارودۆخ دەرکەوت، ئەمەش کاریگەریەکی زۆرباش وخێرهێنەری بۆ یەکێتی بزوتنەوەی جولەکەکان تێدابوو.
لە لەندەن  دوای ئەوەی ژابۆتنسکی سەری بە زۆر دەرکاندا کرد و زۆر جارانیش بێئومێد دەکرا، لە دواییدا رێگەی پێدرا کە بەتالیۆنێکی جوان پێکبهێنێ.
لە روسیاشدا ترومپێلدۆر هەوڵیدا لەشکرێکی جولەکان لە سەد هەزار سەرباز پێکبهێنێ و لەڕێی قاوقازەوە بەرەو فەلەستین بخشێ.
لە ئامریکاشدا بنگۆریۆن و بن زیڤی  بانگی سەربازانیان دەکرد تاکو خۆیان بخەنە ریزی بەتالیۆنەکەی جوان و شانبەشانی ئینگلیزەکان بجەنگن. ئەوان  بەشداری رزگارکردنی فەلەستین دەکەن و ئەڵقەیەکی گرێدانی  کریکارانی ئامریکا بە فەلەستینیش دەبن. بنگۆریۆن و بن زیڤی  هیوایان دەخواست کە سەربازە جوەکان لە کەنەدا و ئامریکادا بڕیار بدەن دوای ئەوەی فەلەستین رزگار دەکەن هەرلەوێ بمێننەوە. بەتالیۆنەکەی جوان دەبوایە سەر بە بەریتانیا بووایە نەوەک هێزەکانی ئامریکا، چونکە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئامریکا جاڕی شەڕی دژی تورکیا نەدابوو.
لە نۆڤێمبەردا هەواڵێک لە لەندەنەوە هات، زایۆنیستەکان لەهەموو وڵاتاندا بەشێوەیەکی سەرسوڕهێنەر پەرشوبڵاوبوونەتەوە و سەرپەرشتی ئاهەنگی خۆشی دەکەن. راگەیاندنەکەی بلفۆر لە نامەیەکی وەزیری کاروباری دەرەوەی ئینگلیز زیاتر نەبوو کە بۆ لۆرد رۆتشیلد Lord Rothschildی ناردبوو، بەڵام ناوەڕۆکەکەی لەلایەن سەرۆک ویلسن  Wilson دواتریش لەلایەن ئیتالیاو فەڕەنساوە پەسەندکرا. بلفۆر جاڕیدا کەوا حکومەتەکەی < بە خۆشحاڵیەوە ئامادەی دروستکردنی ماڵێکی نیشتمانییە بۆ گەلی جولەکە لە فەلەستیندا>.
لە دیسێمبەردا ئۆرشەلیم لە تورکان ستێندرایەوە.
ئەو پێشهاتە وەک ئەوە دەهاتە بەرچاوان کە سەردەمی خۆش لە چاوەڕوانی گەلە پەڕاگەندەکەدایە.
لە ١٩١٨دا بنگۆریۆن خۆیشی چوە ریزی بەتالیۆنەکە، دوای هەفتەیەکیش لەگەڵ کۆمەڵێ لە خۆبەخشەکان چوونە کەنەدا تاکو مەشقی سەربازی ببینن. بنگۆریۆن هەرگیز ئەو دیمەنەی گۆڕەپانی سەربازی بانگۆر Bangor لە ماینە  Maineی لەیاد ناچێتەوە کە چۆن یەکێک بە ئاڵایەکەوە رێرۆیشتنەکەی وەستاند تا دەرفەتی تۆقەکردن ولە ئامێزوەرێنانی ئەو سەربازە جوانە بدا کە بەرەو زێدی باپیرانیان بۆ

جەنگ بەڕێدەکەون.
بۆ بنگۆریۆن خواحافیزیکردن لە پاولا زەحمەت بوو. دوای چوار مانگی دیکە پاولا چاوەڕوانی زراسک (کۆرپە)ی یەکەمیان بوو. یەکێک لە دوا شتەکان کە هاوسەرە گەنجەکە پێش رۆیشتنی کردی، دانانی وەسیەتنامەیەک بوو بۆ هاوسەرەکەی، تیایدا هاتبوو گەر هاتو کۆرپەکەیان کوڕ بوو ناوی ئامۆس Amosی لێبنێ گەر هاتو کچیش بوو ناوی گەولیا Geulya (پەیڤێکی عیبرییە بۆ رزگاری)ی لیبنێت. ژنەکەی بەتەمای خوشکە گەورەکەی لە برۆکلین بەجێهێشت، وەک هەر جەنگاوەرێکیش کە بۆ شەڕ دەچێتە ولاتی باپیرانی، بەڵێنی پێدا زوزو نامەی بۆ بنوسێ.
بەتالیۆنی ژابۆتنسکی ناوی بەتالیۆنی غەددارەی ٣٨ بوو. بنگۆریۆن و سەربازەکانی باکوری ئامریکاش ٣٩مین بەتالیۆنی غەددارەیان پێکهێنا. لە ئابدا گەیشتنە میسر، هەرلەوێش سەدان خۆبەخشی فەلەستینیان رەگەڵکەوتن.
بنگۆریۆن کرایە عەریفی پلە یەک و بن زیڤیش عەریف. ئەوان نیشانەکەیان لە جلە خاکیەکەیان دروی و پێوە سەرفراز بوون هەروەک ئەوەی خودی شا نیشانەکانی پێوەکردبن.
لە مۆڵگەی بیاباندا هەرزو ورەی بەتالیۆنی ٣٩ خراپ دەبوو. چونکە ئەوێ ئەو شێوە ژیانە نەبوو کە خۆبەخشەکانی ئامریکا چاوەڕییبوون. بنگۆریۆن و بن زیڤی نەخشەی لەشکرکشانێکی دژوارانەیان بۆ رگارکردنی ولاتی پیرۆز لەدەست تورکان پیشنیازدەکرد؛ ئەمەش پێویستی بەمەشقی سەربازیانی بێژمار هەبوو، بۆیە تادەهات خۆبەخشەکان بێئومێدتر دەبوون.
کەمێک دوای گەیشتنیان بە بیابان، بنگۆریۆن توشی دیزانتری بوو بردرایە نەخۆشخانە. لەوێ پەیامێکی لە بروکلین، لە ژنەکەیەوە پێگەیشت کە کچێکی بووە و ناوی -گێولا-ی لێناوە.
ئەوانەی فەلەستینان دیتبوو و ناسیبوو، بە گەڕانەوەی دوای شەڕ بۆ ولاتی پیرۆز هێدمەگرتی بوون. ئەوسا زانیان چی قەوماوە. تەنها شەست هەزار جو لەوێ مابوون، لە بەرامبەریشدا شەشسەد هەزار عارەب و بێژماریش سەربازی بەریتانی.
شەڕ رابردو شتگەل رویدابوو. مرۆ پێویست بوو بیچمی ئەوان ببینێ تابۆی دەربکەوێ کە برسێتی چۆن زاڵ بووە. بۆ هەر دە نەخۆشێک تەنها یەک سەرینی نەخۆشخانە هەبوو.
دکتۆر حایم وایزمەن هاتە فەلەستین. ئەو ئیدی سەرکردەی ددانپێدانراوی گشتیی بزوتنەوەی زایۆنیستەکان بوو. راگەیەندراوی بلفۆر بە پلەی یەکەم لەچاوی ئەو دەخوێندرایەوە. وەک سەرۆکی کۆمیتەی زایۆنیستەکان هاتە ئۆرشەلیم، زۆر کەس کۆمیتەکەیان بە ناوکی حکومەتی نوێی جوانیان دەزانی کاتێ کە رۆنرابا.
عەریف بنگۆریۆن پێیوابوو کۆمەڵێ باسوخواس وەک سەرکردەیەکی جوە سۆشیالیستەکان هەن کە لەگەڵ د. وایزمەندا باسیانبکا. بەلام زەحمەتیەک هەبوو: بنگۆریۆن لەبن دەسەلاتی تەلئەبیبدا بوو، کەچی د. وایزمەن ٦٠ کیلۆمەتر دورتر دەژیا، ئەو لە ئۆرشەلیم بوو، سەرکردە سەربازیەکەی بنگۆریۆنێش پرسە سەربازییەکانی

بەهەند هەڵنەدەگرتن.

بۆیە رۆژێکیان بنگۆریۆن ریسای سەربازیانەی شکاند و بێپرس لە سەربازگەکە دەرچـووو. بێ هیچ زەحمەتییەک گەیشتە ئۆرشەلیم و رازیشبوو سەبارەت بەو گفتوگۆیەی لەگەڵ د. وایزمەندا کردبووی. لە کۆتایی گفتوگۆکانیدا بە وایزمەنی گوت کەوا بێپرس هاتۆتە ئۆرشەلیم.

ئەوێش دڵنیای کـردەوەو گوتـی: «ئاهـا، مـن چـارەی دەکـەم و دەسەڵاتدارە سەربازییەکانی ئۆرشەلیم تێدەگەیەنم. من مشوری ئەوەت بۆ دەخۆم کە مادۆنییەکی بیست و چوار سعاتیت بۆ وەربگرم».

دوای بەسەرچوونی بیست و چوار سعاتەکە عەریف بنگۆریۆن گەڕایەوە نێو مۆڵگە سەربازییەکەی خۆی لە تەلئەبیب. هەر گەیشتەوە جێ دوو پۆلیسی سەربازی ئینگلیزی ئەویان گرت.

بنگۆریۆن بە نارەزاییەوە؛ «ئاخر من لە ئۆرشەلیمەوە بیست و چوار سعاتم مادۆنیم وەرگرتووە».

وەڵامیان دایەوە؛ «ئـەرێ ئێمە ئـەوە دەزانـین. بـەڵام مادۆنییەکە لـەو کاتەوە دەستیپێکرد کە گەیشتبوویە ئۆرشەلیم. تۆ هیچ مۆڵەتی لێرە دەچوونت نەبوو، بۆیە دەتگرین».

لە سزای بێپرس رۆیشتنیدا پلەکەیان لێستاندەوە و ٣٠ رۆژانیش بنچاوکرا و دواتر گواسترایەوە بۆ بەشێکی دیکە.

نەخێر ئەوکاتی بنگۆریۆن لەریزەکانی بەتالیۆنی جواندا لەژێر فەرماندەیی ئینگلیزدا بوو لە سەردەمی شـەڕی جیهانیی یەکەمدا، بێگومان ئەودەمەش سەردەمانێکی بەختەوەری ژیانی ئەو نەبوو.

# بەشی
# (٤)

داود بنگۆریۆن لە هەمو ژیانیدا تەنها سێ برادەری وای هەبوون کە لە بارەی گیانیی و روناکبیرییەوە بە یەکەوە پابەندبن. رەنگبێ سیانیش نەبن هەر دوو کەس بن. بە گوێرەی قسەی هەندێک کەس تەنها برادەرێکی تاقانەی هەبووە. برادەرایەتی لەگەڵ ئەوەیان کەمێک دوای جەنگی جیهانیی یەکەم سەریهەڵدا.

لەو رۆژگارەدا فەلەستین توشی پەشۆکان هاتبوو. لەو شەست هەزار جولەکەی لە فەلسەتیندا مابوونەوە، هەندێکیان ئامادەبوون بە ئارامی لێیپاڵبدەنەوە و چاوەڕێی براوەکانی شەڕ بکەن تا بەڵێنەکانیان بگەیەننەسەر، هەستیان وابوو رۆژی بەدیهێنانی بەڵێنەکەی بلفۆر نزیکبۆتەوە. هەندێکیشیان دەیانزانی ئەوان هێشتا بۆ ئەو رۆژە تایبەتمەندە تەیاروئامادە نین کە سەربەخۆیی خۆیان جاڕ بدەن. پێویستە زۆر شت پێش ئەوەی ئیسرائیل ببوژێتەوە، روبدا.

لە کاتی لەوێنەبوونی بنگۆریۆن یەک دوو سەرکردەی نوێ سەریان هەڵدابوو. یەکێکیان ناوی بێرل کاتزێنلسۆن Berl katzenneslon و ئەویدیکەشیان ئێلاهو گۆلۆمب Eliahu Golomb بوو.

رەنگبێ هەلومەرجێکی رێکەوتانە بێ، کە هەردوکیان لە بەژن و باڵادا هەر بەقەد بنگۆریۆن بن: درێژی هەرسێکیان ئاساییانە نەبوو. بێجگە لـەوەش لە زۆر شتی دیکەشدا هاوپشک بوون.

بێرل کاتزێنلسۆن (هەموکەسێک بە گەنج و پیرەوە هەر بە بێرل ناویان دەبرد) لە روسیاوە هاتبوو. ئەو کتێبەوان (پیشەی کارمەندی کتێبخانە) و مامۆستا بوو. دواتریش کتێب لەژیانیدا پشکێکی بایەخداری هەبوو. بەخۆشی زۆر کتێبی دانان. دوای مردنی، بەرهەمەکانی لە دوانزە بەرگدا چاپکرانەوە. ئەو هەمیشە وانەی دەوتنەوە. بنگۆریۆن و زۆرانی دیکە ساڵانی دورودرێژ بە مامۆستا ناویان دەبرد، مەبەستیان ئەوە بوو بڵێن کە بۆ ئەوان تەنها یەک مامۆستا هەیە. کاتزێنلسۆن بەچەند مانگان لە بنگۆریۆن بچوکتر بوو. ئەو دوای سێ ساڵ لە هاتنی گەنجەکەی پلۆنسک خۆی گەیاندبووە فەلەستین.

ئەویش هەروەک بنگۆریۆن بە گەیشتنە فەلەستین کاری کشتیاریی کرد: ئەو یەکێک بوو لە بنیاتنەرانی کێڵگە هەرەوەزییەکانی کیناریێت Kinnaret، کە کەوتبووە سەر گۆلی(دەریاچە) گالیلیا.

لەو کاتەی بنگۆریۆن لە ئامریکا بانگەشەی بۆ بەتالیۆنی جولەکان دەکرد، کاتزێنسلۆن لە فەلەستیندا خەریکی درووستکردنی هێزی چەکداری جولەکان بوو. کاتێک بنگۆریۆن چوە ریزی سەربازییەوە ئەویش خۆی گەیاندێ.

بارێل کاتزێنسلۆن چ لەبارەی جەستەییەوە چ لەبارەی کاراکتەرەوە لەگەڵ گەنجایەتی ئالبێرت شوێتزر Albert Schweitzer یەکانگیر بوو. ئەو پۆڕ (پرچی پێشەسەر) ی هەبوو، پیاوێکی زبری برۆ قاوەیەکی تۆخ بوو. سمێڵە گەورەکەشی هەمان رەنگ بوو. چاوەکانیشی چاوی نەرمونیانی مرۆڤێک بوو کە نەیدەزانی روالەت چییە. ئەو رێزێکی قوڵی بۆ بەهای مرۆڤایەتی دادەنا. ئەو گیانێکی ماندونەناسانەی تێکەڵ بە فانتازیای هەبوو. لە مەیلدا ئاریستۆکراتێک بوو. ژیانی ئەو بۆ هەمو ئەوانەی هاموشۆیان دەکرد، کانییەکی رۆحی بوو. بە گورجوگۆڵی پەرەی بەهەستی رەوایانەی خۆی دابوو هەروەها باوەڕی بە مرۆڤایەتیش هەبوو.

برادەرەکانی دەربارەیان دەگوت؛ بێجگە لە لەشساخی خۆی نەبێ لە هیچ شتێکی دیکەدا کەمتەرخەم نیە. هەر بۆیەشە زۆر جاران نەخۆش دەکەوت.

ئەو پیاوێکی خاکییانە بوو. ئەو قەت خوازیاری پلەوپایەی بەرز لەنێو جڤاکی جودا نەبوو، هەرگیزیش پێینەگەیشت. باقی پەنجا ساڵەی ژیانی بۆ ئەو ئەوەندە بەس بوو،کە مام مۆتکێک (بناخەدانەرێکی رۆحی) بێ، ئەوانی دیکە بۆنمونە بنگۆریۆن ژیانی جەماوەریانەی خەڵکی پێ لەسەر بنیاتبنێ. ئەو بەچەشنی بنگۆریۆن نەبووە سەرکردەیەک، داواشی نەدەکرد، بەڵام رۆحیانە تێدەکۆشا.

لەو رۆژگارەدا دوای جەنگی جیهانیی یەکەم کاتزێنسلۆن لە زۆر روی کەسایەتی و روناکبیرییەوە لە بنگۆریۆن لە پێشتر بوو. ئەو بایبلی هەڵگێرو وەرگێڕ کردبوو، بەڵام حەزیشی لە وێژە بوو، بۆنمونە شیعر و ژانرەکانی وێژە کە بنگۆریۆن زۆری مەیل بۆ نەدەچوو.

گرنگترین پنتی بە یەکگەیشتنی ئەو دو پیاوە ئەوە بوو کە ئیسرائیل چەقی بانەی جیهانی بیرکردنەوەیان بوو. روداوەکان، خەڵک، شوێن و بیرۆکەکان هەر ئەوەندە بەلای ئەوان سەرنجراکێش بوون کە پەیوەستی بە کەڵکەڵەی سەریان هەبووایە. هەر دەمارێکی لەشیان، هەر بیرۆکەیەکیان کەبۆ دەهات، هەر دنەدانێکی هەڵچوونی سۆزدار کە هەستیان پێدەکرد بۆ ئیسرائیلیان بەکاردەهێنا.

هەروەک مەزنە پیاوان ئەوان دەیانزانی کە چ تاکە ئامانجێک بکەنە چەقی بازنەی تێکۆشانیان. بێ پشتگیری کاتزێنلسۆن هەرگیز بنگۆریۆن نەیدەتوانی ئەرکە مێژوییەکانی رابیبکا. لە ماوەی چارەکە سەدەیەکدا بنگۆریۆن باندۆری خێرهێنەری «مامۆستا»ی خاوەن کەسایەتیە هێمنەکەی لەسەربوو، هێزو توانای لە کانیاوی ئاوەزی ئەو هەڵدەهێنجا. کاتێ بنگۆریۆن گوێی بۆ کاتزێنسلۆن راهێشتبا، یان مامۆستا هەڵوێستەکانی شیکردبانەوە ئەوا هەمیشە بۆ بنگۆریۆن رۆشنی و بەرچاوڕونی بوو. هەمو کاتێ گەر مامۆستا بیروڕایەکی جودای هەبووایە، ئەوا بنگۆریۆن لەگەڵ ئەو هەمو برادەرایەتیەشدا قسەی لەقسە نەدەدایەوە. لەبارەی پرسە سیاسیەکاندا زۆرجاران یەکانگیر بوونە.

وەک نوسەرو ئەندامی دەستەی نوسەرانی رۆژنامە، کاتزێنسلۆن هەوڵوتەقەللای بۆ ئەوەبوو، جوەکانی فەلەستینی لەوە ئاگادار دەکردەوە ئاخۆ لە وڵاتەکانی دیکەدا چیان لەسەر دەگوترێ و باسدەکرێ. هەروەک بنگۆریۆن ئەویش باوەڕمەندێکی سۆشیالیستخوازانە بوو، بەڵام دۆگما نەبوو هەوڵی بۆ جاماوەرێکی هەرزانفرۆش نەدەدا. ئەو ئایدیالیستێکی کرداریانە بوو، هەمو کاتێک لایەنە مرۆییەکەی کێشەکانی دەدیت. هەرچەندە ناسیۆنالیستێکی بە جۆشیش بوو، بەڵام هیچ ئاشنایەتی لەگەڵ شۆڤینیزمی سنورداریشدا پەیدانەکرد.

ئەو حەزی لە کۆبوونەی پر ئاپۆرەی جەماوەریانە نەدەکرد، بەڵام لە سۆنگەی کورتە پیاسە و لەملاو ئەولا گوێگرتندا، بایی پێویست دەیزانی لەنێو جەماوەردا چ باسە.

هەردو پیاوەکان بەشێوەیەکی هۆشمەندانە یەکدیان فراژی دەکرد.

دوای مردنی کاتزێنسلۆن، زۆرجاران بنگۆریۆن دەیگوت:

«من لە خۆم دەپرسم، تۆ بڵێی کاتزێلسۆن لەسەر ئەو مژارەیە چی گوتبا».

جارێکیان ئەو سەرنجەی دا:

«من لەو باوەڕەدام لەسەر راستین، بەڵام ئاخۆ باشتر نەدەبوو گەر هاتباو لەگەڵ بێرت پرسەکەم تاوتوێ بکردبایە».

لە بەرایی ساڵە یەکەمەکەیان لە وڵات ، هەردو پیاوەکە یەکیان نەدیتبوو. ئەوان یەکدیان دوای جەنگی جیهانیی یەکەم بە باشی ناسی. دوای ئەو کاتە بەردەوام دەچوونە لای یەک.

کاتزێنسلۆن بنگۆریۆنی بە پیاوی کردار دەدی کە دەتوانێ کرداری پەرجوانە بئافرێنی، بەڵام هەستی دەکرد کە برادەرەکەی پێویستی بە کەسێکە جاروبار بیسەنگرێنیتەوە. زەحمەتیەکەش لەوەدا بوو کە بنگۆریۆن ئامادەیە تەنها گوێ لە یەک کەس بگرێ، ئەویش بێرل کاتزێنسلۆن خۆی بوو. بۆیە ئەویش بە ئەرکی خۆی دەزانی ناوبەناو هاوڕێکەی بوەستێنێ.

بێرل بە روناکبیرێتی بنگۆریۆن سەرسوڕمان بوو، لەو بارەیەوە ئاوا وێنای دەکرد:

«گیانی ئەو چرایەکی روناکەرەوەی بەدواداچوونە. ئەو دەزانی لە گرفتەکاندا کامەیان لە هەمویان گرنگترە تا لەسەری رژدبێ و روناکی بخاتەسەر».

کاتزێنسلۆن زیاتر لەڕێی نوسینەکانی نەوەک دوانەکانی بە جەماوەرەکەی خۆی دەگەیشت. ئەو شێوەیەکی لەخۆگرەوەی هەبوو کە کارانگازیەکەی بەقەد بایبل لەسەر بنگۆریۆن هەبوو. لە وتارە نوسراوەکانیدا بنگۆریۆن سی وشەی وەرگرتن کەلای ئەو پەندئامێز و زۆر خۆشەویست بوون و خستنیە سەر فەرهەنگی وشەکانی؛ ئەوانیش : هێز، بەهاداری و ئاکام بوون. جارێکیان هەرسێ پەیڤی بەوشێوە لەیەکدان و بەکاریهێنان:

«بۆئەوەی بە ئاکامەکەت بگەی، پێویستە گەل هێز و بەهادارێتی لە هەناوی خۆیەوە هەڵبهێنجێ».

هەرچەندە کاتزێنسلۆن حەزی لە کۆبوونەوەکان نەدەکرد، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا قسەکەرێکی لێزان بوو. کورتهێنی سیفەتی ئەو نەبوو، هەروەها ئەوانەی برادەرایەتیشیان دەکرد هەروایان دەگوت کە کورتهێنی و سنوورداربوون سیفەتی ئەو نەبوون. لە ١٩٣٤دا دەبوایە کاتزێنسلۆن بۆ کۆنگرەیەکی گەنجان کە سێ رۆژی خایاند، پوختەی وتوویژەکان باسبکا. ئەو بەسەریەکەوە نزیکەی شەش سعاتان تەواوی گفتوگۆ و موشتومڕەکانی کۆنگرەی پوختکردەوە. لەو ماوەیەشدا کەس هۆڵی گوێگرتنی بەجێنەهێشت. دوای مردنی ئەو، بنگۆریۆنیش زیاتر لە جارێک دوانی شەش سعاتیانەی داوە، دەشیزانی گوێگرەکانی بەقەد مامۆستاکەی پێیەوە سەرسامن.

ئێلیاهۆ گۆلۆمب وەک بنگۆریۆن و مامۆستاکەی لە فەلەستین بە کاری کشتیاری دەستیپێکردبوو. ئەو ساڵێک لەوان بچوکتربوو، ئەو لە قوتانخانەی گیمنازیومی هێرزلیا بوولە تەلئەبیب. شێرتۆک کە دەبووە زاوای، لە هەمان قوتابخانەوە دەرچوبوو.

گۆلۆمب لە رێخستنی خۆبەخشە جوەکان بۆ پاڵشتی ئینگلیزەکان بەتایبەتیش دوای پەڕینەوەی ئالێنبی Allenby بۆ سنوری فەلەستین، کۆمەکی کردبوو. ئەو بەتالیۆنی جولەکانی بە «گرنگترین کاری ئەو سەردەم» دادەنا. ئەو بە توندی لە روی وایزمەنەوە وەستایەوە، بەڵام زۆر بە ژۆبۆتنسکیەوە سەرسام بوو.

لەگەڵ ژۆبۆتنسکیدا بۆ پێکهێنانی بەتالیۆنی جولەکان تێکۆشاون. ئەو دەیدی دوای شەڕ ژمارەی بەتالیۆنەکە زۆر کەم دەبێتەوە، لە مانگە بەراییەکانی ١٩٢٠دا لە پێنج هەزار پیاوەوە ببوونە سێسەد تا پێنج سەد کەس. ئەو هەستی بەوە دەکرد کە رەفتاری دژەسامیانەی هەندێ لە ئەفسەرە بەریتانیەکان هۆیەکی لەپێشی کەمبوونەوە بوو، نەخاسمە خۆبەخشەکانی ئامریکایی و کەنەدی خواخوایان بوو دەرفەتی دەربازبوونیان بۆ هەڵبکەوێ.

بۆهەر کەسێک کە پێویست بایە گوێبگرێ گۆلۆمب قسەی ئەوەی بۆدەکردن کە پێویستیە جولەکە رێکخراوێکی چەکداریانەی نهێنییان هەبێ. بنگۆریۆن لە کەسە گوێگرەکان بوو، چونکە گەنجە جوە دلێرە ئەکسێنت روسییەکە چاو و رۆحە تیژەکەی جێسەرنجی ئەوبوون؛ ئیدی هەرزوش بوونە برادەر.

لەو کاتەی گۆلۆمب دەستی بە رێکخستنی لەشکرە ژێرزەمینیەکەی بەناوی هاگانا Hagana (بەرگریکارەکان) کرد، بنگۆریۆن، کاتزێلسۆن و بن زێڤی پشتیانگرت.

ئەو هەستەی بنگۆریۆن بەرامبەر گۆلۆمبی هەیبوو، لە روی مێژوییەوە رۆڵێکی گرنگی بۆ پیاوە پیرەکە هەبوو. لە چاوی ئەودا ئێلیاهۆ گۆلۆمب بەرجەستەکردنی کەسایەتیەک بوو لەو سەردەمە نوێیەی جیهانی کۆندا؛ گەنجێکی روناکبیری جو، سۆشیالیستخوازێک، کە هەمو شەوەکەی لەگەڵ کاتزێنسلۆن و بنگۆریۆندا دەربارەی ئاڵۆزترین پرسگەلی سیاسی وتوویژ دەکەن، لە پاش ئەوەشدا شارەزا و لێزانێکی سەربازییانە بوو، هەر لەبەر ئەوەش نا کە حەزی لە جەنگ بێ، بەڵکو بڕوامەندبوو کە جوەکان ناچاردەکرێن لەسەر وڵاتی بەڵێنپێدراوی خۆیان بجەنگن.

سی و پێنج ساڵ دوایی، چیدیکە ئەو پیاوە کەسێکی چارەنوسساز نامێنێ. نمایشی سوپای جولەکە لە ١٩٤٨دا بە تەواوی کۆتایی بەو بەندوباوە هێنا گوایە جو ترسنۆکن.

بەڵام لە ١٩٢٠دا گۆلۆمب بە هێزترین خاڵی گوشاری لەسەر بنگۆریۆندا دانا، چونکە بنگۆریۆن هیوای وابوو کەسانی وەک گۆلۆمب نمونەیەکی ئاساییانەی وڵاتی جولەکان دەبن. هەر لەبەر ئەوەش بوو هانی گەنجەکەی دەدا، متمانەی پێبەخشی، کۆمەکی کرد لە پەرەسەندنە سیاسیەکاندا ، پشتگیری نەخشە سەربازییەکانی کرد، کارێکی وایکرد ئەویش یارمەتی ئەم بدا. گۆلۆمب بۆ بنگۆریۆن نمونەی ناوبژێکار بوو. بنگۆریۆن دەیتوانی ئەو بنێرێتە لای وایزمەن، وایزمەنیش گوێی لە پەیامەکەی دەگرت. ئەوسا بە دورودرێژی گۆلۆمب راپۆرتەکەی خۆی دەدایەوە بنگۆریۆن. ئەو نایابانە دانوستانی دەکرد.

گۆلۆمب پێش ئەوەی بەری رەنجدانەکەی بخوا، کۆچی دوایی کرد؛ بەڵام ئەوەی لە ١٩٤٨دا قەوما، لە ڕاستیدا بە پلەی یەکەم هونەرەکەی بۆ ئەو دەگەڕایەوە. هونەرەکەی بۆ ئەو و بۆ بنگۆریۆن دەگەڕایەوە. بەڵام لەو بارەیەدا بنگۆریۆن بیرۆکەکانی دادەڕشت، پلانی دادەنا و گۆلۆمبیش پیاوی کردەوە بوو.

کاتێک پاولا دەرفەتی وەرگرت و لە نیویۆرکەوە گەیشتە فەلەستین، زۆر کێشەگەلی نوێتر پەیدا بوون، شتی ناگرنگ، ئاستەنگی تایبەتمەندانە، هەندێکیان وەک گرفتە سیاسییەکان چاوەڕواننەکراو و چارەسەرنەکراو بوون، کە بەهۆیەوە بنگۆریۆن ئالودە ببوو.

پاولا نەدەترسا و نە شەرمیشی دەکرد کار بکا؛ بەڵام فەلەستین وڵاتێکی زبر بوو بۆ ژنەگەنجێک کە کۆرپەیەکی ساوای هەبوو. ئەو وەک بە بیری دێ لە گەڕەکێکی ئارامی خۆشی دلڕفێنی نیویۆرکدا دەژیا. هەنوکە بە شەقامگەلێکدا دەڕوا کە تەژییە لە عەرەبە چوارشانەکان، کە بە ترسناکییەوە تەماشای دەکەن. تێکڕای مامناوەندی ژیانی رۆژهەڵاتی ناوین پیسوپۆخڵ، کورتهێنانی پاک و تەمیزی، مێشومەگەز، دەرۆزەکەر، خواردنی نائاسایی، هیچی شتێکی هاندەرانە نیە. ئەو تەنها ئەو پیچە روسیەی ساڵانی منداڵی بەبیر مابووەوە کەمێک جیدیشی دەزانی لەگەڵ ئینگلیزیدا. بەڵام زۆر لە ئاخێوەرەکان عیبری یان عەریبی زمان بوون.

پاولا لە دواییدا قسەیەکی لەو بارەیەوە کردبوو، دیار بوو کە زێدەڕۆیی نەکردبوو؛ «بەڕاستی زۆر قورس بوو لەو ژیانە رابێم».

بنگۆریۆن فلاتێکی لە تەلئەبیب بەکرێ گرت. تا لەوێ دەژیان پاولا ئەوپەڕی هەوڵی دەدا لەو ژیانە بە حسابی خۆی سەرەتاییانەی لێواری بیاباندا رابێ.

ساڵەکانی ١٩٢٠ تا ١٩٣٠ رۆژگارێک بوو بنگۆریۆن زۆری کاردەکرد، پاولاش زۆر خەمی دەخوارد و جوەکانی فەلەستینیش لە تەنگژەیەکەوە بۆ تەنگژەیەکی دیکە دەچوون. ئەو ساڵانە بۆ هەموان ساڵی نادڵنیایی، گرژی و ئاڵۆزی، سەرکەوتنە کورتخایەنەکان، ناوبەناو ماتەم و بێهێزی و بێئومێدیش بوون. لە نیسانی ١٩٢٠دا هاوپەیمانان لە سانریمۆی دلڕفێنی ئیتالیادا لەسەر دابەشکردنی دەستکەوتەکانی دوای شەڕ کۆبوونەوە. فەلەستین هێشتا نۆرەی نەهاتبوو قسەی لەبارەوە بکرێ.

پاولا لە مێردەکەی پرسی «ئەرێ چی رودەدا؟».

بنگۆریۆن شانی بۆ هەڵتەکاند، کی دەتوانێ هیچ بڵێ؟ کێ دەکارێ پێشبینی

کۆنفرانسی ئاشتی بکا؟
چاوەڕوانکرنەکە جوەکانی فەلەستینی دەمارگرژ و ئاڵۆزوبڵۆزتر کرد. ڕۆژیکیان هەواڵ هات. دیارە راگەیاندنەکەی بلفۆر هەر مەرەکەبی سەر کاغەز نەبوو. سانڕیمۆ لەپشت بەڵێنەکە بوو. بەریتانیای گەورە مانداتی پلە Aی فەلەستینی وەرگرت.
«پلە A؟ ئایا واتای چیە؟».
بنگۆریۆن بە هێواشی رونیدەکردەوە. ئەمە واتای ئەوە دەگەیەنێ ئەو پیاوانەی دەوڵەتی عوسمانیان دابەشکردووە، بۆیان سەلمێنراوە کە تەنها پرسی کاتە ئەگینا گەلەکەمان  پێگەیشتووە و دەتوانێ خۆیان بەڕێوە ببەن، ئەوەش لە ماوەیەکی کورتدا دێتەدی.
بە هەرا و گۆرانیەوە جوەکان بە شەقامەکاندا وەربوون. هەر پێکی شەڕابی سوری فەلەستینی بوو لەیەکدەدرا. شایی و سەما کرا، هەندێکیشیان فرمێسکیان لەچاوان قەتاریان بەست.
ئیسرائیل ژیایەوە!
دوای دوو هەزار ساڵ  ژیایەوە!
بەڵام بنگۆریۆن هەمان رۆژ ئاهەنگی نەگێڕا. ئەو بەبرۆ لەیەکداندا لە دەقی منداتەکەی دەکۆڵیەوە.
ماددەی چوار؛ لایەنی دەسەڵاتداری ماندات دەبێ ددان بە «ئاژانسی جولەکاندا» دابنێ، کە نوێنەرایەتی گەلی جو بۆ هەولەکانی رۆنانیماڵێکی نیشمانیی دەکا. ئایا چۆن ئەو دامەزراوەیە هەڵدەبژێردرێ؟ کێ سەرکردایەتی دەکا؟ ئایا چ دەسەڵاتێکی دەبێ؟
ماددەی شەش؛ کۆچی جوەکان ڕێپیدراوە. مرۆڤ هانی جوەکان دەدا کە بێنەوە وڵات و لێی جێنشین بن. بەڵام چۆن؟ کێ؟ کەی؟ لەکوێ؟
لەسەر شەقامەکاندا شایی دەکرا، لێ بنگۆریۆن لەو هەوایەدا نەبو ئاهەنگ بگێڕێ. بەردوام ئەو هەر ئاوا بووە. کاتێ کە خەڵک لەگەرمە هەرا و سەمادا بوون ، ئەو بە رەخنەی خۆپارێزییەوە هەولی دەدا خۆشییەکە جڵەو بکا،بەڵام کاتێک هەموان ماتەم و شینیان بوو، ئەو تاقانەیان بوو کە ئاماژەی بە کزە چرایەک دەدا.
لە تەموزدا دەسەڵاتی سەربازی بە بەڕێوبەرایەتییەکی مەدەنی گۆڕدرا کە لە لەندەنەوە رەوانەکرابوو. یەکەمین  کۆمیسیاری باڵا سێر هێربەرت سامۆئیل Sir Herbert Samuel بوو.
جارێکی دیکە خەڵک بە کەیفوسەفاوە دارژانەوە سەر شەقامەکان. «ئەرێ گوێت لێبوو؟» خەڵک لەگەڵ یەکتردا دەدوان. « جولەکەیەک! دوهەزار ساڵە چاوەرێ دەکەین، هەنوکەش جولەکەیەک دێت لە ئۆرشەلیمەوە وڵات بەڕێوەدەبا».
لەیەکەم شابات Sabbat (شەممەی) دوای گەیشتنیە فەلەستیندا، سێر هێربەرت لە سیناگۆگێیەکی کۆنەشارەکەدا لە ئۆرشەلیم نیشانیدا  هێشتا هەر لەسەر دیینی باپیرانیەتی.
بنگۆریۆن بە خۆپارێزیی مایەوە.

تۆ بڵێی ئەو چ جۆرە جویێک بێ؟ ئەو پشتگیری کامە لا دەکا؟ ئایا دەکرێ متمانەی پێبکەین؟ دەلیگەڕێ باجارێ چاوەڕێبکەین.
کاتێکیش ڕێسا سنورداریێەکەی سەر کۆچکردن کە عوسمانییەکان دایاننابوو، هەڵگیرا؛ کۆچی نوێی گەڕانەوە بەرەو نیشتمان دەستیپێکرد، هەرچەندە فەلەستینیش لەوبارەدا نەبوو ئەو ژمارە زۆرەیە لەباوەشبگرێ. بەڵام هەمویان پەرۆشی گەڕانەوە بوون.
«ئەوان یارمەتیمان دەدەن تا نەتەوەیەکی نوێ بنیاتبنێین!»
بنگۆریۆن دەیدی کە ئاکنجیانی شارۆچکە نوێیەکە زیاد دەبن و خەڵک بەرەو هەر چوارلادا پەلداوێ. کەمیان وابوو بچنە دێهات. زۆریان لەگەڵ خۆیاندا بڕە پارەیەکی کەمیان هێنابوو، دەیانەویست دوکانیک دابنێن یان لێرەولەوێ پارەکەیان بخەنەگەڕ چونکە دەستی کار هەرزان بوو.
بنگۆریۆن و کاتزیننلسۆن بەیەکدیان گوت؛ «ئـاوا ئێمە پێشبینی ئەوەمان نەکردبوو».
کاتێکیش کۆنفرانسی ئاشتی لە پاریس سازدرا، بنگۆریۆن و کاتزێنسکی سەقاڵی دامەزراندنی پارتێکی سیاسی نوێ بەناوی ئاخدوت ئاڤۆدا Achdut Avoda (پارتی یەکێتی کرێکاران) بوون. بەڵام بەداخەوە یەکێتیەکەیان جارێ هەر بەناو بوو. لە سێهەزار کرێکاری جوی ڕێکخراودا، تەنها دووهەزاریان چوونە ریزی پارتەکە.
ترومپێلدۆری نـاودار لەوسالەدا لەشەڕ گەڕایەوە. لەڕێی یاڵتا بۆ قوستەنتینە ڕۆیشتبوو لەگەڵ دەستی خۆیشی بانگەشەی بۆ دەستپێکەکان کردبوو.
پاشاگەردانی سیاسیانەی وڵات بۆ ئەو تاڵترین بێئومێدی بوو. تەماشاکا ئەو هەمو شپرزەییە! ئەو هەموو بێبەرنامەییە. جارێکی دیکە چووە سەر کاری کشتیاری، چونکە لەمێژبوو غەریبی خاکهەڵکێڵانی کردبوو. لە گەڕانەوەی بۆ گالیلیادا سەرنجیدا کە هێشتا بە هەزاران لە ڕەوەندە عارەبی تالانکەر لەسەر گردەکان و بەوناوەدا دێن و دەڕۆن. ئەو پەیوەندی بە نشینگەی تێل های Tel Haiیەوە کرد تاکو لە بەرگریکردندا یارمەتیانبدا. لەو کاتەی ئەو لەوێ بوو، عەرەبەکان بەسەریاندادان. شەڕێکی کاولکاریانە قەوما. دە کەس بەرامبەر یەک، بگرە هەزار بەرامبەر یەک کەس بوو. لەوێ کوژراو هەبوون. ترویپلدۆر گوللەیەکی بەر گەدەی کەوت. بەڕاستی بەختەکەی سەیر بوو، ئەو پیاوە خورت و بازوداره دوای پاڵەوانێتی لەدو جەنگدا، دەبێ لە شەڕێکی لابەلا لەگەڵ عەرەبان و لە بەرگری ژمارەیەکی کەمی لە پەنجەی دەست تێنەپەڕیوی چەند کۆلیتە دارێکی بیابان، ژیان لەدەستبدا.
کەمێک دوای سانڕیمۆ لە لەندەنیش کۆنفرانسێکی گرنگ بەسترا و بنگۆریۆنیش وەک نوێنەری پارتی یەکێتی کرێکاران بەشدار بـوو. ئـەوە یەکەمین جـاری بوو کە لە کۆنفرانسێکی نێودەوڵەتیی بەشداربێ. کۆبوونەوەکە لە هۆڵی ئەلبێرت کە هۆڵێکی بێڕاددە گەورە بوو، ئەوەندە گەورە بوو جێی هەمو ئەندامانی پارتی یەکێتی بەخاوخێزان بگرە بەهەندێ لەدراوسێکانیشیان دەبووەوە، بەسترا.
لەسەر سەکۆی کۆبوونەوەکەدا پیاوە دیارو ناسراوەکانی نیویۆرک، بۆستن، پاریس،

وارشۆو لە هەمو کونوقوژبنێکی دنیادا هاتبوون، قسەیانکرد. داود بنگۆریۆنی تەمەن سی وسێ ساڵە، سەرکردەی پارتێکی سیاسی دووهەزار ئەندامیش، دەبێ وتار بدا. لەو کۆنفرانسەدا بۆ یەکەمین جار بنگۆریۆن و حایم وایزمەن بەرەنگاری یەک بوونەوە. لێرە سەردەمێکی سی و دوساڵی بە دەنگ دەهات، لەو ماوەیەدا ئەو دوو پیاوانە باندۆریان خستبوووە سەر ژیانی ملیۆنان جولەکەی ناوەوە و دەرەوەی ئیسرائیل. برادەرەکانی وایزمەن ئەویان بە «نەخشەداڕێژەری دەوڵەتی جولەکان» دادەنا. گەر بێت و وایزمەن نەخشەداڕێژەر بووبێ، ئەوا بنگۆریۆنیش وەستای بنیاتنانەکە بوو. لەماوەی ئەو ساڵانەدا کاتی واهەبوو هەردووکیان هارمۆنیانە بە یەکەوە یەکێکیان وەک نەخشەداڕێژەر ئەویدیکەشیان وەک وەستای جێبەجیکار کاریان دەکرد. بەڵام رۆژگاری واش هەبوو هەردووکیان زۆر لەیەک دوربوون، ئاشتبوونەوەیان ئاستەم بوو. هەردوکیان جو بوون و لە روسیاش لە دایک ببوون، وایزمەن زۆر لە شوێنی لە دایکبوی پاولاوە دور نەبوو. هەردوکیان ژیانیان بۆ بنیاتنانی دەوڵەتی جولەکان تەرخانکردبوو. بەڵام یەکانگیربوونەکەیان هەر ئەوندە بوو بەس.

حایم وایزمەن پیاوێکی باریکەڵەی درێژی بەرچاو بوو. هەر کاتێک هاتبایە ژورێک، هەموان خۆرسکانە بێئەوەی بزانن کێیە لەبەری هەڵدەستان. لە دوا ساڵەکانی تەمەنیدا سەری تەواو رووتابوەوە تەنانەت یەک تاڵە موشی پێوە نەمابوو. سمێڵێکی کورت و تەنکە ردێنیکی رەشی هەبوو لە نیمچە شەیتان دەچوو. بنگۆریۆنیش تابلێ کورت و بچوک بوو، لە سەردەمی لاوێتیدا بە نمونەی سەرکردەی سەندیکا پیشەییەکان دەچوو.

حایم وایزمەن لە هەمو نیگایەکیدا پیاوێکی ئەریستۆکراتیانە بوو. بنگۆریۆنیش شانازی بەوە دەکرد کە پیاوی نێو خەڵکە، «کابرایەی ئاسایی» بوو.

وایزمەن هەمو هاموشۆیەکی بەخۆشی و هێوریەوە بوو. بنگۆریۆن حەزی لە ئاهەنگ نەبوو. لە ئاهەنگ و بۆنەکانیشدا لەگەڵ میوانێکدا دەچوونە گۆشەیەکی لاپەڕگەی ئاهەنگەکە، لەسەر کورسیەک دادەنیشتن باسی ئەو بابەتانەیان دەکرد کە بەسەریدا زاڵ بوون.

وایزمەن هەستیارێکی تام ناسک بوو. لە جۆری شەڕاب و مەیەکانی دەزانی و حەزی لە ژەمەخواردنی بە پێز بوو. پاولا جارێکیان گوتی: «ئێمە بە زۆری میوە و سەوزە دەخۆین. پیاوەکەم بە زۆری حەزی لە لیمۆی هیندیی و توری پۆلۆنیە».

وایزمان بە فەرەنسی، زمانی دیپلۆماتان هەروەک پاریسیەکی راستەقینە قسەی دەکرد. بنگۆریۆن کەمێک فەرەنسی، بەڵام بەرەوانی نەدەپەیڤا.

وایزمەنی کۆسمۆپۆلیت، لە مایفێردا Mayfair وەک ئینگلیزێکی ئاروستۆکرات هەستی دەکرد لە ماڵی خۆیەتی. بنگۆریۆن زۆر چووبووە لەندەن، بەڵام وێست ئێند West Endی هەر نەدیتبوو. شەقامەکەی ئەو چارینگ کرۆس رۆد Charing Cross Road بوو کە پڕی کتێبفرۆش بوون.

کاتێ وایزمەن لە دواییدا لە فەلەستین جێگیر بوو، ماڵێکی لەسەر شێوە ئاورۆپی دانا، هەریەک لە ژوری خواردن و کتێبخانەکەی پانزە مەتر درێژ دەبوون و لەنێویشیدا

مەلەوانگەی دروست کردبوو. زەوقێکی باشی هەبوو، هەمو کەلوپەلە گرانبەها هونەریە چینیەکەیی و تابلۆ فەرەنساییەکانیشی گواستنەوە ئۆرشەلیم.

بنگۆریۆنیش وەک سەرەک وەزیران، ماڵێکی سادەی لە ئۆرشەلیم هەبوو؛ دیوی دەرەوەی خانوەکەی لە تەلئەبیبدا لەگەڵ سەدان خانوی دەوروبەریدا هیچ جیاوازییەکی نەبوو.

وایزمەن لە بەرلین و سویسرای خوێندبوو؛ لە زۆر روەوە شارەزابوو، هەڵگری چەندان پلەی باڵای خوێندن بوو. بنگۆریۆنیش کەسێک بوو خۆی خۆی پێگەیاندبوو، لە زانکۆی عیبری دکتۆرای شانازیی پێبەخشرابوو، هیچ بڕوانامەیەکی خوێندنی باڵای نەبوو.

وایزمان لە مالباتێکی هەرە دەوڵەمەند بوو، وەک جێنتلمانەکانی ئینگلیز پێشوازی لە میوانەکانی دەکرد. میوانەکانی بنگۆریۆن کاتێ سەرەک وەزیرانیش بوو، بە زۆری لەسەر مێزی نانخواردنی ئاشپەزخانەدا دادەنیشتن، هەندێک جارانیش دەبوایە خۆیان قاپەکانیشیان بشۆن.

وایزمەن دەوڵەتمەدارەکانی وەک لۆرد بلفۆر Lord Balfor، ژەنەڕاڵ سموتس Smuts، لیۆن بلوم Leon Blumو لۆرد سێسیل Lord Cecil و گەورە ئەفسەرانی وەک لۆرانس T.E.Lawrenceوئۆردە وینگێیت Orde Wingateێ دەدیتن و لە ماڵی خۆی بەخێرهاتنی دەکردن. ئەو وینستۆن چەرچل Winston Churchillی لە تافی لاوەتیەوە دەناسی. قسەی لەگەڵ پاشای ئیتاڵیا، پاپا، لێیدی ئەستۆر Lady Astorو رەمزی ماکدۆنالد Ramsay MacDonald کردبوو. بنگۆریۆنیش کاتێ بووە سەرەک وەزیران حەزی بە چارەی کیبۆتنشینەکان،گەنجە دەستپێکەکان، ئەفسەرانی سوپا و پیاوانی بزوتنەوەی ژێرزەمینی دەکرد بیانبینێ.

وایزمەن لە هەمو شارە گرنگەکانی دنیادا برادەری باشی هەبوون. بنگۆریۆن تا لە ژیاندا بوو هەر یەک دوو برادەری هەبوون.

وایزمەن کەسێک بوو دەیتوانی ئاراستەی شتەکان زوزو بگۆرێ. دەیتوانی لە ساتێکدا کەیفسازبێ و لە پڕیشەوە بگۆڕێ و کابرایەکی توندوتوڕەی لێدەرچێ. بنگۆریۆن بەدەگمەن بەکەیفسازیی دەبینرا.

وایزمەن کەسێکی پڕ گومان بوو. بۆ هەمو گرفتەکان دەچوو بێئەوەی بە شێوەیەکی زانستیانە بیانگرێتەخۆ. بنگۆریۆن هەمیشە لەناخەوە بیریدەکردەوە.

وایزمەن تاکتیکوانێکی شارستانی بوو، لە هەمو نوسینگە دەوڵەتییەکانی ئاوڕوپادا داخوازینامەی خۆی پێشکەشکردوون. ئەو هەرگیز پرسی متمانە بەخۆبوونی لە دەستنەدەدا. دەیزانی کەسی دیپلۆمات دەبێ ئارامگرو بە حەوسەڵەبێ، بۆیە هەمو کات ئامادەیی چاوەڕێکردنی تێدا هەبوو. بنگۆریۆن زۆرجاران توڕە دەبوو، ئەو کەمتر هەدادانی هەبوو، هەرگیز ئامادە نەبوو زۆر چاوەڕێ بێ.

وایزمەن زۆری حەز لە کەیفوسەفا بوو، بەڵام بە دەگمەن نوکتەی دەگوتن، گەر بشی گوتبا بە زمانی جدیشی دەیگوت. بنگۆریۆن لەگەڵ کەیفسازیدا نەبوو، هەمیشە جدییانە بوو. گەر یەکێک نوکتەیەکی بۆ گوتبا تا هەڵوێستەکەی خۆی رونکردبایەوە،

خەندیەک دەیگرت، بەڵام ئەو هەرگیز نوکتەی نەگوتووە. ئەو حەزی لە کەیفوسەفای جیدیشیانە نەبوو، چونکە بە لای ئەو کەسایەتی گیتۆیی (ئۆردوگایی) پێ نمایش دەکرا.

کورتە شیعرەکانی وایزمەن بەناوبانگن. دوو گۆتەی کلاسیکیانەی ئەو هەمیشە دەگوترێنەوە، ئەو گوتویەتی کە یەکێکیان هی ئەو نیە، بەڵام هەمویان لە ڕێی ئەوەوە بڵاوبووەوونەتەوە:

«راستە پەرجو دەقەومێن، بەڵام پێویستە سەرگەرمانە بۆیان لە خەباتدا بی».

یان:

«پێویست نیە دێوانە بی تاببیتە زایۆنیست، بەڵام پشتگیری زۆریان بکە».

بنگۆریۆن تا زیاتر تەمەنی هەڵدەکشا باشتری دەنوسی؛ وتارەکانی، نوسینە وەستایانەکەی، شێوازە چڕوپڕو زمانڕەوانییەکەی ناسراو بوو، بەڵام تێبینیە رۆحیانەکەی بێهودە مرۆڤی بۆخۆی کێشدەکرد.

جارێکیان لە وایزمەنیان پرسی، بۆچی سوپای میسر بەو شێوە شپرزەییە خرایە نێو شەڕەوە، تەڕدەستانە وەڵامی دایەوە:

«کەمینەکان لاوازتر و زۆرینەکانیش قەڵەوتر بوون».

لە کاتی کڵپەی ناکۆکبوون لەسەر پێشنیازی بەریتانییەکان سەبارەت بە ئۆگەندا، وایزمەن هەوڵیدا هەستی خۆی لەو روەوە بۆ بلفۆری وەزیری بەریتانی رونبکاتەوە:

«جەنابی بلفۆر، گەر من پاریست لە بری لەندەن بدەمێ، پێی ڕازی دەبی؟»

بلفۆریش تەڕدەستانە لێی هاتە وەڵام:

«ئاخر، دکتۆر وایزمەن، خۆ لەندەن هی خۆمانە».

زایۆنیستە درێژەکە بزەیەکی دلۆڤانیانەی هاتێ و لەسەرەخۆ بەرسڤی دایەوە:

«بە مسۆگەرییەوە، بەڵام ئێمە ئۆرشەلیمان لە رۆژگارێکدا لەبەردەستدا بوو کە لەندەن هێشتا هەر زۆنگاو بوو».

زۆرجاران پێویستی هەبوونیماڵێکی نیشتمانیی بۆ جولەکەکان بەو شێوەیە شیتەڵ دەکرد:

«هەر کاتێ مرۆ خانەخوێ بوو، هەمیشە دەتوانێ میوان باش بەخێر بهێنێ. ئەو کەسانەی بانگهێشتی فراوین دەکرێن، دەزانن کە دەتوانن لە ماڵەوەش فراوینیان بخۆن. سویسڕا وڵاتێکی بچکۆلەیە. ژمارەی ئەو سویسڕاییانەی لە دەرەوەی وڵات دەژین، لەچاو هی ناوەوە زیاترە. لەگەڵ ئەوەشدا تەوژمی دژە سویسڕیی لەئارادا نیە، چونکە سویسڕایی هەردەم دەتوانێ بگەڕێتەوە ماڵەکەی، گەر ویستی دەتوانێ خەڵکیش بانگهێشت بکا.»

بنگۆریۆن هەرگیز نایەتە سەر ئەو بیرۆکەیەی کە نمونەی سەرەوە بهێنێتەوە. فراوین و میوان بانگهێشتکردن لەو شتانە نەبوون کە سەری خۆی پێبێشێنێ. ماڵ بە گوێرەی تێڕوانینەکەی ئەو شوێنەیە کە پێش هەمو شتێک کتێبەکانی خۆتی لێدابنێی.

جارێکیان وایزمەن دەنوسێ: «من گەر لە برۆکسل یان پاریس بم هەوەک ئەوە وایە لە ماڵی خۆم لە سانفرانسیسکۆ بم». بنگۆریۆنیش بەردەوام دەنوسێ؛ «زێدی

باوک و باپیرانم وڵاتی تایبەمەندی خۆمە». مەبەستیشی ئیسرائیل بوو.
کاتێک وایزمەن یەکەمین جاری بوو سەردانی ئیسرائیل بکا لە بیبلیۆگرافیای ژیاننامەی خۆیدا گرنگیەکی زۆری بە شتە سەرنجراکێشەکانی وڵاتی بەڵێنپێدراودا نەدا، کەچی بنگۆریۆن سەدان لاپەڕەی لە باسوخواسی وڵات و وەسفی دەقاودەقی نوسیوە. کاتێک تەمەنی وایزمەن گەیشتە چل و پێنج ساڵان ئەوسا نوسی: «پێویستە مرۆڤ شتەکان لە نزیکەوە ببینێ تا هەست بە داب و شۆپی وڵات بکا». ئەوکات هاتە فەلەستین، کەچی زۆری لێنەمایەوە، دیسان رۆیشتەوە، ئەو جارەیان زۆری پێچوو تا دواتر گەڕایەوە. کاتێکیش دەوڵەت دامەزراو ئەویش بە سەرۆک هەڵبژێردرا، ئەوسا بە یەکجاری لە ئیسرائیل نیشتەجێ بوو. ئەوەش دوا ساڵەکانی تەمەنی بوو. پێشتر سەردانی کورتخایەنی بۆدەکرد. بنگۆریۆن دەستبەجێ رەگوڕیشەی بەناخی خاکێکدا راهێشت کە خۆی لەخۆشەویستی زێدی باپیرانی هەڵبژاردبوو. هەرچەندە زۆرجاران بە ئەرکی سیاسییانە هاتوچۆی دەرەوەی وڵاتی دەکرد، بە زۆری هەستی لە ماڵبوونی بەس لە ئیسرائیلدا هەبوو.
لە ماوەی شەڕی یەکەمی جیهانییدا وایزمەن پشکێکی بایەخداری لە سەرکەوتنی هاوپەیماندا هەبوو، بەوەی لە تاقیگەی کۆلیژی سەربازی بەریتانی شێوەیە مادەییەکی تەقەمەنی نوێی پەرەپێدا. لە هەمان ماوەی شەڕدا بنگۆریۆنیش لەگەڵ بەتالیۆنەکەی کارێکی وا قورسیان کرد کە هاوپەیمانەکان سەربکەون.
وایزمەن بەرامبەر بزوتنەوەی کرێکارانی فەلەستینی خۆشحاڵ بوو، بەڵام هەرگیز نەچووە ریزی پارتێکی سیاسی. بنگۆریۆن ژیانی خۆی بۆ کردەی سیاسیانە تەرخان کردبوو.
وایزمەن لیبرال و بنگۆریۆنیش سۆشیالیست بوو.
وایزمەن پیاوێکی تیۆریی و بنگۆریۆنیش ئاساییانە و بە ئەزمون کردەیی بوو. وایزمەن بڕوای وابوو کە بنگۆریۆن کەمتر بایەخ بە رای گشتی جیهانیی دەدا. بنگۆریۆنیش پێیوابوو کە وایزمەن زۆر خۆی بە کەسانێک سەرقاڵ دەکا کە لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاست ناژین رەنگبێ بیریشی لێبکەنەوە.
وایزمەن زۆر لە بارەی «خاڵە هێزدارە دیماگۆکیەکانی سیاسەتوانان»ی قسە دەکرد کە بە پێچەوانەی «شێوازی راستی روناکبیرییانە»ی دادەنا کە دەرهاوێشتەی زانستی تاقیگەیە. بنگۆریۆن بێجگە لە سیاسەت و کاری بانگەشە کردن کەمتر کاری دیکەی کردوون.
وایزمەن بڕوای بە رێسای پلەداریی بەرەبەرە هەبوو. ئەو خۆی بە کەسێکی «نەرمڕۆ» دادەنا. بنگۆریۆن گیانێکی بزوێنەرانەی هەبوو، پیاوێکی بەجۆش بوو دەیەویست ئاکامەکەی دەستبەجێ ببینێ.
وایزمەن بەبڕوایەکی تەواوە هەواداری هاڤلاگ Havlagah واتە هونەری بەسەرخۆدازاڵ بوون بوو. بنگۆریۆن وایدەبینی لە هەندێ هەلومەرجی دیاریکراودا مرۆڤ زیاتر بە کردەوە نەوەک بە ئۆقرەیی و ددانبەخۆداگرتن دەگاتە مەبەستی خۆی.

له ٤٨٢ لاپەڕەکانی ژیاننامەی خۆیدا وایزمەن بەئاستەم ناوی بنگۆریۆن دەهێنی. تاکە ئاماژە بۆناوی ئەو لە لاپەڕە ٤٤٢ی پاشکۆکەیدایە کە بەم شێوەیەی خوارەوەیە: بنگۆریۆن بەرهەڵستی وایزمەن دەکا.

بنگۆریۆن جوامێرانەتر بوو. کە کاتی خۆی هات بنگۆریۆن دوودڵ نەبوو لە شاردنەوەی نەیاریێتی خۆی دژی وایزمەن.

وایزمەن بەشێکی زۆری ژیانی خۆی داکۆکی لە گریمانەیەک دەکرد؛ دەوڵەتی جولەکە ئەوکاتە دروست دەبێ کە ئینگلیزەکان هاوکاری بکەن. بنگۆریۆن لەبەر ئینگلیزەکان ئۆقرەی لەبەر هەڵگیرابوو، لە دواییدا بە توندی دژیان وەستایەوە، بەتایبەتیش دوای پەیمانشکێنی پارتی کرێکاران و هاتنەسەرکاری ئێرنست بێڤین Erest Bevin وەک وەزیری کاروباری دەرەوە.

زۆر لەو خاڵە ناکۆکییانەی نێوانیان، لەلایەن خودی خۆیان و هەمولایەک رون و ئاشکرا بوون. رەنگبێ بە نائاگایی هەستی گەورەیی لای وایزمەن بەسەر پیاوە کورتەباڵاکەی سەرکردەی سەندیکای پیشەییدا دروستبووبێ. لەبەر ئەوە جیاوازیەکانی نێوانیان زیاتر بەدیاردەکەوت. رەفتاری بنگۆریۆن زۆرجاران گەواهی تۆڵەیەکی خۆڕسکانەی لەهەمبەر وایزمەندا دەدا. ئەو نەیدەتوانی بەو کورتەباڵاییەی خۆیەوە لەگەڵ شەقڵی ژیان، فەلسەفەو سیاسەتەکەیدا یەکانگیر بێ، هەرچەندە بە تەواوی دەشیزانی کە وایزمەن بۆ زایۆنیزم بیچمێکی بایەخدار بوو.

لە دوای کۆبوونەوەی ١٩٢٠دا لە هۆڵی ئالبێرتدا بنگۆریۆن گوێی لە وتاردەر لەدوای وتاردەر دەبوو کە داوای خۆپاریزی، بە ئۆقرەیی ئارامگرتن و سنورداركردنی کۆچکردنیان بە پاساوی پارەنەبوون دەکرد. تادەهات هەدادانی نەدەما. دکتۆر وایزمەنی وەک ئەپۆستێل (شاگردێک لە دوانزە شاگردەکانی عیسا)ی سیاسەتێکی ئازاد دەهاتە پێشچاوان.

یەکەمین دوانی بنگۆریۆن لە کۆبوونەوەیەکی نێودەوڵەتییانەدا لەوانە نەبوو وەستایەتی دیپلۆماتیانە بێ هەروەها لە کێماسی رەوانبێژیش بە شێوەیەک لە شێوەکان بەدەرنەبوو، وەلێ کەس گومانی لەوەدا نەبو کە لەوێ گوێیان لە دەنگی راستەقینەی جولەکەکانی فەلەستین بوو.

ئەو دەربارەی پەرۆشی گەڕانەوە قسەی دەکرد، کە خەریکە بەهۆی سیاسەتی بەردەوامی وەخراندن، کەم ببێتەوە. ئەو داوای نەخشەی بوێرانە و تاکتیکی پێشوەڕۆیانەی دەکرد. بە زەقی دژی ئەو کەسانەی بە دوژمنی کرێکارانی جولەکەی دادەنان، قسەیکردن. لۆمەی کۆمیتەی زایۆنیزمی دکتۆر وایزمەنی کرد، بەوەی کۆمیتەکە بۆتە ناوبڕێکی نێوان گەلی فەلەستین و دەسەلاتدارە نوێکانی وڵات.

«پێشان راستەوخۆ رومان لە جەمال پاشا دەکرد» بەدەنگی دلێرانەتر لەسەری رۆیشت و گوتی: «بەڵام هەنوکە هەمو شتێک بەرێی نێوبەردا دەڕوا».

کاتێکیش پاولا لەگەڵ گیولای کچی گەیشە لەندەن، بنگۆریۆن فلاتێکی لە مێدیا ڤالا Media Vale کە بە ترامی ژێر زەوی بەیەک دوو خولەک دەگەیشتنە نێوجەرگەی لەندەن، بەکرێگرت. لەو فلاتەدا ئامۆس لە دایک بوو.

کاتێ بنگۆریۆن ناوی ئامۆسی بۆ کوڕەکەی هەڵبژارد، پاولا لێیپرسی:
«بۆچی ئامۆس؟»
بنگۆریۆن بە دەنگێک کە وای لە پاولا کرد بیر لە پێغەمبەرەکانی بایبل بکاتەوە، رونیکردەوە کە ئامۆس لە تێستامێنتدا بە شوان هاتووە، ئەو شوانەی بیری کردەوە کەخوا بە تەنها هی جولەکان نییە بەڵکو هی هەمو مرۆڤایەتییە. ئامۆس ئەو کەسە بوو هەڕەشەی لە چەوسێنەران کرد.
پاولا گوتی: «ئەو سەرنجەم لا پەیدا بووە کە ئاموس سۆشیالیستخوازێکی لێدەردەچێ».
بنگۆریۆن پێکەنی.
ئامۆس نەوەک هەر داکۆکی لە چەوساوەکان کرد، بەڵکو بەرچاوی گەلی جولەکەشی وا رۆشنکردەوە کە رۆژێک دادی بەرەو وڵاتی خۆیان بگەڕێنەوە. ئەو پێشبینی سەردەمێکی خۆشگوزەرانی بەختەوەری بۆ جوە دورخراوەکان کرد کە کۆتایی بە ئاوارەبوونیان دێ. بنگۆریۆن بەوە نیگەران بوو کە ئامۆس لە فەلەستین نەهاتبووە سەر دونیا. گێولا لە نیویۆرک و هەنوکەش ئامۆس لە لەندەن لەدایک ببوو. بەڵام رەنگبێ رۆڵەی سێهەم بەراستی سابرا Sabra (ئەو منداڵە جوەی لە فەلەستین لەدایک دەبێ) یی بێ.
موشێ شێرتۆک کە لە قوتابخانەی باڵای لەندەن ئابوریناسی دەخوێند، زۆرجاران سەردانی دەکردن. هەندێ جاریش داود هاکۆهن David Hakohenی لەگەڵ خۆیدا دەهێنا. هاکۆهن کوڕی نوسەرێکی بەناودەنگی عیبری بوو. بنگۆریۆن لەگەڵیاندا باسوخواسی پرسگەلی سیاسەتی تاوتوێ دەکردن، لە هەمان کاتدا ئاگای لە گێولا و ئامۆس دەبوو چونکە پاولا بۆ شتکڕین چووبووە بازاڕی ئێجوەرد رۆد Edgware Road.
رۆژێکیان هاکۆهن پێی ڕاگەیاند کەوا «گۆلۆمب لە ڤیەننایە، بە تەمایە چەک بۆ هێزە ژێرزەمینییەکەی بکڕێ».
کەمێک دواتر هاکۆهن تەلگرافێکی لە گۆلۆمب پێگەیشت، تێیدا هاتبوو بە زوترین کات خۆی بگەیێنێتە لای لە ڤیەننا. ئەو ساتەکەی کردە ساتێکی مێژویی : «ئەوە یەکەمین جارە کە جبەخانەیەک بۆ یەکەمین لەشکری جولەکان دابنرێ. گۆلۆمب ناونیشانی ئەو شوێنەی بۆ ئاشکرا بوو کە چەکی تیادا دەفرۆشرێ. لەگەڵ لیڤی شکۆلنیک Levi Shkolnick کە ئەندامێکی پارتی کرێکاران بوو لە گەڕەکێکی پێشەوەی ڤیەننا خەریکی پێچانەوەی چەکەکان بوون، کە هاکۆهنیان گەیشتێ.
گوێی لێبوو پێیگوترا» بیچێچەوە، یارمەتی تۆمان دەوێ».
هاکۆهنیش وای کرد، ئیدی بەم شێوەیە بەنوێژی نیوەڕۆ بەکەتنەوە لەلایەن پۆلیسەوە بەسەریاندادرا و گیران. گۆلۆمب و شکۆلنیک کەمێک دوای روداوەکە بەردران. بەڵام هاکۆهن وەک سەرکردەیان تەماشاکرا و بۆیە دەبووایە مانگێک بچێتە بەندیخانە، ئەوەش مەشقێکی باش بوو بۆی چونکە زۆر جاری دیکەش بەهۆی سیاسیانەوە خراوەتە زیندان.

تەمەنی ئامۆس هەر مانگێک دەبوو کە بنگۆریۆن بڕیاریدا خۆی و خێزانەکەی گەشتێکی گەڕان بە شارەکانی ئاوڕوپادا بکەن. ئەوان بە کەشتی لە نۆکەندەکە پەڕینەوە، ئەو گەشتەی کە هەرگیز لە بیر پاولا ناچێتەوە. زۆربەی گەشتیارەکان نەخۆشی دەریایان گرت. پاولا بیری لە برۆکلین و شێوە خۆشگوزەرانیەکەی ئەوێ دەکردەوە، پێش ئەوەی حەز لە سیاسەتوانە فەلەستینییەکە بکا.

بەڵام پاریس شارێکی خۆشی سەرنجڕاکێشبوو. هەورها ڤیەنناش، ئەوشارەی دایک و باوکی کاتی خۆی بۆیان باسکردبوو.

بە هەفتان لەم شار بۆ ئەو شار دەچوون. بۆ هەر ژنێک ئەو جۆرە گەڕانانە مایەی خۆسەلماندنن. شەمەندەفەڕەکان پیسوپۆخل بوون. میوانخانەکانی لێیدادەبەزین پلە سێ بوون. بە رۆژان لەسەریەک خۆی و منداڵەکانی لە ژوری میوانخانەدا دەمانەوە، چونکە بنگۆریۆن کۆبوونەوەی سازدەدان. تەنها شەوان، باقی کاتی دیکە بنگۆریۆن سەرقاڵی دواندانەکانی بوو.

هەندێ جاران کەسێکی پەیدا دەکرد تا چاوی لە منداڵەکان بێ، چونکە خۆیشی دەچوو گوێی لە مێردەکەی بگرێ. ئەو تێبینیەی لا پەیدا بوو کە رەوایەتی و ئایدیالیزم زیاتر بەرەو کۆبوونەوەکانی کێشدەکا.

دوا شوێنی گەشتە ئاوڕوپاییەکەیان پلۆنسک بوو. باوکی بنگۆریۆن ژنی هێنابووەوە. هێشتا یەک دوومنداڵی هەر لە ماڵدا مابوونەوە.

دواتر پاولا لەسەر شوێنی لە دایکبوونی هاوسەرەکەی بەڕێزەوە گوتی: «ماڵەکەی پلۆنسک خۆشترین ماڵ بوو».

# بەشی
# (٥)

هیستادروت Histadruth ئەو ناوە بوو کە فیدراسیۆنی گشتیی جولەکەکانی یەکێتی سەندیکا پیشەییەکانی پێدەناسرا. بنگۆریۆن پێش سی و هەشت ساڵ دامەزرێنەری بوو هەروەها سیاسەتەکەشی بۆ دەستنیشان دەکرد.

هیستادروت رەنگبێ یەکێک بێ لە لەخۆگرترین فیدراسیۆنی کرێکاران لە جیهاندا. پزیشکەکان، وەستاکارانی دیوار، نوسەران، کرێکارانی کانەکان، مامۆستایان، شوفێران، لێکۆڵەرەوە زانستیەکان، تەنانەت منداڵانیشی دەگرتەوە، واتە نیوەی دانیشتوانی وڵاتی ئیسرائیل تیایدا ئەندام بوون.

فیدراسیۆنەکە هەر پارێزەری کرێکاران نەبوو، بەڵکو پاڵپشتی خاوەنکارەکانیش بوو. خاوەنداریێتی بەرچاوترین بانکی بیمەی وڵات بۆ هیستادروت دەگەڕایەوە، سەرباری ئەوەش خاوەنی هەندێ بانکی دیکەش بوو، ٩٦٪ ئامرازەکانی گوازتنەوە، پشکە هەرە زۆرەکانی چاڵە کەمە نەوتیەکانی وڵات و نزیکەی نیوەی هەمو بەڵێندەرایەتییە پیشەسازییەکان لەنێویشیاندا دامەزراوی خانودروستکردن کە ئەو بوارەی پاوانکردبوو بۆ هیستاردوت دەگەڕایەوە. بێجگە لەمەش هیستادروت خاوەنی تیاتری خۆی بوو.

لە ئیسرائیلی تازەدا نە خواردن، نە ڕازان، نە گەشت نە مردن بەبێ پەیوەستبوون بە هیستادروتەوە نەدەکرا. بنگۆریۆن لەسەر بنەمای تیۆری پێی وابوو رێکخراوێکی وەک هیستادروت ناوێری سەرچڵی بەو هەمو سەرمایەوە بەتایبەتیش لە قۆناخی بەرایی خۆیەوە بکا.

بارەگا سەرەکیەکەی هیستادروت لە تەلئەبیب باڵاخانەیەکی قەبەی حەوت نهۆمییە، کە لە لای گەشتیارەکاندا زۆر جاران بە تەلاری پەڕلەمانی وڵاتاکەی تێدەگەن. هەر لەبەر ئەوەی هیستادروت باندۆرێکی زۆری بەسەر سیاسەتەوە هەبوو، بۆیە بە تەوسەوە بە کرێملن Kremlinی وڵاتەکە ناودەبردرا.

هەر زوو بنگۆریۆن کرایە سکرتێری گشتیی هیستادروت، ئەوسا لە ژێر سەرپەرشتی ئەودا هەڵمەتی هێنانە ریزی کرێکارە عەرەبەکان بۆ ناو فیدراسیۆنەکە برەوی پەیداکرد. ئەمەش بووە مایەی پەیابوونی نەیار بۆی.

ئەوانەی ئەوجۆرە سیاسەتەیان بە دڵ نەبوو دەیانگوت: «ئاخر بیرۆکەی ئەوەی جولەکە کرێکارە عەرەبەکان رێکبخا تاکو داوای کرێ و مزی زیاتر لە خاوەنکارە

جوەکان بکەن  دروست نیە».
لە ماوەی نێوان ١٩٢٠ تا ١٩٣٠دا بنگۆریۆن وەک نوێنەری هیستادروت سەردانی پیشانگای کشتوکاڵی لە مۆسکۆدا کرد. ئەوەی لەوێی چاوپێکەوت نەبووە مایەی سەرنجدانی، لە بەرامبەریشدا شۆڕەوییەکان بایەخیان بە پیاویلکەی  بی بۆینباخ و شەپقەی پەرۆشی هیستادروت و کرێکارانی زایۆنیزم نەدا. لەو سەردەمەدا زۆر جویان بە تۆمەتی  هەواداریتی زایۆنیزم رەوانەی سیبێریا Siberie کردبوون.
دوای ساڵێک لە جێگیربوونی مانداتەکەی بەریتانیا  ئاژانسی جولەکان دامەزرا. بە گوێرەی وێناکردنی مانداتەکە دەبوایە ئاژانس نوێنەرایەتی جولەکان بۆ خەباتی سەربەخۆبوون بکا. ئاژانسی جولەکان بە بودجەی تایبەتمەندی خۆی، بە کابینەی خۆی، بە لەشکرو هەواڵگریی خۆی ببووە دەوڵـەت لەنێو دەوڵـەتدا. بنگۆریۆن لەنێو کابینەکەدا (دەستەی کارگێڕی ئاژانسی جولەکان) جێیگرت، بەڵام موچەی لە هیستادروت وەردەگرت، بۆیە بەبێ بەرامبەر لە ئاژانسەکەدا کەوتەکار.
ئەو بە هێوری گوتی «پێموایە مرۆ دەبێ بنەماکانی بە کردار بەرجەستە بکا».
لە مانداتەکەدا هیچ دەربارەی لەشکری ئاژانسی جولەکان نەگوترابوو، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەر سەریهەڵدا: هاگانا Hagana  خەباتگێرە ژێرزەمینییەکان، کە گۆلۆمب دایمەزراندبوو، هاتەکایە. بنگۆریۆن هەر لە بەراییەوە پشتگیری رێکخراوەکەی کردبوو.
«پێویستە ئێمە مشوری ئەوە بخۆین، ئەو جوانەی  دەگەڕێنەوە، شانازی بە جوایەتی خۆیانەوە بکەن».
لەسەریان پێویستە باری مسکێنیانە (رەعیەتانە)ی خۆیان فڕێبدەن. هەروەها پێویستە ترسەکەشیان بە لاوەبنێن. بۆئەوەی خۆیان لە ترسی سەرشانیان دەربازبکەن، پێویستە هەستی ئەوەیان لا پەیدا بێ کە ئەوان بێ دەستوەکەر نین. پێش سەردەمی بنگۆریۆن کەم وابوو جولەکە لەسەر ئەو بڕوایە بن  رەفتاری پەلاماردەرانە بنوێنن.
دوای سەردانێکی ئینگلستان بنگۆریۆن گوتی:
«مرۆ ئینگلیزەکان بەوە هەڵدەسەنگێنێ کە هەن، بەڵام مرۆ دەبێ ئێمە هەمیشە بەوە هەڵبسەنگێنێ کە چی دەکەین».
ئەو دەیویست لە ئافراندنی وڵاتەکەیدا هاوکاربێ، وڵاتێک کە جوەکان هەست بە ئاسودەیی بکەن، وڵاتێک جوەکان گرژی وئاڵۆزی ئەو بیست سەدانەیان بە لاوە بنێن، شوێنێک کە چیدی خەمی کوڕەویان لەبەر نەبێ هەروەها خەمی وەڵامی ئەو پرسەشیان نەبێ ئاخۆ لە یانەیەکی گۆلفدا وەردەگیرێن یان نا.
کاتێ کە برادەرەکەی بنگۆریۆن کاتزێنسلۆن بووە سەرنوسەری رۆژنامەی نوێی داڤار Davar (پەیڤ)، بارودۆخی کرێکارانی فەلەستین باشتر ببوو. ئیدی لە ئێستاوە کاتزێنسلۆن لە وتارەکانیدا ئاراستەی بنگۆریۆن و بزوتنەوەی کرێکاران دیاردەکرد. ئەو بیردۆزی پەرەپێدەدا و بنگۆریۆنیش بە کردار بەرجەستەی دەکردن. ئەوەش هاوکێشەیەکی نمونەیی بوو.
رۆژێکیان لە ١٩٢٨دا بنگۆریۆن، خانمەکەی و هەردو منداڵەکانی، لەگەڵ کاتزێلسۆن

و هاوسەکەی و شوفێرەکە و خێزانەکەی هەموویان بە ئۆتۆمۆبیلێک بەرە و ئاهەنگێکی بزوتنەوەی لاوان دەچوون. لە ڕێگادا لەنێوان لیدا Lydda و رامله Ramleدا شوفێرەکە هەر بۆخۆشی ویستی بە پێش ئۆتۆمبیلێکی دیکە بکەوێتەوە؛ کە پێشیشی کەوتەوە، بە لە خۆڕازیبوونەوە بایدایەوە. بەڵام ئۆتۆمبێلەکە لە جادەکەدا دەرچوو، خۆی بە درەختە زەیتونێک دادا. زۆر نەمابوو بزوتنەوەی کرێکاران دوو سەرکردەی بایەخدار لە دەستبدا.

زێیف شارێف Zeef Sharef (دوای سەرهەڵدانی ئیسرائیل کرایە سکرتێری کابینەی حکومەت) یشیان بە ئۆتۆمۆبێلی تایبەتی خۆی بە دوایانەوە بوو. ئەو سەرنشینەکانی ئۆتۆمۆبێلە بەسەریەکدا قوپاوەکەی دەربازکردن. کاتزێنسلۆن قاچێکی شکابوو، دەموچاویشی بریندار ببوون. هەمو ئەوانی دیکەش کەم تازۆر بریندار ببوون.

بنگۆریۆن پێش هەمو شتێک خەمی لە پاولا و منداڵەکان خوارد.

کاتزێنسلۆن کە ئازارێکی زۆری هەبوو، بانگی شارێفی کرد. لای ئەو تەنها شتێک دڵتەنگی کرد.

«مشوری ئەوە بخۆ کە شوفێرەکە تەنگەتاو نەکەن. نابێ ئەو سزا بدرێ».

دوای ئەوەی هەر هەشت لێقەماوەکەی گەیاندنە نەخۆشخانە، شاریف خۆی گەیاندە ئاهەنگەکەی لاوان و شێرتۆکی سەرۆکەیانی ئاگادار کردەوە کە دەبێ هەر خۆی هەمو دوانەکان جێبەجێ بکا.

هەمان ساڵ کاتێک بنگۆریۆن لە وارشـۆدا بوو، تەلگرافێکی بۆهات، زۆر پێی کەیفخۆش بوو. هەمو هاوڕێکانی هەوڵیاندەدا مەتەڵی ناواخنی تەلگرافەکەدا هەڵبێنن.

«تۆ بڵێی ئینگلستان کتێبێکی سپی دیکەی دەرکردبێ و مافەکانی ئێمەی زامن کردبێ؟ ڕەنگبێ لە ئامریکادا...».

لە شەودا تێلگرافەکەی نیشاندان. تێلگرافەکە لە پاولاوە هاتبوو. تیایدا نوسرابوو کە ئامۆس لە تاقیکردنەوەکانی سەرکەوتووە.

هێشتا بنگۆریۆن پێی نەنابووە ساڵی ١٩٣٠ کە ئەسمەرتر لێهات و پرچیشی هەڵدەوەری. هەرچەندە هێشتا هەر گەنج بوو بەڵام داوی زیونی لەسەردا لێپەیدابوون. ڕەنگبێ ئەوەش دەرهاوێشتەی بارودۆخە نائارامەکە بووبێ. ئەو پەرۆشیەی کە جەنگی جیهانیی دوهەمی پێ کۆتاهات خەریک بوو سارد دەبووەوە. چاوەڕوانییە گەورەکان بەرێرەوی خۆیاندا نەڕۆیشتن.

سێر هێربیرت سامۆئیل کە زۆر هیوای لەسەر بنیاتنرابوو، دەستەیەکی ڕاوێژکاری بۆ یارمەتیدانی لە بەڕێوەبردنی وڵات پێکهێنا. لەنێو ئەو حەڤدە ئەندامەی دەستەکەیدا تەنها سێیانیان جولەکە بوون. هەمو ئەوانی دیکە عەرەب بوون.

ئیدی خەڵک لەو باوەڕەیەوە لە تەلئەبیب لە خۆیان دەپرسی؛ «ئاخر کەی ئەوە شێوازی ئامادەکردمانە بۆ بەدەستهێنانی سەربەخۆیی».

«تۆبڵێیی بەڕاست ئەوە جولەکە بێ؟»

«ئا بۆچی ئەو نەیاریمان لەگەڵدا دەکا؟»

«ئایا بۆچی هیچ مشوری ماددەی شەشەم ناخوا؟»
ماددەی شەشەم نەخشەڕێگای بەریتانیا بۆ پەرەپێدانی تەوژمی کۆچکرنی جوەکان و گەڕانەوەیان بۆ فەلەستین دیاردەکا، کەچی هەر جولەکەیەک بیەوێ لە خاکی وڵاتی بەڵێنپێدراو نیشتەجێ ببێ، پێویستە بڕوانامەیەکی پێبدرێ، لەندەنیش ئامادە نیە هیچ بڕوانامەی دیکە بداتە جولەکان.
زۆریان سێر هێربێرتیان بە بەرپرسی دۆزەکە دەزانی.
«ئەو بیرۆکەیەی کە جوێک لە خۆمان بێ و ئاواشمان بەسەربێنێ!» تاڵ بوو.
وایزمەن کە تەشریفاتیانە چووە لای وەزیری کاروباری کۆلۆنەکانی بەریتانیا، وەڵامێکی رەقی وەرگرتەوە:
«تۆ ناتوانی لە فەلەستیندا بجوڵێیتەوە. وڵاتەکە لێواولێو پڕبووە. جێی کەسی دیکە نابێتەوە. ئایا کەڵکی هیچی پێوەماوە داوای مۆڵەتنامەی زیاترم بۆ کۆچبەران لێبکەی؟»
دەبووایە وایزمەن حەڤدە ساڵی رەبەقی دیکە بوەستایە تا بەرسڤی وەزیری کاروباری کۆلۆنەکان بداتەوە، کاتێ گوتی:
«تەماشاکا چۆن ئێمە هاتین و چووین، دامـەزراوە پیشەسازییە نوێکانی سەر خاکمان بژمێرە ئەوسا لێمان پرسە ئاخۆ وڵاتەکەتان هەژارە یان نا».
بەڵام هەنوکە تازە ساڵی ١٩٢٩یە، بەریتانیای گەورە لە هەوڵوتەقەللادا بوو، عەرەبەکان بە گوشارخستنە سەر جوەکان رازیبکا. گەر وایزمەن، بنگۆریۆن یان هەر یەکێکی دیکە دەنگی ناڕەزایی هەڵبڕیبا، یەکسەر بەریتانییەکان کۆمۆسیۆنێکیان پێکدەهێنا و رەوانەی رۆژهەڵاتی ناوینیان دەکرد. کۆمسیۆنەکەش لێکۆڵینەوەکانی خۆی دەکردن ، گوێی لە گەواهیەکان دەگرت و راپۆرتی خۆی دەنوسی و بەرزی دەکـردەوە. لە کۆنگرەی داهاتوی زایۆنیستەکاندا لە ڤیەننا بنگۆریۆن لە جیاتی بەرپرسانی جوانی فەلەستین قسەیکرد. بە کراسێکی وەرزشوانان، چەناگەی بزێوانە دەبردە پێش و لە بەرامبەر دووسەد نوێنەردا تاڵترین دوانی لە ژیانیادا دا. لە سەرەتای دوانەکەیدا هێرشی کردە سەر سێر هێربەرت.
«کاتێ ئەو هات، ئێمە بەڕێزەوە سەیرمانکرد. بەڵام ئایا ئەو چی بۆ ئێمە کرد؟ ئەو حاجی ئەمین ئەلحوسەینی Haj Amin El Husseini (یەکێ لە سەرکردە عەرەبە غەیرە جوەکان)ی بۆ ئێمە وەک موفتی ئۆرشەلیم ڤیتکردەوە!»
ئەوسا بە تورەییەوە دابەزییە سەر ئینگلیزەکان.
سەرۆکی کۆنگرەکە دەبوایە زوزو چەکوچەکەی بکوتێ. نیردەکان بە شڵەژانەوە لەسەر کورسییەکان ئاوڕیان بۆ ئەملا و ئەولا دەدایەوە.
ئەو ساڵانە ساڵانێکی گرژی بێئومێدی و بێدەسەڵاتی بـوون. لەهەر چوارلای بنگۆریۆن هەر ناڕەوایانە بەرامبەر گەلەکەی دەجوڵانەوە. کارمەندەکانی بەڕێوبەرایەتی ئینگلیزەکان لە فەلەستیندا چەکدار بوون. هەر هەمویان بێجگە لە کارمەندە جوەکان چەکداربوون. تەنانەت داواکارە گشتیە ئینگلیزییەکەش جو بوو، دەبوایە چەکەکەی خۆی دابنابایە.

بارودۆخی کرێکارانیش خراپ دەبوو. لە تەلئەبیبدا کارگەکان وەک قارچکی دوای ڕێژنە باران هەڵدەکەندران.

بنگۆریۆن رایگەیاند؛ «بەڵام لەنێو دیوارەکانی ئەو شارە جولەکەییەدا کەم وایە مرۆ گوێی لە قسە و گۆرانی جولەکان بێ. هەمو کارەکان لەلایەن دەستی کاری عەرەبانەوە دەکرێ».

کشتیارانی پێتاخ تیکڤاهیش نەخشەیەکیان داڕشتبوو کە چۆن کرێکاری هەرزان لە میسرەوە بهێنن.

لە ئۆرشەلیمدا باڵەخانەیەک بۆ نوسەران دروستکرا، دەبوایە ناوی هێرزلی هەڵبگرتبایە، بەڵام هیچ کرێکاری جو ئیشی تێدانەدەکرد.

ساڵەکە بە راوەدونانێکی خوێناویانە کۆتایی پێهات. عارەبە سەرگەرمەکان دو سعاتان جەللادانە دەسوڕانەوە، لەنێو ئۆرشەلیمدا تاڵانوبرۆیان کرد، تێکیاندەدا. لە لەندەنیش کۆمسیۆنێک دروستکرا، دوای بەسەرچوونی کات لێکۆڵینەوەیەکی ئەنجامدا. چەند مانگێک دواتر راپۆرتەکەیان دەرچوو بەوەی بە پلەی یەکەم موفتییان بە بەرپرسیاری روداوەکە دانابوو. لە بەرامبەردا حکومەتی بەریتانی کتێبێکی دیکەی سپی دەرکرد، بەهۆیەوە زیاتر کۆچی جوەکانی سنوردارکرد و ئەوەشی ئاستەنگکرد کە جوەکان زەوی بکڕن. ئەوەی بەلای بنگۆریۆنەوە زۆر تاڵ بوو، ئەوەبوو کە هەمو ئەو کارانە حکومەتی کرێکارانی بەریتانیا دەیکردن. سەرۆک وەزیران رامزی ماکدۆنالد بوو کە هەمیشە رایدەگەیاند گوایە هەواداریێتی لەگەڵ پرسی جولەکەدا هەیە. بنگۆریۆن نە لەبیری کرد و نەلێشیبوری.

هەنوکە سەردەمی زنجیرە کوشتارگەکان دەستیپێکرد: لە ئاوروپادا بارودۆخ تادەهات خراپتر بوو، لە فەلەستیندا عەرەبەکان پەلاماریاندەدا، کۆمسیۆن دەهاتن و دەچوون، کتێبی سپی تازە دەردەچوون و لە دوایشدا شەڕ.

پاولا بۆ جاری سێهەم دووگیان بوو. ئەم جارەیان کۆرپەکەیان لە فەلەستیندا لەدایکبوو، کچێکیان بوو، ناوی رێنا Renna (کامەرانی)یان لێنا. ئاخروئۆخریەکەی بنگۆریۆن منداڵێکی سابرایی پەیدا بوو.

لەو ساڵانەدا بنگۆریۆن زۆر دەردەچوو، گەشتی زۆر، کۆنفرانس و کۆبوونەوەی ساز دەدان. بێجگە لەوەی سەرۆکی سەندیکای پیشەیی بوو سیاسەتوانیش بوو.

لە کۆنگرەی زایۆنیزمی داهاتودا رۆڵە سەرەکییەکان ژابۆتنسکی و وایزمەن گێڕایان.

ژابۆتنسکی ئەمجارەیان دواندەرێکی کارامە بوو. ئەو هەشت تا نۆ زمانی بە تەواوی دەزانین و لەلایەن بێژمار لە گەنجە فەلەستینی و پۆلۆنیایی پشتگیری دەکرا. ئەوان زۆر رێزی ئەم پیاوە شاعیر، زانا و هونەرمەندە، بە پلەی یەکەمیش ئەو تێکۆشەرە زایۆنستیەیان دەگرت. پیاوانی وەک ماکیسم گۆرکێ Maxim Gorki و لیۆ تۆلستۆی Leo Tolstoiش دەربڕینەکانی ژابۆتینسکیان بە باشی هەڵدەسەنگاند.

ئەو و وایزمەن بە یەکدی دەوێران. لەو کۆنگرەیەدا ژابۆتینسکی یەکێک لە دوانە گڕاویەکانی خۆی دا؛ ئەو داوای پێکهێنانی دەوڵەتێکی جولەکانی لە هەر دوو دیوەکانی

ئوردن دەکرد، کە ئەوەندە  بە قەد فەلەستینی دێرین گەورەبوو. کاتێکیش  لە دوانەکەی بووەوە وایزمەن بە پێکەنینەوە گوتی:

«دیوارەکانی یەریخۆ Jericho لەبەر ژاوەژاوی دیواری سکالاَ و دەنگی دەهۆڵەکان روخا. من هەرگیز گوێم لە دیوارێکی بەو شێوە دانراوە نەبووە».

رۆژێک دواتر وایزمەن بە سەرۆکی رێخراوی زایۆنیزمی هەڵنەبژێردرایەوە. ئیدی کشایەوە.

بنگۆریۆن جڵەوی سەرکردایەتی بزوتنەوەی نوێی کرێکارانی بە ناوی ماپای mapai گرتەدەست. لایەنگرانی ژابۆتینسکی خۆیان بە ریڤیژیۆنیست (نۆژەنکەرەوە) دادەنا. ئەوە ململانێیەکی نێوان چەپ و راستەکان بوو، دڵڕەقانە لەگەڵ یەکدا جولاّنەوە تا کار گەیشتە سەر لێکەوتنەوەی یەکەمین کردەی کوشتنی سیاسیانە لە فەلەستیندا.

نازییەکان  هاتنەسەر تەختی دەسەلاّت و مرۆ لە رۆژنامەکانەوە شێوە ناقۆلاّیەکەی کینەی دژی سامێتیان دەخوێندەوە. لەو رۆژگـارەدا هیتلەر جارێدا گەر هاتو لە ماوەیەکی کورتدا جوەکان ئاڵمان و ئاورۆپا بەجێبیلّن، ئەوا هیچیان بەسەر ناهێنێ. حایم ئارلۆسرۆف Chaim Arlosoroff سەرۆکی بەشی سیاسیی ئاژانسی جوان، نێردرایە بەرلین تا لەوە بکۆڵێتەوە بەڵکو ژیانی نیو ملیۆن جولەکەی ئاڵمان رزگار بکا. هەفتەیەک دواتر بە ڕاپۆرتێک گەڕایەوە.

لە ئێوارەیەکی خۆشی هاویندا حایم ئارسۆلۆف لەگەڵ ژنەکەیدا لە لێواری زێ لە تەلئەبیب پیاسەیان دەکرد. نەناسراوێکی گەیشتێ و داوای ئاگری لێکرد. ئارلۆسۆرۆف گیرفانەکانی خۆی گەڕا. هەر هێندە بوو دەنگی گولله هات. ئارلۆسۆرۆف جەستەیەکی بێگیان کەوتە سەر زەوی. بکوژەکەش لەبەرچاوان ونبوو.

ئابراهام ستاڤسکی Abraham Stavsky لاوێکی ریڤۆژیۆنیست لەسەر کوشتنەکە گیرا. بنگۆریۆن بە ئاشکرا رایگەیاند کە بڕوای وایە ستاڤسکی تاوانی کوشتنەکەی کردووە.

لە هەمو فەلەستیندا بابەتەکە ببووە بنێشتە خۆشەی بن ددانان.

پێشان زایۆنیستەکان تەنها دەمەقاڵیان بە قسە بوو. بەڵام بەو تاکتیکە نوێیە مرۆ لەناخەوە سڵەمیەوە. ئایا پێویستە ئەوجوانەی لە سەر خاکی بەڵێنپێدراودا دەژین یەکدی بکوژن، لەکاتێکدا کۆڕەوە هەر مەزنەکەی رۆژگار لە ئاوروپا لەدەستپێکدایە؟

لەکۆتاییدا ستاڤسکی بەردرا، بەڵام پانزە ساڵ دواتر لەوشوێنەی ئارلۆسۆرۆفی لێکوژرا ، کوژرایەوە.

ئەوە لەکاتێکدا رویدا کە ژابۆتینسکی شاعیری ریڤۆشیۆنیست و بنگۆریۆنی بزوتنەوەی سەندیکای سۆشیالیستەکان  هەردوکیان هەڵپەی دەسەلاّتگرتنەدەستیان بوو. لە ئاکامی دەنگدانێکدا بەدەرکەوت کە بنگۆریۆن لە  ٣٢٠ دەنگی نوێنەرانی کۆنگرەکەدا زۆرینەی بەدەستهێناوە. بنگۆریۆنی کورتەبنە لەسەر کورسی سەرۆکایەتی دانیشت.

لە بەهاری ١٩٣٥دا سێ پیاو و سێ ژن لە ئۆرشەلیم بۆ گەڕانێکی پێنج رۆژە دەرکەوتن. یەکێکیان ئیلاهو ئێپستاین Eliahu Epstein بوو. دە ساڵ بوو لە ڕوسیاوە

هاتبوو، هەروەک بنگۆریۆنیش بانگەشەی بۆ دەکرد سەرەتا لە کیبۆتێک لە زۆنگاوێکدا کاریکرد. ئەو خەریک بوو بە مەلاریاوە بمرێ و هەنوکەش کرێکارێکە لە حەیفا کە دەکەوێتە سەرسنوری کەناری رۆژهەڵاتی ئوردن و عەرەبستانی سعودییە و کرێکاری دروستکردی فرۆکەخانەیەکە بۆ R.A.F. ئێپستاین برادەری لەنێو رەوەندەکاند (بێدون Bedoein) دا هەبوون و گەشتەکەشیان بەرەو لای باکوری دەریای سورەوە بوو، لەو شوێنەی خۆرهەڵاتی ئوردندا گوندێکی راوەماسی بەناوی ئەقەبە Akabaی لێیە، لە بەرامبەریشی بەدیوی فەلەستیندا شوێنێک هەیە لە سەرنەخشەدا بە ئومرەشڕاش Umm-Rashrash ناوی هاتووە، بەڵام تەنها کۆڵیتی سەرەتایی لێن، ئەویش هی پیاوێکی ئینگلیزبوو کە بەدوای کانزاکاندا دەگەڕا. لەو دەڤەرەدا ئێپستاین دڵی بۆ بیابان لێدەدا، عەرەبی زانینیەکەی  یارمەتیدەری بوو. خەیاڵێکی بۆهات گەلۆ گەر دەوڵەتی جولەکان دامـەزرا ئومرەشڕاش چی بەسەردێ. ئەو گەشتەکەی بۆ ژنەکەی و برادەرەکانی (بنگۆرین و هاوسەرەکەی لەگەڵ کاتزێنسلۆن و خانمەکەی) پێشنیازکردبوو تا ئەو ناوچە بیابانەیان پێنیشانبدا.

ئـەوان بە سـواری لە ئۆرشەلیمەوە چوونە شـاری عەمانی ئـوردن، لەوێوە بە کەناری ئوردنەوە  لەسەر دەریای مردوودا  بەرەو ئوم رەشڕاش  چوون. ئەوەش هەڵگەڕانەوەی رێڕەوی موسا بوو.

ئـەوان لە کاتی خۆیدا دەرچـوون تا پێش ئێوارەی جەژنی پاس بگەنە شوێنی مەبەست؛ دەیانەویست  نەرتیتئاسا  جەژنی سایدەر  Seider لەو شوێنەدا بگێڕن کە لە دیرۆکی  گەلی کۆنی جولەکاندا رۆڵێکی کارای گێڕاوە.

ئەوانی دیکە هەرگیز نەهاتبوونە ئەو ناوچەیە کە رێبەرەکەیان دەیگێڕان. بێگومان لێرەدا پاشماوەی شوێنەواری خەڵکی کەڤنار نەمابوو.

ئێپستاین هاواری کرد «بەڵام تەماشای بەندەرەکە بکەن».

هەمویان  لە سۆنگەی دیرۆکی بایبلدا  هەستیان بەماڵی خۆیان دەکرد و پێویستیان بەوە نەبوو یەکیان شت بە بیر ئەوی دیکەدا بهێنێتەوە بەوەی ئاخۆ ئوم ڕەشاش لە سەردەمی شا سالۆمۆ Salomoدا ناوی سێلات Selath بووە. ئالێرەدا سالۆمۆ (سلێمان) کەشتیگەلێکی دروستکرد. لەو تەنگەوە جوەکانی ئیسرائیلی کۆن کاڵایان بۆ هەمولایەک دەگواستنەوە.  لە کانەکانی ئەوکاتدا مس پاکو لوس دەکرایەوە. لە دوهەمین تابلۆنامەی ئەستێر Estherدا هاتووە کە شاژنی  سەبەء Saba پێش ئەوەی سەردانی سالۆمۆ بکا کەشتی پڕ کاڵای بەنرخ، بەردی مەڕمەڕ و شەشسەد کوڕ و کچ کە لە هەمان سات و رۆژ و ساڵدا لە دایکببوون هەموشیان یەک بەرگی رەنگی شاهانەیان پۆشیبوو  رەوانەی لای سالۆمۆی کردبوون.

ئەوان بە رەنگینی لمی ئیلاتەوە کارانگاز ببوون. رەنگیان هەر بۆرێکی ئاسایی نەبوو کە لە هەمو شوێنێکدا دەبینرا، بەڵکو شین، سورباو بنەوشەییەکی ناسک بوو.

لەو کاتەی هەندێکیان سەرقاڵی یادەوەی ئیسرائیلی کۆنینە بوون، ئەو پیاوەی کە پرچی  تەنک و بۆز ببوو،هەر دەیڕوانییە بەندەرەکە. ئەو چاوەکانی  وەک ئەوەی خەونێک ببینێ، نیوە نوقاندن.

مانگێک دواتر بنگۆریۆن لە نامەیەکیدا بۆ دادوەر براندایس Brandeisی سەرۆکی دەستەی باڵای دادوەری ئامریکا پێشبینیکرد، زۆر نابا دەوڵەتی جوان دادەمەزرێ و ئیلاتیش چ لە رویی ئابورییەوە چ لە روی سیاسییەوە ئەو رۆڵە گرنگە دەگێڕی کە کاتی خۆی لە رۆژگاری بایبلدا گێڕاویە.

کەمێک دوای گەشتەگەڕانەکەیان بۆ ئیلات، بنگۆریۆن بووە سەرۆکی ئاژانسی جولەکان، ئەوەش لە راستی و بەکردەوە واتای ئەوەی دەگەیاند کە بۆتە سەرۆک وەزیران بەڵام سەرۆک وەزیرانی سایە، حکومەتی وڵاتێک کە هێشتا بوونی نییە.

یەکێک لە باشترین برادەرانی بنگۆریۆن لە ناو عەرەباندا موسا ئالامی Musa Alami بوو. موسا پیاوێکی شارستانی پێشکەوتوو، لە ئاوروپا خوێندنی تەواوکردبوو. موسا کە پێشتر جێگری داواکاری گشتی فەلەستین بوو خزمی موفتیش بوو. ئەو لە ئۆرشەلیمدا دەژیا. لە بەهاری ١٩٣٦دا بنگۆریۆن لەگەڵیدا کەوتە دانوستان بەو هیوایەی بگەنە رێکەوتنێک هەردولایان عەرەب و جولەکە دەوڵەتی خۆیان دابمەزرێنن.

بۆ هەردولایان، نەخاسمە بۆ موسا کارەکە لە سەرچڵی بەدور نەبوو. چونکە هەمو عەرەبێک کە گومانی ئەوەی لێکرابا لەگەڵ جولەکاندا لە گفتوگۆدایە، ترسی ئەوەی لەسەر بوو لەناو نوێنیشەوە رابکێشرێ و هەر لە رێی خەڵکی خۆیەوە بکوژرێ.

دروست لەو کاتەی بنگۆریۆن و موسا ئالامی بۆ دوهەمین جار کۆدەبوونەوە، ئاژاوەی عەرەبەکانی ١٩٣٦ دەستیپێکرد. سەرەتا لە یافاوە تەقیەوە. ئەوکات بەقەد یەک لە جولەکەو عەرەب بریندار بوون. رۆژ بەرۆژ ژمارەی کوژراوەکان زێدەتر دەبوون. عەرەبەکان مانیانگرت. هەر کەمێک دوای ئەوە لە سەرتاسەری فەلەستیندا بە کردەوە هاتوچۆ راوەستا.

حکومەتی بەریتانیا سەربازی زیاتری لە میسرەوە ناردن. لە ماڵتاشەوە هێزی زیاتری رەوانەی ئەوێکرد. پاشان لەشکرێکی تەواو لە ئینگستانەوە نارد. لە کۆتاییشدا هەروەک جاران کۆمسیۆنێکی بۆ لێکۆڵینەوە پێکهێنا.

هەر کە بنگۆریۆن هەستی کردبا کە جڵەوی ددانبەخۆداگرتنی لەدەست دەردەچێ، بەسەر شاخی سکۆپوس Scopus کە زانکۆی عیبری لەسەر دروستکرا، سەردەکەوت، ئەوسا تاهێور دەبووەوە بە قوڵی سەری بەسەر کتێبەکەدا (مەبەست کتێبە پیرۆزەکەیانە-وەرگێڕ-) دەگرت.

ئەو دەستە ئینگلیزیە بۆ لێکۆڵینەوە لە هۆکاری ئاژاوەی عەرەبەکان هاتنە فەلەستین ناوی دەستەی پیێل Peel هەر بەناوی سەرۆکەکەیان لۆرد پیێل بوو. ئەو راپۆرتەی پێشکەشیان کرد بریتیبوو لە چوارسەد روپەڕ. بنگۆریۆن وشەبەوشەی لێکدایەوە، پاشان خۆی گەیاندە لەندەن کە بەچەندان رۆژ لەسەر سەکۆی دواندانی ئەنجومەنی نوێنەران و لۆردەکانی بەرتیانیادا خەریکی گفتوگۆ و مشتومڕ بوو.

دواتر کە لێیان پرسی رەفتاری ئینگلیزەکانت لە گفتوگۆکاندا چۆن بینی؟ وەڵامی دانەوە: «پێموابوو من لە کۆنگرەیەکی زایۆنییانە دام!»

ئایا ئەو چی لە گوێڕاگرتنی ئەو وتوێژانە فێربوو؟

«تۆ دەتوانێ گەلێک شت لەگەڵ ئینگلیزەکاندا بکەی، بەڵام ناتوانی بیانگۆڕی

و بیانکەیە غەیرە ئینگلیز. پیاوی ئینگلیز کێشەکان لە چاوی جولەکەوە نابینێ، ئەو بەدڵێکی جولەکانە هەست ناکا و بەڵگەوبەندی جولەکانەشی بەمێشکدا نایەت».

لە راپۆرتەکەی کۆمسیۆنی پیلدا جەخت لەسەر پێشنیازی دابەشکردنی وڵات بۆ دوو دەوڵەتی عەرەب و جولەکە کرا. جیاوازی ئەو نەخشەیە لەگەڵ نەخشەی نەتەوە یەککگرتووەکانی دواییدا ئەوە بوو کە کۆمسیۆنی لۆرد پیل ئۆرشەلیم، نەزارەت Nazaret، بێتلەهیم Bethlahem، حەیفا Haifaw و ڕێڕەوی ئۆرشەلیم تا سەر زێ بە دەستی ئینگلیزەکانەوە بمێنێ؛ باقیەکەشی ڕێژەی ٧٥٪ بۆ عەرەبەکان و ٢٥٪ یش بۆ جولەکان بێ؛ ئەوەش هێڵێکی باریک بوو لە گالیلیاوە بە لێواری دەریاوە بوو.

لە ئاوڕوپادا جەنگ لە ئانوساتی تەقینەوەدا بوو. هیتلەر دەرگاکانی ئاڵمانی کلۆمدان. فڕانکۆ و فاشیزم لە ئیسپانیا باڵادەست بوون. بەڵام لە هاوینی ١٩٣٧دا سەرکردە جوەکان لە کۆنگرێسی زایۆنییانەی خۆیاندا هەر باسوخواسی دابەشکردنی فەلەستینیان تاوتوێ دەکرد.

لەو ساڵانەدا بۆ یەکەمین جار بنگۆریۆن و کاتزێنسلۆن کە برادەری یەکدیبوون، بە ئاشکرا بەیەکهەڵشاخان. سەرنوسەری رۆژنامەی کرێکاران دژی دابەشکردن بوو. رابی ناسراوی ئامریکایی ستێفان وایز Stephan Wise و ئابا هیلەل سیلڤەر Abba Hillel Silverەوە هەمان هەڵوێستیان هەبوو. هەمو نوێنەرە ئامریکاییەکان دژی بوون، گۆلدا میرسۆن Golda Myrson (دواتر بووە گۆلدا مایر)یش کە لە کاتێکی سەختدا لەلایەن بنگۆریۆنەوە بە وەزیری کاروباری دەرەوە هەڵبژێردرا هەر دژ بوو.

ئەوان وتاری زۆر زیرەکانەیان دا.

کاتزێنسلۆن گوتی: «بۆ یەکدانەواندن پێویستە هەبێ، بەڵام لە کاتێکدا دەستبەرداری شتێک دەبێ کە توانستی پەرەپێدانی شتی دیکە وەربگرێ».

لە کۆتاییدا ئەو پیاوەی کە سەری سپی راست راگرتبوو وەک ئەوەی کە تەواو بارگاوی بووبێ، چوە سەر سەکۆی دوان. لە هەمو بیچمیدا هێزی دینامیکایە بەدەردەکەوت.

«باشترین حکومەتی ماندات کە مرۆ بیری لێبکاتەوە لە حکومەتەکەی خۆماندا نقوم نابێ».

هەر سەری رەزامەندبوون بوو دەلەقا. قسەکانی رەتنەدەکرانەوە.

ئەو پێشبنی کردن. وەک ئەو گوتی زەحمەت نەبوو زۆریشی نەدەخایاند کە دەوڵەتی نوێی جولەکان لەماوەی سەرەتای دە ساڵی خۆیدا ملیۆن و نیوێک کۆچبەر لەخۆ بگرێ. (ئەوەش پێشبینییەکەی خراپ نەبوو. چونکە لە دەساڵی یەکەمی دەوڵەتی جودا نزیکەی یەک ملیۆن کۆچبەر هاتنە ئیسرائیل.)

«ئەوە ساڵی پیاوانە، کە دووهەزار ساڵە چاوەڕێی دەکەین».

لە کۆتاییدا ئەنجامەکەی کە بۆ هەردوو لا مایەی پەژراندن بوو، وەرگیرا، بەڵام بڕیاری یەکلاکەرەوەی لێنەدرا. سەرکردەکانی کۆنگرە راسپێردران وردەکاری زیاتری

نەخشەکە لە ئینگلیزەکان بپرسن.
بنگۆریۆن هەرکە منداڵ بوو خەونی بە دەوڵەتی جولەکانەوە دەبینی، ئەوساڵیش لە کۆنگرەکەدا گوتی:
«بۆیەکەمجارە رایدەگەیەنم کە ئامادەم لە بەڕێوبەرایەتی بزوتنەوەی زایۆنیستدا بەشداربم تاکو هەڵمەتی دامەزراندنی دەوڵەتی جولەکان دەستپێبکەین. ئەوەش لە ئێستاوە هەمو ئامانجی ژیانم دەبێ».
داودی نوێ دەستی بە ململانێیەک لەگەڵ کەللەشەقێکی وەک گۆلیات Goliath دا کرد.
ئینگلیزەکان (هەرچەندە پێشنیازەکەش لەلایەن کۆمسیۆنێکی خۆیانەوە کرابوو) روبەرووی پڕۆژەکە وەستانەوە.
عارەبەکان دەبوونە ترسناکترین دوژمنیان.
سەرکردەکانی بزوتنەوەی زایۆنیزمی لە ئامریکادا دژی پرۆژەکە تێدەکۆشان.
ژابۆتینسکی و ریڤیژیۆنەکانیشی هەر دژبوون. پیاوە هاوپەیمانەکانی،راوێژکارەکانی هاوپارتەکانی پێیان وابوو بڕیارەکەی ناڕاست بوو.
بێرل کاتزێنسلۆن ئەو پیاوەی کە هەمیشە بنگۆریۆن راوێژی پێدەکرد، لە بەرامبەری وەستا بووەوە. بنگۆریۆن تەمەنی گەیشتبووە پەنجا ساڵ. زۆرانبازییەکە هێشتا دەبوایە دە ساڵی دیکەی بخایاندبا تا نەخشەیەکی باشتر دەرکرابا. ئەوەش سەرەتای ئەو خەباتە بوو کە جوەکان وەک هەر نەتەوەیەکی دیکە دەیانەویست لەسەر خاکی خۆیاندا بژین، ئەو شوێنەی بناغەی سەدە دوورودرێژکانی شارستانیانی کۆنیان بوو.
بنگۆریۆن لە ١٩٣٧دا لە جاران زیاتر هێشتا هەر پیاوێک بوو، تەواو ئایدیالست.

# بەشی
# (٦)

عەرەبە تالانکار و خوێنمژەکان دوو ساڵ دەبێ، بوونەتە بەڵا بەسەر وڵات؛ پێشناچێ ئومێدی کۆتاییهاتنی کردە کاولکاریەکانیان لە ئاسۆدا دیاربێ.
دەستەی چەکدار دێنودەچن و هەر جوێک بکەوێتە بەردەستیان بێ سێودوو دەیکوژن. بەسەر شەمەندەفەرەکان دادەدەن، ڕێگای نشینگە جوەکان ئاستەنگ دەکەن. وایەری تەلەفون لە ستونەکانیانەوە دەقرتێنن. بۆڕییە نەوتەکانی لە عێراقەوە دێن، خاپور دەکەن. ئاگر لە دارستانەکان بەردەدەن.  دارە بەبەرەکان لە بنەوە دەبڕنەوە. تەڵەزگە (کەمین) بۆ ڕێبواران دادەنێن و لەپڕ بە سەریان دادەدەن و تەقە لە کاروانەکان دەکەن.
ئەوەش نهێنییەکی  نێو جەماوەر بوو کە عەرەبە فەلەستینییەکان پارە و چەکیان لە دەوڵەتە عەرەبییە دراوسێکانەوە بۆدێ.
بۆ دانیشتووانی فەلەستین ئەو ڕۆژانە زۆر ئاڵۆز بوون شەوەکانیشی هی رازان نەبوون. پاولا بنگۆریۆنیش یەکێ بوو لەو هەزاران کەسەی کە شەوان ناوی خۆیان لە لیستی ئێشکگراندا تۆمار کردبوو.
«هەمو شەوێک کە منداڵەکانم بردنە سەرجێگا و خەواندمن، نۆرەی ئێشگریەکەم دێ. لە کازیوەی بەیانیشدا پێش ئەوەی زارۆکەکانم لەخەو هەڵبستن، دەگەڕێمەوە ماڵەوە».
ڕۆژێک هەواڵی ڕۆژنامەکان رایانگەیاند هیتلەر بەرەو نەمسا کشا. زۆریشی پێنەچوو تەلگرافێک لە بەرلینەوە هات، نازییەکان بۆ هەمو کارێکی ناشیاو و قێزەون لەسەرپێین. لەبەر ئەوەی گەنجێکی جولەکە لە پاریس تەقەی لە دیپلۆماتێکی ئاڵمان کردبوو، هاینریش هیملەر Heinrich Himmler فەرمانی بە ئێس ئێس SSەکانی خۆیدابوو، دەستبکەنەوە. بە سەدان سیناگۆکێ و ماڵە جولەکەیان سوتاندن. لە وڵاتی ئاڵماندا بیست هەزار و لە ڤیەنناش بیست هەزار جولەکەی دیکە گیران. زیاتر لە حەفتاهەزار دوکانی جولەکان تالانکران. زۆر جولەکە کوژران و نەخۆشخانەکانیش لە قوربانییەکانیان تەژیبوون. دوو ڕۆژ دواتر کۆمیتەیەک بە سەرپەرشتی هێرمان گورینگ Hermann Hoering پێکهات و جڤاکی  جولەکەی بە دووسەد هەزار دۆلار سزا دا. لە ئێستاوە دەبوایە هەمو جوەکان ئەستێرەی زەردی داود بپۆشن. لە ئێستاوە دەبوایە هەمو جوەکان ...

بنگۆریۆن به نیازی ئەوەی ئەو سەد هەزار جولەکەی کە مەرگی ناگەهان چاوەڕێی دەکردن رزگاریان بکا و بیانگوازێتەوە فەلەستین پەنای بردە بەر وەزیری کاروباری کۆلۆنەکانی بەریتانی. وەزارەت هەر یەکسەر گوتی «نابێ». ئیدی هەر سەد هەزار کەسەکە بۆ بەختی رەشی خۆیان بەجێهێشتران.

بنگۆریۆن داوای مۆڵەتنامەی کۆچکردنی بۆ بیست هەزار منداڵی پۆلۆنی و دەهەزار گەنجی بە ڕەچەلەک بالکانی کرد. بەڵام داواکەی رەتکرایەوە. (بۆئەوەی بۆ مێژوی بسەلمێنێ، ساڵێک دواتر راشکاوانە رایگەیاند کە ئەو سی هەزار گەنجەی دەکرا رزگار بکرێن، هەمویان کوژران.)

لەنێو جولەکاندا پەشۆکاویی و تاڵاونۆشین پەیدابوو. لەهەمو لایەکی جیهانەوە پاشاگەردانی بوو. لەهەر چوارلاوە کوژراو هەبوون. جوەکان لەهەمو سەردەمێک زیاتر پێویستیان بە سەرکردەیەک هەبوو تا ریگەی دەربازبوونیان نیشانبدا.

وایزمەن ئەو کەسە نەبوو رۆڵەکە بگێڕێ. هیشتا وایزمەن هەر سوربوو لەسەر ئەو ڕایەی خۆی گوایە ئینگلیزەکان هەموکاتیک و لەهەر بارودۆخیکیشدا بێ تاکە دۆستیانن.

ژابۆتینسکی چارەسەرێکی دۆزیبووەوە. ئەویش بەکارهێنانی تیرۆر بوو چ دژی ئینگلیز چ دژی عەرەبەکان. چاو بە چاو و ددان بە ددان. ئەو ناوی لە هێزی ژێرزەمینی خۆی نا لەشکری ئیرگون زاڤی لوێومی Irgun Zavi Leumi (رێکخراوی سوپای نەتەوەیی). هەر لە سەرەتای دروستبوونییەوە تا هەڵوەشاندنەوەی دوای چواردە ساڵ، دڵڕەقانە جوڵایەوە. لەشکرەکە وەڵامی تیرۆری بە تیرۆر دایەوە. «کەسانی لابەلاو ئاساییمان لێدەکوژن، ئێمەش کەسانی بەرچاوتان لەناودەبەین. گەر هاتو ئێوە کەسێکمان لە سێدارە بدەن، ئێمە سێ کەستان لە داردەدەین. تا ئەوکاتەی ئێوە فێری هەڵسوکەوتی جوامێرانە دەبن ئێمە دەست لە کوشتن، ئەشکەنجەدان و تیرۆرکردنتان هەڵناگرین». ئەوانە بنەماکانی رێکخراوی ژابۆتینسکی بوون.

لەو سەردەمە پڕ ژان و کەسەرەی دیرۆکی جولەکاندا، لەهەمو لایەک نەخاسمە لەنێو لاواندا بیرۆکەی دەستکردنەوە برەوی زۆری هەبوو، بەمجۆرە ژابۆتنسکی لایەنگری زۆری پەیداکردبوون. ئەوانی دیکە بەئازار و دڵنیانەبوونەوە پێیەوە گرێدراوبوون؛ ئەوان پێویستیان بە دەنگێکی ئۆقرەگرتو هەبوو تا رزگاریان بکا.

نرکەی ئەودەنگە هێورەش لە ٣ی ئابی ١٩٨٣دا دەرکەوت.

«ئێمە لەیەک کاتدا لە سێ بەرەوە دەجەنگین. لەنێو ریزەکانی خۆماندا دووبەرەکی هەیە. ناکۆکیمان لەگەڵ عەرەبەکاندا شێوازی توندوتیژی بەخۆیەوە گرتووە. جیاوازی بیروبۆچونەکانمان لەگەڵ ئینگلیزەکاندا تادێ قوڵتردەبێتەوە.» ئەو لە هەوڵوتەقەللای ئەوەدابوو بارەکە لەوەی هەیە خاوتر بکاتەوە. ئەو هەق و رەقانە جوڵایەوە. بەڵام هەر هەوڵیشی دەدا وەک هەمو جارێک، دیوی دیکەی میدالیاکەش ببینێ. هەروەک لەکاتی هەواڵێکی خۆشدا هەرگیز نەچۆتە سەر شەقام هەڵپەڕێ، ئاواش لە کاتی تەنگانەدا هەرگیز پەیامبەرێکی بەدبەختی رەشبین نەبوو کە هیچ دەرەتانێک نەدۆزێتەوە.

«ئەوەی ئێمە راپەرێنێکی نەتەوەیی نیە». ئەو قسەی بەرامبەر ئەو ئاژاوە زۆرەی

سەر گۆڕەپانی فەلەستین کرد. لەسەر دوانەکەی بەردوام بوو: «گەلی عەرەب گریدراوی ئاژاوە نیە، تەنانەت زۆرینەی گەلی عەرەبیشی تێوەنەگلاوە؛ هێشتا هی ئەوە نیە کە بە هەمو هێزەوە بەرەنگاری ببینەوە. کەمینەیەکی بچوک لەسەر مان و نەمان شەڕ دەکا، لەو شەڕەشیدا هەمو ئامرازەکان با قێزەونیش بن بەکاردەهێنێ.»

دیسان گەڕایەوە سەر مێژو.

«بۆ گەلێکی وەک ئێمە کە دو هەزار ساڵ پێشتر لەو خاکەدا ژیاوە..»

ئەوە نمونەی کاراکتەری خۆی بوو لە دوانەکانیدا پەنا بۆ روداوگەلێک ببا کە لە ئێستا رو دەدەن و تێکەڵاوی دوێنێیان بکا. بەردەوام بەبیر هاوڕەگەزەکانی دەهێنایەوە کە روانینی دیرۆکیانە زێدەمافی زۆر گەورەی گەلی جولەکانە.

هەنوکە گەڕایەوە سەر ورە.

«ئێمە دەبێ لە بەرامبەر عەرەبدا هەرلەبەر ئەوەی عەرەبن خۆمان بەکەم نەزانین. ئێمە نامانەوێ نیشانە لە عەرەبێک بگرین کە هیچ تاوانێکی تیرۆریانەی نەکردووە. ئێمە نغرۆبوون لە تاکتیکی تیرۆرستیانە رەتدەکەینەوە.»

ئەم قسەیان ئاراستەی ژابۆتینسکی بوو.

«خوێنڕشتنی بێتاوان گوناحە.»

بەڵام ئەمجارەیان وەک مۆرالیستێکی واقیعبینانە گوتی:

«بەڵام بە داخەوە دەنگی ویژدان بڕیاردەری روداوەکانی جیهان نییە. لەکاتێکدا بایبل فەرمانی کوشتنمان پێنادا، کەچی کەسیش گوێی پێنادا تەنانەت جوێکی ئۆلداریش.»

بۆیە بەڵگەوبەندە پراگماتیەکانی ئەوانی هێنانەوە کە بۆچی نابێ ناڕەوایی بە ناڕەوایی وەڵام بدرێتەوە. تیرۆر پاشاگەردانی لەگەڵ خۆیدا دێنێ. لە فەلەستینێکی پاشاگەردانددا تەنها عەرەبەکانی لێ سودمەند دەبن. لە وڵاتێکی پاشاگەرداندا جو ناتوانێ زەوی بکڕێ، ناتوانێ نشینگەکانی بنیاتبنێ، ناتوانێ کۆمەکی ئەو جوانە بکەی کە پێویستیان پێیەتی.

ئەمجارەیان بانگی ئازایەتییان کرد.

«ئایا دەبێ ئێمە لەوە بترسین کە رۆژ بەرۆژ خەڵکمان لێدەکوژرێ؟ هەر لەو کاتەی یەکەمین جو پێش شەست ساڵ لێرە نیشتەجێ بۆتەوە، کوشتن هەر هەبووە. ئایا ئێمە بەو هۆیەوە راونراین؟»

هاتە سەر ئەوەی باس لە بەڵگەوبەندی رەوایەتی کوشتن لە ڕێی دڵسۆزی نیشتماندا بکا.

«ئەوەی لەسەر عەرەبەکان پێویستە نەیکەن، جوش هەروا دەبێ نەیکا. پاساوی دڵسۆزی بۆ نیشتمان، عەرەبەکانیش هەیانە. ئێ خۆ ئەوان هەر بۆ کەیفوخۆشی خۆیان جولەکە ناکوژن.»

کاتێک گەیشە سەر باسکردنی دەرەنجام بە خۆشییەوە گوتی:

«ئێمە سەرکەوتنی چارەنوسازیانەمان بەدەستهێناوە. بۆ یەکەمین جارە دوای دوو هەزار ساڵ، جو لەشکری خۆی هەبێ. ئەرکی پیرۆزیشی پاراستنی گەلی جولەکەیە.»

هەرچەندە هاگانا ڕێکخراوێکی نهێنی بوو، بەڵام ئینگلیزەکان سوێندیان بە پێنج هەزار ئەندامیان خواردبوو، سەرو تفەنگیشیان دابوونێ تا نشینگەکانیان پێ پاسبکەن. هەنوکە جولەکە مافی هەبوو ڕێگەی ئاسنین بخاتە ژێر چاودێرییەوە. لە باکورو لە باشور پێبەپێی سنور... کاتێک بنگۆریۆن ڕونیکردەوە ئەو دەستکەوتەیان بە چ ئاستەنگێک بەرهەمهاتووە،لە پەرۆشیان چاوە قاوەییەکانی دەبریسکانەوە ..

هەزار ژن و پیاوی جولەکە بە درێژایی ٩٠ کیلۆمەتری سنوریان تەلبەند کردبوو تا ڕێ لە بکوژ و تالانکەرانی عەرەب بگرن.

ئینگلیزەکان پێیان گوتین «ئەوە ئەستەمە».

ئەوێ ڕۆژێ ئەوێ وێرانەیەک بوو، بەشێکی زۆنگاو بوو، گەر هاتبا کەسێک بە ناشارەزایی شەقاوی هاوێشتبا نغرۆ دەبوو. سەرباری ئەوەش ئەوانەی ئیشیان تێدادەکرد، بە ئاسانیش دەبوونە قوربانی دەستی دەستەگەڕۆکە عەرەبییەکان، دەیانتوانی بە ئاسانی ئاژاوە بنێنەوە.

بنگۆریۆن بەخۆی سەردانی کردبوون. ئەوەی بەچاوی خۆی بینیبووی گێڕایەوە. هەزار کوڕ و کیژی جو خەریکی کاری جوامێرانەی خۆیان بوون، لەو کاتەشدا سێ سەد جولەکە ئەرکی پاسەوانیان لە ئەستۆدا بوو. ئەو بڕیاریدا:

«هیتلەر بە زەبروزەنگەوە نەمسای داگیرکرد، جوەکانی لەناوبردن، گەفی لە فەڕانسا و چیکۆسلۆڤاکیاش کرد. ئێمە گەلێکی بچوکی بێ سوپا، بێ دەوڵەت بێ دەنگێکی دەسەلاتدارین. ئێمە ناتوانین دابڕسێینە جیهان. ئێمە تەنها یەک شتمان هەیە کە هێزی لێوە هەڵبهێنجین؛ ئەویش ڕەوشتی پاکی ژیان وکار و بەهای نمونەیی فەلسەفەمانە. بە ئازایەتی، لێتێگەیشتن و دەستپاکی دەکرێ ئێمە سەربکەوین.»

ئەو شەوە جوەکان کە لە ترسولەرز و دودڵیدا دەژیـان، تا بەیانی بە ئارامی نوستن.

ڕەنگبی بنگۆریۆش ئەو شەوە ئارام نوستبێ، چونکە لەسەر دووڕیان وەستابوو؛ دەشیزانی ڕێگا ڕاستەکەی دەستنیشانکردووە. زۆر جاران ساتەوەختی وا ئاستەنگ دێنە پێش کە بڕیاری گونجاوی یەکلاکەرەوەی بۆ کێشە بنچینەییەکان داوە.

یەکەمین بڕیاری گرنگی لەژیاندا بەجێهێشتنی پۆلۆنیا و لە ئیسڕائیل سەنگرانەوە بوو.

دوهەمین بڕیار ئەوکاتە بوو کە بڕوای تەواوی بە داکۆکیکردنی نشینگەکەکان پەیداکرد.

هەنوکەش سێهەمیانە: بڕیارێک هەرچەندە جوەکان بە تیرۆر ڕەفتاریان لەگەڵدا دەکرێ، بەڵام پێویستە ئەوان ڕێگای تیرۆر نەگرنەبەر.

لەسەر دۆزی کۆچی ناقانونیانە (قاچاخانە)ش بیروڕای جیاواز پەیدابوون. سەبارەت بەو پرسەش ئەو و کاتزینسلۆن بەیەکهەڵشاخان. سەرنوسەر لەو بڕوایەدا بوو هەرچۆنێک بێ، بەشەڕیش بێ پێویستە جولەکەکان ڕزگاربکرێن. لە ڕاستیدا بنگۆریۆنیش داکۆکی لەو دیمانەیە دەکرد، کە داواکردن لە ئینگلیزەکان بۆ مۆڵەتپێدانی کۆچبەران زیاتر بکرێ، لەگەڵ ئەوەدا یەکی نەدەگرتەوە کە جو بە قاچاخی ئاودیوی

وڵات بکرێن.
لەو کاتەی هەدوو سەرکردەکە کێشەکەیان تاوتوێدەکرد، بزوتنەوەی دەستپێکەکەکان (بەرابییەکان – مارِەکان)ی جوەکانی پۆلۆنیا کەشتیەکی گریک (یۆنان)یان بەکرێگرت و دووهـەزار کەسیان سوارکرد. کەشتی ڤێلۆس Vellos پێشتر رۆڵی خۆی لە بازرگانیکردنی پێست سپییەکان گێرابوو. سێ سەد جولەکەی پۆلۆنی لەم وڵات بۆ ئەو وڵاتی ئاودیودەکردن، تا لە دواییدا خۆیان گەیاندە بەندەری پریاوس Piraeus ی گریکی. لەوێ لەسەر پشتی ڤێللۆسیان حەشاردان و چەند رۆژێک دواتر بە شەو لە نزیک تەلئەبیبیان دابەزاندن.
کاتێک ڤێللۆ بە دووەم باری گەڕایەوە، ئەمجارەیان ئینگلیزەکان رێکارِی توندیان گرتبووەبەر. بۆ گەڕان و جاودێری فڕۆکەی R.A.Fیان بەکارهێنا. بەلەمە گەڕۆکەکانی پۆلیس بە لێواری دەریادا دەهاتن و دەچوون. کاپتنی کەشتیەکە هیچ دەرفەتی نەدی تا بارەکەی دابەزێنێ و مۆڵەتی دابەزاندنیشی نەبوو، بۆیە بە ناچاری گەڕایەوە یۆنان.
دە هەفتەی رەبـەق کەشتی ڤیللۆس ئەم بەندەر و ئەو بەندەری دەکرد، وەک کەشتیەکی جنۆکەئاسای لێهاتبوو. کەشتییەکە دەیتوانی لە بەندەردا لەنگەر بگرێ بەڵام بۆ جوەکان نەبوو لێیدابەزن. لە کۆتاییدا کۆچبەرە قاچاخەکان ناچارکران بگەڕێنەوە پۆلۆنیا و لەوێ خستنیانە نێو ئۆردوگایەک.
شتگەلی زۆرتریش قەومان. ژابۆتینسکی و رێکخراوەکەی بە قاچاخ کۆچبەریان ئاودیوی وڵات دەکردن. چەند باندێک ناجوامیرانە دەرفەتەکەیان قۆستەوە بەوەی لە بەرامبەر نرخێکی زۆردا هەرچەندە بەریتانیاش بەربەستی زۆری دانابوون، جوەکان بخەنە ناو تابوتەوە بە کەشتی لە وڵات دایانبەزێنن.
بە پێی تێپەڕینی رۆژگار بنگۆریۆن لە هەڵوێستەکەی خۆی پاشەکشەی کرد. ئەو دۆزە دۆزێکی رەوشتیانە نەبوو. خۆ بەڵگەوبەندەکانی کاتزێنسلۆن بڕوایان بەو نەهێنابوو. ئەو هەمو هیوایەکی لەدەستدابوو بەوەی ئینگلیزەکان بێنێتە رایێ و مۆڵەتنامەی کۆچبەرانیان لێوەربگرێ. بۆیە لە دواییدا رەزامەند بوو کە کۆمیتەیەک بۆ کۆچبەرە قاچاخەکان (ناقانونییەکان) دابمەزرێ، هـەرزو کۆمیتەکە بە مۆساد Mossad ناویدەرکرد. بارەگای سەرەکی کۆمیتەکە لە پاریس بوو، نوێنەرەکانیشی بە وڵاتانی ئاورِوپادا بڵاوبوونەوە. پەنابەرەکان بە شەو دەخرانە سەر پشتی کەشتی. کەشتییەکان لە رێگەی پەیوەندی رادیۆییەوە بە بارەگای سەرەکی هاگانا، لە فەلەستیندا گرێدرابوو. ئەوان شوێنی ئارامیان بۆ دەستنیشان دەکرد، کورِو کچی هاگانا لەسەر کەنار لە چاوەڕێی پەنابەرەکاندا خۆیان حەشاردابوو، گەر هەر ئاماژەیەکی پێزانینی ئینگلیزەکانیان بۆ هاتبا، ئاگادارینامەیان دەدایە کەشتییەکە.
لەو مـاوەیـەدا بنگۆریۆن چاوی بە پیاوێک کـەوت وەک ئـەوەی لەنێو رۆمانە سەرِچڵیەکلاندا هاتبێ، وابوو.
ئۆردە وینگێیت Orde Wingate ئەوکات بە لۆرانسی جودا ناو دەبـردرا، لە سەرەتای لاوێتیدا متوی عەرەبان ببوو، حەزی لێبوو زمانی رۆڵەکانی بیابان فێرببێ.

ئەو نە مامۆستای گرت و نە ڕێزمانە کتێبێکیشی کڕی، بەڵکو سۆراخی ئێست ئێندی لەندەنی Londen East End کە زۆر عەرەبی لێدەژیان کرد. لەوێ ژوورێکی بەکریگرت، بە چەندان هەفتە لەوێ ژیا، ویستی وەک عەرەبان بیربکاتەوە و وەک ئەوانیش بدوێ.
سالێک دواتر بە پلەی ئەفسەری هەواڵگریی لەگەڵ لەشکری بەریتانیدا نێردرایە ئۆرشەلیم. لەوێ هەرزو بە پێی ڕاژەکە فێری ژیانی کیبۆتنشینی و زمانی عیبریش بوو.
لە سەرتادا پیاوانی هاگانا لێی بە گومان بوون، بەڵام لە دواییدا توانی متمانەیان بەدەستبێنی. وینگێیت شێوەچارەیەکی پەرەپێدا تا نشینگە جوەکان لە بەسەرددانی کتوپڕیانەی عەرەبەکان بپارێزێ. بەشەو لەگەڵ دەستەیەکی جولەکاندا دەچووە سەر گوندێکی عەرەبان، لەخالّی ئێشگریان دەردەچوون، بەدوای شوێنی حەشاردانی چەک و تەقەمەنیدا دەگەڕان. چەکەکانیان دەدزین و جبەخانەکەشیان دەتەقاندەوە، ئیدی دەستەکە لەبن دەستکەوتی زۆردا نقەیان دەهات و دەگەڕانەوە، ئەوەی بۆیان هەگلێرابا لەگەڵ خۆیاندا دەهێنا.
وینگێیت جوەکانی فێری ئەوەش کرد چۆن بە ماتۆڕسوارییەوە لولە نەوتییەکانی موسل–حەیفا لە دەست پەلاماری عەرەبان بپارێزن. لە ڕاستیدا ئەو بیچمێکی ئەفسانەیی بوو؛ هەر لە منداڵیەوە خۆشەویستێکی زۆری بۆ کۆنە تێستامێنت هەبوو، بەهۆی ناسینی لاوانی کیبۆتنشین و مەشقپێدانیان لەسەر زاڵبوون بەسەر دوژمنەکەیاندا، زمانی عیبری لا شیرین ببوو. لە سەرەتادا بنگۆریۆن وینگێتی پێ پیاوێکی خراپ بوو بەڵام دواتر ڕێزیکی زۆری لێنا و جارێکیشیان بە ئاشکراش لەسەر ڕێکخستنی دەستەی شەوانەدا بە شانوباڵیدا هەڵدا.
لە هەفتەی یەکەمی فیبرایری ١٩٣٩دا ئینگلیزەکان ژاوەژاوێکی زۆریان نایەوە، گوایە لە کۆشکی سنت جێمس St.Jamespaleisی لەندەندا کۆنفڕانسیک بە بەشداری خۆیان و عەرەب و جولەکە دەبەستن.
گرفتی یەکەم ئەوەبوو عەرەبەکان ئامادە نەبوون بەهەمان ئەو دەرگایەی جولەکەی پێدا دەڕوا، هاتوچۆ بکەن. چونکە کۆشکەکە زۆر دەرگای هەبوون،هەرزو گرفتەکە چارەسەر کرا.
ئەنجا ئەوان نەیاندەویست لە ژورێکدا لەگەڵ جوەکان دابنیشن. ئەو کێشەیان لەویدیکە جاڕستر بوو. ئینگلیزەکان کۆنفڕانسێکی سیاسییانەیان سازدا بەڵام تیایدا هەردوو لایەنی بەشدار یەکیان لەم لاو ئەویدیکەشیان لەولا ...
هەر ئاواش ڕۆیشت؛ عەرەبەکان لە ژورێک و جوەکانیش لە ژورێکی دیکەدا، نوێنەرە بەریتانییەکانیش لە هەردولا؛ بۆیە لە یەککاتدا دوو کۆنفرانس بوون.
لە ڕاستیدا هەر لە سەرەتاوە ئاماژەی ئومێدبەخشی چارەسەری ئەو هەمو کێشە کەڵەکەبووە زۆرانەی لایەنە تەواو ناکۆکەکان خۆیان نەدا بەدەستەوە.
لەو بۆنە تایبەتیمەندەدا بنگۆریۆن وەک کارمەندێکی وایتهال Whitehall: چاکەتێک، پانتۆلێکی خەتدار، کراسێکی سپی و بۆینباخێکی لابۆری بەزت. ئەو بە شێوەیەک

لەگەڵ بەرامبەرەکەی کە بێباکانەتر بوو لەوەی لە تەلئەبیب لەگەڵ هاورەگەزەکانی دەپەیڤی، جوڵایەوە.

«سڕکردنی کۆچی جولەکان بەبێ یارمەتی سەرەنیزەی بەریتانییەکان ئەستەمە».

عەرەبەکان داخواز بوون: ڕێگا بە تاکە جولەکەیەکیش نەدرێ بێتە فەلەستین، ماندات هەڵبگیرێ، فەلەستینیش ببێتە یەک دەوڵەتی عەرەبی و بەریتانییەکانیش بکشێنەوە.

بنگۆریۆن و وایزمەنیش تەنها داوای مۆڵەتدانی بنیاتنانی ماڵێکی نیشتمانییان بەگوێرەی گیانی مانداتەکە دەکرد، بایی پێویستیش مۆڵەتنامەی کۆچبەرەکان بدرێ تا ئە جوانەی ئاورۆپا کە لە بارێکی ناچاریدان بهێندرێنە فەلەستین.

بە ددانبەخۆداگرتن و دیپلۆماسیەوە لە دواییدا ئینگلیزەکان توانیان هەردولا لەیەک ژوردا کۆبکەنەوە، بەڵام عەرەبەکان مەرجێکیان دانا؛ نابێ ئەو بەیەکەوە دانیشتنە وا لێکبدرێتەوە گوایە عەرەبەکان ددان بە ئاژانسی جوەکان دادەنێن.

گفتوگۆکان مانگ و نیوێکی خایاند بێ ئەوەی هیچ لایەکیان بە مو بۆ ئەوی دیکە دابنوێنی.

لە ئازاردا چیکۆسلۆڤاکیا کەوتە بەرپێی نازییەکان. کەچی لە کۆشکی سنت جێمسدا هێشتا هەر گەرمەی گفتوگۆ بوو.

ڕۆژێکیان لە وەزارەتی کاروباری کۆلۆنەکانی بەریتانیادا هەڵەیەکی بچوک کرا. زەرفێکی قەبە و ئەستوری زۆر فەرمییانە بۆ دکتۆر وایزمەن هات. ئەویش زەرفەکەی وەرگرت و چووە سویتەکەی خۆی. زەرفەکە کۆنسێپتی کتێبی سپی تێدابوو کە حکومەتی بەریتانیا دەیویست چاپ و بڵاوی بکاتەوە. ئەو دانەیان دیاربوو بۆ سەرکردەی عەرەبەکان نەوەک بۆ نێردەی جوەکان دانرابوو. (بەڵام ئەو هەڵەیە چۆن کراو درایە دەست وایزمەن، تائێستاش روننەبۆتەوە.) بەریتانییەکان دەیانەویست لە ئێستاوە لەوە دڵنیابن ئاخۆ عەرەبەکان بەو پێشنیازە رازی دەبن.

وایزمەنیش بە سەرسوڕمانەوە بەڵگەنامەکەی خوێندەوە، دواتر نیشانی بنگۆریۆن و باقی ئەندامانی نێردەی خۆیانی دا.

ئیدی ئەوان بۆیان دەرکەوت کە هیچ چارەسەریەک لە گۆڕێدا نیە. دوو مانگ دوای ئەوەی کۆنفرانسەکەی کۆشکی سنت جێمس تەواو بوو، حکومەتی بەریتانی کتێبی سپی کە لە روی کارگێڕیەوە بە فەرمانی ٦٠١٩ ناسراوە، بڵاوکردەوە. تیایدا هاتبوو؛ لە ماوەی پێنج ساڵی داهاتوودا ساڵانە ڕێگە تەنها بە پانزەهەزار کۆچبەری جو بۆ فەلەستین دەدرێ. دواتر نابێ هیچ کۆچبەرێکی دیکە لە وڵات جێگیر ببێ مەگەر دەسەڵاتدارە عەرەبەکان رازی بن. ئیدی بەمجۆرە جووەکان هەمیشە هەر بە کەمینە دەمێننەوە، کەواتە جوەکان سێیەکی دانیشتوان رەنگبێ دواتر ببنە پێنجیەکی سەرتاپای دانیشتوانی فەلەستین. بێجگە لە دەڤەرێک زیاتر، جو بۆیان نیە لە فەلەستیندا زەوی بکڕن. حکومەتی بەریتانیاش هەمو هەوڵێکی خۆی دەخاتەگەڕ تا لەماوەی ئەو دە ساڵەی دادێدا دەوڵەتێکی عەرەبان بێنێتە پێشەوە.

فەرمانی ٦٠١٩ لە هەمو خاڵەکانیدا واتای پیشێلکردنی ماندانی کۆمەڵەی نەتەوەکانی دەگەیاند. لەو کاتەیدا کۆمەڵەی نەتەوەکان بەریتانیای گەورەی راسپاردبوو، یارمەتی نیشتەجێبوونی جولەکان بدا، بەریتانییەکان کۆسپیان بۆ زەوی کڕین دادەنا. دەبوایە ئەوان کارئاسانیان بۆ تەوژمی کۆچی جولەکان کردبا، کەچی دەیانەویست کۆچەکە رابگرن. لەجیاتی ئەوەی فەلەستین ببێتەماڵێکی نیشتمانییانەی جولەکە، کەچی دەبووە دەوڵەتێکی عەرەبی.

فەرمانی ٦٠١٩ کۆتایی بە هیوای ملیۆنان جولەکەی ئاوروپادا هێنا، بۆ ئەوان تەنها ژوری گاز و سوتاندنیان لەپێش مابووەوە.

بە دەگمەن وابوو بەریتانیا هەنگاوێک بنێ ئەو تورەییەی لێبکەوێتەوە. نیڤیل چامبەرلاین Neville Chamberlain ئەوکات سەرەک وەزیران بوو. ئەو پیاوەی کە چەند مانگ جێی ئەوی دەگرتەوە ونستۆن چەرچل Winston Churchill بوو، سیاسەتەکی پێشخۆی بە «نابوتییەکی رەوشتی و فیزیکیانە و زەبرێکی کوشندە کە بەر گەلی جولەکان کەوت» وێناکرد.

پیاوێکی دیکە کە چەرچەل لە کابینەکەی خۆیدا نابوو، لەو بارەیەوە گوتی:

وشە نهێنییەکە «ئەوە بوو سەر بۆ عەرەب و موفتی دابنوێنن». بە هۆیەوە شوێنپێی خۆمان لەنێو عەرەب وجوەکان لە دەستدا.

لە تەلئەبیب و ئۆرشەلیمدا خۆپیشاندان سازدران، بەڵام هەرزو شەڕوهەرای لێکەوتەوە.

سێ مانگ دواتر کۆنگرەی بیست و یەکەمینی زایۆنزمەکان لە جنێڤ بەسترا؛ بێزاری و خەمگینی باڵی بەسەر کۆنگرەکەدا کێشابوو. لە هەمو لایەکی دنیادا چرایان بە ڕودا دەکوژانەوە. لە ئاوروپادا وڵات لە دوای وڵات دەرگەیان لەسەر دادەخسترا. دەرگای فەلەستین بە ئاستەم کرابووەوە. حکومەتی بەریتانیا پەیمانشکێنی کرد و قسەی خۆی خواردەوە. تۆ بڵێی هیوا لە قوژبنێکدا مابێ؟

وایزمەن ئەو پیاوەی هەمیشە ئامۆژگاری دەکردن کە بڕوایان بە ئینگلیزەکان بێ، هەنوکە هیچی وای پێنەمابوو.

بنگۆریۆن رایگەیاند کە بە قاچاخ پەنابەرهێنان تاکە دەرەتانە.

رابی سیلڤەر Silver دژی ئەو دەربڕینە وەستا و داوای رێگەچارەیەکی هۆشمەندانەتری کرد.

لەو ساتەدا بێرل کاتزینسلۆن کە لەلای زۆریان بە باوکی کۆچی قاچاخ دەناسرا، هاتە پێشەوە، دوا دوانی بایەخداری لە ژیانیدا دا.

بە زمانیکی بایبلیانە پەسنی ئەو گەنجە پاڵەوانانەی کرد کە هەرچەندە هێزی وشکانی، ئاوی و ئاسمانی ئینگلیز ئێشکگری چاودێری بەسەر وڵاتەوە دەکا، بەڵام توانیویانە جوە مەرگ بەسەرداسەپێنراوەکانی ئاوروپا لە تونی مەرگدا رزگار و ئاودیوی وڵاتیان بکەن. ئەو تیشکی خستە سەر بایەخی زێ بۆ گەلی جولەکە و رایگەیاند؛ رۆژێک دەبینێ کەشتیگەلی دەریای سپی ناوەڕاست کە لە هەرچوارلاوە هاتون، بەرەو وڵاتی پیرۆزەوە دێن. بەڵێ هەنوکە، بڕوام وایە کە کات درەنگ نیە

مرۆ گوێی لە گۆرانی بۆ دەریاوانەکانمان بێ و تەنانەت مرۆ گوێی لە درودەکانیشیان دەبێ کە بۆ خۆشگوزەرانی دەیخوێنن. کێ دەزانێ رەنگبێ لە سیناگۆگەکانی ئامریکادا نوێژیان بۆ بکرێ! (ئەوەش رکوکینەی بوو بەسەر رابی سیلڤەری داباراند.)

لەو کاتەی من لێرە وەستاوم، پێویستە بیر لە نوێژێکی زۆر باش بکەمەوە، نوێژ بۆ دەریاوانەکانی رابی ناخمان Nachman کە پێش شەشسەد ساڵ لە رێی دەریاوە دەستی بە کۆچبەرهێنان بۆ ئیسرائیل کرد، ئەو کاتیش کۆچ قەدەخە بوو. لەو نوێژەدا گیانە بەد و ترسناکەکان ناویان هات، بەڵام ئەو هیچی دەربارەی هێزی مارینز و بەلەمە گەڕۆکەکانیان نەدەزانی، هەروەها بە وێستگە ئێشکگرییە ئینگلیزی-عەرەبیەکانیشی نەدەزانی.

تۆ بڵێی لە شەرمی ئێمەماناندا هیچ جولەکەیەک نەمابێ، کە ئەو درودەی زێ بۆ ئێمە بخوێنی، ئایا کەس ئامادە نیە بۆ پاراستنی ژیانی دەریاوانەکانمان نوێژ بکا؟»

ئامادەبوان لەناخەوە بە هەژاوی گوێیاندەگرت؛ بنگۆریۆن رەنگبێ زیاتر لە ئەوانی دیکە لەژێر کاریگەری واژەکانیدا بووبێ. لە سۆنگەی پەیڤەکانی مامۆستادا، سەرنجی لەسەر زێ راگرت. ساڵیک دواتر ئەویش لە دوانێکیدا جەختی لەسەر زێ کردەوە و پەسنی قارەمانە دەریاوانە جوەکانی دا.

لەو کاتەی کۆنگرەی زایۆنیزمی لەسەر دانیشتنەکانی خۆی بەردەوام بوو، ئاڵمان و یەکێتی شۆرەوی رایانگەیاند کە بۆ ماوەی دە ساڵ پەیمانی دەست لەیەکنەدانیان واژۆ کردووە. هەمویان دەیانزانی کە شەڕ هەر دەقەومێ بۆیە بە پەلە کۆتاییان بە کۆنگرەکەیان هێنا.

وایزمەن گەڕایەوە سویتەکەی میوانخانە، نامەیەکی بۆ چامبەرلاینی سەرەک وەزیرانی بەریتانیا نووسی، لەدوا دێڕەکانیدا هاتبوو:

«ئاژانسی جولەکان لەو دواییانەدا بیروڕای لەگەڵ دەسەڵاتی ماندات جیاواز بوو. ئێمە پێمان وایە ئەو جیاوازییە دەبێ لە بەرامبەر بارێکی ناچار و گەورەتری ئەو رۆژگارەماندا بکەوێتە دواوە».

بنگۆریۆنیش رونکردنەوەیەکی دا کە تەنها یەک رستە بوو، بە هۆیەوە بە ساڵان گەلی جولەکەی پێژیا:

«ئێمە دژی کتێبی سپی دەوەستینەوە وەک ئەوەی شەڕ هەر نەبووبێ، شەڕیش دەکەین وەک ئەوەی کتێبە سپیەکە لە ئارادا نەبێ»

# بەشی
# (٧)

هەشت رۆژ دوای دەستپێکردنی جەنگ، بنگۆریۆن کەتنێکی دەرهەق ڕێنمایی و ڕێساکانی دەسەڵاتی ئینگلیزەکان لە فەلەستیندا کرد؛ بە نهێنی راوێژی لەگەڵ ئەفسەرەکانی سوپای ژێرزەمینی (نهێنی) هاگانا کرد. کەسانێکی زۆر لەنێو هاگانادا دوودڵ بوون و پێویستیشیان بە سەرکردە هەبوو. پیاوە پرچ سپییەکە بێ پێچوپەنا رایگەیاند کە دەبێ لە ئێستاوە لە دوو بەرەدا شەڕ بکەن. هۆشداری ئەوەشی پێدان کە نابێ «کاری دوژمنکارانە دژی ئینگلستان و گەلی ئینگلیز بکەن» بەڵام «لەگەڵ ئەو هەمو کۆتوبەندانەشدا دەبێ تەوژمی کۆچبەران زیاتر ببێ، کاری دەستپێکەکانیش وێڕای هەمو کۆسپ و تەگەرەیەک دەبێ بەرە و پێشەوە بڕوا».

ئەو رۆژە نیگایەکی پەیامبەرانەی هەبوو، گوتی؛

«ئێمە لە ئێوارەی روداوگەلێکی جیهان هەژێنداین، ئێمەش دەبێ حیسابی خۆمان بکەین ئاخۆ گەلەکەمان بە کامە ڕێگادا بەرین و بۆ چ جۆرە ئامانجێکیش تێبکۆشین. جەنگی جیهانیی یەکەم ئێمەی گەیاندە جاڕنامەی بلفۆر، جەنگی جیهانیی دوهەمیش دەبێ بمانگەیەنێتە دەوڵەتی جولەکان.»

لە راستیدا هیچ خێزانیکی جولەکە لە فەلەستیندا نەبوو کە بە سۆزو هەڵچونەوە پابەندی جەنگەکە نەبێ. وارشۆ بە بۆمبارانکردن خاپورکرا. نزیکەی هەمو جوێکی فەلەستین برادەر، خزم، ئەندامی نزیکی خانەوادەییان لە پۆلۆنیادا هەبوون. کیژی ئەبراهامی برای بنگۆریۆنیش لەگەڵ هاوسەر و منداڵەکانی لەوێدا دەژیان.

لەگەڵ تێپەڕبوونی رۆژو توند و گەرمبوونی بۆردومانەکان، خەڵک گومانی ئەوەی هەبوو کە لەوێ  هیچ کەس دەربازببێ.

بنگۆریۆن و هاوکارەکانی لە ئاژانسی جولەکاندا  رایانگەیاند هەرکەسێ  ئامادەیە لەو جەنگەدا پاڵپشتی ئینگلیزەکان بێ، با خۆبەخشانە ناوی خۆی تۆمار  بکا. لە ماوەیەکی زۆر کورتدا هەشتاو پێنج هەزار پیاو و پەنجا هەزار ژنی جولەکە خۆیان ناونوسکرد.

لە مانگی دەستپێکی جەنگەکەدا، دەبوایە چل و حەوت جولەکە لە بەردەم داداگای ئۆرشەلیمدا ئامادەبن؛ ئەوان بەوە تۆمەتبارکرابوون کە بەنهێنییەوە مەشقی سەربازیانەیان بینیوە. هەر چلو حەفت کەسەکە ئەندامی هاگانا بوون. پارێزەرانی هاگانا بەو ئاقارە داکۆکیان دەکرد کە ئەوان  بۆ ئینگلیزەکان چەکیان هەڵگرتووە تا

بتوانن لە ئاژاوەی عەرەبەکاندا بچنە پاڵ راژەی ئینگلیزەکانەوە. مەشقی ناقانونیانەی سەربازیشیان لە ژێر سەرپەرشتی ئەفسەرە ئینگلیزەکان و لەنێویشیاندا ئۆردە وینگێیت ئەنجام داوە، بۆیە ئەو چل و سێ کەسانە نە هیچ کارێکی قەدەخەیان کردووە و نە رەفتارێکی شەرانگێزیانەیان نواندووە.

ئەو بەڵگەوبەندانە هیچ کاریگەریان نەبوو. یەکێک لەو چل وسێ کەسە بە حوکمی زیندانی تاهەتایە و باقی ئەوانی دیکەش دەساڵیان بە تەنگەدا درا.

بنگۆریۆن داوای لە هەمو جولەکانی فەلەستین کرد تا لە رۆژی دواتردا بۆ ماوەی دوو سعاتان وەک نارەزاییەک مانبگرن.

لەو کاتەی کۆتوبەندەکان وایان لە جوەکان کرد لە ٩٥٪ی وڵاتدا نەتوانن زەوی بکڕن، بنگۆریۆن بڵاونامەیەکی (مانیفێست) واژۆ کرد، تیایدا ئەو ڕیکارە لەخۆگرەی ئینگلیزەکانی بە «سوکایەتییەکی نەپەژرێنراو» لە قەڵەمدا. لە کۆبوونەوەیەکی سەرکردە زایۆنزمەکاندا لە ئورشەلیمدا گوتی:

«قانونی زەویوزار بۆ ئەوە دەرچووە کە موفتی و باندە چەکدارییەکەی بکەنە برادەری خۆیان، ئاخر ئەدی هەوڵیشیان نەدا کە هیتلەر رازی بکەن.

(موفتی ئەو خەڵاتەی سێر هێربەرت ساموئیل بوو، دایە جولەکان؛ لەو ماوەیەدا بە ئاسانی لە نێوان رۆماو بەرلیندا دێت ودەچێ، ئەو بێشەرمانە بۆتە ماشێنێکی بە کرێگراو کە هەردوو دیکتاتۆرەکە بەکاری دەهێنن.)

هەشت مانگ دوای دەستپێکردنی شەڕ، بنگۆریۆن جانتای خۆی تێکنا و خۆشەویسترین کتێبی لە بنهەنگڵدا ناو بەرەو لەندەن کەوتەڕێ.

«من دەبێ هاوکاری وایزمەن بم بۆ پێکهێنانی لەشکری جولەکان» روی دەمی کردە هاوسەرەکەی و دلۆڤانانە گوتی: «هەوڵیش دەدەم بە زوترین کات بگەڕێمەوە.»

هەنوکە پاولا بنگۆریۆن لەسەر لە ماڵبوون و نەبوونی مێردەکەی راهاتووە، چونکە هاوسەرەکەی زۆر دەردەچوو. پاولا دەبێ زیاتر مشوری خۆی بخوا لەگەڵ خۆشەویستی دەوڵەتە لە دایک نەبووەکە ئاشنابێت. بیرۆکەکان ئەویان خستە سەر ئەوەی بازنە رەشەکان بهێنێرتە بەرچاوی خۆی، توشی ماوە زۆری بێخەوی کردبوو، تامی ئەو کەمە کاتە ئازادەی هەیبووی لێتێکدابوو.

هەرکاتێ بنگۆریۆن لە فەلەستین بووبایە، پاولا مشوری دەخوارد، خواردنی باشی بۆ ئامادە دەکرد، کارێکی وای دەکرد لە کاتی پشو و حەسانەوەیدا رێگر بێ لە بەردەم کەسانێک کە دەیانەویست لەگەڵیدا بدوێن. بە پێی لە هەندێ گەشتدا یاوەری بووە، بۆیە دەیزانی کە بچێتە دەرەوەی وڵات، کارەکەکانی وەک پێویست نارِوا. خەڵکانی دیکە کە هەواداری ئەون لە نیوەشەویشدا بێ، بێداری دەکەنەوە و لەگەڵی دەکەونە قسان. ئەو هەرگیز بیر لە خواردن ناکاتەوە، مەگەر یەکێک بە بیری بهێنێتەوە.

هەنوکە ئەو دەیەوەێ بچێتە لەندەن، رۆژ و شەویش نیە لەندەن لەلایەن فڕۆکەکانی ئاڵمانەوە بۆمباران نەکرێ.

لێ پاولا تەنها ئەو وشانەی بۆ مێردەکەی دەربڕین کە لە هەمو سەدە و لە هەمو زمانێکدا خۆشەویستی نێوان دوو هاوسەر دەگەیەنێ.

«دەبێ ئاگات لەخۆت بێ؟»
ئەوسا ئەو ڕۆیشت.
بنگۆریۆن لە کاتێکدا گەیشتە لەندەن کە ئینگلیزەکان توشی خراپترین شکستی مێژوییان ببووبن. لە فەڕانسادا بارودۆخەکە بێئومێد ببوو؛ بەلژیکا خۆی دابووەدەست. نۆسەد کەشتی کۆکراوە زیاتر لە ٣٠٠,٠٠٠ سەربازی ئینگلیز و فەڕەنسیان گواستەوە ئەودیوی نۆکەند (کەنال) تا بە هێواشتر خۆیان گورج بکەنەوە و شەڕەکە دەستپێبکەنەوە.
لە ساڵەکانی دواتردا، کاتێ کە بنگۆریۆن هانی گەلەکەی دەدا زۆر جاران کە باسی شکستی دەکرد، داونکەرکە (Duinkerken)ی بە نمونە دەهێنایەوە:
«بەڕێکەوت من لەوێ بووم و گەواهیدەرم... کشانەوە کارەستبارەکەی سوپای بەریتانیا لەو پارزەمینەدا چاوەڕیی کەشتیە لوکسەکانی وەک ماریای شاژن Queen Mary و ئەلیزابیسQueen Elizabethیـان نەکرد. سەربازەکان لە کەچەیی بەلەمەکانیان نەدەپرسی، بەلەمی پیس و بۆگەنی هەمو وڵاتیان کۆکربوونەوە بەڵکو ژیانی ئەو پاڵەوانانەی شەڕیان پێ بپارێزن. هەمو ئینگلیز شانازیان بە پاشەکشەی داونکەرکە دەکرد و حەقیشیان بوو.»
بنگۆریۆن ژورێکی سـادەی لە پەنسیۆنێک (میوانخانەیەکی خانەوادەییە لە ئاوڕوپادا-وەرگێڕ-)دا دەستکەوت. شوێنەکەی زۆر لە وێستگەی ترامی ژێرزەمینی سویسکۆتێیگ Swiss Cottage دوور نەبوو، هەروەها لە مەدام توسۆس نزیک بوو.
بارەگای ئاژانسی جولەکانیش لە خانوێکی سێ نهۆمی شەقامی گرییت روسەل Greet Russel streetەوە بوو کە بە بەلەکۆنێکی سەیر رازابـووەوە. لەوێ نوسینگۆکەیەکی مۆبیلیات سادەی لە نهۆمی دوهەمدا لە تەنیشت هۆڵی کۆنفڕانسەکاندا دەستکەوت. لە پەنجەرەوە سەربانی خانوەکانی بلۆمسبوری Bloomsbryو دوو درەختە هەڵچوەکانی شەقامی مۆنتێگو Montague Streetی لێوە دیار بوون.
لەندەنی ١٩٤٠ بۆ ژیانی بنگۆریۆن سەردەمێکی نوی و نامۆ بـوو. رەنگبێ گۆڕانەکان بەهۆی جەنگەوە بووبن، کە مەرگ و کاولکاری لە هەمو شەقامەکاندا چاند. رەنگبێ تەمەنی ئەویش رۆڵی خۆی تیایدا هەبووبێ؛ ئەو گەیشتبووە قۆناخێک کە مرۆ زۆرجاران خۆی لە ریڕەوێکی ئاسان دەبینێتەوە. بنگۆرین نزیکەی پەنجا و چوار ساڵ بوو. قژی تەواو سپی و تەنک ببوو. دەموچاوی کوریشکی تێکەوتبوو. ئەو لە جاران زیاتر ماندو دەبوو.
زۆر جاران لە نوسینگەکەی خۆی لە شەقامی گریت روسەل، بە چاونوقاوەیی سەری بەسەر خۆدا دەگرت نوقم دەبووە نێو دنیای هزرو ئەندێشەکانی. ئەو لە جاران داخراوتر و هەر سەری بەسەر بیرکردنەوەکانی خۆیدا دەگرت. زۆر جاران بە سعاتان وشەیەکی لە دەم نەدەهاتە دەرەوە.
کاتێکیش بۆمباران دەستی پێدەکردەوە دەبوایە خۆیان بخزاندبایە حەشارگە، کە لەوێ کەس نەیدەدی برادەرێکی دەیپرسی:

«ئەرێ بنگۆریۆن لە کوێیە؟»
سعاتێک دوای پەلاماری فڕۆکەکان هێور هێور دەگەڕایەوە باڵەخانەکە. کاتێکیش لێیان دەپرسی ئاخۆ لە کوێ بووە، بە هێواشی دەیگوت لە سینەمادا دانیشتبووم.
«ئەو سینەمایەی کەلە گۆشەی تۆتنهام کۆرت رۆد Tottenham court Road ە وەییە.»
ئایا فیلمەکە چی بوو؟
ئەو نەیدەزانی، چونکە چاوەکانی نوقاندبوون.
بەڵام کە چاوەکانی لەسەریەک دانابن ئەدی بۆچی چۆتە سینەما؟ لەبەر ئەوەی کورسییەکانی خۆش و فراوان بوون. بلیتی چوونە ژورەوە زۆر گران نەبوو، دەیتوانی بە هێمنی بیربکاتەوە.
کەسایەتی بنگۆریۆن لە لەندەنی ۱۹٤٠دا رەهەندی دیکەی وەرگرت. دەستی بە خوێندن و لێکۆڵینەوە کرد.
بارەگای بزوتنەوەی جولەکە لە مۆزەخانەی بەریتانییەوە نزیک بوو، لە کاتی ئاساییانەدا مۆزەخانەکە نمونەی هەمو کتێبێک کە لە ئینگلستان دەرچووبا لەگەڵ ژمارەیەکی زۆری دۆزراوە ئارکۆلۆجییەکان، تابلۆکان، دەستنوسەکان و گەنجینەی هونەری دیکەی تیدا بوو. بەڵام مخابن بنگۆریۆن نەیدەتوانی چێژیان لێوەربگرێ، چونکە دەرگاکانی داخرا بوون و بەربەستی خۆڵیشیان بۆ کردبوو. زۆرینەی گەنجینە هونەریەکان لەوێ لابردرابوون، لە ئەشکەوت و ژێرزەمیندا شاردراوبوونەوە و سەرەوەی حەشارگەکەشیان والێکردبوو کە نەناسرێنەوە.
لەو کاتەی دەرگای کتێبفرۆشی چارینگ کرۆس رۆد Charing Cross Road داخرابوو، بەڵام مرۆ لە شەقامۆکەیەکی بلۆمسبوریدا کارتۆن و جانتای بچوکی پر کتێبی لە بوار و بابەتە جۆراوجۆرەکاندا دەبینی.
لە سەرەتادا بنگۆریۆن لە دیرۆکی کۆلۆنیالی ئینگلیزی قوڵبووەوە، بە دوای ئەوەدا چوو، چۆن ئیمپراتۆریەتەکە پەرەی سەندووە. دوای یەک دوو مانگ یەکێک لە بڕیارە تایبەتمەندییە خێراییەکانی دا.
بە ئاشنایەکی ئاژانسی جولەکانی گوت؛ «لێکۆڵەنەوەکەم فێریکردم کە چۆن گەلێک تەنها لە ڕێی خەباتی خۆی بۆ ئازادی، سەربەخۆیی بەدەستدێنێ.»
کتێبفرۆشەکانی بلومسبوری هەر کاتێ سەرەسپییەکەی بنگۆریۆن دەردەکەوت، بە خەندەوە سەیریان دەکرد. ئەو زۆر نەدەدوا، بەڵام دەشیزانی چی دەوێ. هەندێک جاران کتێبفرۆش دەبووایە مانگێک بگەڕێ تا یارمەتی بداو کتێبەکەی بۆ بدۆزێتەوە کە بۆ دووەم جار چاپ نەکراوەتەوە.
لە ۱۹٥٨دا، واتە هەژدە ساڵ دواتر، نامەیەکی رەوانەی ئاژانسی جولەکان لە شەقامی گرییت روسل کرابوو، ئەو ناوەی لەسەر بوو:
بۆ بەڕێز بنگۆریۆن.
ئەوەش هەواڵە وەڵامێک بوو بۆ ئەو کتێبەی کە بنگۆریۆن لە ۱۹٤٠دا لە کتێبفرۆشێکی فەلەستینی داواکردبوو.

له کۆتاییدا کتێبەکە دۆزرایەوە، تیایدا واهاتبوو گەر بنگۆریۆن سەردانیان بکا دەتوانێ کتێبەکە ببا. دیار بوو کتێبفرۆشەکە سەرقاڵی کتێبە تۆز لەسەرنیشتووەکانی سەر رەفەکانی بوو، بواری ئەوەی نەبوو بزانێ کە بنگۆریۆن هەنوکە بۆتە سەرەک وەزیران و بچمێکی لە پێشەوەی جیهانیە و کە لە روبەرێکی زۆر دوری شەقامی گرییت روسل دەژیێ.

مانگێک دوای ئەوەی بنگۆریۆن گەیشتە لەندەن، رۆژانێکی نا ئاساییانەی بۆمباردمانی بەردەوامی لەندەن بوو. بۆمبێک لە خانوێکی نزیکی مۆزەخانەکە کەوت.

کاتێک بنگۆریۆن لە رۆژێکدا بە چەندان سعات لە بەر بۆمباردمانەکە ژێرزەمیندا دەبوایە بمابایەوە، بە پیاوێکی نزیک خۆی گوت:

«گەر کار وابڕوا، واباشە کەڵک لەو کاتەم وەربگرم  و خۆم فێرە زمانی گریکی بکەم»

«بەڵام بۆچی گریکی؟»

«دوای ئەوەی من مێژوی کۆلۆنیالیزمی ئینگلیزیم خوێندەوە، هاتمە سەر ئەو بڕوایەی کە بەختی ئیسڕائیل لە نێوچاوانی ئـەوەی ئێمە دەربـارەی کاروباری سەربازییەوە دەزانین، دیاردەکرێ.»

«بەڵام ئەمە چ پەیوەندییەکی بە زمانی گریکییەوە هەیە؟»

«ئاخر من دەمەوێ توسیدیدەس Thucydides (توسیدیدەس ٤٦٠-٤٠٠ پێش زایین، سەرکردەی سوپای ئەتیناو ستراتیژدانەر و مێژونوسێکی بەناوبانگی گریکی بوو-وەرگێر) بخوێنمەوە تا  فێری ستراتیژی سەربازییانە ببم.»

دواتر بنگۆریۆن رونکردنەوەیەکی دیکەی بۆ ئارەزووە نوێکەی دا. ئەو دەیەویست زیاتر لە بارەی ئەفلاتونەوە بزانێ(ئەفلاتون، فەیلەسوفی ناوداری گریک دەورووبەری ٤٢٧-٣٤٧ی پێش زایین) ئەو فەیلەسوفەی کە هەمیشە و زیاتر لە ئەوانی دیکەی پێکارانگاز بوو.

هەرچەندە فڕۆکەی نازیەکان زۆرجـاران ئاسمانی لەندەنیان تاریک دەکرد و مەرگیان لە شەقامە نزیکەکان دەچاند، بنگۆریۆن لە حەشارگەیەکی لەندەن لە ١٩٤٠دا سەرگەرمی لێکۆڵینەوەی بەرهەمە کلاسیکییەکانی گریک بوو. سەلیقە خێرا و تیژەکەی زۆری بەکەڵک هات. توانا زۆرەکەی وردبوونەوەش یارمەتیەکی باشی دا. بێگومان دڵە پەرۆشەکەی بۆ زیاتر زانیاری بەدەستهێنان لە خزمەتیدا بوو.

بە ڕاستی مایەی تێبینی بوو پیاوێکی وا هەرچەند دەچووە تەمەنەوە ئاسانترو زانیاری پەرۆشتر دەبوو.

بە رێزو پەرۆشییەوە ئاشنایەتی لەگەڵ بیردۆزەکانی ئەفلاتوندا پەیداکرد. چ دەوڵەت چ خودی مرۆڤیش بەهۆی تیۆرییەکانی لە بەدکرداریدا رزگار دەبن، نەخاسمە گەر هاتو فەیلەسوف فەرمانڕەوا یان فەرمانڕەوا فەیلەسوف بێ. هەڵبەت  بیرۆکەکانی ئەفلاتون لەگەڵ دەرس و وپەندەکانی پێغەمبەرانی ئیسڕائیل یەکیان نەدەگرتەوە، هەمیشە فێری ئەوەبوون کە نەوەک ئەو سەرکردە ئاستبەرزەکان و هەروەها گەلیش بە بیرۆکە سەرمەشقەکانی چاکە، هەق و خەمخۆری بەرزی دەکاتەوە نەوەک هۆشمەندی.

لەو ماوەیەدا بنگۆریۆن بووە بیرمەندێکی سەربەخۆ. پێش ئەو دەم سیاسەتوانێکی کارامە بوو، سەرکردەیەک بوو دەیزانی چۆن باندۆر بخاتە سەر نوێنەران، کۆنفرانسەکانی پارتەکەی خۆی جۆش دەدایەوە و سەرپەرشتی هەڵمەتەکانی دەکرد. لەمەو پاش نیگاکەی بەرفراوانتر دەبێ، وەک کابرایەکەی فرەڕەهەند و مشورخۆر، کە دەتوانێ سەبارەت بە فەلسەفەی گریک لەگەڵ گریکییەک بکەوێتە دەمەتەقێ یاخود لەگەڵ فەیلەسوفێک، هەروەها دەیتوانی لەسەر کێشە میتافیزیکییەکان لەگەڵ کەسانێک بکەوێتە گفتوگۆ کە مەیلی سیاسەتبازییان نییە.

لەو کاتەی بنگۆریۆن بە درایژایی ئەوساڵ لە لەندەن زیاتر لە جاران بیری چاکە و خراپە، هۆ و ئاکام، ژیان، یەزدان و نەمریی دەکردەوە، کەوتبووە ژێر کارانگازێتی سەرکردە جەنگییە مەزنەکانی ئینگلیزیش.

ئەوان لە شتگەلی کەمیاندا هاوبەش بوون، بنگۆریۆن سۆشیالیستێکی بەهرەمند زۆری حەز بە هاوڕێیەتی نەدەکرد. هەرچی وینستۆن چەرچلیش بوو سیاسەتوانێکی کۆنسەرڤاتیف، لەدایکبووی خانەوادەیەکی ناودارو دەوڵەمەندی مالبۆرۆس Malborough بوو، پیاوێک بوو خوێندنەکەی لە هارۆو Harrow وساندهورتس Sandhurts کە نمونەی ئەرستۆکراسیەتی ئینگلیزی بوو، تەواوکردبوو.

وینستۆن چەرچل نوێنەرایەتی بنەماگەلێکی سیاسیانەی وای دەکرد کە بنگۆریۆن کەیفی پێنەدەهات. بەڵام ئەو سەرکردەیەکی مەزن بوو، بنگۆریۆنیش شتی لێفێربوو. هەشت ساڵ دواتر ئەویش بە گەرمی پێویستی بە شتەکانی چەرچل بوونەوە، ئەو کاتەی دەبوایە گەلێک بهێنێتە جۆش کە چەکیان داری گەسک بوو، دەشبوایە بۆ مانەوەی خۆیان بجەنگابان.

بەداخەوە تەنها یەک خەسڵەت بنگۆریۆن نەیتوانی لە چەرچلی وەربگرێ، ئەویش سەلیقەی زەوقی سەرەک وەزیرانی ئینگلیز بوو. رەنگبێ ئەوەش مایەی لێتێگەیشتن بێ. چەرچل ئەوکات روبەروی تراژیدیایەک ببووەوە. بەڵام تراژیدیای بنگۆریۆن دووهەزار ساڵی تەمەن بوو، گیان و هەناوی ببوونە چەقی بازنەی تراژیدیاکە.

تایبەتمەندیەکی دیکەی بنگۆریۆنی نوێ لە ١٩٤٠دا ئەوەبوو؛ کە دەستی لە جگەرە کێشان هەڵگرت و نەچووەوە سەری. پێش ئەو کاتە بە بەردەوامی جگەرەی دەکێشان، رۆژانە شەست تا هەشتا جگەرەی دەکێشا. ئەو جگەرەکێشانی لەبەر باری تەندروستی یان دەستگرتنەوە بەلاوەنەنا، بەڵکو جگەرە فڕێدانەکەی تەنها پرسی بەسەرخۆدازاڵ بوون بوو.

«من چیدیکە نامەوێ کۆیلەی خوێک بم.»

لە نوسینگەکەیدا لە بلومسبوری بنگۆریۆن کاری لەسەر بەرنامەیەکی چوار خاڵیدا دەکرد: دەیویست کۆمەکی ئینگلیزەکان بکا لە هەوڵی شکستپێهینانی دوژمنەکەیاندا، هەوڵیدەدا رای گشتی جیهان بە باشی بەرەو لای جولەکان وەرگێرێ، ئەوپەڕی توانای بۆ پشتگیری قوربانییەکانی شەڕ تەرخانکرد و کاری بۆ خۆئامادەکردنی سەرهەڵدانی دەوڵەتی جولەکەش دەکرد، کە دەبوایە دوای شەڕوەستان سەرهەڵبداتەوە.

ئەو پێیوابوو دوای ئەوەی چەرچڵ جێگەی چامبرلاینی گرتەوە، ئیدی کتێبی سپێ

ناخوا. هیوای وابوو بڕوا بە چەرچل بهێنی کە واز لە هاگانا بێنێ و چیدی تەنگەتاو نەکرێن، بۆ ئەو مەبەستە ڕێنمایی نوێ بداتە دەسەڵاتدارانی فەلەستین تا نەخشەی جولەکە بۆ وشککردنەوەی زۆنگاوەکانی گالیلیا بپەژرێنێ، پەرە بە بەندەری تەلئەبیب بدا، لە هەموشیان لەپێشتر وا پێویستە دوو لەشکری جولەکە دابمەزرێن؛ یەکیان بۆ جوەکانی فەلەستین و دوهەمیشیان بۆ جوەکانی دیاسپۆرا.

بنگۆریۆن لەگەڵ وایزمەندا پلانەکەیان بردە وەزارەتی کاروباری کۆلۆنەکانی بەریتانیا، لەوێ زۆر بە ساردی پێشوازییان لێکرا. لۆرد لۆید Lord Lloyd بە بێزارییەوە پرسی؛

«ئەرێ گەر خەڵکی ئێوە بەراستی خەمی سەرکەوتنی ئینگلیزیان بێ، بۆچی ناچنە نێو ریزی سوپای ئینگلیزیەوە؟»

بنگۆریۆن بەخۆخواردنەوەیەکی توڕەییانە هاتە وەڵام:

«ئایا بۆچی ئەو پرسە لە فەڕەنسی یان چیکی یاخود پۆلۆنی ناکەی؟»

لۆرد لیۆد رایگەیاند «بەتالیۆنی جولەکان باری ئاستەنگیەکانی ئەوێمان سەربارتر دەکەن.» بنگۆریۆنیش پێیگوتەوە: «بە بڕوای من گەورەترین ئاستەنگ ئەوەیە کە ئێمە تائێستا ماوین.»

هەواڵەکانی شەڕ، ئەو رۆژە خراپ بوون. لەوانەیە لۆرد لیۆن هەر لە خەمی هەواڵەکاندا بووبێ. بۆیە تەنها بەیەک گوێی گوێیلێڕاگرتن. ئەوکات گوتی هەقە میوانەکانمان ئەوە بزانن کە بارودۆخی ئینگلستان چەند دژوارە. بنگۆریۆنیش بەرسڤی دایەوە:

«ئەوە بۆ تۆ ئەزمونێکی نوێیە کە روبەڕووی وێرانکردنێکی هەمەلایەنە دەبیتەوە. ئێمە نزیکەی دوو هەزار ساڵە دژی ئەو مەترسیە دەجەنگین.»

کاتێکیش بنگۆریۆن هیچی بەدەستنەهێنا، ویستی داوایەک بکا. تۆبڵێی ئینگلیزەکان ئامادەبن ئەو چل و سێ پیاوەی هاگانا کە بە تۆمەتێکی شەڕانگێزیانە تاوانبار کراون، ئازاد بکەن؟

لۆرد لیۆن تەنانەت ئەو داوایەشی بۆ جێبەجێنەکردن.

گەر وایزمەن و بنگۆریۆن وەک بنگۆریۆن بۆیچوو کۆمەکی ئینگلیزەکانیان لەو بارودۆخە شپرزەییەدا بکەن، ئەوا دەبێ هەردوکیان یان تەنها یەکێکیان بەپەلە بچێتە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئامریکا، قسە لەگەڵ جوەکانی نیویۆرکدا بکا و ئەوانیش بە رۆڵی خۆیان گوشار بخەنە سەر حکومەتی واشنتۆن تا رادەیەک بۆ بێلایەنی ئامریکا لە شەڕدا دابنێ.

وایزمەن بە لێکۆڵینەوە کیمیاییەکانی خۆیەوە کەبۆ شەڕەکە گرنگ بوو، سەرقاڵ بوو، بۆیە بنگۆریۆن هەگبەکەی هەڵگرت؛ ئەفلاتونی خستە گیرفانێکی پاڵتۆکەی و فەرهەنگی گریکیشی خستە گیرفانەکەی دیکە و بەرەو نیویۆرک بەڕێکەوت.

# بەشی

# (٨)

لە نیویۆرک ئەوەندە کاتی نەبوو تا بە ئەفلاتونەوە خەریکبێ.

بنگۆریۆن جێی لە میوانخانەیەکی سادە لە شەقامی ئیست سێڤنتین East Seventtienth Streetەوە گرت و دەستبەکار بوو.

خوشکی پاولا و منداڵەکانی ویستیان بانگهیشتی فراوینێکی خانەوادەییانەی بکەن. هەندێکی لەوە ئاگاداریان کردەوە، ئەوەی بێتە نیویۆرک، دەبێ سەرێکی شانۆی ئەوێ بدا. بەڵام ئەو زۆر سەرقاڵ بوو.

ساڵی ١٩٤١ دەستپێکرد وهەمو ئامریکاییەکان بە تایبەتیش جوەکانی ئامریکا هەر تامەزرۆی هەواڵی ناوەخۆ بوون. تۆ بڵێی ئێستا لە ئینگلستان چ روبدا؟ تۆبڵێی وەک باس دەکەن بۆمبارانی لەندەن توندتر نەبووبێ؟ تۆ بڵێی بەریتانیای گەورە تاسەر خۆی بگرێ؟ ئەدی تۆ بڵێی چی بەسەر جولەکەکانی سەر وشکانی ئاورپادا دێ؟

بنگۆریۆن ئاشنایەتی لەگەڵ جێمس فارلی James A. Farley پەیداکرد. فارلی لە هەڵبژاردنی سەرۆکایەتی دکتۆر رۆزڤێلت D. Rooseveltدا رۆڵیکی گرنگی گێڕابوو، هەروەها ویندل ویلکی Wendel Willki کە رۆزڤێلت بۆ جاری سێهەم سەرکەوت، خەریک بوو ئەو بە تەواوی بدۆڕێ، ناسی. بنگۆریۆن سیناتۆر رۆبەرت واگنەر Robert Wagner نمونە سەرمەشقی جوەکانی نیویۆرکیشی دیت. گفتوگۆی دورودرێژیشی لەگەڵ رابی ستیفان وایز Stephan Wiseڤ و لویس براندایس Louis D. Brandeis ئەندامی دەستەی باڵای دادگای وڵاتە یەکگرتووەکانی ئامریکادا کرد.

بنگۆریۆن قاتێکی وەرگرت و بۆینباخێکی رەشی بەست تا لەسەر شەرەفی مێزی فراوینی برایندایس دابنیشێ. ئەو زۆر کەشخە دیاربوو، هەستی بە خۆشی خۆی زیاتر دەکرد لەوەی کە بە پانتۆڵە خەتخەتەکەی هۆڵی کۆنفرانسی کۆشکی سنت جێمس لە لەندەن بوو.

ئەو لە کۆبوونەوەیەکی گەورەی هۆڵی کارینگی Carnegie دابەزیە سەر کتێبی سپی ئینگلیزەکان. سەرپەرشتی کۆبوونەوەیەکی هاداسا Hadassah شی کرد کە یەکێتی ژنە جوەکانی ئامریکا سازیان دابوو؛ لەوێدا گوتی:

«ئێمە پێویستە کۆمەکی بەریتانیای گەورە بکەین. لەسەرمان پێویستە لەشکرێکی جولەکە ساز بدەین، هەروەها لێرەش لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئامریکادا... لەو

رۆژگارەی ئێستاماندا هیچ کارێکی پیرۆزتر لە خەباتی لەناوبردنی هیتلەر ونازیزم دا نیە، لێ گەلۆ ئەوەش تەنها بە قسان ناکرێ.»

ئەو بەردەوام بوو لەسەر ئەرو تاکتیکەی بەخۆی دایاوبوو- شەڕ لە هەردوو بەرەدا بکرێ، یارمەتی بەریتانیای گەورە بدرێ، بەڵام هەمان ولاتیش ناچار بکرێ باشتر بیربکاتەوە. ئەوەش سەمای سەرپەتان بوو کە زۆریان لێی تێنەدەگەیشتن. بەهۆیەوە ئامریکاییەکان توشی سەرگەردانی هاتبوون.

سێ مانگ دواتر جارێکی دیکە بنگۆریۆن رۆیشتەوە. لە فەلەستیندا زۆریان پێویست پێ هەبوو، بەڵام کەشتییە ژێر دەریاییەکانی ئاڵمان چالاکتر ببوون، شوێنی لە فڕۆکە دەستنەکەوت بۆیە بەڕێی رۆژئادا بۆ باکور رۆیشت. لە نیوزلاندا New-iseland دا دیدارێکی دۆستانەی لەگەڵ پێتەر فراسەر Peter Fraserی سەرۆک وەزیراندا کرد.

کاتێک رێنانە Renana بەخێرهاتنی لێکرد لێیپرسی: «ئەرێ بەڕاستی گەشتێکت بە دەوری جیهاندا کرد؟»

کورە تاقانەکەی، ئامۆس هەنوکە بۆتە قەیرە و چوەتە ریزی سەربازیی ئینگلیزەکانەوە. ئەو رەنگبێ تا پلەی سەرهەنگ major(پلەیەکی سەربازی چوار ئەستێرە) بڕوات و لە بەرەی جیاجیاشەوە بجەنگێ.

گێولا دوا تاقیکردنەوەکانی لە گیمنازیوم ی هێرزلیا تەواوکردوون و بۆ مامۆستایەتی دەخوێنێ..

رۆژێکیان گیولا سعاتێک لە قوتابخانەکەی دواکەوت، کاتێکیش گەیشت بی هیچ قسەیەک، یەکسەر چووە سەر مێزەکەی. بەڵام مامۆستاکە بە پەستیەوە پێیگوت؛ «ئەرێ گێولا گەر ئەوەندە دوابکەوی، نابێ رونی بکەیەوە لە کوێ بووی، یان هەر هیچ نەبێ داوای لێبوردن بکەی.»

گێولا لەوەڵامدا گوتی: «پاساوێکی زۆر باشم بە دەستەوەیە کە بۆچی وەخراوم. من مێردم کردووە راستەوخۆش لەلای رابیەوە بۆ ئێرە گەڕاومەتەوە.»

پاولا بە دیتنەوەی مێردەکەی شادمان بوو. پاولا زۆر خەمی کەشتییە ژێر دەریایەکان و .. دەخوارد.

«ئەرێ خوشکم لە نیویۆرک چۆن بوو؟ منداڵەکانی چۆن بوون؟ ئایا سەری بروکلینت دا؟»

ژابۆتینسکی مردبوو.

کاتزێنلسۆن بە دەردی لەشساخیەوە ئالودە ببوو.

ئابراهام ستێرن Abraham Sterenکە یەکێک بوو لە دامەزرێنەرانی رێکخراوەکە، ئاگربەستی لەگەڵ ئینگلیزەکان شکاندبوو، رێکخراوێکی تیرۆرستی نوێی بە ناوی دەستەی ئەستێرە Steren Group پێکهێنابوو. لایەنگرانی نەوەک هەر شەڕی پارتیزانیان دژی ئینگلیز وعەرەبەکاندا دەکرد، بەڵکو لەوەشیان تێپەڕاندبوو: بۆ ئەوەی پارەیان بکەوێتە دەست، بە نوێژی نیوەڕۆیەک بەسەر بانکێکی تەلئەبیبیان دادا. لە بانکەکەدا بیست هەزار دۆلاری ئامریکاییان برد، هەمولایەکیش دەیزانی بانکەکە بە

سەرمایەی جولەکەکان کەوتۆتەگەڕ.
جموجۆڵی کار و چالاکی لە فەلەستیندا لەوپەڕیدابوو. هەمو لایەک تەژی سەربازی هاوپەیمانان بوو. بەریتانیای گەورە داوای لە ئاژانسی جولەکان کردبوو کە هەزار و دووسەد پسپۆڕیان بۆ ئامادە بکا تا لە دەرەوەی فەلەستین بیانخاتە راژەی خۆیانەوە. هەر یەکسەر پانزە هەزار خۆبەخش خۆیان ناونوسکرد. دوو هەزار کارگەی جولەکان بە شەو بە ڕۆژ کاریان لەسەر بەرهەمهێنانی کاڵای جەنگ بۆ ئینگلیزەکان دەکرد، هەمو شتێکیان بەرهەم دەهێنا؛ کەلوپەلی نەشتەرگەری تا قاچ و دەست و ئەندامی دەستکرد. لێکۆڵەرەوە زانستیە جوەکانیش کاریان لە فابریکە کەمەکانی داودەرماندا دەکرد.
دوای کەمتر لە پێنج مانگی گەیشتنەوەی بۆماڵ، جارێکی دیکە گەشتەکانی دەستپێکردنەوە، ئەمجارەیان روە و قاهیرە، لەندەن و نیویۆرک.
میوانخانەی بیلتیمۆر Biltmore بۆ خەڵکی جۆراوجۆر رەهەندی جیاجیای دەگەیاند. بۆ ئاکنجیانی نیویۆرکیش میوانخانەیەکی گۆشەیەکی گەڕەکی مادیسۆن Madison Avenueو شەقامی ٤٣ بوو.
بۆ دانیشتوانی فەلەستینیش داڕسانێکی بەرامبەر ئینگلیزەکان بوو.
بۆ بنگۆریۆنیش دەستپێکی قۆناخێکی دژوار و نوێ بوو.
لە ئایاری ١٩٤٢دا لەلایەن کۆمیتەی تایبەتی ئامریکی بۆ کاروباری زایۆنی کۆنفرانسێک لە میوانخانەی بیلمۆر بەسترا. لەهەمو لایەکی ئامریکاوە شەشسەد نوێنەر هاتن، کە نوێنەرایەتی هەمو کایە سیاسیەکانیان دەکرد. لە نێویاندا زۆر لە جوە بەرچاوەکانی ئاوڕوپا جێیان گرتبوو، کە زۆر نابێ داوای مافی پەنابەرێتیان لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئامریکادا کردبوو.
لە ١٩٤١دا هیچ کۆنفرانسێکی زایۆنیزمی سازنەدرابوو؛ بارودۆخی شەڕ کارێکی وایکرد کە لە ١٩٤٣شدا ئاستەنگ بێ زایۆنیزمەکان کۆنگرەی ساڵانەیان سازبدەن؛ بۆیە ئەو کۆنفرانسەی بیلتیمۆری بێ دەسەڵاتی بریاردانی فەرمانبەردار بەسترا. هەر شتێک کە لە کۆنفڕانسەکە بڕیارێ لێبدرێ پێویستە لە لایەن رێکخراوی نوێنەرەکانەوە دواتر بپەژرێندرێ.
بەڵام بنگۆریۆن پێشوەچوونی دەبینی.
تەنانەت گەر هاوپەیمانانیش سەربکەون، ئەوا بەریتانیای گەورە دەبێتە هێزی پلە دوو، ئیدی دەەرفەتێکی باش لەدەستدایە کە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئامریکا ناچار بکرێ رکێفی سیاسەتی جیهان بگرێتە دەست.
جەنگەکە گۆڕانکاری زیاتر لەگەڵ خۆیدا دەهێنێ. گەر ساڵیک بۆ دوادە بگەڕێینەوە دەمانبینی کە جوە ئاکنجییەکانی ئاورووپا دوو ئەوەندەی ئامریکا دەبوون. کاتێکیش ئەو دەنگۆیەی لە ئاڵمان و پۆلۆنیاوە دێ، راست بێ، کەواتە لە ماوەیەکی کەمدا دەبینین رێژەی جو لە جیهانی نوێ بەرامبەر هی کۆن (مەبەست جیهانی نوێ ئامریکایە-وەرگێڕ) زیاتردەبێ. ئەوسا ئامریکا و جوەکانی ئامریکا لەبەر دوو هۆ لەجاران بایەخدارتر دەبن.

ڕەخنەگرانی بنگۆریۆن زۆر جارانیان بە هەلپەرست لەقەڵەم دەدا. گەر مەبەستیان لەوە بووبێ کە ئەو دەیزانی چۆن خۆی لەگەڵ بارودۆخی گۆڕانکارییەکان بگونجێنی بەڵی وابوو، بنگۆریۆن هەلپەرست بوو.

پێنج مانگ پێشتر تەواوی ئامریکا گوێی لەبەر زەبری بەندەری پیرل Pearl Harbor کەڕبوو.

زایۆنستەکانی ئامریکا هیشتا لە کتێبە سپییەکەی بەریتانیا توڕە بوون.

هەواڵی دڕندانەی ژوری گازخنکێن وسوتاندن دزەیانکرد. بۆیە بنگۆریۆن بڕیاریدا کە ساتی ئەوە هاتوە هەڵوێست دژی «سیاسەتی بەرەبەرە» بگیردرێتە بەر و سیاسەتی رۆشنی و تەیاربوونی زایۆنزمیانە جێبگرێتەوە. ئیدی ئەوە ئەو ساتە بوو کە لەسەر هەمو جوەکان پێویستە بە جدی بۆ راگەیەنراوی بلفۆر هەوڵبدرێ و لەگەڵیدا بەڵێنەکانی کۆمەڵەی نەتەوەکان و ماندات بهێندرێنە جێ.

بێگومان ئەو نەخشەیەی توشی بەربەرستی نەیارانی کردەوە.

دکتۆر وایزمەنی نەرمونیان، لیبرالی هەستیار پێشەنگی نەرمڕەوی، کە هەمیشە بڕوای بە پیاوەتی دوژمنەکانی هەبوو، بەرامبەر ئەو نەخشە نوێیە پەلاماردەرە وەستایەوە.

زۆر لە ئەندامانی پارتەکەی خودی بنگۆریۆنیش لەگەڵ سەرکردەکەیاندا هاوڕا نەبوون. دکتۆر جودا ماگنێس D. Judah Magnes کە لە ئامریکا دایکبووە و بەڕێوبەرێکی لێهاتووی زانکۆی عیبری بوو لایەنگری دەوڵەتێکی دوانەیی عەرەب وجولەکان بوو. هێنریتا سۆلد Henrietta Szold ئەویش لە دایکبووی ئامریکا بوو، دامەزرێنەری هاداسا بوو کە لە ئۆرشەلیم نەخۆشخانەیەکی گەورەی دامەزراندبوو، هاوهەڵوێستی ماگنێس بوو، بەمەش باندۆری خۆی هەبوو تەنانەت لەنێو غەیرە زایۆنی و غەیرە جوەکانیش.

لەو کەشەدا کۆنفرانسی بیلتیمۆر بەسترا کە بنگۆریۆن ویستی بانگی دەوڵەتی جولەکان هەڵدا.

هەندێکیان رایانگەیاند گوایە بنگۆریۆن شێت بووە.

گەر هاتو نەتوانێ شەشسەد نوێنەر بهێنێتە سەر هەڵوێسەتەکەی خۆی، رەنگبێ دەست لە سەرکردایەتی خۆی بشوا، لەوەش گرنگتر لەوانەیە خەونەکەی دوای چەند ساڵی دیکە بێتەدی. بەڵام بیرەوەری ئەوەی لۆرد مین Lord Moyne کە مانگێک پێشتر پێیگوتبوو، زیاتر دنەیدەدا. لۆرد لیۆد مرد و مۆینە جێگای ئەوەی وەک وەزیری کاروباری کۆلۆنەکان گرتەوە. بنگۆریۆن لە لەندەن سەردانی کرد بەڵکو دامەزراندنی لەشکری جولەکانی پێبسەلمێنێ. لە درێژەی قسەکانیاندا وەزیری کاروباری کۆلۆنەکان چارەسەریەکی بۆ پرسی جوەکان هێنایە گۆڕێ، بەوەی «پارچە زەوییەکیان» پێبدرێ. بەڕای وەزیر شوینەکە بکەوێتە ئاوڕوپا (بەڵام نەیگوت لەکوێ) کە نمونە بێ بۆ گێتۆیەک(ئۆردوگایەکی گەورە) و لەلایەن جوێکەوە بەڕێوە ببردرێ، دوای شەڕیش بمێنێتەوە.

کاتێک بنگۆریۆن باسی «سێ ملیۆن کەسی» بۆ دەکرد، لۆرد مۆین بابەتەکەی بۆ

شتێکی دیکە گۆڕی.
کاتێ ئەو پیاوە بچکۆلەیە بە قژە لولە سپی زیوینەکەی هاتە سەر سەکۆی دوانی کۆنفرانسەکە، لای خۆی توند دەستی بەوە گرتبوو کە دەبێ ئەو شەشسەد نێردەیە بهێنێتە سەر بڕوای خۆی. ئەو لە تەلی سۆزی نەدان، بەڵکو کردەییانە وەک کەسێک شتێک رونبکاتەوە، لێتێگەیشتن بۆ شتێک بخوازێ و روحیانە جۆشیان بدا، وایکرد. تۆنی دەنگی مامۆستایانە بوو، تۆنی دەنگی هی پیاوێک بوو کە نەوەک هەر دەیەوێ هەر دڵەکانیان کێشبکا بەڵکو گیانیشیان بۆلای خۆ رابکێشێ.
لەدەستپێکی دوانەکەیدا بە رونیکردەوەیەک کە بەختی جولەکەکانی ئاوڕوپا کۆتایی بەو پرسە نایەکانگیرە هێنا ئاخۆ زایۆنیزم بیرۆکەیەکی ئاینیانەیە یان سیاسییانە، کەشی کۆنفرانسەکەی پاککردەوە.
کاتێکیش بە هێورەیی و بە ددانبەخۆداگرتنەوە کە ئاخۆ تائێستا ئیسرائیلی هاوچەرخ بەچی گەیشتووە. ئەو چەند دۆنمە زەوییەی کە بەراوردکراون. ئەو زۆنگاوانەی کە وشک کراونەتەوە. ئەو دۆنمە زەویانەی کە بۆ کۆچبەران دانراون. ئەو دەربارەی نەقەب، گالیلیا، دەربارەی لمی بیابانی ریشۆن Rishon، بەردەکانی موسا، دەڤەرە گرداوییەکەی هانیتا Hanita و هولێهباسین Hulehbassn قسەیکرد.
ئەو لە قسەکانیدا پەلەی نەبوو. زۆری خایاندبوو تا ئەو گوتارەی بدا و هەمو ژیانی خۆی بۆ ساتەوەختێکی وا تەرخانکردبوو. مێژوی دوو هەزار ساڵە ئەوانی گەیاندۆتە ئەو کاتوساتە.
ئەو بنیامێنی Benjaminی تەبەریا، فارسەکان، دەسەڵاتدارە بێزەنتینیەکانی بەیاددا هێنانەوە. بە لەسەرخۆیی و ئاسانی، دواندەرەکە لە ١٩٤٢ەوە بۆ ناو سەدەی حەفتەم شۆربووەوە، گەڕایەوە سەردەمی ئێستای، جارێکی دیکە بۆ چاخی پێغەمبەرەکان چووووەوە.
تاکە برادەری راستەقینەی بنگۆریۆن، کاتزێنسلۆن لە ئۆرشەلم نەخۆش کەوتبوو. بەڵام بێئەوەی ناوی بهێنی پەسنی دا.
بە گوێی گوێگرەکانی دادا: «سەرچڵییە نوێیکەی جولەکە لە فەلەستیندا بە ئاراستەی زێدا کراوە. ئەو کەسانەی تەنها جوەکانی ئاوڕوۆپا وئامریکا دەناسن، رەنگبێ وابزانن کە بیرۆکەی دەریاوانیی جوەکان گوناح بێ.
«چل ساڵ بەرێ ئەو دیاردەیەش ئەستەم بوو کە جوەکان کاری کشتیار بکەن. بەڵام هەر کردیشیان.
«شەش ساڵ پێش ئێستا لە فەلەستیندا هیچ دەریاوانێکی جولەکە نەبوو، هەرچەندە بازرگانی ئەوبەری زێش بەتەواوی لەبندەستی جوەکان خۆیاندا بوو... هەنوکە کەشتیگەلی جولەکە بە کابتن و دەریاوانی جوەوە و دەریا جیهانییەکان تەیدەکەن.
«ئەوە تیرەیەکی عیبری زمان بوو کە تیروس Tyrus و سیدۆن Sidonیان دامەزراند، لەوێوە بناخەی دەسەڵاتداریتی قەڵەمڕەوی قرتاجە Carthaags لە سۆنگەی دەریاوانیەوە گەورە بوو.
«هەر دەریاوانە جوەکان بوون پێش ئەوەی ئۆرشەلیم بڕوخێ لە سەروی یافاوە

شەڕێکی خوێناویان کرد و زەبرێکی کوشندەیان لەرۆمانییەکاندا دا.
«تیروس و سیدۆن لەسەر گۆی زەوی نەماون. بەڵام پاشماوەی جوەکان ئەوانەی لە حەیفاوە دژی رۆمانییەکان جەنگان، هەر ماون. زۆریان گەڕاونەتەوە فەلەستین و زۆری دیکەش دەگەڕێنەوە. ئەوان وەک سەردەمی بەرێ زەویان وەبەرهێنا. هەروەها سواری دەریاش دەبن.
«فەلەستین وڵاتێکی بچوکە. بەڵام دوو زێیەکە بۆ ئیسرائیل، دەریای ناوەڕاست و دەریای سور، بە باشی دەرەقەت دێن کە دەریاوانە جولەکەکانمان و ماسیگرەکانمان مشوری ئەوە بخۆن وڵاتەکەمان بە بەردەوامی شوێنی لەنێو کۆمەڵگەی نەتەوە دەرییایەکاندا ببێتەوە.»
ئەوانە پەیڤی مامۆستا بوون کە کەمتر ئاوا بەرفراوان و تازەکرابونەوە.
نەخشەی بنگۆریۆن دواتر وەک بەرنامەی بێلتیمۆری لێهات، لەخۆیەوە زۆر سادە بوو.
١. کۆچێکی بێسنوری جولەکان لەژێر سەرپەرشتی ئاژانسی جولەکان.
٢. دامەزراندنی لەشکری جولەکە.
٣. دامەزراندنی کۆمۆنوێلسێکی جولەکان کە هەمو فەلەستین لەخۆبگرێ.
کاتێک بەرنامەکە گەیشتە سەر مێزەکەی وایزمەن، نیشانەی دەمارگرژی لێوەدەرکەوتن. ئایا بەرێکوپێکی هەڵسوکەوتیان کردووە«نەخشەکە لە کۆشکی سپی، داونگ ستریبت وکۆشکی بوکینگهامBuckingham دا دەبێتە مایەی نارەزایەتێکی توند.»
لێرە و لەوێ دژایەتی نەخەشەکە کرا. لە لۆبیەکانی هۆڵی جاوەڕوانیەکاندا دەنگ دژی بنگۆریۆن هەڵبڕدرا، ئەویش هەددادانی لەبەر هەڵگیرابوو ئۆپۆزسیۆنی بە هەند هەڵنەگرت. هەندێکیان ناوی بگنۆریۆنیان بە کەللەلەڕەق هێنا، ئەوانی دیکەش هێشتا دەربڕینی نادۆستانەتریان پێدەگوتەوە.
وردەکاری نەخشەکە زیرەکایەتیەکەی ئاشکراکرد. ئەو لەسەر ئەوە رژد بوو کە لە بڕیارەکەدا دەبێ وشەی کۆمۆنوێلسی جوەکان بەکاربهێندرێ.
نەیارانی پێیان وابوو : «بەڵام ئینگلیزەکان لێمان تێناگەن گەر هاتو کۆمۆنوێلس بەکار بهێنین، واباشترە بڵێین (دەوڵەت)» بنگۆریۆن بە خەندەوە؛ «گەر ئێمە بڵێین دەوڵەت، ئەوا ئامریکاییەکان بە هەڵە لێمان حاڵی دەبن. چونکە لە چاوی ئەوان دەوڵەت بەشێکە لە فیدرالیی. ئێمەش ئەو ئاقارەمان بەهیچ شێوەیەک ناوێ.»
مەبەستی بنگۆریۆن هاتەدی. ئەو هەر ئەوەی نەسەلماند کە کاریگەری زۆری هەیە و دەنگەکەی یەکلاکەرەوەیە، بەڵکو سەردەمێکی نوێشی بەدواداهات.
هەنوکە ئامریکا زلهێزێکە. گەر هاتو بەریتانیای گەورە بە شاشی لە جولەکان بگا، ئەوا کارەسات نیە.
ئێستا جیهان گوێلێبوو کە بنگۆریۆن بۆ چ ئامانجێک تێدەکۆشی. رەنگبێ کەمتر خۆشی لەخۆی ببینێ بەڵام بانگی دەوڵەتێکی جولەکانی راهێشت.
نەرمڕەوەکان بەناچاری بوونە کەمینە. دکتۆر وایزمەن هێشتا ساڵێکی دیکەش

رونکردنەوە دەداتە کۆمیتە هەر دەوڵەتمەدارە پیرەکەی بزوتنەوەکە دەمێنیتەوە، بەڵام ئەوەی لەو گەنجتر جڵەوی رابەرایەتی دەگرێتە دەست. بنگۆریۆن نزیکەی پەنجاو شەش ساڵانە. لە راستیدا خەریکە تازە کارنامەکەی برەو دەسێنێ.

کاتێک کۆنفرانسی بیلتیمۆر دوایی‌هات، دەبووایە نێردەکان بۆ رێکخراوە جۆربەجۆرەکانیان ئەوە رونبکەنەوە کە چ بڕیارێکیان داوە، ئەوکات دەنگی لەسەر دەدرێ. بنگۆریۆن لە ئێستاوە دڵنیابوو کە جوەکانی فەلەستین نەخشەکەی دەپەژرێنن. گەلۆ خۆ ئەوەش زۆر بە ئازار و ژان دەبێ گەر هاتو لە نیوەی رێگادا بەجێیان هێشت.

لە ئۆرشەلیمدا بە ئاستەم کاتی ئەوەی هەبوو هەگبەکەی تێکبنێ و دیارییەکانی بداتە پاولا و زارۆکەکان کە بۆی کڕیبوون. دوای ئەوەی گوێی لە رەوتی روداوەکان بوو بەلەز ئەمجارەیان ئەم گوندو ئەو گوند بۆ جگەرگۆشە روحیەکەی دەگەڕا. هەرگیز ئەو توانا و وزەیەی نەبووە، وەک ئەوە وابو جنۆکە دەستیان لێدابێ.

لەو ماوەیەدا لە ئامریکادا ریکخراو لە دوای رێکخراو دەنگیان لەسەر نەخشەکەدا دەدا. بڕیارەکە بە زۆرینەیەکی بەرچاو وەرگیرا. ئاخر خۆ هەمو جوەکانی ئامریکا زایۆنیست نەبوون، ئەوانەی دەنگیان دا هەمویان لەگەڵ بیرۆکەکانی بنگۆریۆن هاوڕا نەبوون، بەڵام لە ١٩٤٢دا زۆرینەی جوەکانی ئامریکا بە دڵ بیریان دەکردەوە؛ ئەوان جڵەویان بۆ حەزەکانیان شلکربوو، کۆمەکی قوربانیانی دەستی جەنگی هیتلەریان دەکرد. نەخشەکە خستنەروییکی توانستی بەیهێنانی پێبوو.

هێشتا بنگۆریۆن لەمێژ نەبووە گەڕابۆوە ولات، کە واشنتۆن، لەندەن و مۆسکۆ راگەیاندنێکی هاوبەشیان دا:

«لە هەمو ناوچەیەکی داگیرکراودا جولەکەکان بە شیوەیەکی زۆر هۆڤیانە بەرەو رۆژهەڵاتی ئاوروپا گواستراونەتەوە... لەوانەی گوازرانەوە هیچ سۆراخێکیان نەما... بێگاریان پێکردون و زۆریشیان هەر لەسەر کار لەناوچوون... زۆریان لەبرسان و سەرماندا مردن... کۆڕەوی گەورە.. توندوتیژیەکی دڕندانە.. سەدان هەزار ژن و پیاو منداڵی بێتاوان...»

کاتێکیش بنگۆریۆن لە هێدمەگرتنەکەی راست بووەوە، تراژیدیانە هاواریکرد:

«ئەرێ ئەی نەتەوە ئازادیخوازەکان، داکۆکیکارانی مافەکانی مرۆڤ، خەباتکارانی بەرزراگرتنی بنەماکانی دیموکراسی و مافەکانی مرۆڤ چیتان بەسەرهێناین؟

«ئەرێ چ تاوانێکتان دەرهەق گەلێکی بێوەی کرد، ئاخر تا مردن خوێنی لەبەردەچۆڕا و هیچیشی پێنەدەکرا، بێ ئەوەی دەستی هیچ یارمەتیەکی لەو بەدبەختیە و ناچارییەدا بۆ درێژ بکرێ، تەنها بە زمانی تۆڵە کە هی شەیتانەکان بوو لەگەڵیدا جوڵانەوە؟

«ئەرێ بۆچی شین و شەپۆرمان لەکەدار دەکەی و هیج وشەیەکی هاوخەمیمان بۆ دەرنابڕی، کە بە ملیۆنان لەخانەی نازیەکانی ئاوروپادا مەرگیان بە گوێدا چرپاندن؟

ئەرێ بۆچی چەکت نەدایە بەرگریکارەکانی گیتۆکانمان، کەچی چەکت دایە پارتیزان و خەباتگێرە نهێنییەکانی گەلانی دیکە؟

«ئەرێ بۆچی رۆژانە کە گوێت لە دەنگی کەللەسەری هەزاران منداڵانی جو بوو

که به دیوار و بنمیچەکان دەکەوت، کەچی قولماتێکیشت لێوەنەهات؟»
بنگۆریۆن ئەو بە تاونبارزانینانەی پەرچەکرداری تورەییەکەی نەبوون. ئەو مەبەستێکی هەبوو. کە لە دوا رستەدا رون دەبووە
«گەر هاتو لەدەسەڵاتتدا نەبێ کۆتایی بەو کوشتارگەیە بهێنی، ئەدی بۆچی رێگەمان پێنادەی تۆڵەی خوێنی ملیۆنان برای خۆمان بە دەستی خۆمان بکەینەوە، بە پەلە دەست بەچەک دژی نازیەکان شەڕ بکەین، وەک جولەکەیک لە نێو ریزی لەشکری جولەکەدا و لە ژێر ئاڵای جولەکەدا خەبات بکەین؟»
سێ مانگ دوای ئەوەی هێزەکانی هاوپەیمانان لە نۆکەندەکە پەڕینەوەو شەڕیان لە وشکانی پارزەمینی ئاوروپادا گەرمکرد، چەرچل لە ئەنجومەنی نوێنەراندا رایگەیاند:
«حکومەت داوانامەی ئاژانسی جولەکانی تا لە فەلەستین لەشکری جولەکە پێکبهێنن کە کارایانە پشکداری ئۆپەراسیۆنەکان دەبن، پەسندکرد .. لە راستیدا بۆمن مایەی رەوایە کە ئەو بەشە تایبەتمەندەی جولەکان کە رەگەزێک پێکدەهێنن، لەلایەن نازییەکانەوە ئازار و ئەشکەنجە دراون، وەک پێیکهاتوویێکی سەربەخۆ لە ریزەکانی چەکداریدا بەشداربن تا بەتەواوی شکست بە نازیەکان بهێنن.»
دیسان بنگۆریۆن نەبەردێکی جەنگە درێژخایەنەکەی بردەوە. ئەرێ دەستکەوتەکە پێنج ساڵی رەبەقی خایاند، لەو ماوەیەدا بە هەزاران کیلۆمەتری بۆ بەدەستهێنانی برِی، تا جیهان بهێنیتە سەر را.
ئیدی هەزاران جولەکەی کارا لە راژەی سەربازییانە چ لە فەلەستین یان سەدان هەزاری وڵاتەکانی دیکە دەتوانن گەر بیانەوێ بچنە ریزی لەشکری جولەکەوە و ئەستێرەی داود لە شانیان بدەن، ئەو دروشمەی کە هیتلەر جوەکانی ئاڵمانی وەک کەمینەیەکی سوک تەماشا دەکرد.
لە رۆژێکی ئابی ١٩٤٣دا دوو سەربازی بەریتانی لە کاتی دزینی چەک لە جبەخانەیەکی ئینگلیزیەوە گیران. پێواژۆی دادگاییەکە زیاتر لە مانگێکی خایاند. هەرچەندە هەواڵنێران بۆیان نەبوو لە دادگایی سەربازییدا ئامادە بن، بەڵام دەسەڵاتدارە ئینگلیزەکان بۆ ئەو بۆنە تایبەتمەندییە بانگهێشتی نوێنەرانی هەمو رۆژنامە، گۆڤار و ئێستگە رادیۆیەکانیان کردبوو. لەگەڵ ئەوەش کەمیان لەبەر نەبوونی فرۆکە دەیانتوانی بگەنە فەلەستین، بەڵام هەواڵنێرانی ئامریکاییان لە قاهیرەوە بە فرۆکە بۆ فەلەستین گواستنەوە. لە ڕاستیدا سکاڵانامەکە هەر دژی دوو سەربازەکان ستۆنەر Stonerو هاریس Harris نەبوو. بەڵکو داداگایەکە بۆ تەواوی جولەکانی فەلەستین بوو. نوێنەری رۆژنامەگەری بۆیە بانگهێشتکرابوون تا بە جیهانی نیشانبدەن ئاخۆ چ جۆرە داکۆکییەک لەخۆیان دەکەن. هاریس و ستۆمەر وەک دوو بابای هەژای گەنج تەماشادەکران کە لەلایەن دەوڵەمەندترین رێکخراوو لە هەمو رۆژهەڵاتی ناویندا کەتنی دزینی چەک و تەقەمەنیان پێکرابوو تا پێیان بفرۆشنەوە.
لە ١٩٤٣دا نهێنییەکی نێو جەماوەر بوو کە بازرگانییەکی گەرم بە چەکەوە دەکرێ. ئەو جبەخانە گەورانەی کەچ لەلایەن ئاس Asەوەو چ لەلایەن هاوپەیمانانەوە لە رۆژئاوای بیابانی میسرەوە جێهێڵرابوو، لە بازاڕی رەشدا بە نرخ و دەستکەوتی

زۆرەوە فرۆشران. هەمان شتیش سەبارەت بەو تفەنگ و تەقەمەنیانەی کە لە ئۆردوگا و حەشارگەی هاوپەیمانن رویدا، دزراو فرۆشران. دزەکان بە پلەی یەکەم عەرەبەکان بوون. کڕیارەکانیش بە پلەی یەکەم جوەکان بوون. هاگانا چەکی دەویست. گەر هاگانا چەک و تەقەمەنییەکانی نەکڕیبان، ئەوا عەرەبەکان دەیانبردن و لەوانەش بوو دژی جوەکانیان بەکارهێنابایەوە.

ئینگلیزەکان دەیانزانی کە هاگانا چەکدارە و چەکیشی بەکارهێناوە.

بۆ رزگارکردنی لوبنان ئینگلیزەکان داوای خۆبەخشە جوەکانیان کرد تا پالاوگە نەوتیەکانی شاری تریپۆلی Tripoli لوبنان بتەقیننەوە. بیست وسێ جولەکە خۆبەخشانە چوونەپێش. ئینگلیزەکان چەکیان نەبوو بیاندەنێ بۆیە دەبوایە چەکی خۆیان لەگەڵ خۆیان ببەن. هیچ کام لەو بیست و سێ کەسە جارێکی دیکە نەگەڕانەوە.

بەشداربوون لە کاری کۆماندۆیی هاگانادا بە چەکی خۆشیان نەبووە مایەی شەفاعەت بۆکردنیان لەوەی لە پێواژۆی دادگاکە بە تۆمەتی هەڵگرتنی چەکی قاچاخەوە تاوانبار نەکرێن.

لە کاتی پێواژۆی دادگاکردنی هاریس و ستۆنەردا بە فەرمی سەلماندییان کە پۆلیس داوای لە هەردوو سەربازەکە کردبوو لەو هەژدە وێنانەی خستنیانە بەردەستیان تاکو ئەو پیاوە بناسنەوە کە بە گوێرەی رونکردنەوەکەی خودی خۆیان لە چایخانەیەکی حەیفادا لەگەڵ سەرکردەیەکی جولەکان دانیشتبوو ئیشیان چەک ئاودیوکردن بوو.

پۆلیسەکان ئەمجارەیان وێنەیەکی بنگۆریۆنیان خستە نێو وێنەکان، ئەوسا یەکێک لە سەربازە تۆمەتبارکراوەکان گوتی:

«بەڵێ، ئەو پیاوە خۆی بوو!»

نە داواکارەکە و نە داکۆکیکارەکە پێیان سەیر نەبوو.

لە دواییدا سەرۆکایەتی دادگا لەسەر ئەوە رژد بوو کە ئاژانسی جولەکە سەرپەرشتی «دژوارترین و بەرفراوانترین باندی ئاودیوکردنی چەک»ی کردووە و هیستادروتییشی بەوە ناوهێنا کە «رێکخراوە نازییەکانمان بەبیردێنێتەوە»کە چەکیان لە سەربازانی هاوپەیمانانیان دەدزی».

بنگۆریۆن رەخنەی لە ئەوانەی تۆمەتباریان کردبوو گرت، گوتی ئەوان هەوڵی رێپێگرتنی بزوتنەوەی زایۆنیزمی دەدەن تا سیاسەتی کتێبی سپییان بەرەوا دابنێن.

بێرل کاتزێنسلۆن لە شەممەی هاوینی ١٩٤٤دا لێدانی فشاری خوێن مرد.

ئەوە گوترا گوایە کاتێک بنگۆریۆن بە هەواڵەکەی زانیبوو، کەوت و بۆ چەند سعاتێک لەهۆش خۆیچوو.

هەمو رۆژەکە زمانی لەگەڵ کەس نەکەوتە گەڕ.

وەک ئەوە وابوو کە بەشێک لە دڵی مردبێ.

رۆژی پاشتر ریڕەوی بە خاکسپاردنەکەی لە ئۆرشەلیم بۆ تەلئەبیب ماوەی حەفتا کیلۆمەتر، لەوێشەوە بۆ کینەرەت سەد و شەست کیلۆمەتر درێژەی کێشا. کینەرەت ئەو نشینگەیە بوو کە کاتزێنسلۆن وەک کرێکارێکی کەرتی کشتوکاڵی کاتێ هاتە فەلەستین ئیشی دەکرد.

هەینی رۆژێک پێش مردنی زێیڤ شاریف و تێدی کۆلێک یەکێک لە گەنجە سەرسامبووەکانی لە کینەرێت سەردانی سەرنوسەریان کردبوو لەوێش لەگەڵ دەستەیەکی زۆردا گفتوگۆیان کردبوو.

کاتزێنسلۆن گوتبووی: «من هەرگیز دەرفەتی ئەوەم نەبوو بەسەر هەستی حەزنەکردن لە گردبوونەوەی پڕ ئاپۆرەدا زاڵببم.»

چل و هەشت سعات دواتر ئاپۆرەی خەڵکی کە شتێکی دەگمەن بوو لە فەلەستیندا کۆبوونەوە، تا بەڕێزەوە بینێژن.

نزیکەی رۆژێکی رەبەقی خایاند تا بە نێو ئاپۆرەی خەڵکدا کەژاوەکەی بگەیەننە نشینگەکەی سەر گۆلی گالیلیا.

بنگۆریۆن دوای ئۆتۆمۆبێلی خانەوادەکەی کۆچکردوو لە یەکەمین ئۆتۆمۆبێل دابوو.

هەنوکە برادەرەکەی مرد. لەوانەیە ئەو تاقە برادەری بوبێ و، برادەری وەک ئەویش نابینێتەوە.

هەمو رۆژەکەی ئەو هەر هیچی نەگوت.

مامۆستاکە لە نێویاندا رۆیشت و کۆچی دوایی کرد.

دوو ساڵ دواتر هێشتا ماتەمینیەکەی هەر گەرم بوو. لە کۆبوونەوەیەکی ماپایدا، ئەو پارتەی کە لەگەڵ کاتزێنسلۆن دایمەزراندبوو گوتی:

«لێتان ناشارمەوە لەو ئێوارە هەرە دڵتەزێنەی کە داود هاکۆهن هەواڵی مەرگی بێرل کاتزێنسلۆمی پێڕاگەیاندم، کەوتومەتە بن باری ژانی کۆستێکی گران، ژانیکی زۆر، خەفەتێکی گازگرتوو. لەژێر ئەو بار گرانیەی خەم و خەفەتەدا تا دەمرم دەرناچم...»

# بەشی
# (٩)

هەمو کەسێک شتێکی لەساڵی ١٩٤٥دا بەبیرماوە. روداوەکانی ئەوساڵ گۆڕانیان بەسەر ژیانی نزیکەی هەمو خەڵکێکی ئەم گۆی زەمینەدا هێنا.

له ١٩٤٥دا فرانکلین رۆزڤلت مرد. گۆبلز و هیتلەر خۆیانکوشت. مۆسۆلینی گیرا و کوژرا. یەکەم، دوهەم و سێهەم بۆمبی ناوەکیش تەقێندرایەوە. له ئاوروپادا کۆتایی بە جەنگ هات. رێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان دامەزرا. ژاپۆن بەبێ مەرج خۆی بەدەستەوەدا. وینستۆن چەرچل لەلایەن دەنگدەرانەوە ناچارکرا واز له دەسەڵات بێنێ.

بۆ بنگۆریۆنیش ١٩٤٥ ساڵێک بوو، هۆی دیکەی بۆ یادکردنەوە هەبوو.

له مارتدا بە پشتگیری و هاندان و موبارەکبادی بەریتانیای گەورە (بەگوێرەی هەندێکیان بە پێداگرتنی خودی ئینگلیزەکانەوە) حەوت دانە دەوڵەتی عەرەبی بە کۆی رێژەی چل ملیۆن دانیشتوانیانەوە کۆمکاری عەرەبیان(الجامعة العربية) پێکهێنا. ئەوان تەنها مەرامێکیان هەبوو، ئەویش دەرکردنی فەرەنسیی و جولەکەکان بوو له رۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا. لەو کاتەی عەرەبەکان هەڵوەدای ئەوە بوون چۆن دوو ملیۆن دۆلار له ساڵی داهاتویاندا له بانگەشە خەرج بکەن، بنگۆریۆنێش له پاریسی ئازادکراودا سەرقاڵی کۆنفرانسێکی نهێنی بوو لەگەڵ سەرکردایەتی کۆمیتەی ئاودیوکردنی کۆچبەرانی مۆساد، کە قۆناخیکی دژواری بڕیبوو.

ئاژانەکانی مۆساد کە بەسەر حەوت وڵاتی ئاوروپاییدا بڵاوببوونەوە، داوایان له سەدوپەنجا هەزار جولەکەی ئاوروپاوە پێگەیشتبوو؛ تا زوە بیانگەیەننە فەلەستین. ئاژانەکان دەیانزانی کە هێشتا سەرەیایە. پێبەپێی رزگارکردنی بەشەکانی ئاوروپا لەلایەن هێزی هاوپەیمانانەوە ، زیاتر جولەکە دەردەکەون، کە خوازیارن هەرچی زووە کیشوەری ئاوروپا جێبهێڵن.

بنگۆریۆن له سەرکردەکانی مۆسادی پرسی:

«ئەرێ پێویستیتان بەچی هەیە؟»

«یەکێک بەرسڤی دایەوە: پێویستمان بە کەشتی هەیە.»

یەکێکی دیکەش هەڵی دایە و گوتی: «پێویستیمان بە پارەش هەیە.»

بە خەندەوە بنگۆریۆن تەماشای ئەو دەستە گەنجانەی دەوروبەری کرد. ئەرێ، ئەوانەن نمونەی جوە نوێیکان. باوکی زۆربەیانی دەناسی. هەندێک لەو گەنجانە له

کیبۆتەکانەوە لەدایک ببوون. ئەوان پێیان دەگوترا سابراییەکان، چونکە ئەوان هەروەک بەری درەختی کاکتوس تیژ و توندوبەند بوون. ئەوان لە لایەن هاگاناوە مەشقیان پێدرابوو. لەماوەی جەنگەکەدا جار لەسەر جار گیانیان لەسەر لەپی دەست دانابوو، ئەوان دزەیان کردبووە سنووری تەواو پارێزراوەوە و پێبەپێی ڕێگایان بەنهێنی لە لیواری دەریای سپی ناوەڕاستەوە دەبڕی، تا ئەگەر هیچ بەدبەختیان نەیەتەسەر ڕێ، چاوەڕوانی کەشتی قاچاخی کۆچبەران بکەن.

بێگومان هەڤاڵ بنگۆریۆن خۆت دەزانی گەر هاتو ئینگلیز و ئامریکاییەکان لە کۆتاییدا بوخنواد Buchenwald .. (ئەو ئۆردوگایە زۆرەملێیە بوو کە SSەکانی نازی لە ١٩٣٧دا بۆ جولەکەکانی ئاڵمانیان لە جەنگەڵێکی نزیک شاری وایمار Weimarەوە دروست کردبوو. ئۆردوگایەکە لە ١١ی نیسانی ١٩٤٥ لەلایەن لەشکری ئامریکاییەوە رزگار کرا-وەرگێر-).

پیرەمێرد گوتی «بەڵێ دەزانم»، زۆر کەس لە پاشملە بە بنگۆریۆنیان دەگوت پیرەمێرد. لەسەری رۆیشت و گوتی: «بەڵێ من دەزانم و بڕواش دەکەم، من کۆمەکتان دەکەم.»

نیسان ئەو مانگە بوو کە ئاڵمانەکان بە فەرمی خۆیانبەدەستەوەدا.

لە هەمو شارێکی فەلەستیندا خەڵک دارڕژانە سەر شەقام و شایلۆغانیان دابەست. لە کیبۆتەکان و گوندەکانیشدا ئاهەنگی خۆش گێڕدران.

وەک کردەی ئاساییانەی خۆی، بنگۆریۆن هەوڵی دا دیوەکەی دیکە ببینێ.

«ئاوڕوپا هەنوکە ئازاد بوو، ئەمما...»

«خەڵک دەڵێن کە قۆناخێکی نوێ داهات، تیایدا ئاشتی، ماف و ئازادییەکان باڵکێش دەبن..»

«بەڵام تۆبڵێێ کی  ئەمەمان بۆ زامن بکا، کە ئەوەی قەوما نەقەومێتەوە..؟»

«ئەوەی رویدا بە هیتلەر دەستی پێنەکردبوو. ئاخر ئەدی چۆن بزانین کە بەمەرگی ئەو کۆتایی  بەشتەکان دێ؟»

لە حوزەیراندا بنگۆریۆن چووە ئاوڕوپا تا بە چاوی خۆی شتەکان ببینێ. سەرەتا چووە بولگاریا. جوەکانی ئەوێ بە واتای وشە تەفروتونا کرابوون. ئەو دەموچاوگەلێکی دیتن کە هەگیز لە بیری نەچونەوە. بەتایبەتیش سەروسیمای ئەو منداڵانەی لە ڕاستیدا لەوە تێنەگەیشتبوون کە چیان بەسەرهاتبوو. ئەوان وایان لەوکرد کە خۆی وەک کەسێکی ناو ئەفسانەکان بێتە بەرچاو. هەوڵیدا دۆستانە لەگەڵیاندا بجوڵێتەوە. ئەوان لە هەندێ لەو وشە سلاڤیانە دەگەیشتن کە بنگۆریۆن دەریدەبڕین، بەڵام ئەوان رەق لە شوێنی خۆیاندا دەمان و دەترسان. ئەوان بە چاوی مۆڵلەقەوە بە دەموچاوە بەیکداقوپاوەکەیان تەماشای بنگۆریۆنیان دەکرد.

چەند مانگێک دواتر بنگۆریۆن سەبارەت بە چاوی زارۆکەکانی بولگاریای قسەیکرد.

ئەو لەوێ رۆیشت و چووە ئاڵمان.

ژەنەڕاڵ دویت ئایزنهاوەر Dwight Eisenhowerیش ئەوکات لەوێ دەسوڕایەوە،

بنگوریۆن بە سەرکردەی هێزە رزگارکارەکان ئاشنابوو. هەردووکیان هەرزو حەزیان بە چارەی یەکدیکرد.

بنگوریۆن لە نامەیەکیدا بۆ فەلەستین نوسی: «ئاڵمانی نازییەکان ئێستا وێرانەیە. دیسان گەلی جولەکە چووەوەوە سەر گۆڕی چەوسێنەرەکانی.»

هەروەها زیاتری لەو بارەیەوە نوسی:

«من لە ژیاندا ماوەکانی کۆڵیتە ژێرزەمینیەکانی ئاڵمانم دیتن. من سەردانی داخاو Dachaw و بێلسن Belsenم کرد. من ژوری گازم بینی کە رۆژ بە رۆژ جولەکەیان تیا دەخنکاندن. ئەوان بە ڕوتی دەبووایە بچنە ژورەوە، وەک ئەوەی دوشێک بکەن، نازییەکانیش بە تامەزرۆوە لە کونەکانەوە تەماشایان دەکرد ئاخۆ چۆن دوا دەماریان گرژ دەبێتەوە.

«من تونی مەرگی سوتاندنم دی، کە بە ملیۆنان جولەکەیان بە زیندویی تێدەئاخنین تا ببنە سوتماک. ئەو سێدارانەی بێلسنیشم دیتن کە لە هەمو جەژنێکی جولەکاندا چەندانێکیان لە قەنارە دەدان، لەو کاتەی ئەوانی دیکە دەبوایە ئەو سزا قیزەونانە ببینن کە بۆ کەسانیک ئامادەکرابوون گەر هاتباو بە خولەک لەسەر کاریان وەخرابان. من ئەو قوژبنانەم دیتن کە سەگی هاریان لێدانابوون، تاکو پەلاماری ئەو لاتوکەترانە بدەن کە لە ریزی جوەکان بەرەو کار یان گۆڕهەڵکەندن بەجێدەمان. من ئەو دار و دیوارانەم دیتن کە ژن و پیاوی جولەکەیان لێدەبەستەوە و جەللادەکان تا گیانیان دەردەچوو لێیان دەدان.

من ئەو لاتوپاتە پاشماوانەی جوانەی ئاوڕوپام بینی، کەمیان لەو شەش ملیۆنە جولەکە کە سەردەبڕدران دەربازبوون؛ لە کاتێکدا جیهان بە ساردی، بێباکانە تەماشای گەلێکی دەکرد کە دوو هەزار ساڵە تالاوی ژانی تاراوگە دەچێژێ و قڕدەکرێ.»

لەوێشەوە بەرەو لەندەن رۆیشت.

وایزمەن و شێرتۆک لە نوسینگەی سەرەکییەکەیان لە شەقامی روسل بوون. ئەوانەی لەمێژساڵە بنگوریۆن دەناسن، گوتیان کەوا هەرگیز بنگوریۆنمان وەها نەدیوە. هەمویان سەریان لە گیانە پڕ جۆش و خرۆشە جەنگاوەریانەکەی سوڕمابوو. ئەو ببووە مایەی جێ سەرنجی هەمویان.

لە بەرامبەریاندا گوتی: «وا باشە هەموتان سەرێکی ئاڵمان بدەن و ئەوە ببینن کەمن دیتم.»

لەوێشە بنگرتی نەبوو بەرەو نیویۆرک رۆیشت.

ئەمجارەیەیان ستافێکی بۆ گەشتە ئامریکایەکەی لەگەڵ خۆدا برد؛ چونکە لەوێ کاری گرنگی لەپێش بوون. ریوڤن شیلۆا Reuven Shiloha سکرتێرە سیاسییەکەی کە دواتر بووە نوێنەری ئیسرائیل لە واشنتن، حایم سلاڤین Caim Slavinی ئەندازیار، و ئێلیزەر کاپلان Elizer Kaplan موحاسیبی ئاژانسی جولەکان کە لە یەکەم کابینەی حکومەتدا بووە وەزیری دارایی، لەگەڵدابوون.

لەوێ لە میوانخانەیەک لە ناوەڕاستی مانهاتن دابەزین و رۆژی پاشتر بنگوریۆن پێشوازی لە رودۆلف سۆنەبۆرن Rudolf G. Sonneborn خاوەنکاری

هەرە دەوڵەمەندی نیویۆرک کرد. کابرا پیاوێکی درێژی قۆز و بیچمێکی بەرچاوی بزوتنەوەی زایۆنیزم بوو. بنگۆریۆن پێیئاشنابوو، حەزیشی بە چارەی دەهات. بنگۆریۆن بانگهێشتی کرد کە «پاروە نانێک» بەیەکەوە بخۆن.

سۆنەبۆرن لەسەر مێزی نانخواردن گوتی؛ «ئێمەی جولەکەی ئامریکا، هیوامان وایە کە پارتی کریکارانی بەریتانی لە هەڵبژاردنی مانگی داهاتودا بباتەوە. بەڵکو ئەوسا بە بەڵێنەکانیان پابەند بن، ئەرێ وانیە؟»

بنگۆریۆن برۆکانی هەڵدان و شانێکی هەڵتەکاند و گوتی:

«من لەوە دەترسم حکومەتێکی دیکە کەمتر لە بەرژەوەندی ئێمەدا بێ.»

«ئایا مەبەستت ئەوەیە کە سۆشیالیستخوازەکانی ئینگلیز بەڵێنشکێن دەردەچن؟»

سۆنەبۆرن پرسی: «ئایا ئایندەت چۆن دێتە بەرچاو؟»

«ئەرێ ئەو ئەگەرە هەیە کە ئینگلیزەکان لە فەلەستین بکشێنەوە. بڕوام وایە بەرەبەرە دێنە سەر ئەوڕایە. بەڵام ئەوکات شەڕێکی خۆجێیی هەر رودەدا.»

ئەوەی بنگۆریۆن دەیگوت لەگەڵ پێشبینیەکانی ئەوانی دیکە یەکیان نەدەگرتەوە. سۆنەبۆرن بەگومان بوو، بەڵام پرسی:

«گەر وا بقەومێ، ئایا جولەکەکانی فەلەستین بۆ بەرگری لەخۆکردن تەیار و ئامادەن؟»

بنگۆریۆن برۆکانی لێکناو گوتی: «نەخێر، هەر ئەوەشە منی گەیاندۆتە ئێرە.»

رۆژی پاشتر سۆنەبۆرن زەنگی بۆ نۆزدە کەس لێیدا، لەوانە هەندێکیان لە کالیفۆرنیا، میامی و فلۆریدا بوون.

ئەو بە برادەرەکانی خۆی گوت: «لەو ساتەدا پیاوێکی بەرچاوی فەلەستینی لێرەیە. سعات ١٠ی سەر لە بەیانی رۆژی یەکشەممە لە ماڵی من لە شەقامی ٥٧دا ئامادەبن، گتوگۆ دەکەین. بەڵام هەمو هەوڵێک بدە تا ئامادە بیت. هەمو پرسەکەش بە نهێنی بهێڵەوە.»

رۆژی یەکشەمە، ١ی تەموزی ١٩٤٥ کە تاوێکی گەرم بوو لە نیویۆرک. تەنها یەک بانگهێشتراو ئامادە نەببوو. ئەوانی دیکە ئالبێرت شیف Albert Schif، هێنری مۆنتۆر Henry montor، یولیوس فلیگلمان Julius Fliglman، چارلس گوتویرس Charles Gutwirth، جول گرۆس Joel Gross، هارۆلد گۆلدەنبێرگ Harold Goldenberg، ئابراهام بێرکوۆتز Abraham Berkowitz، شیفەرد برۆود Shepherd Broad، سامۆئیل چێر Samuel Cherr، ویلیەم کۆهن William S.Cohen، فیلیپ لۆون Philip W. Lown، بارنی راپاپۆرت Barney Rappaport، ماکس لیڤنگستۆن Max Livingston، چارلس رۆزەنبلوم Charles Rozenbloem، ئێرزا شاپیرۆ Erza Z.Shapiro، یاکوب شاهان Jacob Shahan، ولیوم سیلک William Sylk و سامۆئیل زاش Samuel J.Zachs هەمویان ئامادەبوون .

لە هۆڵە گەورەکەی سۆنەبۆرن کۆبوونەوە. بنگۆریۆن لەسەرێکەوە دانیشتبوو هەر قسەی بۆدەکردن. ئەوەی لە ئاوڕوپای دیتبوو بۆیگێڕانەوە. ئەوسا هاتە سەر فەلەستین.

لە گۆشەیکی هۆڵەکەدا مێزێکی پڕ زەڵاتە و خواردن دانرا بوو، بەڵام کەس کاتی ئەوەی نەبوو دەستی بۆببا. هەندێک لە ئامادەبووان خواردنەوەی سارد و تەزییان دەخواردەوە، کەچی بنگۆریۆن لەسەریەک قسەی دەکرد؛ کراسێکی لەبەردابوو، ئارەقە بە دەموچاوی دەهاتەخوارەوە، واش قسەی دەکردن هەروەک لە کۆنفرانسێکی ماپای دانیشتبێ.

پەرۆشیە لەناخدا هەڵقوڵاوەکەی باندۆری لەسەر خاوەن بانکەکان، پیشەسازان، پارێزەران، بازرگانان، بۆرسەچییاندا دانا. ئەوان سێ سعات گوێیان لە بنگۆریۆن گرت و لەپاشانیش پرسیارکوتیان کرد.

بنگۆریۆن داکۆکی لەو دیمانەیە دەکرد کە هاتنە کایەی دەوڵەتێکی جولەکە تاکە چارەسەرێکی واقیعیانەی گونجاوە، بەڵام هەروەک گوتی جاڕدانی دەوڵەتەکە رەنگبێ جەنگی لێبکەوێتەوە.

پێیگوتن: «من هیچتان لێداواناکەم، بەڵام ئەوەی لەسەر ئێمە پێویستە بیکەین باندۆری خۆی لەسەر پێگەی ئێوە وەک جو دادەنێ، بۆیە ئەرکێکە لەسەرم هۆشداریتان بدەمێ. ئەگەری ئەوە هەیە داوای قوربانیی زۆرتان لێبکرێ.»

کاپلان تێیگەیاندن کە شەڕ چ خەرجییەکی دەوێ. شیلۆهیش لەسەر دەرهاوێشتە سیاسییەکانی شەڕ قسەیکردن.

خەریک بوو دۆخەکە تارمایی بکەوێتە سەرو بێباکیی لێبکەوێتەوە، بەڵام ئەوان هێشتا قسەیان کردن. تاریکی داهات و یەکێکیان خواحافیزی لێکردن و کۆبوونەوەکەی جێهێڵا.

پێش ئەوەی پیاوەکان پەرت ببن و بڕۆن، لەسەر چوار خاڵ رێکەوتن. هەر نۆزدە ئامریکایەکە بەڵێنیاندا، ئەوەی لە توانایاندا هەبێ قسورنەکەن. ئەندامانی کۆنفرانسەکە سۆزی خۆیان دا سەرتاپای دانیشتنەکەیان و ئەنجامەکەی زۆر نهێنی بێ. کۆدەناوی چالاکیەکەیان ناوی «پەیمانگای سۆنەبۆرن»ی بەسەردادرا. هەرکاتێک بنگۆریۆن بە پێویستی زانی و کاتەکەی گەیشت ئەوا پەیوەندییان پێوەدەکاتەوە.

بەو شێوەیە پەیمانگای سۆنەبۆرن نافەرمییانە کە رێکخراوێکی نهێنی هەمو نەتەوەکە بوو، پشتگیری هاگاناي کرد.

کەواتە بنگۆریۆن دەیتوانی بگەڕێتەوە فەلەستین.

لە کاتێکدا گەیشتەوە فەلەستین کە بۆیەکەمین جار لەدوای جەنگدا لە ئینگلستان هەڵبژاردنی گشتی کرابوو، پارتی کرێکانیش بردبوویەوە.

لە هیچ وڵاتێک هیچ پارتێکی سیاسی بەقەد پارتی کرێکارانی بەریتانیایی بە فەلەستینەوە پەیوەست نەبوو. لە کۆنگرەیەکی پارتی کرێکاراندا پێشنیازێک پەسەندکرا کە سنورەکانی فەلەستین بەرفراندا بکرێ، عەڕەبەکان بگوازرێنەوە، کۆتوبەند لەسەر کۆچی جولەکان هەڵبگیرێ؛ لە کۆتایشدا بانگی دەوڵەتێکی جولەکە لە فەلەستیندا بدرێ. ئەوەش زۆر لەوە زیاتر بوو کە بنگۆریۆن، وایزمەن یاخود ئەوانی دیکە داوایان دەکرد.

لە شەوی ٢ی تەموزی ١٩٤٥دا جولەکەکانی فەلەستین بە تامەزرۆوە گوێیان لە

ئاکامی هەڵبژاردنەکانی ئینگلستانەوە دەگرت. لە ئۆرشەلیم، حەیفا، تەلئەبیب، زانکۆی سەر کیوی سکوپس Scopus و لە کیبۆتەکانی نەقەب دەست بە ئاهەنگێڕان کرا. شایلۆغان دابەسترا وەک ئەوەی پارتی کرێکاران بەڵێنەکانی بەجێهێنابێ.

لە کاتی هەرای ئەو بەزموڕەزمەدا بنگۆریۆن لە ژوری خوێندنەکەی خۆی سەرقاڵی نوسینی وتارێک بوو لە ژێر سەردێڕی: «تاکە چارەسەری دۆزی جولەکان».

زۆر کۆپلەی نوسینەکە ئاراستەی پیاوەکانی داونینگ ستریت ژمارە ١٠ Downing Street No.١٠ و نوسینگەکانی کۆشکی سپی بوون.

هەنوکە جەنگ کۆتایی هاتووە ئیدی کەس ئەوەمان لێچاوەڕێ ناکا کە خۆمان بە کۆتوبەندی ڕێنماییەکانی کتێبی سپەوە ببەستینەوە...»

«لێرەوە ڕێگاکانمان لێکدەبنەوە، مرۆڤ دەبێ یان کتێبی سپی هەڵبژێرێ یاخود دەوڵەتی جولەکان...»

سکاڵانامەی بنگۆریۆن لە دەست ئەوە بوو کە هەموکات گەلەکەی پەکی لەسەر وەڵامنامەی ئەوانی دیکەوە کەوتبوو. لە کۆنفرانسیکی لاواندا گوتی:

«ئەرێ ئایا بەڕاستی ئەوە سەیرە نیە کە ئێمە ئەوەندە بچوک بین لێبەگەڕێن خۆمان نابینا بکەین لە ئاست دەسەڵاتێکی زلهێزەوە و ئەگەرەکانی دەسەڵاتدارانی کە قەڵەمڕەویتی جیهان دەکەن؟ باوەڕبەخۆبوون داخوازی هێزیکەی سەروی دەسەڵاتی مرۆڤە .»

لە ئابدا سەرۆک ترومان Truman ڕاپۆرتێکی لە ئاوڕوپاوە پێگەیشت: لەو دووسەدهەزار جولەکە بێ دەوڵەتەی ئاوڕوپادا هێشتا زۆریان لە ئۆردوگای پڕ ئاپۆرەی پیسوپۆخڵدا دەژین، دەستەو ئەژنۆ دانیشتوون، ورەیان زۆر نزمە و ڕێژەی مردنیشیان بەرز. ئیدی سەرۆک بە ئاتلیی Atleeی سەرەک وەزیرانی گوت کەوا ئەو دوسەدهەزارە بە زوترین کات بگوازێتەوە فەلەستین.

کەمێک دوای سەرکەوتنی پارتی کرێکاران لە هەڵبژاردنەکاندا کۆنگرەی زایۆنستەکان بۆ یەکەمین جار دوای جەنگ لە لەندەن بەسترا. زیاتر لە سەد نوێنەر لە حەڤدە وڵاتەوە هاتبوون، بەڵام زۆر لە کۆنە ناسیاوان نەمابوون. هێشتا ئێرنسی بیڤین Ernest Bevin هیچ ڕاگەیاندنێکی سەبارەت بە سیاسەتەکی لە هەمبەر فەلەستیندا نەدابوو. وایزمەن و زۆرینەی نوینەرانی کۆنگرەکە هیواپڕ بوون.

بنگۆریۆن ڕایگەیاند کە پیاوەکە ( مەبەست سەرەک وەزیرانی بەریتانیایە-وەرگێڕ ) ئەو کارەی لەدەست نایە بەڵکو پێویستە خۆمان بۆ هێدمەگرتنێک ئامادە بکەین.

بەڵێ ئەو هێدمەیە لە ١٣ی نۆڤێمبەردا قەوما. بنگۆریۆن و شێرتۆک بانگی وەزارەتی کاروباری کۆلۆنەکان کران. لەوێ دانەیەکی کۆپیکراوی ڕاگەیاندنامەیەکی وەزیری کاروباری دەرەوەیان پێدان، کە بیڤین دەقاودەق ٣٠ خولەک پێشتر لە ئەنجومەنی نوێنەراندا خوێندبوویەوە.

ئەوان بە پەلە گەڕانەوە شەقامی روسل ژمارە ٧٠، وایزمەن بە تاسەوە چاوەڕوانی دەکردن. هەر سێ پیاوەکە بە تامەزرۆوە سەریان بەسەر بەڵگەنامەکەدا گرت و خوێندیانەوە.

بەڵی ڕاگەیەندراوەکە لەوەش خراپپتر بوو کە بنگۆریۆن پێشبینی کردبوو. پشتگیرییە نێو دەوڵەتییانەکەی بزوتنەوەی کرێکاران دیاربوو خەیاڵپلاویی بوو. بەڵێنەکانی سۆشیالیستخوازانی ئینگلیز مایەپوچ مانەوە.

بە گوێرەی ڕاگەیاندنامەکە ئەوەی باسی ڕێگەپێدانی کۆچی بێ کۆتوبەند دەکرا، فشە دەرچوو، هیچ باسیش لەو دووسەد هەزارەی کە ترومان قسەی لێوەکردبوو، نەهاتبوو؛ بیڤین ئامادە نەبوو زیاتر لە هەزارو پێنجەد کۆچبەر مانگانە ڕێپێبدا.

بە گوێرەی ئەوە دەوڵەتی جولەکە دروستنەدەبوو، بەڵکو تەنها کۆمیتەیەکی نوێ. تاکە جیاوازی لەگەڵ شتەکانی پێشو ئەوەبوو؛ لەو کۆمیتە نوێیەدا نەوەک هەر تەنها شەش ئەندامی ئینگلیزی تێدا دەبێ، بەڵکو شەش ئامریکایش لە کۆمیتەکەدا جێدەگرن.

ئاخر ژن و پیاوەکانی ئەودیوی تێلدڕی ئۆروگاکان زەبونتر دەبن، کەچی سەرلەنوێ کۆمیتەیەکی نوێ پێکدەهێندرێ. جارێکی دیکە دەبێ سەرکردە جوەکان دەرفەتی ئەوە بقۆزنەوە کە ڕاگەیاندننامە بدەن و دەست بە نزا و پاڕانەوە بکەنەوە.

ئەوسا جارێکی دیکە ڕاپۆرتێکی دیکە دەردەچێتەوە.

وایزمەن بە کرێی سەرمێزەکەی بەجێهێشت. ئەو بە نوشتاوەیی ڕێیدەکرد. کاتێ کە دەرچوو پیرتر دیاربوو لەوەی کە هاتبووە ژوور.

بۆ بەیانیەکەی کۆنفراسێکی بە پەلەیان ڕێکخست. سیاسەتی نەرمڕەوی نوشستی هێنا. هەمو چاوێک لەسەر بنگۆریۆن بوو. ئەو تاکە هیوایان بوو.

«ئێمە بەرەو مەترسی دەڕۆیـن، کە لە وڵاتـی خۆماندا هێشتا هەر بە کەمینە بمێنینەوە. لە بەرامبەر ئەوەدا یەک تاکە بەرسڤ هەیە؛ ئەویش بەرگریکردنە!»

ڕۆژێک دواتر زەنگێک بۆ ڕودولف سۆنەبۆرن کە لە نیویۆرک بوو لێدرا؛ زەنگەکە لەلایەن کەسێکی ئەکسێنت ئینگلیز بوو، نەیویست ناوی خۆی ئاشکرا بکا.

«من بە دوای سۆراخی سۆنەبۆرنی پەیمانگادا دەگەڕێم، پێم وایە کە بەڕێزتان دەتوانن یارمەتیمان بدەن.»

ئەو پیاوەی زەنگەکەی لێدا گەنجێکی لەندەنی بوو بەناوی سیمۆن مارکس Simon Marks کە پەیامەکەی بنگۆریۆنی پێبوو:

«کاتی هاتووە!»

لەسەر پێشنیازی بنگۆریۆن هەمو ئەندامانی گروپە سەرەتاییەکە برادەرە هەرە لەپێشەکانیان ئاگادارکردنەوە کە بچنە ریزی ڕێکخراوە سەیرەکە، کە نە نوسینگە، نە ناونیشانی پۆست، نە تەلەفون، نە ئارشیف، تەنانەت ناویشی نەبوو. یەکەمین شت دەبووایە پەیدای بکەن پارە بوو. هەمو ئەندامان بە بڕێکی زۆرەوە باروبوی خۆیان پێشکەشکرد، داوای کۆمەکیان لە دۆست و ناسیاوەکانیان کرد، زۆر جاریش پێیان نەدەگوتن ئاخۆ پارەکە بۆ کێ دەڕوا.

پەیمانگای سۆنەبۆرن ئەو کەشتیانەی دەکڕین کە مۆساد بۆ بە قاچاخ گواستنەوەی کۆچبەرانی پێویست بوو؛ ژمارەی کەشتیەکان زیاتر لە دوانزە دانە بوون لە نێویشیاندا SSی سەرۆک وارفیلد ‘Prsident Warfield’ کە سالۆنەبەلەمێکی کۆنی تەنگەی

Chespeakebaai بوو، دواتر لەسەر روپەرەکانی رۆژنامەکانی جیهاندا بە ناوی ئیکسۆدوس Exodus ناویدەرکرد.

بێ ئەوەی چاوەڕێی بەرامبەر بکەن، ئەو پیاوانە کەشتیگەلێکیان بە نهێنی بۆ وڵاتێک کە هێشتا هەر لە خەوندا بوو پێکهێنا، گەرهاتبا و ئینگلیزەکانیش زەوقیان هەبووایە هەمیشە بە خەون دەمایەوە.

فرۆکە، چەک، کەلوپەلی دیکە کڕدرا و لە شوێنی جیاجیا بۆ رۆژی پێویستی خۆی حەشاردران.

«پیرەمێردەکە» تاکە دەسەڵات بوو کە پەیمانگاکە ددانیپیدانابوو. لەلای ئەویشەوە ئاماژەیان پێدرا کە ماشینگەلەکە بکەوێتە گەڕ و ئیدی:

«کاتەکەی هاتووە!»

# بەشی
# (١٠)

لەساڵی ١٩٤٦دا لە فەلەستین زنجیرە پیلانگێڕییەکان لە برەودابوون، بەڵام کەم کەس لە تەماشاکارەکان-یان پشکدارەکان- دەقاودەق دەیانزانی ئاخۆ چۆن کۆتایی پێدێ.

ساڵ ساڵی ململانێکان بوو: بنگۆریۆن دژی بێڤین، ترومان دژی ئاتلیێ، ڕێکخراوی ئیرگون دژی هاگانا، ترومان دژی لایەنگرانی عەرەب لەنێو وەزارەتی کاروباری دەرەوەی خۆیدا، بنگۆریۆن دژی وایزمەن، نەرمڕەوەکان دژی چالاکەکان.

ساڵ ساڵی تورەیی ڕشتن بوو، گفتوگۆی بێ سەروبەر، چالاکی قاچاخانە، شەڕو دەمەقاڵێ، تیرۆر و لە پڕێکەوە کوشتنی زۆر.

لەو ساڵەدا تاڵترین ململانێ لە نێوان سەرکردەکانی وڵاتێکی بچوک کە هێشتا نەهاتبووەکایە لەگەڵ وەزارەتی کاروباری دەرەوەی دەوڵەتێکی زلهێز، لە ڕوانگەی هەندێکیانەوە لە قۆناخی کۆتاییهاتن بە دەسەڵاتی نزیک بۆتەوە.

مرۆ دەیتوانی ململانێکە بە زۆرانبازی نێوان داود و گۆلیات Goliath (شەمشون-زەبەللاح) بچوێنێ، بەتایبەتیش کاتێ مرۆ لایەنی کەسایەتی هەردوولایان لەبەر چاو نەگرێ، بەڵکو تەنها لایەنی قەبارەیی بهێنێتە بەرچاو؛ بەوەی جوەکان وەک لەپی دەستێکی پڕ لە هێڵێکی درێژکۆڵەی وڵات لە کەناری ڕۆژهەڵاتی دەریای سپی ناوەڕاستەوە لەگەڵ زلهێزێکی وەک دەوڵەتی بەریتانیای گەورەدا لە ململانێدابێ. بەڵام کەس ناتوانێ کەسایەتیەکانیش لە یاد بکا چونکە ململانێیەکی توندیش لەنێوان هەردو پیاوەکەدا هەبوو.

ڕەنگبێ ئەوە سەیربێ کە بنگۆریۆن ئەوەندە بە چەرچل سەرسام بووبێ، کەچی هەستێکی قوڵی سوکایەتی بەرامبەر بێڤین هەبوو. ئەو و بێڤین چەندان خاڵی هاوبەشیان هەبوون. هەردووکیان سکرتێری گشتیی یەکێتی سەندیکای دەسەڵاتداری پیشەوەرەکان بوون. لە سەرکردایەتی سەندیکاییەوە بەرەو سیاسەت ڕۆیشتبوون. هەردوکیان خەباتیان دژی ڕوتاندنەوەی چینی کرێکاریی دەکرد و هەردوکیان پێیاین وابوو بەرفراوانبوونی سەرمایەداری مەترسییە.

تەنانەت لە ڕواڵەتی سەروسیماشیانەوە خاڵی لەیەکچوونیان هەبوو. هەردووکیان کورت بەڵام بەرین بوون. هەردوکیان بەخۆڕسک تێکۆشەر بوون.

دوساڵی ڕەبەق ملیان لەبەریەک نا. بێئەوەی ماندووبن، بێئەوەی زۆرانبازییەکەیان

شەقلێکیش وەربگرێ. هەردوکیان یەکدییان بە پەیڤی نادۆستانە و دەربڕینی توڕەییانە دەشوشتەوە. ئەوان سوکایەتیان بەیەکدی کرد، بێڕێزیان بەرامبەریەکدی دەنواند، بەیەکدیان ڕادەبوارد و سکاڵایان لەیەک دەکرد.

بێڤین لە کۆنگرەیەکی رۆژنامەوانیدا گوتی، گوایە هەمو بەڵگەنامەکانی دەربارەی فەلەستین سەراوبن کردوون، هەروەها لە بایبل و قورئانیشی کۆڵیوەتەوە، بەڵام لە هیچ شوێنێک وڵاتی بەڵێنپێدراوی نەدۆزیوەتەوە کە جوەکان دەهۆڵی بۆ دەکوتن گوایە دەوڵەتی خۆیان لەسەر بنیات دەنێن.

بنگۆریۆن بە نوسین وەڵامی دایەوە، کە قسەی لەسەر نییە ڕێزدار بێڤین هەمو بایبلی نەخوێندۆتەوە، هەروەها دیارە لە راگەیەندراوەکانی وڵاتەکەی خۆشیدا کەم ئاگایە.

بێڤین رایگەیاند کە ئەو نۆهەد ملیۆن موسوڵمانە ( لە دەقەکە موحەمەدییەکان هاتوە، چونکە لە ئەدەبیاتی رۆژائاوادا بەتایبەتیش هۆڵەندیدا لە جیاتی موسڵمان دەگوترێ موحەمەدی، بەناوی پێغەمبەرەکەیانەوە دەناسرێنەوە-وەرگێڕ)ی هیندستان(ئەوکات هیندستان، بەنگلادیش وپاکستان یەک وڵات بوون-وەرگێڕ) یش زۆریان پێخۆشە بێنە فەلەستین بژین.

بنگۆریۆن بەرسڤی دایەوە:

«من دادەڕسێمە سەر وەزیری کاروباری دەرەوە گەر بسەلمێنێ لەو نۆهەد ملیۆن موسڵمانەی ئەوێ تەنها نۆهەد هەزار کەسیان لە هیندستان ناوی فەلەستینیان گوێ لێبووبێ!»

بێڤین بە زمانی مامۆستایەکی قوتابخانە نەوەک بە زمانی وەزیر قسەی دەکرد، ئەو جولەکەی تەمبێ دەکردن کە «نابێ لەسەر ئەوە مکوڕبن پێشکات لە ریزدا بوەستن.»

بنگۆریۆن لە وەڵامەکەیدا لەوە ورد دەبووە کە زانیاریەکانی بێڤین «کێماسییێکی بەرچاویان تێدایە» ئەو سەبارەت بە هەندێ پرس» بابایەکی نەزانە»، ئەو کۆنە پارێزێکە و پارتی کرێکرانی بە خراپی لە راژەی بیردۆزە بەسەرچووەکان بەکاردەهێنێ تا رویان جوان و قشتیلە نیشان بدا.

بێڤین بنگۆریۆنی بەوە تاوانبار دەکر گوایە کاتێک شت رادەگەیەنێ بە شاشی رامان و گریمانە دادەدنێ، بەوەی هەمو پاشماوە جوەکانی ئاورۆپا ئامادەن بۆ فەلەستین کۆچ بکەن.

لە وەڵامدا بنگۆریۆن نوسی:

«ئایا ئەوە نیە جەنابی بێڤین کەشتیگەل، فڕۆکە و پەرەشوتەوانەکانی ناردونەتە فەلەستین تا رێگە لەو کۆچبەرانە بگرن کە حەز بە کۆچ ناکەن؟»

بێڤین جارێکیان بە ئاشکرا بە توڕەیی دابەزیە سەر ترومان، ئامریکایەکان تەنها پێ لەسەر ناردنی ئەو سەدهەزار جولەکە بۆ فەلەستین دادەگرن، » لەبەر ئەوەی حەز ناکەن ئەو ژمارەیان لە نیویۆرکدا هەبێ.»

ئەمجارەیان پێوست نەبوو بنگۆریۆن خۆی بە وەڵامدانەوە ماندوو بکا. دوو

سیناتۆری نیویۆرک بە توندی بەرسڤی بیڤینیان دایەوە و بە «ناڕاست و دەربڕینی دژەسامیانەیان» تۆمەتبار کرد.

لە هەمان سەردەمدا بنگۆریۆن کە لەوە بێزار ببوو وەک زڕمنداڵێکی نەخوازراو سەودای لەگەڵدا بکرێ، نوسی:

«لەمەوپاش ئێمە تەنها لەگەڵ ئینگلستاندا لەسەر بنەمای سیاسەتی هاوبەشی نێوان دوو لای سەربەخۆ کە هەرچەندە لە هێزیشدا هاوسەنگ نین بەڵام هەمان مافیان هەیە، دانوستان دەکەین.»

لە سۆنگەی رەفتارە توندەکەی بیڤین وینستۆن چەرچل قسەیەکی وایکرد کە ئەمە «دژوەستانەوەیەکی ئاستنزمی جولەکانە».

هەر لە سۆنگەی رەفتارە فیززلیەکەی بیڤنەوە بنگۆریۆن بە شێوەیەکی دیکە داڕسایەوە :

«لەگەڵ گریمانەکەی هیتلەر و لایەنگرانی، هێشتاش باوەڕمان وایە کە جولەکە هەروەک ئینگلیزەکان و هەمو ئەوانی دیکە مافی ئەوەیان هەیە چ وەک تاک یان وەک گەل بژین.

«بەڵام ئێمە هەروەک ئینگلیزەکان لەو بڕوایەداین، کە هەندێ شتی دیارکراو لە خودی ژیانیش بایەخدارترن بۆیە ئێمە پێمان باشترە لە پێناویدا بمرین لەوەی دەستبەرداری ببین.»

ئەوە خەباتەهاوار بوو. ئەوە داڕسانێک بوو روبەڕوی حکومەتی کرێکاران، سوپای بەریتانی، مارینز، هێزی ئاسمانی و رێزدار بیڤین کرابووەوە.

لەو زۆرانبازییەدا بۆ هەمو کەسێک کە بیتوانیبا نێوان دێڕەکانی رۆژنامەکان بخوینێتەوە ئاشکراو دیار بوو، کە بیڤین لەسەر بنەمای دەربڕینەکانی پێویستە وەک دژە سامیەک تەماشابکرێ.

بنگۆریۆن لە درێژەی ململانێیەکەدا سەرکردەیەکی کۆڵنەدەری گەلەکەی بوو، زۆری نەمابوو بگاتە کۆتایی بیرۆکە سەرمەشقەکەی کە خەریک بوو لەپێناویدا سەری تێدابچێ.

بەڵام هێشتا زۆر شتی دیکە ماون روبدەن تا دەگاتە دوا مەبەست.

ئەو دوای نیوەڕۆیەی کە بیڤین راگەیاندراوەکەی لە ئەنجومەنی نوێنەراندا پێشکەشکرد، سەرکردە جوەکانی جڤاکی فەلەستین بڕیاریاندا رۆژی دوایی لە سعات دوانزەی نیوەڕۆوە تا نیوەشەو بۆ نارەزایی مانبگرن.

هەمویان دەستیان لە ئیشی خۆیان هەڵگرت لە ناوەندەکاندا بۆ نارەزاییینیشاندان کۆبوونەوە. لە تەلئەبیبدا سی‌هەزار جولەکە کۆبوونەوە؛ بە شێوەیەکی ئاسایشپارێزیانە راگەیاندنەکەیان شەرمەزار کرد.

هەمان شەو دەستە و تاقمە بچوکە توندڕەوەکان توندتروتیژتر جوڵانەوە. ئەوان بەزۆر چوونە دامودەزگامانی میری، کەلوپەلەکانیان تێکدەدا، دۆسیەکانیان دەدڕاند، لێرەولەوێش ئاگریان لە هەندێ شت بەردا.

جولەکەو پۆلیسی ئینگلیز بێهودە هەوڵیان دا بارەکە هێوربکەنەوە، لە دوایشدا

هێزەکانی بەریتانی بەدەرکەوتن و تەقەیان کرد و چەند جویکیشیان بەر گوللەدان. بەمجۆرە قەدەخەکردنی هاتوچۆ جاڕدرا و لەشکری ٦٠ی ئێربۆرن Aireborne هاتە ناو شار.

لە ماوەی ئەو دە رۆژەی بەدوایدا هات شەڕی زیاتر و تەقەی زیاتری لێکەوتەوە؛ ژمارەی کوژراوەکان بەرز بووەوە. نەخۆشخانەکان راپۆرتیاندا کە زۆر زارۆکی جولەکە لەنێو قوربانیەکاندان، هەندێکیشیان برینەکانیان زۆر سەختە چونکە گوللەی وا بەکارهاتوە کە لەناو جەستەدا دەتەقێتەوە گۆشتەکە هەلابەهەلا دەکا.

لە یەکێ لە رۆژنامە عیبرییەکاندا کاریکاتۆرێک لێدرابوو کە نمایشی ژوری نەشتەگەری نیشان دەدا، دکتۆری نەشتەرگەر بە یارمەتیدەرەکەی دەگوت:

« سەیرکە، ئەو ئینگلیزانە چ نیشانەئەنگێوێکی کارامەن، تەنانەت ئەو ئامانجە ورد و بچوکانەشیان لەدەست دەرناچیٚو دەیپێکن!»

پێش ئەو رۆژگارە، تیرۆر لە سنورێکی دیارکراودا بوو. ئۆتۆمبێلی بارکراو بە دینامێت دەستی بەسەرداگیرابوو، هێڵی ئاسنین دەتەقێنرایەوە و تاک تاکە کوژراویش هەبوون.

بەڵام هەنوکە بنگۆریۆن شەڕی دژی ئینگلیزەکان جاڕدابوو. ئەو هێمایەی پێدان، کە بە دزیەوە کارگەی تەقەمەنی بخەنە گەڕ و بەردەوامیش پەیوەندی لەگەڵ پەیمانگای سۆنەبۆرن و رێکخراوی دیکەی چەک کڕیندا هەبوو.

لەو نێوەدا ئەو کەوتبووە هەڵوێستێکی ناجێگیر. لە خۆڕسکەوە ئەو کەسێکی پاسیف بوو. ئەو کەیفی بە توندوتیژی نەدەهات و هاوکارەکانی هەر زو بۆیاندەرکەوت کە کردەی کوشتن رەتدەکاتەوە. بەڵام هەنوکە دوای روخانی سیاسەتی وایزمەن، ئەو شۆڕشی بە تاکە چارەسەر دەزانی.

ئـەوەی بنگۆریۆن دەیەویست شۆڕشێکی خوێناوی نەبوو. دەیویست شەڕی ئینگلیزەکان بە هەمان شێوازی خۆیان بکا. ئەو تاکتیکەی دەیەویست بۆ ناچارکردنی دەرچوونی ئینگلیز لە فەلەستین، پەیڕەوبکا: گەیاندنی ژمارەی زۆری کۆچبەران بە قاچاخ، کردەی تێکدان لەهەمو لایەک، تەقاندنەوەی دامەزراوە ئینگلیزییەکان، ناوبەناو رفاندنی یەکێک. بەڵام نابێ نە تیرۆر نە ئازر و ئەشکەنجەدان، نە کوشتن ، گەربێتو بتوانرێ لێی دوربکەونەوە، پەیڕەوبکرێ.

بنگۆریۆن چەمکی بەرەنگاری رونکردەوە:

«ئایا بەرەنگاری چی دەگەیەنێ؟ بەرەنگاری ئەوە دەگەیەنێ کە هەمو وزەمان، هەمو توانامان بۆ نشینگەبوون تەرخان بکەین. بەرەنگاری ئەوە دەگەیەنێ کە ئێمە گەلەکەمان تێبگەیەنین و بۆ ئازادی جۆش بدەین، ئێمە دەبێ لەهەمولایەک بانگەشە بۆ سیاسەتی زایۆنیزم بکەین، پێویستە کاربەدەستان، سەرکردەی سەندیکاکان، پارتە سیاسیەکان و رێکخەرەکانی کڵێساکان و هەمو دەستەو تاقمەکان بخەینە پاڵ بیرۆکەکانمان. بەرەنگاری واتای ئەوە دەگەیەنێ لە رۆژنامەکانمادا بنوسین، کە خەباتمان بە سیاسەتی جیاکردنەوە(discrimination)ەوە بەندە، ئێمە بۆ هەمو مافێکمان تێدەکۆشین، ئێمە بەرامبەر دوژمن و شوێنپێهەڵگرانیان رادەوەستین، ئێمە

وەک هەر نەتەوەیەکی دیکە کە ویست وتوانا و ئەرکی خۆی هەیە، رەفتاری لە داکۆکی لەخۆکردن و خۆپاراستن، دەنوێنن.»

بیرۆکەکانی بنگۆریۆن لەلایەن رێکخراوی ئیرگۆن و تاقمی ئەستێرە گوێیپێنەدرا. سەرکردەکانی ئەوان بەشێکی زۆریان لە گەنجە تالاونۆشەکان بوون، کە لەمێژ نەبوو لە ئاوروپاوە گەیشتبوون، لەوێ هیتلەر فێرە رکوکینەی کردبوون. ئەوان ئەوەندە کوشتارگەیان دیتبوو، ئەوان گەواهیدەری کردەگەلی درندانەی وا بوون کە چیدیکە کەسانێکی ئاسایی نەمابوون. ئەوان بە بێهەڵوێستی ئینگلیزەکان لەمەڕ ژان و کەسەری جولەکەکانی ئاورووپادا و بە گوتە دژەسامیەکانی بێڤین، کەللەیی و دەهری دەبوون. ئەوان بە چاوی خۆیان تورەییە بێدەسەلاتەکەی خۆیان بەرامبەر ئەو هەمو کەشتیانەی کە هاورەگەزەکانیان لێبارکرابوون و گەیشتبوونە ولاتە بچوکەکە بەلام ئینگلیزەکان لێنەدەگەران دابەزن، دەدی، ئیدی شێلگیرانەتر بەرەو توندوتیژی دەڕۆیشتن.

زۆر لە لایەنگرانی ئەو رێکخراوانە گەنج بوون، زۆریان جولەکەی رۆژهەلاتیی بوون، هێشتا پێنەگەیشتبوون و ئەزمونی سیاسیانەیان نەبوو، هیچ هەولێکی تێگەیاندنیشیان نەدرابوو. بەپێچەوانەوە سەرکردەکانیان دنەی هەست و سۆزیان دەدان و تیژتریان دەکردن؛ بێباکانە ژیان و ئەنجا لەپێناو ئامانجێکی بەرز و پیرۆزدا، هزری خۆبەختنکردن سەرمەشق و پێشەنگیان بوو.

لەسەرەتادا هاگانا هەولیدا لەگەڵ ئەو توندڕەوانەدا هاوکاری بکا. دواتر مرۆ هەولیدا باندۆر بخاتە سەر کردە بێباکەکانیان. لە دوادوایدا هەولیدا بە توندوتیژی دایانبمرکێنێتەوە، چونکە مرۆ لەوە دەترسا کردەکانیان لە دوایدا هەمو دەرفەتێکی سەرکەوتن لەدەستبدا.

بنگۆریۆن لەو تاکتیکە جێگۆڕکێیە بەردەوامەدا کە پاڵنەریان بوو، رەوتی کاروبارەکان وایلێکرد لەبەردەم کۆمیتەکانی لیکۆڵینەوەدا حاشایی بکا. ئەوکاتەی هەولیدا تیرۆر جڵەو بکا و کۆتایی پێبهێنێ، سەرکردە توندڕۆیەکان دەستیان بۆ هەمو ئامرازێک برد تا درێژە بە کردەوە تیرۆریستیەکانیان بدەن.

تیرۆر بنگۆریۆنی ناچارکرد بڕیاری پێنجەمی ژیانی بدا. لە ١٩٤٦دا دەبوایە بڕیار بدا ئاخۆ ئامانج پاساوی ئامرازی بەدیهێنانی دەداتەوە. بەلام ئەوە هەرگیز پرسێکی پاک و بێگەرد و سنورڕۆشن نەبوو کە مرۆ مەرامێکی فەلسەفیانە لێکبداتەوە و فتوای لەبارەوە دەربکا. ئەو شۆڕشەی دەیەویست رابەرایەتی بکا لەگەڵ بەرەنگاریەکەی گەلی ئامریکایی یەکیدەگرتەوە، ئەوان سەدوحەفتا سال پێشتر لەگەڵ ئینگلیزەکان لەململانێدا بوون، چونکە دەیانەویست بە بەری داری ئازادی و سەربەخۆیی بگەن. هەروەک ئەوکات هەنوکەش خۆلادان لە خوێنڕشتن کارێکی ئەستەمە. لەوانەیە هەمو ئەو چەکانەی بەنهێنی کڕدراون و حەشاردراون، بەکاربهێنرێن. بنگۆریۆن پێیوابوو شۆڕش و جەنگیش رەوشتی خۆیان هەیە.

تیرۆریستەکان کەیفیان بە بیروڕای جیاوازی فەلسەفیانە نەدەهات. پاساوی ئەوان ئەوە بوو کە بە رێوشوێنی تیرۆر سوپای بەریتانیا ناچار بکەن فەلەستین

بەجێبهێڵێ.
کاتێک تاقمی ئەستێرە لۆرد مۆینەیان لە قاهیرەدا ساردکردەوە، بنگۆریۆن بۆ گەلی خۆی و جیهانی رونکردەوە کردەوکە بەهیچ شێوەیەک فڕی بەسەر بیرۆکەی ئەودا نەبووە، نیازی ئەو نەبووە بەو جۆرە دژایەتی ئینگلیزەکان بکا.
لەمەوپاش وایلێهاتبوو نزیکەی رۆژانە بنگۆریۆن  پێویستی بەوە بوو بڕیارێک بدا ئاخۆ ئەو کردە نوێیە، یان شێوەیەکی دیکەی شەڕو بەرەنگاری بەرپرسایەتیەکی رەوشتیانەی هەیە، یاخود دەکرێ ئەو گردبوونەوەی خەڵکی ناپەسەند بکرێ هەر چەندە کردەکە لەلایەن جوەکانەوە کراوە کە بۆ هەمان ئامانج تێدەکۆشان.
لە فەلەستیندا زۆر بوون ئەوانەی گیرۆدەی هەمان کێشە ببوونەوە. چیرۆکی ئەو کۆبوونەوەیەی لەلایەن ئالیاه کاداسا Aliyah Khadasha پارتی پێشڤەڕۆ ناسراوە، کە هیچ سەرەدەریان لەگەڵ ئینگلیزەکان نەدەویست. ئەندامێکیان گوتی:
«هاگانا رادیۆیەکی بە نهێنی هەیە، رێکخراوی ئیرگونیش  هەیەتی، ئەدی باشە بۆچی ئێمەش نەمانبێ؟»
بە زۆرینەی دەنگ پێشنیازەکە وەرگیرا؛ کۆمیتەیەک  بۆ هەنگاونانی پێویست پێکهێنرا. لە کۆبوونەوەی داهاتوی پارتەکەدا سەرۆکی کۆمیتەکە راپۆرتی خۆیانی خوێندەوە:
«بە داوای لێبوردنەوە دەبێ پێتان رابگەیەنم، من نەمتوانی ئەرکەکەم بەجێبگەیەنم. ئینگلیزەکان مۆڵەتنامەی وێستگەیەکی پەخشی نهێنیان پێنەدام!»
لە مارتی ١٩٤٦دا کۆمیتەیەکی ئانگلۆ-ئامریکی بۆ لێکۆڵینەوە لە دۆزی فەلەستین بۆ گوێگرتن لە گەواهیدەران گەیشتە ئۆرشەلیم. دوانزە ئەندامەکەی کۆمیتەکە سەلیقەیەکی دۆستانەیان نەبوو. گەشتەکەیان بە شەمەندەفەڕ لە قاهیرەوە بۆ ئۆرشەلیم شانزە سعاتی خایاندبوو. شاری پیرۆزیان زیاتر وەک مۆڵگەیەکی سەربازیانەی دەهاتە پێشچاو لەوەی کە رێڕەوی حەجی سێ ئاینی جیهانیی بێ. هەمو تەلارە گرنگەکان بە تێلبەند پەرژینکرابوون. دەروازەی میوانخانەی شا داود کە کۆمیتەکەی لێدابەزیبوو، حەشارگەیەکی ژێرزەمینی بوو، لا شەقامەکانی تانکی سەربازیی لێبوون، لەسەر بانەکەشیەوە سەربازی چەکداری لێدامەزرابوون.
میوانخانەکە خۆی تەژی بوو لە شێخەکانی عەرەب، لێکۆڵەرەوە تایبەتەکان، ئاژانەکانی زایۆنیزم، بێژمار نێردەی رۆژنامەوانیی، وێنەگرەکان و ئەفسەرانی ئینگلیز.
پێش ئەوەی شاهێدیی شاهیدەکان وەربگرن، کۆمیتەکە لەلایەن کۆمیسیاری باڵای بەریتانیا لە تەلارێکی خۆشی مەزن کە بەسەر دۆڵی ئوردندا دەیڕوانی بەڵام سەربانەکە نیشانئەنگێوە سەربازەکانی لەسەر بوون، پێشوازیان لێکرا.
بنگۆریۆنیش کە بانگێهشتنامەی بۆ هاتبوو، حەزیدەکرد قسەیەک لەگەڵ ریچارد کرۆسمان Richard Crossmanی پرۆفیسۆری ئۆکسفۆردا بکا. ناوبراو لە دەستەی نوسەرانی New Statesman and Nationlyی لیبرالەکان بوو، لە تەمەنی سیوپێنج ساڵیشدا نوێنەری پارتی کرێکاران بوو لە ئەنجومەنی نوێنەراندا.

بنگۆریۆن ویستی فەیلەسوفە ئینگلیزەکە کە لەگەڵ پێنج هاوڵاتی خۆیەوە فراکسیۆنی ئینگلیزییان لە کۆمیتەکە پێک دەهێنا، کێش بکاتە گۆشەیەک بەیەکەوە قسە بکەن:» کاتێک بەر لەساڵێک بە زمانی گریکیی «کۆماری ئەفلاتون»م بە قوڵی خوێندەوە، کتێبەکەی بەڕێزتانیشم «Plato Today» خوێندبووەوە.

کرۆسمان خۆرسکیانە پێیخۆش بوو. بەڵام بنگۆریۆن لێیپرسی:

«ئەرێ بۆچی ئەفلاتون هەروەک فاشستێک وێنادەکەی؟»

گرۆسمان سورهەڵگەڕاو گوتی من هەرگیز مەبەستێکی وام نەبووە.

لەو کاتەدا یاریدەدەرێکی کۆمسیاری باڵا دەستێکی لە شانی کرۆسماندادا و شتێکی بە بناگوێدا چرپاند.

بنگۆریۆن لێیپردسی: «ئەرێ چی گوت؟»

بە شەرمەوە کرۆسمان وەڵامی دایەوە کە کۆمسیاری باڵا ئاگاداری داوەتی، نابێ ئەندامی لیژنەکە قسەی نادیپلۆماتیانە لەگەڵ بنگۆریۆندا بکا.

کاتێک گرۆسمان لای ئەو رۆیشت، بنگۆریۆن خەندەیەکی داماوانەی بۆکرد.

رۆژێک پاشتر وەک شاهیدێک گوێ لە بنگۆریۆن گیردرا. ئەو و هاوڕیکانی ئەزمونی وایان زۆر هەبوو، زۆر جاری دیکەش ئیفادەی خۆیان لەبەردەم ئەو جۆرە کۆمیتانەدا داوە. هی ئەمجارەیان هەژدەهەمین کۆمیتە بوو بۆ فەلەستین دەنێردرا. کۆمیتەی ئەمجارە سکرتێر، کامیرا، فایل، پرسیی دەقاودەق، بنەمای نەگۆڕ و پێشکات دەرەنجامی دیاربوو.

بەڵام پێکهاتەی کۆمیتەکە لەهی جاران ئایربوو. لەنێو کۆمیتە نوێکەدا ئەمانەی خوارەوەی تێدابوون: پارێزەرێکی کالیفۆرنیایی، دادوەرێکی تاکساسی کە لە شاری لێیلەدایک ببوو لە هۆستن Houston کۆتایی بە تاقمی دژەسامیKu-Klux Klan هێنا بوو. سەرنوسەرێکی بۆستن Boston و پرۆفیسۆری لیبرال کرۆسمان.

لە کاتی ئیفادەدانەکەدا بنگۆریۆنیش یەک دوو پرسی هەبوون:

«ئەرێ بۆچی بەردەوام خەڵک ئێمە جیادەکاتەوە و لێمان پڕە؟.. جولەکەکان تاقانە نین کە لە ئەوانی دیکە جیاوازبن. لە راستیدا ئەوان لەوانی دیکە جیاواز نین، چونکە جیاوازیبوونەکە واژەیەکی ریژەییە. جولەکە ئەوانەن کە هەن. ئەوانی دیکەش ئەوانی دیکەن، بەڵام لە چاوی زۆرینەدا جولەکەکان ئەوانی دیکەن. ئێمە ئەوەین کەهەین، لەوەشدا رەخنەمان نیە. ئایا ئەوە تاوانە...؟

من دەزانم کە دانیشتوانی پارزەمینی ئاوڕوپا ئینگلیزەکان بە ئاساییانە نابینن. بەڵام ئینگلیزەکان خۆیان پێ نائاسایی نیە. بە چاوی ئەوان خەڵکانی دیکەی ئاورووپا نائاسایین. پیاوی ئینگلیز ئەوەیە کەهەیە، بەڵام کەس بە شتی دیکەی نابینێ. بەڵام جوەکان بە شتی دیکە دەبینرێن. نەوەک لەبەر ئەوەی ئەوان شتی دیکەن، بەڵکو لەبەر ئەوەی لە هەمو شوێنێک هەر کەمینە پێکدەهێنن. ئەوان هەمیشە لە هەمبەر سوکایەتی پێکردنی ئەوانەی کە جیاوازیەکەیان بە دڵ نەبێ زەبونن.»

ئەوسا روی کردە ئەندامە ئامریکاییەکانی کۆمیتەکە و گوتی:

«زیاتر لە سێسەد ساڵ زیاتر لە پلیمۆس Plymouth (بەندەرە شارێکە لە باشوری

ئینگلستان-وەرگێڕ) کەشتیەک بەرەو جیهانی نوێ زەریای تەیکرد، کەشتیەکە ناوی مایفلاوەر Myflower بوو. ئەوە گەورەترین روداوی میژووی ئامریکاو ئینگلیزەکان بوو. من دەپرسم ئاخۆ چەندان ئامریکایی یان چەندان ئینگلیز بە دەقاودەقی دەزانن کەی کەشتییەکە بەڕێکەوت، چەند کەسی لەسەر بوون، چ نانێکیان دەخوارد کاتێ لە پلیمۆس دەرچوون؟»

هەندێکیان پێکەنین و ئەوانی دیکەش شانیان هەڵتەکاند.

درێژەی بەقسەکانیدا:

«بەڵێ، زیاتر لە سێهەزارو سیسەد ساڵە جوەکان لە میسر دەرچوونە. کەواتە سی سەدە پێش ئەوەی مایفلاوەر بە دەریادا بڕوا. بەڵام هەمو جوێکی جیهان دەزانێ روداوە دیرۆکیەکەی باپیرانی کەی قەوماوە. ئەوەش لە پانزەی نیساندا بوو. ئەو نانەی دەشیانخوارد ماتزۆ (نانێکی نەترشاو و هەڵنەچو و خڕ-وەرگێر) بوو.»

«ئێستاشی لەگەڵدابێ جوەکانی جیهان، لە ئامریکا، لە روسیا، لەهەمولایەک، لە پانزەی نیساندا هەمان نان دەخۆن و چیرۆکی تاراوگەی میسر دەگێڕینەوە... هەمو کاتێکیش بەو وشانە دوایی پێدەهێنن:

«ئەوساڵ ئێمە هێشتا کۆیلە بووین، ساڵی دادێ ئازاد دەبین. ئەمساڵیش ئێمە لێرەین، ساڵی دادی ئێمە لە وڵاتی ئیسرائیل دەبین.»

ئەنجا بنگۆریۆن روی لەو پیاوە کرد کە دەربارەی ئەفلاتونی نوسیبوو.

«بەڕێز کرۆسمان لە لەندەندا پرسێکی قورسی لە جولەکەیەک کرد: گەر هاتو سەرپشکت بکەن لە ناردنی سەدهەزار پەنابەری ئاڵمان بۆ فەلەستین، بە مەرجێک واز لە بیرۆکەی دەوڵەتی جولەکان بینی، ئایا چ دەکەی؟»

«من دەمەوێ بەرسڤی ئەو پرسە بدەمەوە. وەک خودی خۆم ئامادەنیم گیانی کەس بکەمە قوربانی هەروەها بۆ بیرۆکە سەرمەشقەکانیش کەس ناکەمە قوربانی. من تەنها مافی ئەوەم هەیە خۆم بکەمە قوربانی. من دەکارم داوا لە خەڵکی خۆم بکەم من بکەنە پێشەنگ، بەڵام دەبێ ئەوان خۆیان بڕیاردەربن. من هیچ کەسێک بۆ بیرۆکە سەرمەشقەکانم ناکەمە قوربانی.

«بەڕێز کرۆسمان لەسەری بوو روی دەمی پرسەکەی بکاتە ئەو سەدهەزار پەنابەرەی ئاڵمان. بەڵام گەر تۆ لێیانبپرسی ئاخۆ ئەوان ئامادەن بڕوانامەی چوونە فەلەستین وەک خۆت ناوتلێناوە بکڕن بەوەی دەستبەرداری کۆمۆنوێلسێکی سەربەخۆی جولەکان بن، من دەشزانم وەڵامەکەیان چی دەبێ...

«وادابنێ کە هیتلەر سەدهەزار ئینگلیزی لەبندەستدابوو، زیندانیکردبوون، ئەوسا بە وینستۆن چەرچلی بگوتبا: گەر کەشتیگەلی ئینگلیزم نەدەیێ دەنا هەر سەدهەزار زیندانیەکان دەکوژم»، تۆ بڵێی چەرچل چی وەڵام دەدایەوە؟ ئەو دەیزانی کە وەڵامەکە بۆ سەدهەزارگیراوەکە بەجێدێڵێ. ئەوان نایانەوەی زیاتر لەناو بچن لەوەی لەسەر حیسابی مانەوەی کەشتیگەلی ئینگلیزدا بژین؟»

رۆژی پێش گەڕانەوەی کۆمیتەکە، کرۆسمان قسەی لەگەڵ گەورەپیاوی هیستادروت لە تەلئەبیبدا کرد، ئەنجا سەردانێکی بنگۆریۆنی لە خانوەکەی نزیک زێدا کرد. ئەو لە

ژوری خوێندنەکەیدا کە بە کتێبی گریکی دەورەدرابوون دانیشتن و بابەتی سەرەکیان دەربارەی ئەفلاتون بوو.

کاتێکیش بنگۆریۆن لەگەڵ میوانەکەی تا لای ئۆتۆمبێلەکە رۆیشت و بەڕێیدەکرد، گوتی:

«تۆ دەبێ بۆ ئێمە یان لەسەر ئێمە بڕیار بدەی، بەڵام لەبیرتان نەچێ ئێمە هەرچی روشبدا ئامادەی کارێکی هاوچەشنی داونکەرکەین ( داونکەرکە شوێنی سەر زێیە لەدیوی فەڕەنساوە، لە جەنگی دوهەمیی جیهانییدا بە دەیان هەزار سەربازی ئینگلیزی و فەڕەنسای بەرەو دیوی بەریتانیا کشانەوە، کشانەوەیەکی سەرکەوتوانە بوو تا دواتر خۆیان جۆشبدەنەوە شەڕ دژی نازیەکان درێژە پێبدەنەوە-وەرگێر.») لەوکاتەی پاسەوانەکەی کرۆسمان سواری ئۆتۆمبێلەکە دەبوو تێبینیەکی لەمەڕ مەترسیەکانی رێگای تەلئەبیب-ئۆرشەلیم دەربڕی.

بنگۆریۆن سەری خۆی لە جامی کراوەی ئۆتۆمبێلەکە نزیککردەوە بەڕێکەوت گوتی:

«گوێ مەدەرێ، زەنگم بۆ هەمو تیرۆرستەکانی رێگا لێداوە، مەترسە هیچ لە گۆڕیدا نیە. خواحافیز!»

ئامۆس بنگۆریۆن بێئەوەی سەری پەنجەشی بە خوێندا بێ بەشداری نەبەردییەکانی تۆبروک Tobroek، هەڵمەتی ئیتالیا، گۆڕەپانەکانی شەڕ لە بەلژیک و هۆڵەندای لەڕیزی هێزی جولەکانەوە کرد، بەڵام کەمێک دوای کۆتاییهاتنی جەنگ دەبووایە لە نەخۆشخانەی لیڤەرپول Liverpool لەبەر نەخۆشی مەداری(ئیستوایی Tropical) بخەوێ. پەرستارەکەی کیژێکی جوانی پرچڕەشی ئینگلیز، بەناوی ماری کالۆو Mary Callow بوو، بەڕەچەڵەک خەڵکی دورگەی مان Man بوو. هەرزوو ئامۆس نامەی نوسی کەوا حەزی لەو کچە پەرستارەکەی خۆی کردووە. بەڵام تەنها گرفتێک هەبوو، کچەکە جولەکە نەبوو. بەڵام ئەو ئامادەبوو بێتە سەر دیینی ئامۆس.

کەمێک دوای ئەوەی هەواڵەکە گەیشتە تەلئەبیب، دەبووایە سەرلەنوێ باوکی ئامۆس روو بکاتەوە ئاورڕوپا. کاتێک هەگبەکەی تێکنا، هەندێ کتێب و نامیلکەی بە زمانی ئینگلیزی خستنە نێو هەگبەکەی، چونکە پێیوابوو دەبێ ماری بیانخوێنێتەوە.

کاتێک بنگۆریۆن خۆی بە بوکەکەی ناساند( ئەو دوو سعات لە وادەی مارەکردنەکەیان دواکەوتبوو) یەکسەر کچەکەی کەوتە بەردڵ، بەڵام پێیگوت:

«ئایا تۆ دەزانی کە چیتکردووە؟ تۆ دەبێ قوربانی زۆر گەورە بدەی، چونکە نەوەک ئامۆس بەڵکو تۆ دەبێ لە وڵاتێکی نامۆدا بژی، لەنێو خەڵکێکدا بژی کە زمانەکەیان نازانی و ...»

کیژەکە دەیوسیت رێیپێبگرێ بەڵام ئەو لەسەر قسەکانی بەردەوامبوو:

«ئایا تۆ لەوە دڵنیای کە ئامادەیی ئەو قوربانییەت تێدابێ؟»

ماری بە پێکەنینەوە ئامادەبوونی خۆی نیشاندا.

ئەنجا ئەویش بۆی پێکەنیەوە لەو کتێبانەگەڕا کەبۆی هێنابوون بیانخوێنێتەوە.

بنگۆریۆن لە پاریس بوو کاتێ کۆمیتە ئانگلۆ ئامریکاییەکە راپۆرتی خۆی راگەیاند. بێڤین هەندێ ئەندامی کۆمیتەکەی دڵنیاکربوونەوە( ئـەوەش هەریەکسەر زانرا) کەوا ئامادەیە راسپاردەکانی کۆمیتەکە جێبەجێبکا گەرهاتو راپۆرتەکە بە کۆدەنگی ئەندامانیەوە پەسەندکرا. هەر لەبەر ئەوەش بوو دەرچوونی راپۆرتەکە ئەوەندەی پێچوو؛ لەنێوان ئەندامەکانەوە جیاوازی و دەمەقاڵی زۆر رویدابوو.

کاتێک بنگۆریۆن راپۆرتەکەی خوێندەوە گوتی:» دەبێ ئێمە راپۆرتەکە سەرلەبەری رەتبکەینەوە!»

کۆمیتەکە بیرۆکە سەدهەزار پەنابەرەکەی ترومانی لەخۆگرتبوو، هەرچەندە ئەو خەڵکە هیچ شوێنێکی دیکەیان نەبوو داڵدەبدرێن، بەڵام کۆمیتەکە دژی هزری دانانی دەوڵەتی جولەکە بوو. بەڕای کۆمیتەکە دەبووایە رێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان سەروکاری بەڕێوەبردنی فەلەستینیان تا دروستکردنی وڵاتێکی دوانەیی کە عەرەب و جولەکەکان وەک یەک دەسەڵاتی هەبووایە، بکردبایە.

بەمجۆرە کۆمیتەکە هەوڵی بۆ شتێکی ئاستەم دا؛ راپۆرتیکی وا بنوسن کەوا بە دڵی بێڤین، ترومان، بنگۆریۆن، وایزمەن، موفتی و کۆمکاری عەرەبی واتە هەمولایەکیان بێت.

هاوڕییانی بنگۆریۆن سەبارەت بە کاردانەوە لە هەمبەر رەتکردنەوەی سەرلەبەری راپۆرتەکەدا لەگەڵیدا هاوڕانەبوون. ئەوەی هەنوکە لە لەندەندا رویدا بۆ ئەوان مایەی ئۆخەی بوو. بێڤین قسەکانی خۆی شکاندن. راسپاردەکانی کۆمیتەکە جێبەجێ ناکرێن، حکومەتی پارتی کرێکاران رایگەیاند کە ئەوکات رێگا بە پەنابەرانی ئاوڕوپا دەدا کە هاگانا و رێکخراوە چەکدارە نهێنیەکانی دیکە هەڵبوەشێنرێنەوە و ئاژانسی جولەکانیش کۆتایی بە تیرۆر بهێنێ.

مرۆڤ لە لەندەنەوە دەکرا پێشکات بزانێ کە بەلاوەنانی راسپاردەکانی کۆمیتەی ئانگلۆ ئامریکایی و قسەخواردنەوەی بێڤین، ئاڵۆزی و ئاستەنگی نوێی لێدەکەوێتەوە.

هەزاران کۆچبەر بە قاچاخ گەیەنرانە وڵات. زۆر جاران جولەکە بەرگریکارەکان بۆ دابەزاندنی ئەو کۆچبەرانە و گەیاندنیانە شوێنی حەوانەوەیان لەگەڵ هێزی چەکداری ئینگلیز توشی شەڕو روبەروبوونەوە دەهاتن. نزیکەی هەمو شەوێک تەقە دەکرا. شەمەندەفەرەکان دەتەقێنرانەوە. پردەکان دەرِوخێندران. پێنج لە پیاوانی رێکخراوی ئیرگون گیران و بڕیاری مردنیان بەسەردا سەپێنرا. هـەروەک پەرچەکردارێکی تۆڵەکردنەوە پێنج سەربازی ئینگلیزیش رفێندران.

بێڤین لە باوەرنەمۆس Bournemouth وتارێکی دا، تیایدا رایگەیاند گەر رێ بەو سەدهەزار کۆچبەرە بدرێ ئەوا دەبێ لەشکرێکی تەواوی ئینگلیزی دیکە بنێرێتە فەلەستین. بەڵام ئەو بۆ ئەو کارە ئامادە نییە.

نائارامی زیاتر پەرەی سەند، تا ئینگلیزەکان لە دوایدا رێکاری تەواو توندوبەندیان گرتەبەر.

لە رۆژی شەممەی ٢٩ی حوزەیراندا، زۆر لە دانیشتوان بە پەشۆکاوی لەبەر

دەنگێ تەقینەویەکی زۆر بە سەدا، لەخەو بێدار بوونەوە. ئۆتۆمبێلەکانی بەریتانیەکان بە شەقام و کۆڵانەکاندا دەسوڕانەوە، بە بڵندگۆکانیشیان ئاگاداری خەڵکیان دەکردەوە، کەسیان لە ماڵ نەچێتەدەرەوە.

«هەمو کەسێک جارێ لەو شوێنەی لێیەتی بمێنێتەوە و نەبزوێ.

ئەوەی گوێی لە رادیۆ بگرتبا، لە ئاگادارینامەکە دەگەیشت. بە زمانی عەرەبی، عیبری و ئینگلیزی رایاندەگەیاند کە کۆمسیاری باڵای بەریتانیا «ئۆپەراسیۆنێکی گەورەی» دژی ئاژانسی جولەکان و هاگانا کە لەو بێقانونیەدا بەرپرسیارن، دەستپێکردووە.

لە ئورشەلیمدا سەربازە ئینگلیزەکان دەستیان بەسەر تەلاری ئاژانسی جولەکەدا گرت؛ لەبەر رۆژی شەممە(سابات) دەرگاکان داخرابوون بۆیە دەروازەکەیان بە دینامێت هەڵتەکاند و چوونە نوسینگەی هەمو رێکخراوە جوەکان و رەشبگیریان کرد، بە هۆیەوە هەزاران ژن و پیاو کە بۆیەکێک لە رێکخراوەکانیان کاردەکرد، گیران.

د.وایزمەن کە دەبوایە لە ماوەیەکی کەمدا بەرەو لەندەن چووبا چونکە نەشتەرگەریەکی گرنگی چاوی لە پێشبوو، هیچیان لێنەکرد. سەرە راستیەکەی هاگاناش، ئەو پیاوەی عەوداڵی بوون بیدۆزنەوە و بیگرن، هەرزوو لەلایەن لایەنگرانیەوە گواسترابووە شوێنێکی دیکەو نەکەوتەبەر. بنگۆریۆنیش لەگەڵ سکرتێری سیاسیی و موحاسیبەکەی ئاژانسی جولەکان لە پاریس بوو. ئەندامەکانی دیکەی «حکومەتە سێبەرەکە»گیران و رەوانەی لاتورن laturen کران.

موفتیش کە خزمەتی زۆری هیتلەر ومۆسۆلینی کردبوو ئازادانە لە قاهیرە دەسوڕایەوە، بەڵام شیرتۆک ئەو کەسەی کە بە لەشکرێکی بیستوپێنج هەزار سەربازی یارمەتی ئینگلیزەکانی دا و سەریخستن، هەنوکە لەگەڵ سەدان پیاودا کە لە جەنگی جیهانیی دوهەمدا لە پاڵ هێزی هاوپەیماندا شەڕیان دەکرد، لە پشت تێلدڕی ئۆردوگای گیراوەکاندایە.

بنگۆریۆن هەواڵی ئەو ئۆپەراسیۆنە سەربازییانەی بە تێلگرامێکی کۆدەداردا کە لە ئۆرشەلیمەوە ناردرابوو، پێگەیشت. لە پەیامەکەدا ئاگادار کرابووە کە نابێ ئەو و شیلۆهای سکرتێری سیاسی بگەڕێنەوە فەلەستین چونکە پۆلیسی ئینگلیزی بەدوایاندا کونبەکون دەگەڕێن.

شیلۆها لە رۆژە بەدواداهاتوەکانی روداوەکەدا زۆر سەرقاڵ بوو.

بنگۆریۆن زۆرجاران هەر دەیگوتەوە؛ «من دەبێ دەستبەجێ بگەڕێمەوە.»

شیلۆهاش پێی لەسەر ئەوە دادەگرت کە جارێ ددان بەخۆیدا بگرێ و چاوەڕێبی. «بەڵام من دەمەوێ لەوێ لە تەنگانە لەگەڵیاندا بم.»

شیلاهۆ زۆرجارانی بۆ چەند بارەدەکردەوە کە ئەو لە دەرەوەی زینداندا بێ باشترە و باشتری خەبات بۆ گەلەکەی پێدەکرێ.

بنگۆریۆن کاتێک بەهێواشی بیری دەکردەوە، هاوڕیکەی پێڕاست بوو، بەڵام دڵی وای نەدەگوت، چونکە بۆ فەلەستینی لێدەدا. بە رۆژان ئەو لەمیوانخانەکەیدا هەردەهاتو دەچوو. بە دەمارگیریی و پەلەوە هەواڵنامەی رۆژنامەکانی دەخوێندنەوە.

رۆژێکیان شیلاهۆ چووبووە بازاڕ تا رۆژنامەکان بکڕێ. کاتێک گەڕایەوە

میوانخانەکە، بنگۆریۆنی لەسەر تێکنانی هەگبەکەیدا گرت.
هەروەک مێردمنداڵێک کە بزانێ کەتنێکی کردووە، بنگۆریۆن دانی بەوەدا نا کە جێگای لە نێو فرۆکەدا گرتووە. بە نابەدڵی هەگبەکەی دانایەوە.
دو شەو دواتر، لە پڕێکەوە بنگۆریۆن کە لە گۆشەیەک دانیشتبوو دەیخوێندەوە، بە شیلاهۆی گوت:
«لەو بڕوایەدام زار هەڵدراوە و دوشەشمان بۆهاتووە، دوو ساڵی دیکە نابا لەنێو دەوڵەتی جولەکەدا خۆمان دەبینینەوە.»
لە رۆژێکی گەرمی تەموزدا برادەرە پاریس نشینەکانی هاتن و هەواڵێکی ناخۆشیان پێڕاگەیاند.
لە رادیـۆدا ئاشکراکرا کەوا میوانخانەی شا داود لە ئۆرشەلیم تەقێنراوەتەوە. بەشێکی (باڵێکی) میوانخانەکە بە تـەواوی تەقێندراوەتەوە. حەفتا وپێنج تا سەد کوژراوی لێکەوتۆتەوە.
بە سعاتان بنگۆریۆن لەبەردەم رادیۆدا دادەنیشت و گوێی قوڵاخکردبوو. هەمو رۆژنامەکانی کە بۆی دەهاتن دەیخوێندنەوە.
ئەوە یەکەمین شێوەی تیرۆر بوو. لەوەیاندا جێدەستی رێکخراوی ئیرگۆن دیاربوو، لەو سەرلێدەرکردنەدا ئەو هیچ گومانی نەبوو.
«ئۆپەراسیۆنەکە»لە سعات ١٢:١٠دا بە کاتی ئۆرشەلیمدا بوو، دوای ئەوەی بە تەلەفون سێ جاران لەسەریەک میوانخانەکە و کونسولی فەڕەنسی و رۆژنامەی پۆستPost و رۆژنـامـەی فەلەستین ئـاگـادارکـرابـوونـەوە. بـەڵام کـەس گوێی بە هۆشدارینامەکانیان نەدابوو. کەس فەرمانی پێنەدان تەلارەکە چۆڵ بکەن. بە گوێرەی راپۆرتێک ئەفسەرێکی ئینگلیز گوتبووی:
«ئەز بۆئەوە نەهاتوومەتە ئێرە تا فەرمان لە جولەکەوە وەربگرم و جێبەجێیان بکەم، بەڵکو بۆ ئەوەهاتوم فەرمانیان بەسەردا بکەم.»
تیرۆرستەکان خۆیان وەک عەرەبان هەڵخستبوو و بۆبمبەکانیشیان لەنێو دەبەی شیردا دانـابـوون لە ئۆتۆمبێلیان بـارکـردبـوون؛ ئۆتۆمبێلەکەشیان لە ژێرزەمینی میوانخانەکە راگرتبوو، لە ژێر ئەوباڵەی کە نوسینگەی کارمەندە ئینگلیزەکانی لێبوو. لەنێو قوربانییەکاندا ژمارەیەکی زۆر کرێکانی جولەکە کە لە راژەی دەسەڵاتی منداتەکەدابوون، هەبوون. بنگۆریۆن هەندێکی لێدەناسین. دوو رۆژ دواتر لە لەندەن کتێبێکی دیکەی سپی دەرچوو. تیایدا هاتبوو کە رێکخراوی ئیرگون و تاقمی ئەستێرە کە چەند مانگێکە لەگەڵ هاگاندا هاوکارن، راستەوخۆش لەژێر فەرمانی ئاژانسی جولەکاندا یە، ئۆباڵی کردەکەیان لە ئەستۆدایە. لەسەر ئەو بنەمایەدا خودی بنگۆریۆن بە بەرپرسیاری کارەساتی میوانخانەکە دانرا، چونکە ئەو جڵەوی ئاژانسی جولەکانی لەدەستدابوو.
لە ڕاستیدا بنگۆریۆن هیچی لەوە نەدەزانی کە باڵێکی میوانخانەدا بە هەوادا چوو. مناحیم بێگن Menachem Beiginی سەرکردەی ئیرگون دواتر رایگەیاند، لە بەهاردا دوو جاران بیرۆکەی تەقاندنەوەکەی لەگەڵ سەرکردەکانی هاگانادا باسکردووە، بەڵام

ئەوان هەر داوای وەخراندنیان کربوو، بەڵام ئەمجارەیان لەگەڵیان یەکانگیر بوو کە شتەکە روبدا.

دوو سەرکردەکان ئەو قسەی بێگنیان رەتکردەوە؛ گوتیان تەنها بە مەرجێک لەگەڵ پێشنیازەکە کۆکبووین کە تەقینەوەکە لە کاتێکدا بووایە کە کاتی ئێش نەمابایە و هیچ کەسیش لە سویتەکەی میوانخانەکەدا نەبووبایە.

بنگۆریۆن بۆ رونکردنەوەی هەڵوێستەکەی بە دەستی خۆی نوسی:

«ئێمە دەسەڵاتمان بەسەر تیرۆرستەکاندا ناشکێ. ئێمە ناتوانین کاریان تێبکەین و نە راستەوخۆو و نەناراستەوخۆش لە کردەکەیان بەرپرسیان نین. ئەوان هیچ شێوە دیسپلینێکی نیشتمانیی و گشتی نایانگرێتەوە.»

هەفتەیەک دوای تەقینەوەکە لە رادیۆدا بنگۆریۆن رایگەیاند کە ئەو بیستهەزار سەربازەی ئینگلیز تەلئەبیبیان گۆڕیوە و کردووتیانە مۆڵگەیەکی سەربازییانە و لە هەمو پەیوەندییەکیان بە بەشەکانی دیکەی وڵاتەوە دابڕیوە. رێسای هاتوچۆقەدەخەکردن دەرچووە. تەنها ژنەکان لە دوای نیوەڕۆکاندا بۆ ماوەی دوو سعات بۆیان هەیە بازاڕ بکەن، بەدەر لەوە نابێ هیچ کەس بێتە دەرەوە. ئەوەی سەرپێچیش بکا بێ سێودوو تەقەی لێدەکرێ.

لە ماوەی چوار رۆژدا بیستوپێنج هەزار ژن و پیاو لە خێوەتە هەڵدراوەکانی گۆشەی شەقامەکاندا ئیفادەیان لێوەرگیرا. ئەوانەی ئیفادەیان دەدا مۆرێکیان لەنێوچاوان دەدرا تا» بەران لە مەڕەکان جیابکەنەوە.»

بنگۆریۆن زۆر لەو لەکەدارکردنە جەماوەرییە تورە ببوو، بەڵام هیچیشی لەدەست نەدەهات. چونکە هەر ئاگادارینامەی بۆ دەهاتن کە نابێ جارێ بگەڕێتەوە، بۆیە بەرە و ئامریکا رۆیشت.

دوای ئەوەی ئیفادەی لەبەردەم کۆمیتەی رێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکاندا دا، سەردانی ئامریکای کرد تا بەدوای ئەوەدا بچێ ئاخۆ هەڵوێستی وەزارەتی کاروباری دەرەوەی ئامریکا لە ئاست دۆزی فەلەستیندا چیە.

لە نیویۆرکدا جارێکی دیکە بۆ هەواڵنیران رونکردنەوەی دا. لەنێویاندا کچە رۆژنامەنوس روس گروبەر Ruth Gruberی بڵاونامەی پۆستی نیویۆرکی تێدابوو؛ داوای لە بنگۆریۆن کرد کە گوێی بۆهەڵبخا بەڵکو راپۆرتی ئەو چاوپێکەوتنەی کە داویەتە دەستەی نوسەران بۆ بخوێنێتەوە.

خانمە رۆژنامەنوسەکە شانازی بە وتارەکەی دەکرد کە بۆی دەخوێندەوە. دەستپێکەکەی بەو شێوە بوو: «لە شاری ئێمەدا پیاوێکی لێیە کەبۆ گەلێکی بچوکی فەلەستینی وەک ئەبراهام لینکۆلن Abraham Lincolnە بۆ گەلی ئامریکای سەردەمی خۆی.»

بنگۆریۆن دووجاران ئەو رستەیەی پێ دووبارەکردەوە، ئەوسا بە توندی بەدەنگ هات:

«چۆن وێرای من لەگەڵ ئابراهام لینکۆلندا بەراورد بکەی؟»

پەیامنێرەکە ویستی بۆی رونبکاتەوە.

بەڵام بنگۆریۆن قسەی پێبڕی. تورەییەکەی هەندێک دابەزیبوو. لەسەرەخۆ گوتی:

«گەر من بیر لە مەزنەپیاوێک بکەمەوە، ئەوا بیرلە ئابراهام لینکۆلن دەکەمەوە. بەڵام من کێم؟ پیاویلکۆکەیەکی بچوکی جو.»

لەو کاتەی ئەو لە نیویۆرک بوو، ئاشنایەتی لەگەڵ ئالێکساندەر پێکلیس Alexander Pekelisپەیداکرد. ئالیکساندەر کۆچبەرێکی جولەکەی ئیتالیایی بوو، پێش پێنج ساڵ دەبێ هاتۆتە ئامریکا، بەڵام ببووە سەرنوسەری Columbia Law Review. بنگۆریۆن بە زیرەکی و خۆشویستنی زایۆنیزمیەکەی دڵگیر بوو. بنگۆریۆن بانگهێشتی کرد کە وەک میوانێکی خۆی لە یەکەمین کۆنگرەی زایۆنی دوای جەنگی دوهەمی جیهانیی کە لە ماوەیەکی کەمی دادێدا لە بازلی سویسرادا دەبەسترێ، بەشداربێ.

لە کۆنگرەکەی بازلدا بیچمی هەرە زیاتر کە مایەی بەزەییپێداهاتنەوە بوو، هی خودی د. حایم وایزمەن بوو؛ لەشساخیەکەی لەنگی تێکەوتبوو، لەروی ورەو گیانیشەوە بەهۆی ئەو روداوە توندوتیژیانەی  فەلەستین تێکشکابوو، بەڵام هەر دەشیویست بۆ دواجار بانگی نەرمڕەوی هەڵبدا کە زۆر بڕوای پێی هەبوو.

لە وتارەکەی خۆیدا گوتی: «تەمەنم بۆتە حەفتاودوو ساڵ، لەوانەیە ئەوە دواجار بێ قسەتان بۆ بکەم.»

لە هۆڵەکەدا زیاتر لە چوارسەد  نوێنەری شانزە وڵات و هەزاران میوانیش هاتبوون. هەمو ئامادەبووان زگیان بە زانا نەخۆشەکە دەسوتایەوە، بێگومان دوای مەرگیشی بە شانوباڵیان هەڵدەدا، بەڵام ئەو بۆ دۆزێکی دۆڕاو تێدەکۆشا، نەخاسمە کە جارێکی دیکە لەسەر ئەوە مکوڕ بوو کە متمانە بە بەریتانیای گەورە بکەن.

بێڤین هەوڵەکانی وایزمەنی ئاستەنگ کردبوو. هیچ واتای نەمابوو داوا لە جولەکان بکرێ ددانبەخۆیاندا بگرن و بڕوا بە ئینگلیزەکان بکەن  بەڵکو خێریان پێبکەن.

بنگۆریۆن لە ئامریکادا بێدەنگ دانەنیشتبوو. مشوری ئەوەی خواردبوو کە زۆرینەی نێردەی ئامریکایی لە کۆنگرەی بازلدا پشتی بگرن. تەنانەت رابی سیلڤەریش کە پێشتر زۆرجاران بیروڕایان یەکنەدەگرتەوە، هێنایە سەر ئەو بڕوایە پاڵپشتیبێ. وایزمەن لە ئانوساتی دواندانەکەیدا پێیزانی. هەر بۆیەشە زۆرجاران روی دەمی دەکردە نێردەی ئامریکایی.

«پێویستە ئەوەتان لەبیر نەچێ کە لە نیویۆرکەوە دنەدانی بەرەنگاری ئاسانە... مرۆ باشتر لە زێ دەتوانی مەلە بکا تا حەوزێکی بچوکی مەلەوانی... ئامریکایەکان بە درەنگەوە بێدار بوونەتەوە.»

لە تێڕوانینێکی روکەشانەدا ئەو پرسە سەریهەڵنەدا ئاخۆ کامەیان باشترین سەرکردەیە، وایزمەن یاخود بنگۆریۆن؛ بەڵکو پرسەکە ئەوە بوو ئاخۆ پێویست دەکا مرۆ درێژە بە دانوستاندن لەگەڵ ئینگلیزەکاندا  بدا یان نا.

پشتگیری بنگۆریۆن لەو پنتەدا جارەنوسسازانە بوو. ئەو لەگەڵ ئەوەشدا لە بەرامبەر وایزمەندا بەڕێز و نەرمڕۆ بوو. راستەوخۆ دانەبەزیە سەر زانا نەخۆشەکە،

بەڵام قسوری بە ئینگلیزەکان نەکرد.

«ئێمە وەک دەرۆزەکەرێک بۆ خێرپێکردن روو لە ئینگلیزان ناکەین. ئێمە داوای مافی رەوای خۆمان دەکەین. ئێرتز Eretz (وڵاتی) ئیسرائیل داگیرکراوێکی بەریتانیا نییە، هەروەها بەشێکی ئیمپراتۆریەتەکەشیان نییە. ئینگلستان ناتوانێ ئەوە بسەپێنێ کە دەیەوەێ، وەک ئەوەی فەرمان بەسەر هاوڵاتیانی خۆیدا بکا.»

لە کۆتایی دوانەکەیدا بانگی ئازایەتی، کۆڵنەدان و ئامادەبوونی قوربانیدانی هەڵدا.

بنگۆریۆن و سیلڤەر بە زۆرینەیەکی کەم بردیانەوە. وایزمەن بۆی دەرکەوت کە کۆنگرە متمانەی بەو نەماوە؛ هۆڵەکەی جێهێشت و هەگبەکەی تێکناو بەرەو لەندەن گەڕایەوە.

هەنوکە بنگۆریۆن سەرکردەیەکی بێ ڕکابەرە چ بۆ جوەکانی فەلەستین چ بۆ رێکخراوەکانی زایۆنیزمی جیهانی دەرەوەش.

هەستی خۆشی سەرکەوتن لە سۆنگەی هەواڵە ناخۆشەکانی فەلەستین، بەهۆی دەربرینەی ماتەمبارانەی سەر بیچمی د. وایزمەن کاتێ هۆڵە گەورەکەی کۆنگرەی بازلی جێهێشت، هەروەها بەهۆی هەواڵی برادەرە تازە زایۆنیستە ئیتالیایەکەی کە لە نیویۆرک ناسی، دوای گەڕانەوەی لە کۆنگرەکەدا بۆ ئامریکا بە روداوی تێکشکانی فڕۆکەکەی گیانی لەدەستدا بوو، دامرکایەوە.

# بەشی
## (١١)

گیانی بنگۆریۆن مینای چرایەک بوو، بە هەمو لایەکی خۆیدا دەسوڕایەوە. گەرهاتو بیخستبایە سەر مژارێکی دیاریکراو، روناکیدەکردەوە، تیشکی زۆری دەخستەسەر، تا هەمو لایەنە تاریکەکانی روناکدەبوونەوە. لە ١٩٤٧دا چرا لێکۆکڵینەوە گیانییەکەی ئاراستەی شتێکی نویَ کرد.

هەرچەندە لەو چەند ساڵانەی رابردوودا لە کابینە سایەکەی ئاژانسی جولەکاندا ئەندام بووە، بەڵام بە شێوەیەکی بەرچاو و دیار هیچ پۆستێکی دەستنیشانکراوی داوانەکردبوو؛ لە کۆنگرەی بازلەوە پۆستی بەرگریکردنی پێسپێردرا، ئەوان ناوی «ئاسایشی گشتییان» لێنابوو.

«من ئەو پۆستەم لەبەر ئەوە پەسەند نەکرد کە ژەنەڕاڵێک بم، یاخود شارەزاییم لە زانستی سەربازیدا هەبێ، بەڵکو لەبەرئەوەی کاروباری سەربازییانە وەک هەر کاروبارێکی کردەییانە، کاربەدەستە باڵاکانیان لە هەمو لایەنە وردەکاریەکانی تەکنیکی پسپۆڕ نین... ئەوەندەیان بەسە کە نیگایەکی کراوەیان هەبێ و لە شتان تێبگەن، ئەو تایبەتمەندیانەش کەم تازۆر لە هەمو مرۆڤێکی ئاساییدا هەیە.»

ئەو رونکردنەوەیەی بنگۆریۆن گەواهیەکی زەقی خاکیبوونەکەی زۆرەکەی بوو. بنگۆریۆن ئامادە نەبوو ئەرکەکەی وەک سەرکردەی گشتی لەشکری ژێرزەمینی وەک هەر پیاوێکی سادە بەڕێوە ببا. ئەو بە تاسەو پەرۆشەوە، بە لێوردبوونەوە، بە چرارۆشنکەرەوەی تاکنیکیانەکەی خودی بنگۆریۆن بۆ پۆستە نوێکەی رۆیشت.

پێش ئەوەی ئامادەی هەر شەڕێکی دیکە بێ، دوا هەوڵ و تەقەڵلای لەگەڵ ئینگلیزەکان بۆ دانوستاندن دا. بە گوێرەی ئەنجامەبڕیاری بازل نەدەبووایە دانوستانەکان لەگەڵ ئینگلیزدا لە «بن هەلومەرجێکی زاڵدا» دەستپێبکاتەوە. بەڵام بنگۆریۆن لەگەڵ چەند هاوکارێکی لە سویسڕاوە بەرەو ئینگلستان رۆیشتن، تا بزانێ ئایا ئەو «هەلومەرجە زاڵە»هیچ گۆڕاوە.

لە دەستپێکی گفتوگۆکانیان لە ژوری میوانخانەیەکدا بنگۆریۆن پێیراگەیاندن دەکرێ لەسەر نەخشەی دابەشکردنی فەلەستین رێکبکەون. بە دەدستخەتی خۆی نەخشەیەکی کێشا ( نەخشەکەی لە نەخشەی ئیسرائیلی هاوچەرخ نزیک بوو ) . ئەوانی دیکە لەو پرسەدا لەگەڵی کۆک نەبوون.

لە کۆتاییدا بنگۆریۆن و بیڤین لە لەندەن لەگەڵ یەک روبەرو دانیشتن. هەر یەکسەر

کەشێکی نادۆستانەیان بەسەردا زاڵ بوو.
کاتێک بنگۆریۆن شتێکی لە بارەی پێغەمبەرە کۆنەکانی ئیسرائیل گوت، بێڤین قسەی پێبڕی تا لێیبپرسێ ئایا دەزانی کە رۆڵەکانی ئیسرائیل چییان بەسەر ئەو کۆنە پێغەمەبەرانەدا هێناوە.
بنگۆریۆن خەونی بە بوژاندنەوەی نەمریی ئیسرائیلی دێرین دەدی و لە شوێنی خۆی بێڤنی تەزاند. ئەو هەڕەشەی بەوە لە بنگۆریۆن کرد، کە بە تەواوی خۆی لە دۆزی فەلەستین دەکێشێتەوە و دەیداتە دەست ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان.
لەسەر خوانە تایبەتیەکەی نیوەڕۆدا کاربەدەستێکی بەریتانیایی گوتی کەوا بێڤین گرەو لەسەر هەڵوێستی دژوەستانەوەی روسیا، رەفتارە یەکلانەبووەکەی ئامریکا، دەنگی کۆمۆنوێلسی بەریتانی و ناڕەزایەتی هەمو جیهانی عەڕەب دەکا.
لەو کاتەی لە لەندەندا گەرمەی دانوستانەکان بوو، بزنسمانێک و دادوەرێکی ئینگلیز لە ئۆرشەلیمدا رفێندران، بە هۆیەوە کێرڤی لایەنگرێتی بێڤین بۆ بنگۆریۆن و جوەکانی فەلەستین زیاتر دابەزی.
هەوڵەکانی گەیشتن بە چارەسەرییەک بە پێشنیازێکی بێڤین کۆتاییان پێهات کە ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان بێتە ناوبژیکار، نەخشەکە دەستبەجێ چ لەلایەن عەڕەبەکان چ لەلایەن جولەکەکان رەتکرایەوە.
بنگۆریۆن گەڕایەوە ماڵ. بەندکراوەکانی لاترون، پاش ئەوەی پێنچ مانگان لەنێو ئۆردوگایەکی تەلبەندکراودابوون، ئازادکران؛ هەروەها فەرمانی گرتنی بنگۆریۆنیش کێشرایەوە.
نزیکەی ساڵێک بەسەرچوو. پاولاو منداڵەکانی لە بارێکی باش بوون، بەڵام ئەوانیش وەک زۆرینەی دانیشتوانی تەلئەبیب شەکەت ببوون. هەفتەیەک پێشتر دیسان شەڕو دەمەقاڵێ قەومابووەوە، پێکدادان لەگەڵ سەربازەکان رویدابوو چەند کەسێک کوژرابوون و زیاتر لە یەک ملیۆن دۆلاریش زیانی ماددی لێکەوتبووەوە.
لە کاتی لەوێنەبوونیدا بنگۆریۆن تەمەنی گەیشتبووە شەست ساڵ. ئەوە راست نیە بگوترێ کە بنگۆریۆن هەرگیز جەژنی ساڵڕۆژی خۆی گێڕابێ.
بە برادەرێکی فەلەستینی گوتبوو: «بۆچی ئەو رۆژە دەکەیتە جەژن؟ رۆژی لەدایکبوون ئەوە ناهێنی بیکەیتە جەژن. گەر دەتەوێ جەژن بگێڕی، ئەوا بیر لە رۆژێک بکەرەوە کە تیایدا شتێکت کردبێ و شایانی ئەوەبێ جەژنی بۆبگێڕی، بۆنمونە ئەو رۆژەی کە هاتویتە فەلەستین هی ئەوەیە بیکەیتە جەژن.»
ئەو خۆپێگەیەنەرە شەست ساڵییە هەنوکە خەریکی فێربوونی ئەوەیە کە سەرکردەی گشتی هێزەچەکدارەکان چی پێویستە بزانێ.
لەو تەمەنەدا وزە و تامەزرۆی گەنجێکی بۆ خوێندن و لێکۆڵینەوە نوێیەکەی هەبوو. ئەو هەمو کتێبەکانی لەسەر لایەنێکی دیارکراوی زانستی سەربازیانە کە بەردەستی دەکەوتن، خوێدندنەوە.
داوای لە فەرماندە جۆربەجۆرەکانی بەشەکانی هاگانا کرد بێنە لای لە تەلئەبیب، لەگەڵ یەکە یەکەیان دەچووە ژوری خوێندنەکەی و پرسیاری لێدەکردن. ئەو چرا

گیانییەکەی خستبووە سەر هەمو بەشەکانی کارو چالاکییەکانیان.
یاکۆڤ دۆسترۆڤسکی yaacov Dostrovsky فەرماندەی گشتی هێزەکانی هاگانا، کە تازە لە سەردانە نهێنیەکەی بۆ چەک کڕین گەڕابووە، یەکەمین کەس بوو بنگۆریۆن بانگیکرد. دوای ئەو نۆرەی ئیسڕائیل گالیلی Israel Galili هات. ئیسڕائیل فەرماندەیەکی هاگانا بوو، جوتیارێکی چوارشانە کە هەرگیز ریزەکانی لەشکرێکی ئاسایی نەدیتبوو، بەڵام بنگۆریۆن بە کارامەییە زۆرەکەی سەرسام بوو. گالیلی ئەندامی ماپام Mapam بوو. ماپامیش پارتێکی لایەنگری روسیا بوو لە فەلەستین. ماپام زۆرترین گەنجی خستنە ریزی پالماخ Palmachی هێزی کۆماندۆی هاگانا.
بنگۆریۆن لەگەڵ ئیگال یادین Yigael Yadinیش قسەیکرد. ئیگال لە فەلەستین لەدایک ببوو، شارەزای بست بە بستی خاکەکەی بوو. باوکی ئارکیۆلۆجیکی ناسراو بوو کوڕەکەشی شوێنپێی باوکی هەڵگرتبوو.
ئیگال یادین و بنگۆریۆن گفتوگۆیەکی گەرم و دوورودرێژیان کرد، لە میانەی گفتوگۆکەیاندا چەندان جار سەرۆک وەزیرانی داهاتوو لە مێزەکەی دەدا و بە هۆیەوە پەرداخەکان دەلەرانەوە و جارێکیشیان پەرداخێکیان کەوتە سەر زەوی. لەو کاتوساتەدا گەر گەنجێکی دیکە بوایە دەیگوت «بەڵی، بنگۆریۆن» بەڵام ئیگال یادینی لاواز کە کەللەسەرەکەی لەهی بەرپرسە باڵادەستەکەی بەرامبەری گەورەتربوو، لە شوینی خۆیدا رەق راوەستا. بنگۆریۆن زۆر بە لەسەرهەڵوێست سوربوونەکەی ئیگال کارانگاز بوو، هەرچەندە تازە تەمەنی گەیشتبووە سی ساڵ، بەڵام هەر کردیە بەرپرسی ئۆپەراسیۆنەکانی هاگانا.
ئیگال ئالۆن Yigal Allon، سابرایەکی قژزەردی کوڕە جوتیار کە ساڵێک دوای بەڵێیننامەی بەلفۆر لە گالیلیا لە دایک ببوو، هات. ئەو تازە بیست و نۆ ساڵان بوو، بەڵام بەڕاستی فەرماندەیەکی پالماخ بوو، سەربازێک حەزی لە دەربڕینی رەق بوو، رەفتارەکەی لەگەڵ بنگۆریۆندا دەکریٚ وا وێنابکریٚ کە «شتێک لە لێواری نێوان زیندوێتی و برادەرایەتیەکی لە ناخەوە»بوو. لە رۆژگاری جەنگی جیهانیی دوهەمدا ئەو خۆی چوبووە بن بەرگی عەرەبان و بە سوریادا دەسوڕایەوە و وەک جوێکی فەلەستینی پێشقەرەوڵی هێزەکانی ئوسترالی بوو.
بنگۆریۆن ئەو بیچمە گرنگانەی بەناوی یەکەمەوە بانگ دەکردن، ئەوانیش لەبەردەمیدا بە بنگۆریۆن ناویان دەهێنا، لەکاتێکدا لەنێو خۆیاندا هەر بە «پیرەمێردەکە» یان ب.گ(پیتەکانی سەرەتای ناوەکەی) ناویاندەبرد.
بنگۆریۆن بە قەڵەمێکی داری کە لە دەستیدا بو دەفتەرێکی سەر ڕانی لە کاتی گوێگرتنەکەدا بە وردی تێبینیەکانی بە زمانی عیبری دەنوسینەوە، ژمارەی لاپەڕەکانی یاداشتکراوەکانی گفتوگۆی ئەو زانیاریانەی ئەوان بۆیان هەڵدەڕشت بەسەدان لاپەڕە بوون.
ئەوان ئەو دانیشتنانەیان بە «کۆلیژی بنگۆریۆن» ناودەبرد. ئەوان تەکنیکی کۆماندۆی هاگانایان روندەکردەوە، فڕوفێڵەکانیان کە لە سەردەمی وینگێتەوە فێرببوون، توانا و ئەگەرە سایکۆلۆژیەکانی دوژمنەکانیان، مەترسییەکان، گرفتەکان و

چارەسەرەکانیان روندەکردەوە.
ئەنجا بنگۆریۆن کتێبخانەکەی جیهێشت و بە وڵاتدا گەڕا، هەمو ئەو شوێنانەی مۆڵگە و خانوەکانی هاگانای لێبووایە دەگەڕا.
پرسێکی چەندجاران لێدوبارەدەکردنەوە: «ئایا ئێمە لە هەمو شت زیاتر پێویستیمان بە چی هەیە؟»
پالماخ هەزار کچ و کوڕی هەبوون، رێکخراوەکە بارەگای خۆی هەبوو، فڕۆکەیەکی Piper Cubes ) فڕۆکەیەکی بچوکی یەک ماتۆڕییە، چوار کەس هەڵدەگرێ- وەرگێڕ )یان هەبوو نازناوی یەکەمینیان لێنابوو، یەکەیەکی مارینزی بێ کەشتیگەلیان هەبوو، گۆڕەپانی چالاکییان کەنارەکان بوو تا کۆچبەران بهێننە نێو وڵات.
هاگانا پەنجاهەزار سەربازی هەبوو، بەشی تۆپخانەیان بێ تۆپ بوو، بەشی هێزی ئاسمانییان شەش فڕۆکەی کۆنی شوێندۆزەرەوەیان هەبوو کە لە کیبۆتێکدا (نشینگەیەکی هـەرەوەزی کشتیاری جولەکان لە فەلەستیندا) حەشاریاندابوون، هەروەها دوو فڕۆکەی ئینگلیزی کە کەلوپەلیان بۆ نشینگەکان دەبرد، هەبوو، بۆ بۆمبهاویشتنیشیان بەکاردەهێنا بەڵام دەبوایە ئەوکەسەی بۆمبەکان دەهاوێ بۆمبێکی بیستوپێنج کیلۆگرامی لەسەر چۆکەکانی خۆی دانابا ئەوسا لە ئاسماندا بەریدابانە خوارەوە.
ئەو سوپا سەرپێیە لە بیست هەزار تفەنگ، دوسەد مەترالیۆزی سوک و قورس، تفەنگی شێلکەرشێنی دەستکرد پێکهاتبوو، بەڵام نە تانک نە چەکی ئاگرپرژێن و نە کەلوپەلی جەنگیی نوێی نەبوو.
بەڵام گەر لە ١٩٤٧دا تانک، فڕۆکە و تۆپخانەشیان دابانێ، نەیاندەتوانی وەریبگرن. فەلەستین وڵاتێکی بچوکە و مرۆڤ ناتوانێ تانکێک حەشار بدا. سەربازەکان دەبووایە ئەو چەکانە هەڵبگرن کە بیانتوانیبا بە ئاسانی لە ژێرگڵدا بیشارنەوە تا رۆژی خۆی دادێ. هاگانا هەر زوو دەستی خۆیکردنەوە و قوربانی زۆریشی دا.
لە ماوەی هەردوو جەنگە جیهانییەکەدا سەربازەکانیان لەلایەن ئینگلیزەکان وەک ئۆپەراسیۆنی کۆماندۆ لە بەشی رۆژئاوای بیابان، هەروەها ئەرکی پێسپێردراوی خۆکوژیان لە بالکان وەک پاراشوت کە لە پشتەوەی هێڵی دوژمندا دادەبەزێنران، بەکاردەهێنران.
لە ١٩٤١دا کاتێ هەڕەشەی ئاڵمان توندتر دەبوو، ئینگلیزەکان ویستیان فەلەستین چۆڵبکەن و ئەرکی بەرگریکردنەکەی بدەنە دەست یەکە ژێرزەمینییەکانی جولەکەکان. بۆ ئەو مەبەستە فێرگەیەکیان دامەزراند تا سەربازە کارامەکانی هاگانا مەشق بدەن. بەڵام کاتێک مەترسەیەکە لە ئارادا نەما، ئینگلیزەکان هەمان تاکتیکە کۆنەکەیان بەکارهێنا و سەبازەکانی بزوتنەوە ژێرزەمینەکەیان بە تۆمەتی بە قاچاخ چەکهەڵگرتن و مەشقی سەربازییانە دەگرتن.
کەمێک پێش ئەوەی ئینگلیزەکان و فەڕەنسیەکان هێرش بکەنە سەر فڕانسە فیشییەکانی ( فیشی Vichy شارێکە لە باشوری فەڕەنسا، لەسەردەمی جەنگی جیهانیی دوهەمدا ژەنەرال فیلیپ پیتیان Philip Petainلە ١٩٤٠-١٩٤٤ حکومەتێکی

به هاوکاری ئاڵمەناکان لە فەڕانسەدا پێکهێنا. بە حکومەتی ناپاکی فیشی ناویدەرکرد) ی سوریا ، سەربازەکانی هاگانا کە بە تۆمەتی چەکداری قاچاخ گیرابوون، ئازادکران و وەک پێشەنگی لەشکر بەکارهێنران. یەکێک لەو سەربازانە مۆشێ دایان Moshe Dayan بوو کەلە شەڕەکەدا چاوێکی لەدەستدا و دواتر سەرتاپای ژیانی بە یەکچاوی و بە شریتە رەشەکەی سەرچاوی ناوبانگی پەیداکرد.

ئەو لەشکرە ئارەزومەندە تەنها لە یەک رووەوە لەگەڵ پێوەرەکانی باشترین سوپای جیهان بەراورد دەکرا. ئەوان دەزگایەکی هەواڵگریی نایابیان هەبوو. بەشی زۆری وڵاتەکە بە وردیی و مشورخۆری لەسەر نەخشە دیارکرابوو؛ ئەوەشیان لەڕێی بەکرێگرتنی فڕۆکەیەکی ئینگلیزی ئەنجامدا بوو. فڕۆکەکەیان لە دەزگایەکی هاتوچۆی ئاسمانیی بە دوانزە دۆلار بۆ هەر سعاتێک بەکرێگرتبوو.

هاگانا دۆسیێ هەمو شارەکان، گوندەکان، نشینگەکان بە نەخشەوە لەبەردەست دابوو، نەخشەکان زانیاریان لەسەر هەمو دانیشتوان تێدابوو.

سەربازی سوپا نهێنیەکە کراسی رەنگ خاکیی و پانتۆڵی کورتی خاکییان لەبەردابوو، تا ئەو شوێنەی عەرەبی لێنەبوو بەئاسانی هاتوچۆیان دەکرد. دوای جەنگی جیهانیی دوهەم ئینگلیزەکان تەوای باری کەشتییەکانی رۆژهەڵاتی ناوەڕاستیان فرۆشت. کراسی خاکیی و دەرپێ کورت بە شیلینگێک دەفرۆشران، بەو شێوەیە هەرزانترین شوێنی سەر گۆی زەوی بوو. پزیشک، شوفێرەکانی ئۆتۆمبێلی بار و پارێزەرانیش بە جلی خاکیی وەک سوپای ژێرزەمینی دەسوڕانەوە.

ئەوان نە پلەیان دەبەست و نە نیشانەیەکی واشیان بەخۆیانەوە دەکرد تا بەشەکانیان لەیەک جیابکرێتەوە.

خۆبەخشەکان لە شەست وڵاتەوە هاتبوون و بەنزیکەی ژمارەی وڵاتەکانیش دەپەیڤین. هەندێکیان هێشتا دەسەڵاتیان بەسەر زمانی عیبریدا نەدەشکا. کەواتە زمانێکی هاوبەش بۆ فەرمانبەسەرداکردنیان لەگۆڕێدا نەبوو.

ئەندامانی پالماخ نیو دانە مانگ لە سەر کار بوون و نیوەکەی دیکەش مەشقی خۆیان دەکرد. بۆ کوڕو کچانی هاگانا هیچ رێنمایی ئەوتۆ لە ئارادا نەبوو؛ کاتی دەستبەتاڵیی خۆیان بە مەشقی سەربازی بەسەردەبرد.

کتێبەکانی دەربارەی پرسی سەربازی دەدزران، لە دەرەوە دەهێنران و ئاودیوی وڵات دەکران. ئەوسا کتێبەکان بە زمانی روسی، ئاڵمانیی، ئینگلیزی یان زمانێکی کەم ئاخێوەریش بووبایە، قەیدی نەبوو؛ چونکە یەکێک هەرهەبوو بیانخوێنێتەوە و وەریانبگێڕی، خۆ گەر هاتباو بە زمانی ئارامیش بووبان هەرکێشە نەبوو. بە وردی لە کتێبەکان دەکۆڵرایەوە تا پەڕەکانیان کاڵدەبوونەوە یان تەواو دەنوشتانەوە؛ ئەفسەرەکان لاپەڕە و کۆپلەگەلی وایان لەبەردەگرتنەوە و دەیانخستنە سەر یاداشتی تێبینییەکانیان.

بنگۆریۆن دەیزانی کە تەنها یەک دوو مانگ کاتیان بەدەستەوە ماوە تا ئەو کۆمەڵە ئارەزومەندە تامەزرۆییە بکەنە لەشکرێکی راستەقینە، هەمو تیژبینی و نزیکەی هەمو ژیانیشی بۆ ئەو دۆزە تەرخانکردبوو. هەرگیز ئەو واکەم نەخەوتووە. پاولا و

کچەکانی بەدەگمەن دەدیتن.

لەبەرئەوەی زۆرینەی دەستەواژە سەربازییەکان کە لە سەدەکانی بەریدا بەکاردەهاتن لەنێودانەماون، بە تایبەتیش لە سەردەمێکدا کە زمانی عیبری ببووە زمانێکی مردو، پێوست بە دەربڕینی نوێ هەبوون دابندرێن. یەکەمین جار بۆ دۆزینەوەی دەستەواژەی عیبرییەی بۆ سەرۆکی هێزە چەکدارەکان، بنگۆریۆن روی لە بایبل کرد بەڵکو ناوێک بدۆزێتەوە. لە گێنەسیس Genesis ٣٦:١٥دا وشەی ئالاوف Alouf کە بە میر وەرگێڕدراوە، لە پاشای دەهەمیشدا ٢٥:١٩دا دەستەواژەی سار هازاڤا Sar Hazavaی دۆزیەوە کە بەکەمی بە و دەربارانەی جەنگاوەریان لەبەردەستدایە وەرگێڕدراوە. هەردوو پەیڤەکە مەبەستەکەیان دەدایەدەست. ئەو ئالۆفی هەڵبژارد. ئەوەش بووە مایەی شەڕەقەڵەمێکی روناکبیرییانە لەگەڵ دۆستی باشی خۆی رابی فیشمان Rabbi Fishman (دواتر بووە وەزیری کاروباری دیینی) کە واژەی سار هازاڤای پێباشتر بوو.

لە ژێر سەرپەرشتی بنگۆریۆندا شارەزایان فەرهەنگێکی سەربازییانەی سێهەزار وشەیان دانا، کە تیایدا وشەی عیبریانەیان بۆ چەمکە نابایبلییەکانی وەک پەڕەشوتوان، تەقەی دژەئاسمانی، بریسکە، ئۆتۆمبیلی بارهەڵگری تابالۆنی خشۆکدا داڕشت.

بنگۆریۆن ئامادەی نزیکەی هەمو مەشقەخولەکانی ئەفسەران بوو؛ گوێی لێدەگرتن و تێبینی یاداشت دەکرد، چونکە دەیزانی ئەو پرسەی ئاخۆ وانەکانی باش فێربووە، بۆ ئایندەی گەلەکەی چارەنوسسازانە دەبێ.

مەشقەخولی ئەفسەرە پلە باڵاکان لە کیبۆتێک بە ناوی ئاین هاسخۆفت Ein Haschoft کە ساڵانێکی دورودرێژ بنکەی هاگانا بوو، بەڕێوە دەچوو. ئەوانەی مەشقەکەیان پێدەکرا لە دەستەی بچوک بچوک دادەنران تا ژمارەیان گەیشتە دووسەد خوێندکار. هەر مەشقەخولێکیش چوار مانگی دەخایاند.

ئەو پەیوەندییە توندوتۆڵەی جەنگاوەران لەگەڵ سەرکردە شەستساڵیەکەیاندا باش بوو؛ بنگۆریۆن هەستی بە گەشانەوە دەکرد، چونکە لەسەرێکەوە زانیاری تازەی وەردەگرت، بەڵام لەسەرێکی دیکەشەوە لەگەڵ لاواندا هەستی بە خۆشی دەکرد و لەوەی لەگەڵ هاوتەمەنە کۆنەپارێزەکانی بووایە.

گەرهاتو کێشەی لەگەڵ عەرەبان پەیدا بووبا، یان ناخۆشی لە نێو کابینە سایەکەدا هاتبایە پێشەوە، یاخود گەر ئینگلیزەکان ئۆباڵی گرفتێکی سیاسیان بخستبایە ئەستۆ، ئەوسا پێویستی بەوەبوو بچێتە ژورێکی پڕ لە ئەفسەری هاگانا تا بحەسێتەوە، سیمای دەموچاوی روناک دەبوو لە پیاوێکی بەختیار دەچوو.

ئەو پیاوەی بێ برادەر ( مامۆستا مردووە و ئەفلاتونیش تەنها ناوی کتێبە) لەنێولەشکردا برادەری پەیداکرد.

ئەوەی زیاتر بەلای ئەو راکێشەر بوو کارامەیی لەنێو لەشکردا حەتمیبوونی پلە بەرزبوونەوەی دەگەیاند و فەرمانی کۆماندۆ «بەرەو پێشەوە بڕۆن!» بە فەرمانی «بەدوام کەون!» گۆردرا. ئەوەش بووە مایەی ئەوەی رێژەی سەرتێداچوونی ئەفسەر و ئەفسەرە پلەباڵاکان لەچاو سوپاکانی دیکەدا بەرزتربێ، بەڵام هیچ سوپایەکیش

وەک ئەوان ورەباشتر نەبوو.

خۆشەویستی بۆ ئەفلاتون و خۆشەویستی بۆ لەشکر ئاساییانە بەیەکەوە کۆ نەدەبوونەوە. بەڵام هەستی بنگۆریۆن وابوو کە فەیلەسوفە گریکەکەش هەستی ریزگرتنی هاگانای لەلا دەبوو چونکە خۆدیسپلینکردن رۆڵێکی گرنگی لەنێو لەشکرەکەدا دەگێڕا.

پەیوەندی نێوان بنگۆریۆن و سەربازەکانی تاکلایەنە نەبوو. ئەوان زۆریان حەز بە چارەی دەهات، ئەویان نەوەک هەر بە دامەزرێنەرێکی مەزن بەڵکو بە مامۆتک (باوکی رۆحی) خۆیان دادەنا.

لە فەلەستینی جولەکاندا لاوەکان نەخاسمە سابرابییەکان زۆر ریزیان بۆ بیرۆکەکانی رێکخراوە هەرەکۆنەکە دانەدەنا. لەروی دەرونی و روناکبیرییەوە ئەوان پەیوەندییەکی کەمیان لەگەڵ جولەکەکانی کە لە  وارشۆ، بەرلین، مینسک یان سۆفیادا گەورەببوون، هەبوو.

بەڵام بنگۆریۆن بە زمانی ئەوان دەئاخڤی، خەونەکانی ئەوانی دەدیتن؛ گەر هاتباو لەگەڵ ئەوان بکەوتبایە قسان ئەوا جیاوازییە تەمەنەکەی سیوپێنج ساڵی یان چل ساڵی لە بەیندا نەدەما. ئەو بە کیبۆتنشینێک دەستیپێکرد، ئەوانیش کیبۆتنشین بوون. ئەو هۆنراوەی سەبارەت بە کەسێکی تفەنگ لە شان کە لە نوتەکەشەودا رێدەکا، نوسیوە. ئەوان لەگەڵیدا هاوهەست بوون. ئەو لەتەیکردنی رێگا نوێیەکان نەدەترسا. بنگۆریۆن سەرکردەیەکی گیانیی بوو خاکیپۆش بوو کە ئەوان بە دوایدا دەگەڕان، جەنگاوەرێک بوو ئەرکێکی لەبەردەمدا بوو. ئەو دەبووایە سەری ئەو دەوڵەتە بووایە کە رەنگبێ بە دەستی بێنن، بەڵام هەڵبەت ئەوکاتەی هەبوو هاوشانیان بڕوا.

یەکێک لە هاوکارەکانی بنگۆریۆن، بە کەسێکی زۆر داخراوی ناوهێنا؛  گەرهاتو خەمگین بووایە بە ئاسایی روخسارەکانی خەموخەفەتی پێوە دیار نەدەبوو. بەڵام هەرکاتێک گوێی لە هەواڵێک بووبا کە سەربازێکی هاگانا کوژرابا، ئەوا دەکەوتە بن باری کەسەرەوە. لە بەرامبەر مردندا بەرگەگر نەبوو، نەخاسمە مرنی گەنجان.

لە بەشی وێنەکانی نوسینگەی حکومەت لە تەلئەبیبدا سەدان وێنەی بنگۆریۆن هەڵگیراون. لەوانە لەگەڵ دیپلۆماتەکان، دەوڵەتمەدارەکان، بیچمی ناسراودا، لە هەمو ئەو وێنانەدا سەروسیمای بنگۆریۆنت وادێتە بەرچاو کە پیاوێکە پەلەیەتی و خواخوایەتی بڕوا. بەڵام هەرکاتێ بە سەربازانی هاگاناوە دەورەدرابێ، جا چ لەکاتی روبەروبوونەوەی دوژمناندا یان لەکاتی پشوداندابێ، هەست دەکەی کەوا لەوپەڕی شادمانی و ئارامیدایە.

لە کاتی ململانێکەی لەگەڵ بیڤیندا تولازە سەربازێکی جولەکەی سەر بە لەشکری ژێرزەمینی گیراو لەلایەن داداگای ئینگلیزیەوە ئیفادەی لێوەرگیرا.

پێش ئەوەی بڕیاری لەسەر دەربکرێ لێیان پرسی؛ «ئایا هیچی دیکەت هەیە بیڵێی؟»

لە زینداندا لاوەکە هەڵوێستەکەی خۆی لە هەمبەر جەنگ، ئینگلیز و ئایندەدا راگەیاند. لەو رونکردنەوەیەدا دەرکەوت کە بۆچی بنگۆریۆن ئەوەندە ئەو لاوەی خۆشدەوێ.

«ئێمە بە دڵنیاییەوە ڕۆڵەی یەک مالباتین. ئەوەش هەر خانەوادەی عیبریی نیە. لە ڕاستیدا مالباتەکە گشتگیرییە(جیهانییە). ئەوەندەش کۆنە بەقەد ئەزەل، ئەندامەکانی لەهەمولایەکی جیهاندا دەژین، وشەی نهێنی نێوانیشیان بڕوابەیەکبوونە، قەدەریشیان دەردوژانــە، بەختیان لەسەر قوربانیدان وەستاوە، دوژمنەکەشیان ستەمکارییە، بەیداخیشیان ئازادی و ناویشیان بەرەنگارییە..

«ئێمە هێزی خۆمان بەکەم سەیرناکەین، ڕاستە بە بەراورد لەگەڵ هی ئێوەدا شتێک نییە، بەڵام لێرەدا قانونێکی مێژویی هەیە: هێزی زۆر بە ئاقاری چەوساندنەوەدا دەڕوا، ئامانجگەلی کەم بەدەستدەهێنێ؛ کەچی هێزی کەم ئاراستەکەی بەرەو ئازادی و مافە، ئامانجگەلی زۆر بەدەستدەهێنێ.

«ئێمە سەر بە مالباتە نێونەتەوەیی و جیهانییەکەی بەرەنگارییین. شێوەژیانی ئەو مالباتە توخمی تراژیدییای تێدایە. ئەندامەکانی تفەنگ یان دەمانچە بەکاردەهێنن، بەڵام پێیان خۆشترە لەگەڵ بێڵ و قەڵەمدا کار بکەن.»

گەر بنگۆریۆن بیەوێ بە هێوری پاڵداتەوە نە چیرۆکی پۆلیسییانە دەخوێنێتەوە نەدەشچێتە سەیری فیلم بینین، هەروەها گوێ لە موزیکیش ناگرێ و ئەلکهولیش ناخواتەوە. تا ئەو بێدارە مێشکەکەی بە هەمو توانایەکیەوە لەگەڕدایە. بەڵام کاتێک ویستی بەلاباسێک خۆخەریک بکا، ئەوا بابەتی لێکۆڵینەوە و خوێندنەوەکەی بۆ یەکێکی دیکە دەگۆڕی.

لە ١٩٤٧دا کاتێک لە گرفتە سەربازییەکان پڕ بوو زانیاریی زۆری لەو بارەیەوە بەدەستهێنا، بەدوای لیکۆڵینەوەی فەلسەفە وئایینە ڕۆژهەڵاتیەکاندا چوو. لێرەدا گیانە گەڕۆکەکەی نەوەستا بەڵکو پڕ زانیاری و ڕەهەندەکانی زیاتر بوو.

لە مانگە بەراییەکانی ١٩٤٧دا چەندان ڕوداوی هەستیاری وروژێنەر قەومان: گازینۆی ئەفسەرانی ئینگلیز لە ئۆرشەلیم تەقێنرایەوە، لە تۆڵەدا ئینگلیزەکان دەزگای پۆست وگەیاندنی هەمو فەلەستینیان ڕاگرت. فەرمانێک دەرچوو تا وادەیەکی دیارینەکراو هاتوچۆی ئۆتۆمبێلیان قەدەخەکرد، لە تەلئەبیبدا ڕەوشی ئاوارتە ڕاگەیەنرا، تانکە نەوتییەکانی حەیفا سوتێنران، دوو جولەکە کە بەهۆی کردەی تیرۆرەوە حوکمدرابوون خۆیان کوشت، بەندیخانەی ئاککا Accaیان تەقاندەوە، تیایدا زیاتر لە دوسەد عەرەب و جولەکە توانیان ڕابکەن.

لە مانگی نیساندا لە لێیک سوسێس Lake Success (دورگەیەکە لە نیویۆرک، کاتی خۆی بارەگای کاتیی ڕیکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکانی لە ١٩٤٦ تا ١٩٥٠ لێدامەزرابوو)دا بانگهێشتی بنگۆریۆن کرا تا ڕونکردنەوەی خۆی بدا. گەشتەکەی بۆ ئەوێ لە ڕێی قاهیرەوە بوو؛ کارمەندانی گومرگ لە میسر کە دەیانزانی ئەو پیاوە بنگۆریۆنە، بۆ ماوەی نیو سعات ڕایانگرت و پرسیاری بێسەروبەریان لێکرد و سوکایەتیان پێکرد. بنگۆریۆن ڕوی دەمی خۆی بۆلای هاوگەشتەکەی وەرگێرا و پێیگوت:

«دەبێ لەسەر ئەو هەڵسوکەوتەیان لێوی پەشیمانبوونەوە بگەزن.»

ئەمەیان سەرنجێکی پیاوێک بوو کە بەئاسانی هەڵنەدەچوو.

بنگوریۆن ئەو گەڕانانەی لەسەر حیسابی حکومەتە سێبەرەکەدا بوو، بەڵام هەر وەک خوی جارانی لە میوانخانەیەکی سادەی نیویۆرکدا دابەزی. دو هەگبەی پڕ کتێبی پێبوون. کاتێکیش گەڕایەوە هەگبەکان ببوونە سێ. دوای ئەوەی بۆیدەرکەوت کە شەقامێکی هاوشانی چارلس کرۆز رۆد لەسەر سنوری گوندی گرینویچ Greenwich شەقامێک بوو کتێبفرۆشی دەستی دوی لێبوو لە نیۆیۆرک هەیە، چووە ئەوێ و کتێبی نوێی کڕین.

ئەمجارەیان سەردانی خوشکی پاولای کرد؛ کوڕەکەی ویل ماسلۆ Will Maslow کاربەدەستێکی کۆنگرەی جولەکەکانی ئامریکا بوو. ئەوان کاتی کەمیان بۆ قسەکردن بەدەستەوەبوو، چونکە دەبوایە بنگوریۆن قاتێکی نوێی بەڕادان دابا، بۆیە بەرگدروەکە هات ئەندازەی بگرێ، وێڕای ئەوەش زایۆنیستەکان کە زانیبوییان ئەو لەوماڵەیە هاتن و پرسیارکوتیانکرد.

خوشکەزاکەی پرسی موچەکەی لێکرد. بە هەردوکیان حیسابیانکرد تا گەیشتە سیوپێنج دۆلار لە هەفتەیەکدا. «ئەرێ چۆن بەو پارەیە هەڵدەکەی کە کتێبی دەستی دوهەمیشی پێبکڕی؟»

بنگوریۆن چاوەکانی چەقاوەسوانە لێکنان.

«ویل، ئایا هیچت دەربارەی لیستی خەرجییەکان نەبیستووە؟»

لە دوا هەفتەی نیساندا ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان دانیشتنێکی تایبەتیان سەبارەت بە کێشەی فەلەستین سازدا. بیڤین داوای کۆمیتەیەکی نوێی لێکۆڵینەوەی کرد.

هەر پێنج دەوڵەتە عەرەبییەکە هەوڵیاندا بەربەست بخەنە بەردەم بنگوریۆن تا نەخۆی نە هاوکارێکی نەتوانن لەبەردەم ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکاندا قسە بکەن. هەوڵەکەیان سەرینەگرت و نوێنەرانی جولەکە دەرفەتیان پێدرا تا لە دواییدا داوای مافی خۆیان بکەن.

ڕۆژێکیان ئەندرێ گرۆمیکۆ Andrei Gromyko بە هاوپایەکانی خۆی گوتبوو کە یەکێتی شۆرەوی هەرچەندە ڕێکاری توندی گرتبوونەبەر بۆ ئەوەی لەسنوری خۆیدا کۆتایی بە زایۆنۆیزم بهێنێ، بەڵام ئێستا «ئامادەیە ئیش لەسەر چارەسەریەکی دۆزی فەلەستیندا بکا بۆ ئەوەی کەم تا زۆر جوەکان لە بەرامبەر ئەو کۆستەی ئاوروپایان چیدیکە زیانیان پێنەکەوێ.»

ڕۆژی پاشتر کۆمیتەیەک بۆ لێکۆڵینەوە پێکهات، تیایدا نوێنەرانی وڵاتە بچوکەکانیش جێیانگرت. کاتێک دەستەکە هاتنە فەلەستین، بنگوریۆن وەک گەواهیدەرێک چووە بەردەمیان. لە وەڵامی پرسێکیاندا رونیکردەوە:

«ئێمە پێمان وایە کە مافمان بەسەر هەمو فەلەستیندا هەیە، کەچی ئامادەین ئەگەری دەوڵەتێکی جولەکە لە بەشێکی ئازادی فەلەستیندا هەڵبسەنگێنین. «هەر یانزە ئەندامەکە سەری رەزامەندیان بۆیەکدی لەمەڕ ئەو رونکردنەوەیدا لەقاند.

ئەندامێکی چیکۆسلۆڤاکی لێیپرسی: «کەواتە تۆ دژی دابەشکردن نی؟»

«ئێمە ئامادەین ئەو پرسە هەڵبسەنگێنین.»

بنگوریۆن سەرهێڵی چارەسەرێکی کێشا کە لە دواییدا دۆزیانەوە.
کاتێک هێشتا کۆمیتەکە هەر لە وڵاتە پیرۆزەکە بوون، کەشتیەکەی هاگانا ئێکسۆدوس «Exodus۱۹٤۷» کە پەیمانگای سۆنەبۆرن کڕیبووی، بەخۆی و چوارهەزار وپێنج سەد جولەکەی بێلانەی ئاڵمان گەیشتە کەنارەکانی فەلەستین. مارینزی ئینگلیز چوونە سەرپشتی کەشتیەکە، دوای شەڕێکی بێوێنە کە تیایدا ئینگلیزەکان تفەنگ و گازی فرمێسکڕژێنیان بەکارهێنان، جولەکانیش  بە قوتوی خواردن ودەسکە گەسک شەڕیان دەکرد، کەشتیەکەیان هێنایە  لێواری حەیفا، لەوێ هەر چوارهەزارو پێنجسەد کەسەکە بەسەر سێ کەشتی ئینگلیزدا دابەشکران. دەرگەیان لەسەر هەموان داخستن و رەوانەی ئۆرودگای ئاڵمانەکان کرانەوە.
کۆمیتەی رێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان بە کۆدەنگی رایانگەیاند کە دەبێ ئینگلیزەکان بکشێنەوە. زۆرینەیان دەنگیان بۆ پێشنیازەکەی بنگوریۆن دا: فەلەستین دابەشبکرێتە سەر دوو دەوڵەتی جولەکە و عەرەب.
بەریتانیای گەورە رایگەیاند ئامادەیە گەر ناچاریش نەکرێ فەلەستین بەجێبهێڵێ. بەڵام لەو ماوەدا ئاگرەکە زیاتر کڵپەی سەند، تیرۆرستەکان لە مانگی رابردوودا دوو سێرگینت Sergeant(یارمەتیدەر یان جیگری ئەفسەر) یان لەدار دابوون، دوای ئەوەش رەوتی کردەکانیان تادەهات پەرەی زیاتردەسەند. هیچ کاتێک کێرڤی نمایشی ئینگلیزەکان لەو بەشە زەویەی جیهاندا وا دانەبەزیبوو. هەرگیزیش وا بێ جەماوەر نەببوون.
هەرچەندە بنگوریۆن دەبوایە بێژمار کاروبارەکان رابپەڕێنێ، وەلێ کاتی هەبوو ئەوە  بۆ رای گشتی رونبکاتەوە:
«گەر ساتی جیابوونەوەمان لە ئینگلیزەکان هاتەپێش و سەرکەوت-کە ئێمە هیچ گومانمان لێی نییە- ئەوا ئێمە بەوپەڕی رێزەوە جیا دەبینەوە. ئێمە دەزانین کە هەر ئینگلستانی بێڤین لە ئارادا نییە، بەڵکو ئینگلستانی بلفۆر، ویدگود و وینگێیتش هەیە.»؛
لە راگەیاندنێکی دیکەدا  گوتی:
«من دەبێ ئەوە بڵێم کە سەربازە ئینگلیزەکان لە کاتی ماڵپشکنین، گرتن، راوەدونانی پەنابەراندا ئەرکە بە سفتوسوێکەیان بە نابەدڵی ئەنجام دەدا و فرمێسکیان لەچاواندا قەتیس دەما... شتی وا لە هەندێ سەرباز و مارینزەکان دەگێڕنەوە کە ژیانی خۆیان خستۆتە مەترسیەوە تاکو پەنابەرێک رزگار بکەن... تاوانەکە لە ملی جەنگاوەر و مارینزەکانی ئینگلیزدا نییە، بەڵکو لە ئەستۆی ئەوەدایە کە چەرچل بە «قەڵاچۆکردنێکی ئاستنزمی جولەکان»ی لە قەڵەمدابوو.»
سی ساڵ دوای رۆژی نۆڤێمبەرە ئاهەنگئامێزەکە کە لۆرد بلفۆر بەڵێنەکەی خۆی راگەیاند، رێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان کۆبووەوە و بڕیاری دابەشکردنی فەلەستینیان بەسەر دوو دەوڵەتی عەرەب و جولەکە بە ٣٣ دەنگ بەرامبەر ١٣ دەنگ پەسندکرد. بە بەریتانیای گەورەش گوترا دەبێ لە ماوەی هەشت مانگدا بکشێتەوە. دوو مانگ دواتر جولەکە و عەرەب دەتوانن دەوڵەتی خۆیان رۆبنێن.

بنگۆریۆن لە باکوری وڵات بوو کاتێ هەواڵەکەی پێگەیشت. ئیدی بەلەز گەڕایەوە ئۆرشەلیم. لەوێ لە پەنجەرەی بارەگای ئاژانسی جولەکان سەیری ئاپۆرەی خەڵکی دەکرد کە لە شەقامی شا جۆرجدا کۆبونەتەوە، ڕێگاکە لەسەردەمی حوکمڕانی بلفۆردا بە ناوی پاشای ئینگلیزەکان کرابوو.لە ئاخروئۆخردا جوەکان شتێکیان هەبوو ئاهەنگی بۆبگێڕن: ئەوان هاتنە سەر شەقامەکان، هەڵپەڕین و بەزموهەرایان بوو، دڵیان خۆشبوو گۆرانیان دەگوتەوە.

«ئەو بڕیارە پەڕجوئاسایەی ریکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان دەربارەی ژیاندنەوەی دەوڵەتی ئیسڕائیل خۆی لەخۆیدا بەرامبەر ئەو مەترسیانەی دێتە سەر ڕێمان، پارێزەرنین.»

هەنوکە لە سەر شەقامەکان دەهۆڵکوتان و زوڕنالێدانە.

«گەر پەرجو لە دنیادا پەیدا نەبن، گرژی و توندوتیژیش هەروا سەرهەڵنادەن، بۆ ئەوەی نمونەش ببینی پێویست بە پەرجوێکی دیکە ناکا. هەروەها کاتێ بە یەکجاری دەوڵەتی جولەکە بووە راستی، نابی ئێمە لە ئاست هیواماندا پاڵی لێبدەینەوە بەوەی کە کۆتایی بە هەمو ئاستەنگەکانی بەردەممان هاتووە ئیدی بە خۆشی و کامەرانی دەژین.»

د. حایم وایزمەن کە لە گوندێکی شاخاوی سویسڕادا سەرقاڵی نوسینەوەی یاداشتەکانی خۆی بوو، مانگێک دواتر بەو شێوەیە کاردانەوەکەی راگەیاند:

«ئەرێ بەڕاست ئەوەش پرسێکە، تۆبڵێی پیاوەکانمان بۆ ئەو ئەرکە بشێن؟»

# بەشی
# (١٢)

کەمن ئەو بیچمە مێژوویانەی ئاوا زۆر توشی گێڕەوکێشە، نەیاری و بێئومێدی ببنەوە.

لە ماوەی ئەو شەش مانگەی نێوان بەڵێنەکە و جێبەجێکردنیدا، زۆرجاران بنگۆریۆن ئەو سەرنجەی لا پەیدا دەبوو کە هەمو کەسێک دژی ئەو و دژی گەلەکەی لە پیلانگێڕیدان.

ئاخر بارودۆخەکە بەو شێوەیە بوو: بە پلەی یەکەم چل ملیۆن عەڕەبی دەوڵەتی دراوسێ هەن، ئەو بەردەوام هۆشداری ئەوەی دەدا کە ڕەنگبێ راستەوخۆ دوای بەدیهاتنی خەونی جولەکان، ئەوان هێرش بکەنە سەریان. ئەوسا رێژەی بەرامبەریان دەبێتە هەر شەست و دوو عەڕەب بەرامبەر یەک جولەکەی فەلەستینی. ئەوان بە سەدقات خاکیان لە دەوڵەتی ئیسرائیل قەبەترە. سەرەڕای ئەوەش پشتگیری مەعنەوی سێسەد ملیۆن موسوڵمانیشیان هەیە.

هەر لە خودی فەلەستیندا یەک ملیۆن عەڕەب دەژیان. هەر لە ئێستاوە ئاڵۆزی و ئاستەنگیان دروستکردووە. ڕەنگبێ ئەوان ببنە دوژمنی ژمارە یەکی دەوڵەتە نوێیەکەی ئیسرائیل، بەتایبەتیش گەر گوێیان لە دەنگی عەممان، بەیروت، دیمەشق و بەغدا رادەگرت.

بڕیارەکەی ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان هێمایەک بوو بۆ ئاژاوەنانەوی عەڕەبان کە تا ئێستا لە فەلەستیندا کوشندەترینیان بووە. لە زۆر باردا دەسەڵاتی مانداتی بەریتانی بێکاردانەوە تەماشایدەکرد، کەچی عەڕەبەکان دەیانکوشت، دەیانبڕی، تالانیان دەکرد دەیانسوتان بێئەوەی کەس پێیان بڵێ بەری چاوتان برۆیە. ئەوان پەلاماری ئەو کاروانانەیان دەدان کە بۆ نشینگەکان دەچوون، شوفێر و پیادەکانیان دەکوشتن. لە یافاوە پەلاماری تەلئەبیبیان دەدا، شارەکانی سافاد Safad، حەیفا و لیدا LYddaیان خاپور کرد.

لە حەیفادا کە دوەمین شاری گەورەی فەلەستینە، فەرماندەی هێزی کۆماندۆی هاگانا ئاماژەی ئۆپەراسیۆنێکی جەنگاوەرانەی پێکردن، ئەوەش دوای ئەوەی ئەو حەفتاهەزار عەڕەبەی لەوێ دەژیان و لە ژێر فەرماندەیی کۆماندۆی تایبەتی خۆیاندا ژیانی هەشتا هەزار نیشتەجێی جولەکەی ئەوێی بۆ چوار رۆژی رەبەق تاڵکرد، لە پڕێکەوە سەرکردەی عەڕەبان جاڕیدا کە دەبێ عەڕەبەکان خۆبەخشانە ئەوێ

چۆڵبکەن. بڵندگۆ و رادیۆی هاگانا بەناو شەقامەکاندا هاواریان دەکرد و پەیامی بنگۆریۆنیان بڵاودەکردەوە بەڵکو عەرەبەکان  ئەویّ چۆڵنەکەن و دەوڵەتی نویّی ئیسرائیل ئەوپەڕی رێزیان دەگریّ و دادپەروارانە لەگەڵیان دەجولێتەوە. بەڵام ئەوان فەرمانیان لە  موفتی وەرگرتبوو، بۆیە نەگەڕانەوە، تێیانتەقاند و باریانکرد.

ئەوسا نۆرەی ئینگلیزەکان هات. بنگۆریۆن ئەوپەڕی توانای خۆی بەکارهێنا لەگەڵیاندا راستگۆ بیّ. ئەو لە وتار و دوانەکانیدا زۆر جاران دوپاتی دەکردەوە: «دەبا ئێمە دەمارگیر نەبین، دەبا ئێمە هەمو ئینگلیزەکان وەک یەک تەماشانەکەین، بابەیەک شانە سەری هەمویان دانەهێنین، دەبا ئێمە تاکەکانیان بە بەرپرسیاری رەفتاری میرییەکەیان دانەنێنین.»

بەڵام لەگەڵ نزیکبوونەوەی ١٤ی ئایاردا، تا دەهات دڵتەنگتر دەبوو. لە قسە تایبەتییەکانیدا لەگەڵ دۆست و برادەرانیدا دەستەواژەی «ئینگلستانی ناپاک»ی بەکاردەهێنا و بێدادی ئینگلستانی لەسەر دڵ ببووە مۆتەکە.

ئەوەش هەر لەبەر ئەوە نەبوو کە سەربازانی ئینگلیز تەلاری پۆستی فەلەستینیان تەقاندبووەوە، هەروەها بە ئۆتۆمبێلیکی بە دینامێت بارکراو لە شەقامی  بن یێهودای پڕ دوکانی ئۆرشەلیم  تەقاندەوە، سەدو بیست جولەکەی خەوتویی کەچوکلۆم ( بێدەست و پیّ ) کردن. ئا ئەوەبوو تیرۆر، بەڵام ئەو رکوکینە زۆرو توندەی لەنێو ئینگلیزەکاندا بەرامبەر جولەکەکان هەبوو، کارێکی وایکرد کە جولەکانیش قینیان لە ئینگلیز هەڵبستیّ و  تاوانی هاوچەشنیان دەرهەق ئەنجام بدەن.

شتی زیاتری دیکەی لە پشت بوو، زیاتر بوو لە دژەسامێتییەکەی بێڤین. شتێک رویدا کە بنگۆریۆن هەرگێز چاوەڕێی نەدەکرد. ئەو لەوە دڵنیابوو کە ئینگلیزەکان رێزی نەریتی دیموکراسیانەکەی خۆیان دەگرن، بۆیە بەڕیزیشەوە بڕیارەکەی رێکخراوی نەتەوە یەککگرتووەکان جێبەجێدەکەن، بەوەی بە شێوەیەکی دیموکراسیانە ددان بە بڕیاری زۆرینەدا دادەنێن و بە شێوەکەی ددانبەخۆداگرتوانەش وڵاتەکە جێدەهێڵن. بێڤین بە بڕوابەخۆبوونە لە ئەنجومەنی نوێنەراندا رایگەیاند:

«نەمن نە حکومەتی خاوەنشکۆ دژی بڕیارەکەی رێکخراوی نەتەوە یەککگرتوەکان ناجولێینەوە.»

بەڵام کە بێڤین بایدایەوە و خواریکردەوە ئەو کارەی کرد کە بەڵێنی دابوو نەیکا.

بنگۆریۆن بە توڕەییەوە لە فێبرایریدا بە بەڵگەوە رایگەیاند: لە راستیدا ئینگلیز هەمو هەوڵێکی بۆ پەکخستنی بڕیاری رێکخراوی نەتەوە یەککگرتووەکان بەکاردەهێنیّ.»

لە لەندەندا ئینگلیزەکان گوتیان ئەوان ئارامی ناوچەکە تا کۆتاییهاتن بە ماندات رادەگرن. بەڵام گەر عەرەبەکان بیانویستبا شەڕبکەن، رێگەیان پێدەدرا، ئەوەش لە کاتێکدابوو کە هەر جولەکە بوون دەرِوتێندرانەوە.

لە ئۆرشەلیمدا رۆژێکیان سەربازانی ئینگلیز چوار جولەکەیان چەککردن؛ چەکەکانی ئەوانیان دانە ئەو عەرەبانەی کە لە بنی پێیوە تا تەوقی سەریان چەک و فیشەک بوو، ئاشکراش بوو عەرەبەکان جوەکانیان  سەقەتدەکردن، ئەنجا دەیانکوشتن.

بنگۆریۆن لەندەنی بەوە تۆمەتبارکرد کە دنەی توندوتیژی بەوە دەدا کە هانی

عەرەبەکان دەدا چەکی زیاتر بنێرنە فەلەستین و دەرگای سنورەکانیشی لەسەر هەمو عەرەبێک بۆ هاتنە ژورەوە چ بە تاک یان بە دەستە و کۆمەڵ خستۆتە سەرپشت.

لە عێراق دەستەیەکی بیستوهەشت کەسی لە جەنگاوەرە ئینگلیزەکان سوپای عێراقیان بۆ هێرش کردن و پەلاماردان تەیارکردبوو.

لە رۆژهەڵاتی ئوردندا Transjordanie قۆشەنە لەشکرێک عەرەب کە لەلایەن ئینگلیزەکانەوە چەک و مەشق پێدراوبوو، ئامادەی شەڕ بوون. ئینگلیز ساڵانە دە ملیۆن دۆلاری لە گەنجینەی خۆی و لەسەر حیسابی باجدەرانی وڵاتەکەی لەوێ خەرجدەکرد. رۆژهەڵاتی ئوردن ئامادەی کشان بەرەو ئیسرائیل بوو.

لە عەرەبستانی سعودیشدا چل و پێنج ئەفسەری ئینگلیز پلانیان بۆ دادەنا بەڵکو بە کردەیەک دژی جاڕدانی دەوڵەتی نوێی جولەکان بوەستنەوە.

میسر فڕۆکە، بۆمب، کەلوپەلی سەربازیانە و تانکی لە بەریتانیای گەورە بۆ لێدانی جولەکان وەرگرت.

لەندەن سکاڵای لەسەر ئەو خشتەیەی کە رێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان بۆ کشانەوەی هێزەکانی بەریتانیای لە ١٥ی ئایاردا دیارکردبوو، هەبوو. ئاشکرایە بڕیارەکە لە بارەگای نەتەوە یەکگرتووەکان لە لێیک سوکسێس بڕیاری درابوو.

بڕیار بوو لیژنەیەکی رێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان رەوانەی فەلەستین بکرێ تا لە کاتی لە یەکجیاکردنەوەی هەردوولای عەرەب و جولەکە و جاڕدانی دەوڵەتەکانیان کارئاسانیان بۆبکا، ئینگلستان رێگەی بە لیژنەکە نەدا بێتە فەلەستین.

هێشتا شتی دیکەی زیاتر لە کردەوە تیرۆرستیانەکەی شەقامی بێیهەدوا هەبوو ئەویش گەندەڵییە سیاسیانەکەی وایتهال Whitehall(وایتهال شەقامێکە لەلەندەن، لە گۆڕەپانی ترافلەگەرTrafalgar Square تا کۆشکی وێستمینستر Palace of Westminsterو وێستمینستەر ئابیWestminster Abbey دەڕوا. دەستەواژەکە بۆ مەڵبەندی میریی لە شانشینی یەکگرتوودا بەکاردەهێندرێ) بوو.

دەسەڵاتی ماندات لە شوێنی جیاجیای فەلەستیندا وێڕای تەلاری گەورە لە شارە گەورەکاندا کە هەمو فەلەستینی گرتبووە کە تەلاروباڵاخانەی گرنگ بوون؛ سەنگەرو مۆڵگەی سەربازی گەورە و قایمی دروستکردبوون. ئەو سەنگەرانە بە قەڵای تیگەرTigger کەناوی ئینگلیزە داهێنەرەکەی بوو، ناودەبردران. هەنوکە دەبوایە ئەو قەڵایانەی بتەقاندبانەوە یان بیدابانە هەر یەک لە جو یان عەرەب بەپێی هەڵکەوتە جوگرافیەکانیان. کەچی ئەمە روینەدا. هەر پەنجا سەنگەرە قەڵایەکان کە دەکەوتنە سنوری دەوڵەتی جولەکان، دەبوایە بۆ ئەوان بوونایە، کەچی بە عەرەبەکان بەخشران.

رێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان رێنمایی دایە ئینگلیزەکان کە تا ١ی فبرایر بەندەرێکی سەر زێ بۆ وەرگرتنی پەنابەران چۆڵ و ئامادەبکا، بۆ ئەوەی جولەکەکان بتوانن پێشوازی کۆچبەرەکان بکەن. دیسان لەندەن ئەو داوایەی جێبەجێنەکرد.

گەنجینەی بەریتانیا حیساباتی هەمو بانکەکانی فەلەستینی راگرت، وڵات ئابڵۆقەی لیرەی ئەستەرلینی کەوتە سەر.

باجدەرە بەریتانییاییەکان پارەوپولی زۆریان لە فەلەستین لە خاک، خانوبەرە، جبەخانەکان، کەرەستەی گواستنەوە، کەلوپەلی سەربازیانە وەبەرهێنا بوو. بەشێکی ئەو کەلوپەلانە لە بەرامبەر یارمەرتیدانی کەلوپەلتێکنان و گواستنەوەدا بە عەرەبەکان فرۆشران. هەر کاتێکیش جوەکان ڕێگەیان پێبدرابا هەندێ کەلوپەلەکانیان لێبکڕیبان، ئەوا هەر زوو کڕیارەکان بەهۆی فۆرمۆلەی کڕین و فرۆشتنی فەرمی قوڕسەوە تێدەگەیشتن، کە کردەی کڕینەکەیان ئەستەمە، بۆیە پێیان نەدەفرۆشرا و بە دەست بەتاڵی دەگەڕانەوە.

دەسەلاتیماندات پێشتر کۆمەڵگەی جولەکەی بۆ ماوەیەکی کورت بە ڕاگرتنی پۆست و گەیاندن سزادابوو. هەنوکەش کە چەندان هەفتەی ماوە ماندات کۆتایی پێبێ کۆتاییان بە پۆست و گەیاندن هێنا، بەوەی کە ئەو ٦٥٠,٠٠٠ جولەکەی فەلەستین بە تەواوی لە جیهانی دەرەوەدا دابڕێ.

هیوای بنگۆریۆن و هاوڕێکانی وابوو کە هەرهیچ نەبێ دەسەلاتی ماندات دامەزراوە پێویستەکان کە لەو ماوەی ئەو چوارەگە سەدەی رابردودا دروستکردوە بۆ جولەکان بەجێدەهێڵێ. بەلام دەرکەوت  ئینگلیزەکان لە نەخشەیاندا نیە تەنانەت تاکە دامەزراوێک، فایلیکیش بدەنە دەوڵەتە نوێیکەی جولەکان. ئەو کەلوپەلانەی کە بۆ دەوڵەتە نوێیکەی جولەکان زۆر گرنگ بوون، ئینگلیزەکان بە نوێژی نێوڕۆ و لەبەر چاوی هەمواندا سوتاندییان.

کەم وابووە لە مێژودا روبدا کە دەوڵەتێک لە باریەکهەڵبوەشێ کەچی هەمو جیهانیش لە تەماشاکردندا بێ. رۆژانە دامەزراوێک بەجێدەهێڵرا بەلام تەنها شوێنێکی بەتاڵ و وەک هەواری خاڵی دەمایەوە.

بنگۆریۆن دەیزانی کە هاگانا چەند زەبونە. ئەوەشی دەزانی کەئەو ٦٥٠,٠٠٠ کەسە دۆستی باوەڕپێکراوی کەمیان لە جیهاندا هەن. بنگۆریۆن دەیزانی کە فڕۆکەکانی جولەکەکان تەنها سەدو سی کیلۆمەتر لە سعاتێکدا دەتوانن بفڕن، ئەو تەقەمەنییەی بە نهێنیش کۆکراوەتەوە، جێی بڕوا نیە  زیاتر لە بیست مەتردا کاری خۆی بکا. هەروەها نزیکەی هیچ گوللەیەکی سێ ئینجی تۆپهاوێژیان نیە، لە هەمووولاتیشدا  تەنها ١٨٦ مەترالیۆزی قوڕسیان هەن.

بنگۆریۆن خەمی زۆریشی لەسەر ئۆرشەلیم دەخوارد. کە منداڵ بوو وشەکانی هاگانی لەبەر بوون:

«... ساڵی دادێ لە ئۆرشەلیمدا.»

خۆشەویستی ئۆرشەلیم کەم کەس لە غەیرە جوەکان لێیتێدەگەیشتن. بۆ کریستیانەکان  بێت لەحم Bethlehem، نەزارەت Nazareth و هەردوو دیوی گۆلی گالیلیا Galilea لە ئۆرشەلیم گرنگتر بوون. شاری پیرۆزی موسڵمانەکانیش مەککە بوو. بەلام جوەکان هەرگیز ئەوەیان لە بیرناچێتەوە کە کۆتەڵی(پەیکەر) یەکەم ودوهەم لە ئۆرشەلیم دامەزراوە، ئەو شارە چەقی بازنەی دیرۆک، هەستو سۆز و یادەوەرییەکانی جولەکان بووە. لەگەڵ بەسەرچوونی سەدەکاندا بە ملیۆنان جولەکە خوێنیان لە پێناودا ڕژاوە.

بۆ بنگۆریۆنیش ئۆرشەلیم سیمبۆلی بەردوامبوونی جولەکە بووە، دڵی ژیانی جولەکان بووە، شاری ئەزەلی کە شارێکە مرۆ لە دوادوایدا مرۆڤ هەست بەوەبکا کەلە ماڵی خۆیەتی.

دەبوایە ئۆرشەلیم کرۆکی دەوڵەتە نوێیکەی جولەکان بووایە، بەلاَم لە لییک سوکسیێسدا ئەو دەستکەوتە لە جوەکان سەنرایەوە، بەشێکی وەک بۆ یەکدانەواندنی لایەنە دانوستانەکان لێهات. شاری پیرۆز دەبووایە خرابایە ژێر بەڕێوەبردنێکی نێونەتەوەیی.

لە ئۆرشەلیمدا سەدهەزار جولەکە دەژیان کە هەموشیان بە عەرەب دەورە دراون. زۆربەی ئاکنجیانی پیر و پەککەوتە بوون. کەمیان تێدابوو گەنج بێ و دەستی گۆلمەی تفەنگ بگرێ و بجەنگێ. هەرە ئۆرسۆدۆکسەکانیان (بونیادگەراکانیان، فەندەمەنتالەکانیان) بە بیانوی بنەماکانی دیین خزمەتی سەربازیان رەتدەکردەوە. فەرماندەیی هاگانا سەربازی مەشقپێدراوی کەمی لەوێ هەبوون و چەکیشیان کەم بوو. ئەو کاروانەی لە تەلئەبیبەوە بە دوای ئازوقە بردندا هاتبا، دەبوایە زۆر بە وشیارییەوە بەناو گوندە عەرەبنشینەکاندا رێیبکردبایە کە چەکی دەستی دۆستەکانیان لە دەست دەرنەدەچوو چ جای هی جولەکە. ئاوی ئۆرشەلیم دەبوایە لە مەودای دورەوە راهاتبا. عەرەبەکان بۆریەکانی ئاویان بڕیبوو. لە بارودۆخێکی ئاساییانەدا دانیشتوانی ئۆرشەلیم خواردنیان لە عەرەبە دەوراوپشتەکانیان دەکڕی. بەلاَم هەنوکە ئەو سەودایە ئەستەمە. هەڕەشەیەکی جدی برسێتیش لە گۆڕێدایە.

بنگۆریۆن بە واتای گشتی وشەکە پیاوێکی ئۆلدار نەبوو. بۆ ئەو رواڵەتە سروتیەکانی دین شتێکی کەمی دەگەیاند. بەلاَم خۆشەویستی ئەو بۆ ئۆرشەلیم هیچی لە پیاوێکی زۆر دینداردا کەمتر نەبوو. کاتێک راوێژکارێکی ئالودەی گرفتەکە ببوو بابەتیانە پیشنیازی چۆڵکردنی ئۆرشەلیمی بۆکردبوو، ئەو سەری خۆی بە نەخێرێکی شێلگیرانە راوەشاند.

«بەلاَم تۆ چۆن دەتەوێ خواردنی شارەکە دابین بکەی!»

«کاتی خۆی هات دەیبینین.»

«ئایا تۆ چۆن بەرگری لە شارەکە دەکەی؟»

«من بارەرم بە پەرجو هەیە.»

نەخۆشخانەی هاداسا Hadassah کە گەورەترین نەخۆشخانەی رۆژهەلاَتی ناوینە بە پارەی کۆکراوەی ژنە جوەکانی ئامریکا دروستکراوە، زانکۆی عیبری کە سەدهەزار کتێبی گرانبەهای تێدایە، لەسەر کێوی سکوپس دامەزراون، لەوێوە مرۆ مەڵبەندی ئۆرشەلیمی لێدیارە، بەلاَم عەرەبەکانی فەلەستین رێگای چونە ئەو گردە ناودارەیان گرتووە.

سێ هەفتە پێش ١٥ی ئادار شتیک رویدا کە خێزانە شەش کەسیەکەی بنگۆریۆن کەوتنە بن بارێکی گرانی خەم و ماتەمینی.

حەفتاوحەفت پرۆفیسۆر، پزیشک، پەرستار بە ئۆتۆمۆبێل دەیانەویست بەرەو خانوبەرە دابڕاوەکاندا بڕۆن. ئەوان هیچ مەبەستێکی سەربازیانەیان لەبن کلاَوەوە

نەبوو. کاربەدەستانی دەسەڵاتی منداتیش دڵنیایان کردبوونەوە کە لەو رۆژەدا هیچ مەترسیەک لە رێگەدا نیە. ئەوان سەرقاڵی قسەکردن بوون لەگەڵ یەکدا ئاگایان لە دنیادا نەمابوو، چونکە دڵخۆشبوون لە کۆتاییدا دەرفەتیان هەبوو سەردانی نەخۆشخانەکە و زانکۆکە بکەن.

لە نیوەی رێگادا کاروانەکەیان لە لایەن تاقم و باندی عەرەبەکانەوە بەسەردا دەدرێ. هەرچەندە دەستەیەکی سەربازی ئینگلیزیش لەو ناوە بوون و ئاگاداریش کرابوونەوە. بەڵام ئینگلیزەکان ماوەی شەش سعات و نیوی خشت بێئەوەی رونکردنەوەیەکی بڕواپێکراو بدەن، هەنگاوێکیان بۆ دەستبەسەرداگرتنی بارودۆخەکەدا نەنا. لە کاتێکدا کە عەرەبەکان هەر حەفتاو حەفت ژن و پیاوە جولەکەکانیان سەرەتا ئەشکەنجەدابوون دواتریش لە جێدا ساردیان کربوونەوە.

یەکێک لە پزیشکەکان دەسگیرانی کچە بچوکەکەی بنگۆریۆن رێنانا بوو. ئەوان زۆر یەکدییان خۆشدەویست.

لە کاتێکدا کە بارودۆخەکە وا گرژ ببوو، ببووە مایەی ئەوەی رێکخراوی ئیرگۆنی مناحیم بیگین لە داخانا بتەقێ، بۆیە بەبێ ئەوەی بنگۆریۆن فەرمانیپێدابێ رێکخراوەکەی خۆی جۆشداو پەلاماری یافای دا. یافاش گەورەترین شاری عەرەبنشینی فەلەستین بوو. هەرزو سەربازە ئینگلیزەکان بە تانک و تۆپ و فڕۆکە بە فریای عەرەبەکانەوە هاتن. کاتێکیش شەڕ لەنێو هەرسێ لایەنەکەدا وەستا، زۆرینەی هاوڵاتییە عەرەبەکان بەرەو وڵاتە دراوسێکانیان هەڵاتبوون.

بنگۆریۆن زۆر تورە بوو، چونکە هاگانا نەخشەیەکی دەستکردنەوەی هەبوو کە هەمو دەستە و کۆمەڵەکانی لەخۆ دەگرت، هەروەها گەر هەر کۆمەڵەیەک بە فەرماندەیەکی خۆی بەبێ ئەوەی لەگەڵ ئەوانی دیکە رێکبکەوێ ، چالاکی بکا، تەنها دیاردەی پاشاگەردانی لێدەکەوێتەوە.

ئەوەی لە دێریاسین Dei Yassinیشدا قەوما هێشتا لە هەمویان پۆلکتر (خراپتر) بوو.

بۆ ئەوەی ئازوقە بگەیەنرێتە ئۆرشەلیم، کۆمەڵێک ئۆتۆمۆبێل بە باری ئاو، داودەرمان و پێداویستی سەربازی بەرەو ئەوێ بەڕێکەوتن. عەرەبەکان زۆر جاران لە نیوەی رێگادا پەلاماری ئەو جۆرە کاروانانەیان دەدا ئیدی کوژراو قوربانی لێدەکەوتەوە.

کاتێک هاگانا لە هەوڵی ئەوەدابوو رێگای بەستنەوەی تەلئەبیب بە ئۆرشەلیم بکاتەوە، رێکخراوی ئێرگۆن هاتە پێشەوە ئەرکی پاککردنەوەی رێگاکەی لە دێریاسین گرتە ئەستۆی خۆی. پێش ئەوەی ئێرگۆن گوندەکە بەجێبهێڵێ، ٢٥٤ پیاو، ژن ومنداڵی عەرەبی کوشتن.

لە کاردانەوەدا بنگۆریۆن بە هەمو هەستەکانیەوە تورە بوو. لەسەر ئەوە تورەبوو کە چۆن جولەکە کارێکی وا خوێناوی و قێزەونیان لە مست دێ، هەرچەندە رێکخراوی ئیرگۆنیش پاساوی دەهێنایەوە هەروەها کەشوهەوایەکەش شەڕانگێزیانەبوو؛ لە هەمو لایەکەوە دادەڕسانە سەر جوەکان. دەستبەجێ بنگۆریۆن تێلگرامێکی بۆ شا عەبدوڵای رۆژهەڵاتی ئوردن لێدا، تیایدا بەرپرسیارێتی خۆی لە روداوەکەدا بەتەواوی

ڕەتکردەوە.

لەو ساتەدا وڵاتە یەکگرتووەکانی ئامریکا  کە هەمیشە لایەنگری چارەسەری دابەشکردن بوو، لەهیکەوە ڕایگەیاند کە فەلەستین دەبێ بکەوێتە ژێر دەسەڵاتی نەتەوە یەکگرتووەکان. ئەوەش نەخشەیەک بوو هیچ لایەک پێی ڕازی نەدەبوو.

ویڕای ئەمەش دەبووایە بنگۆریۆن دژی کۆنەپارێزەکانی نێو ریزی خۆشی بوەستێتەوە، هەندێکیان تەنانەت لەنێو ماپای و هیستادروتیشدا بوون، پێیان وابوو بەپێی ڕەوتی پەرەسەندویی پێشهاتەکان بێ، هێشتا ئەو ئانوساتە نەهاتووە کە دەوڵەتی جولەکان دابمەزرێ. پاساویان بەوە دەدایەوە گەر هێشتا  هەندێکی دیکە بوەستین، ڕەنگبێ باشتر بێ. تەنانەت د. وایزمەنیش پشتگیری ئەو گریمانەی دەکرد. بە هێوری بنگۆریۆن ئەوانی بۆ سەر هەڵویستەکەی خۆی کێشکرد.

جوەکانی فەلەستین بنگۆریۆنیان وەک سەرکردەیەکی خۆیان هەڵبژادردبوو، ئیدی ئەرکی سەرشانی ئەویش بوو ورەیـان بەرز ڕابگرێ و یەکێتیی ریزەکانی گەلەکەی تۆکمەتر بکا، ئەو گەلەی هەمیشە شانازی بە ئارەزوی تاکەکانیەوە دەکرد. ئیدی لەسەر بنگۆریۆن پێویست بوو هەڵمەتێکی دیپلۆماسیانەی وا بەرپا بکا کە ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان  بۆ پلانە لەپڕ ڕاگەیەندراوەکەی واشنتۆن نەیەتە سەرچۆکان، پەیوەندی دۆستایەتی لەگەڵ گەلانی دیکەدا پەرەپێبدا. بە سعاتان ئەو ڕوبەڕوی کاروباری سەربازیانە ببووەوە بۆ بەرگریکردن لە دەوڵەتێک کە هێشتا نـەزاوە؛ وەک سەرۆکێکی کابینەی سایەش دەبوایە ئاراستەی ڕاستەڕێ لە نێوان توندرۆ و نەرمڕۆیەکاندا دیارییکات و ڕابەرایەتی دروستکردنی دامودەزگای میریی بکا، بۆ ئەوەی هەرکاتێ ئینگلیزەکان ڕۆیشتن جێگەیان بگرێتەوە. دەبوایە گەلەکەی بۆ مەرگ و کاولکاری ئامادە کردبا، چونکە باوەڕی سەلمێنراوی وابوو کە شتێکی وا چاوەڕێیان دەکا. دەبوایە ئەگەری برسێتی و کورتهێنانی ئاوی خواردنەوە بە هەند هەڵبگرێ و جوەکانیش هانبدا بەرگەی بۆمبارانی ئاسمانیی و تۆپ و ئابلۆقەی دەریایی و لە دەستدانی ئازیزانیان بگرن.

هەنوکە گەیشتۆتە تەمەنی شەستوپێنج ساڵی و لە جاران زوتر ماندو دەبێ، بەڵام ئەو کاتوساتە هی ئەوە نەبوو بیر لە لەشساخی خۆی بکاتەوە. چاکەی بیرنەکرنەوەی لە لەشساخی خۆی بۆ پاولای هاوسەری دەگەڕایەوە، کە ئەو لەو ڕۆژگارەدا بەو شێوەیە ماوە. پاولا مشوری ئەوەی دەخوارد بەلای کەمی لە ڕۆژێکدا ژەمێکی باش بخوا و بێ تەنگەتاوکردنیش کەمێک بخەوێ. بەڵام بنگۆریۆن کاتی کەمی بۆ ژن، کچەکان و کتێبەکانی بە دەستەوە بوو.

سەرباری تەنگوچەڵەمەی ڕۆژانە، سەرقاڵی نوسینی وتاری سیاسیانەش بوو بۆ ڕۆژنامە و گۆڤارێک. زۆر جاران لە سعات دوو یان سێی شەو لە خەو ڕادەپەڕی و هەمو ڕۆژ و ئێوارەکەشی بە بێماندوبوونی کاردەکرد.

شەش مانگی ڕەبەق و بەردەوام کارەکان بە خواروخێچی دەڕۆیشتن.

سێ فڕۆکەی جۆری مێسەرسخمیت Messerschmitt( فڕۆکەیەکی جەنگاوەری ئاڵمانی  جەنگی جیهانیی دوهەم بوو-وەرگێر ) هاتنە فەلەستین، بەڵام یەکیان لە

گەیشتنی کـەوت و شکا، دوهـەمـیان پیش نیشتنەوەی بە نـاچـاری نیشتەوە و بێسەروشوێن بوو.
گۆلدا میرسۆن (دواتر بە گۆلدا مایر ناسرا) کە بیچمێکی ناسراوی کابینەی سایەکە بوو، لەبەر هێرشێکی تەوژمی دڵ نەخۆشکەوت.
دۆستروۆڤسکی سەرکردەی هێزەکان بە قورسی نەخۆش کەوت، بەڵام هێشتا لە پەنسیۆنێکی حەیفادا سەرهێڵەکانی بەرگریکردنی دادەنا.
یادین جێگەی دۆستروۆڤسکی گرتەوە، رۆژانە لەگەڵ بنگۆریۆندا راوێژیدەکرد. رۆژێکیان هەواڵێکی سـەیروسـەمـەرەی پێبوو، هـەرچـەنـدە فـرێ بـەسـەر کـایەی سەربازیشەوە نەبوو. باوکی یادین شتیکی لەگەڵ خۆی هێنابوو کە هەمو ئارکیۆلۆجێک ئێرەیی پێدەبرد.
بازرگانیکی ئەرمەنی کەلوپەلە ئەنتیکەکان، هەواڵێکی بۆ د. سوکینک D. Sukenk (یادین ناوی نهێنی ریکخراوی جەنگاوەرانەی بوو، دواتر کردیە ناوی فەرمی خۆی) نارد، داوایلێکرد بە پەلە بگاتە بەندەری سەربازیی زۆنی B لە ئۆرشەلیم. لەوێ ئەو و کابرای ئەرمەنی دەربارەی چەند لولەیەکی پێچراوە قسەدەکەن.
ئەرمەنیەکە پارچەیەک دەستنوسێکی لەسەر پێستەی لولدراو کە لە ئەشکەوتێکی تاریکی سەر زێی مردو لەلایەن رەوندێک ( بەدەوی Bedoein) کە بەدوای بزنەکانی دەگـەڕا دۆزراوەتــەوە، کڕیوە. پێستە دەستنوسە لولدراوەکە لەنێو شوشەیەکدا دۆزراوەتــەوە. رەوەنـدە عەرەبەکە لەگەڵ خۆی هێناویتە بێتلەحم، هەنوکەش د. سوکەنیکیان دۆزیوەتەوە ئاخۆ بۆ زانکۆی عیبریان لێدەکڕێ.
سوکەنیک لە کوڕی خۆی پرسی ئایا لەو باردوۆخەدا کە عەڕەبەکان وا دژوارن، دەکرێ بچێتە بێتلەحم؟
وەک ئەندامێکی دەستەی ژەنەڕالەکانی هاگانا، بێگومان یادین هەردەبوایە بە «نەخێر، نابێ بچی» بەرسڤی باوکی بدابایەوە، بەڵام رۆژێک پاشتر د. سوکێنیک سەرچڵیەکەی هەر کرد، چووە ئەوێ و هەر سێ لولەکانی کە هەمویان سەد دۆلاری پێنەدا بوون لەگەڵ خۆیدا هێنان. ( ساڵیک دواتر کوڕەکەی لە نیویۆرکدا چوار لولەی لەوانەی هاوچەشنی باوکی بە چارەگە ملیۆن دۆلارێک کڕینەوە.)
نوسینگەی بنگۆریۆن لە خانویەکی شەقامی هایارکۆن Hayarkonی سەر کەناری زێی لە ناوجەرگەی تەلئەبیبدا بو. یادین نزیکەی رۆژانـە دەهاتە لای. بە چەندان سعات خۆی و بنگۆریۆن سەریان بەسەر نەخشەکاندا دادەگرت. زۆرجاران سەرکردە پرچ سپیە لولەکە دەبووایە بڕیاری حەتمی سەربازیانەی بدابان. هەندێک جارانیش کە نەیویستبا لەسەر شتیک شێلگیربێ و بیسەلمێنی، روی دەمی قسەی لە هیکەوە بەرەو زێی مردو وەردەگێڕا.
«ئایا باوکت دەتوانێ نوسراوەکە وەربگێری؟»
لەو ساتەدا یادین کە زیاتر بە بەرزی سەرێکەوە لەسەر سەرکردەکەی بوو، بە چەقاوەسویانە خەندەیەکی بۆ دەکرد و ئەنجا بە پێداگرتنەوە دەیگوت:
«ئاخر، بنگۆریۆن من دەمەوێ دەستبەجێ وەڵامی پرسەکەم وەربگرمەوە.»

میوانانی ئەو نوسینگە بە جۆرەها کێشە وگرفتەوە دەهاتن دەچوون: پرسی چۆنیەتی گواستنەوە و بارکردن، کۆچبەران، ئاوی پاکی خواردنەوە، راژەی پەیوەندییەکان، بەنهێنی خواردن رەوانەکردن، ئۆرودوگای دیلەکان، ئینگلیزەکان، کۆبوونەوەی دادێی کابینە- ئەوسا پاولای خێزانی لەسەر تەلەفون، هەروەها لە دوای ١٥ی مانگەوە سیستمی باج چۆن دەبێ، جەژنەکان، ئایا رۆژنامەکان چۆن دەردەچن و دەزگای ستێنسل چۆندەبێ هەروەها ئایا چۆن حکومەتێک بەبێ دەزگای ستێنسل دەکەوێتە گەڕ؟

رۆژێکیان بە هەڵەداوان کارمەندیک کە بەکاتیی سەرپەرشتی دەزگای پۆست و تەلەفۆنی لە ئەستۆ بوو، هاتە لای بنگۆریۆن پرسیاری ئەوەی لێکرد، بەڵکو بە یارمەتی خۆی ناوی دەوڵەتە نوێیکەی پیبلێ. ئەو دەبێ پول بە ڕادان بدا، بەڵام چۆن دەتوانێک لەگەڵ هونەرمەندێک ریکبکەوێ گەر هاتو ناوی وڵات و دەوڵەتەکەی نەزانێ؟

بنگۆریۆن بەرپرسی پۆست و تەلەفونی رەوانە کردەوە. هێشتا کاتی ئەوە نیە کە ئەو جۆرە کاروبارە لوکسەیانە ( کەمالیاتانە ) قسەی لەسەر بکری.

هەر بۆیەشە لەسەر یەکەم پول تەنها دەستەواژەی دۆوار ئێڤری Doar Ivri (پولی جولەکان) نوسرابوو.

بنگۆریۆن بە زۆری لە خەمی راژەی کاروباری گشتی هاوڵاتیان دابوو. ئەو بە ئەندامانی کابینە سایەکەی گوت:

«گەر کار وابڕوا، بە ئاسانی کاربەدەستە باڵاکانی حکومەتمان دەستدەکەوێ. بەڵام من ئەوە دەپرسم ئاخۆ چۆن دەستمان بە کارمەندی پلە خوارتر وەک لێخورانی شەمەندەفەر، کارگوزاری تەلەفون، پەرستار بۆ نەخۆشخانەکان دەستدەکەوێ.»

لەسەر پێشنیازی ئەو کۆمیتەیەکی تایبەت لە سی پیاو پێکهات. هەر یەکێک لە ئەندامانی لەو کۆمیتەیە بە ڕەهەندیکی حکومەت و چەندان دامودەزگاوە خەریک دەبوو، دەبوایە کارمەندی بۆ بدۆزیبانەوە و ئامادەی ئەوکاتەی کردبان کە دەوڵەتی جولەکان وەک راستییەک دەرکەوتبا. بەڵام ئایا چۆن دەوڵەتێکی تازە دەستی بە کارمەندی بە ئەزمون رادەگا، پیاوانێک کە مانگانەی حکومەت ریکێخەن، نرخی کاڵاکان دیاربکەن و ئەو هەمو نوسینگە و تەلارە جۆربەجۆرانە سازبدەن، بە راستی کارێکی زۆر پێویستیشە.

بنگۆریۆن دەیزانی کە جوەکان هەنوکە وەک هەمو شۆڕشگێڕەکان توشی گرفتی مەزن بوون. لەهەمو ئەو ساڵانەی رابردوودا جوەکان خۆیان وەک بەرەنگاریکارێک(جەنگاوەرێک)، وەک سەربازێکی نهێنی، وەک خۆشاراوەیەک لەبەر دەسەڵات، وەک سیاسییەک و بانگاشەدەرێک خۆی ئامادەو تەیار کردبوو. کەچی ئەو هەمو زانیارییانەی کەمتر بەکەڵک دەهاتن، گەر هاتو بوونە پشکێنەری باجدان یان حیسابی ئەوە رابگرن ئاخۆ دەبێ کیلۆی شەکر لەبازاڕدا بەچەند بفرۆشرێ، چیدەکەن.

رۆژێکیان کۆمیتەی تایبەتیی لەسەر تاوتوێکردنی بارەگای حکومەت کۆبوونەوە. ئایا بارەگای حکومەت لە کوێ دابندرێ؟ ئۆرشەلیمیان لە حیسابەکەیاندا بەلاوە

نابوو. حەیفاش بۆ بارەگای حکومەت دەستینەدەدا، چونکە ئینگلیزەکان رایانگەیاندبوو رەنگبێ شەش مانگی دیکەشیان دوای کۆتاییهاتنی ماندات پێویست بێ تا بە تەواوی دەکشێنەوە. ناوی ناتانیا Natanya کە دەڤەرێکە لە نێوان تەلئەبیب و حەیفادا، هات. ئەوێ ئۆردوگایەکی حەسانەوەی ئینگلیزەکان بوو، پڕ خانوو بوو هەموی بەسەر یەکەوە شەشسەد ژوری هەبوو.

هەروەها نەخشەی ئەوەش لە گۆڕێدابوو کە دامودەزگاکانی حکومەت بەسەر هەمو وڵاتدا دابەشبکەن.

بنگۆریۆنیش پێشنیازی خۆی هەبوو. ئەو کورنوب Kurnub کە نشینگەیەکی جێهێڵراوی نەبەتیەی ناو جەرگەی بیابانی نەقەبە، دانابوو. شوێنەکە بەناوی مامشیت Mamshitیش ناودەبردرا.

کورنوب کاتی خۆی شارێکی بە ئاپۆرەی سەر رێی کاروانی بیابان بوو. کاروانچییەکان بۆ پشوی خۆیان و ئاژەڵەکانیان شەو لەوێ لایاندەدا، باجیش لە کاروانەکان دەستێندرا.

دواتر بووە قەڵایەکی رۆمییە بێزەنتینیەکان.

بنگۆریۆن بە دوای گیانە گەڕۆکەکەیدا چوبوو، هەنوکە شوێنەکە چۆڵکراوە، لەنێو بیاباندایە تەنانەت زۆر لە دانیشتوانی فەلەستین هەر ناویشیان نەدەزانی. بەڵام لە دۆڵەکانی دەوروبەریدا شوێنەواری کشتیاری بەدیدەکرێ، وادەردەکەوێ کاتی خۆی برەوی زۆر هەبووە شوێنەواری بەربەستە ئاوییەکانی رۆژگاری بیزەنتینیەکانی هەر پێوەماوە، کە نیشانەی بە پیتوفەڕی خاکەکەی دەردەخست. بەروبومی زۆری هەبوو زستانانیش بەشی خۆی بارانی لێدەباری.

پیشنیازەکەی بنگۆریۆن لەلایەن نزیکەی هەمو هاوکارانییەوە وەرنەگیرا، ئەویش وەک دیموکراتێک لەسەر کورسیەکەی بە چاوی نیوەداخراوە لیێپاڵدابووەو و دۆڕانەکەی پەژراند. ئەو شوێنەی لە دواییدا دەستنیشانکرا سارۆنا Sarona بوو. سارۆنا نشینگەیەک بوو، زۆر کێڵگە و شورەی بەردینی هەبوو، لە ڕاستیدا کاتی خۆی لەلایەن سوارچاکەکانی ئاڵمانەوە لە لێواری تەلئەبیبەوە بنیاتنرابوو. لە رۆژگاری شەڕی دوهەمی جیهانییدا ئینگلیزەکان ئەوێیان گرت، چونکە خاوەندارەکانی هەواداری نازییەکان بوون. ( ئەو پیاوەی هیتلەر فەرمانی پێدابوو کە جوەکانی ئاوڕوپا قڕ بکا، ئاڵمانێکی شۆڕەسوار بوولە سارۆنا لە دایک ببوو.)

سارۆنا ناوی هاکیریا Hakirya (شارەکە) بەسەردابڕا. یەک بە یەکی ئەندامانی کابینە سایەکە سەری ئەوێیاندا تا ببینن لە کامە کێڵگە فلانە وەزارەت و لە کامە ئاشپەزخانەدا سکرتاریەت و تایپیستی لێدابنرێ، لەوەش دەگەڕان ئاخۆ بەشێکی ژێرزەمینێکی شەڕاب و شوێنی خۆ حەشاردان دەشێ.

بۆیە مێزی نوسینگە، کورسی و دۆڵابی ئەرشیف بە ڕاداندران و بۆ رۆژی خۆی هەموی بەنهێنی گواسترانەوە. هەفت هەفتە پێش ١٥ی مانگ بنگۆریۆن و هاوڕێکانی رونکردنەوەیەکیان دا. هەرکاتێ ماندات کۆتاییهات ئەوان دەوڵەتی خۆیان رۆدەنێن. جولەکان ئامادەبوون پەیوەندی دۆستایەتی لەگەڵ عەرەبەکانی ناوەوە و دەرەوەدا

گرێبدەن. لەگەڵ ئەو هەمو شتەی روشیداوە جولەکاکان هێشتا ئامادەبوون یارمەتی ئینگلیزەکان بدەن تا بە ئارامی و بە ئاسانی وڵات بەجێبهێڵن و باربکەن.

چەند هەفتەی پڕ گفتوگۆ و راوێژی خایاند تا رونکردنەوەیکەیان بپەژرێندرێ؛ بنگۆریۆن بە چەندان سعات هەر داوایدەکرد. هێشتا هەندێ جولەکە مابوون نە دەوێران، لە دەرهاویشتەکەی دەترسان، پێیان وابوو سروشەکەی بنگۆریۆن  بارودۆخەکەی بە باشی هەڵنەسەنگاندووە و بڕیارێ بەجێی نەداوە.

لەدوا رۆژەکاندا بنگۆریۆن لەهەمو لایەک بوو؛ کارگەی گوللە دروستکردنی بەسەردەکردەوە، بێباکانە لەگەڵ دوا ئۆتۆمبێلی کارواندا سەردانی ئۆرشەلیمی دەکرد، قسەی دلێر و ورە بەرزکردنەوەی بۆ هەموان هەبوو، ئەو پەڕی توانای خۆی بۆ بەدەستخستنی متمانەی جولەکان بەکارهێنا.

فەرمانی دایە هاگانا گەر بەراستی ناچارکران بجەنگن، هەوڵبدەن تابکرێ قوربانیی کەم بدەن.

بەڵام لە هەمان کاتدا سەرنجی وردی خستبووە سەر لایەنی سەربازی کە پسپۆرەکان هێنابویانە پێش. ئەوان دەیانەویست چەندان نشینگەی جولەکە چۆڵبکرێن و لەشکرەکەشیان پەرت نەکرێ. لە ڕاستیدا پێشنیازێکی بەجێبوو بەڵام بنگۆریۆن گوتی: «ئێمە دەبێ پارێزگاری لە هەمو گوندێک، تەنانەت ماڵ بەماڵ مەتر بەمەتر بکەین.»

ئەو کەللەڕەقیەی چەرچلیانە هەندێ لە کەسە ریالیستەکانی پەستکرد، هەندێکیان پێیان وابو ئەم رایەی ئێستای بنگۆریۆن لەگەڵ ئارەوزووەکەی بەوەی تابکرێ ریژەی قوربانیدان کەمبکرێتەوە، یەکناگرێتەوە. بەڵام بە گشتی رەفتارەکەی لە جاران جێی بڕوا و متمانەتر بوو.

کاتێ ساتی بڕیاردەر نزیکتردەبووەوە گرژی لەوە زیاتر دەبوون کە وڵاتەکە لە رۆژە پڕ ئاژاوەکانی توشی ببوو. بەیانیەکی باراناوی ناخۆش پۆلیسیک هاتە ئەزمونگەی کیمیاوی تەلئەبیب و سەلکە نقیشکێکی لە جامێکی شوشەدا پێبوو.

کارمەندی پرسگە چاوێکی لە نقیشکەکە بوو تەماشای پۆلیسەکەی کرد.

پۆلیسەکە گوتی: «دەبێ ئەوە لێرە بپشکنرێ.»

لە پرسگەدا بانگی کیمیاگەرێگ کرا.

کیمیاگەرەکە پرسی «بۆچی بپشکنرێ؟»

پۆلیسەکە وەڵامی دایەوە: «پاولا بنگۆریۆن منی ناردۆتە ئێرە.»

کیمیاگەرەکە پێکەنی و دەفرەکەی لە پۆلیسەکە وەرگرت و زەنگێکی بۆ خانمەکەی بنگۆریۆن لێدا.

«ئا بەڵێ، من ناردوومە، پێویستە تۆ نقیشکەکە بپشکنی، چونکە من بیرۆکەیەکی وام بۆ دروستبووە کە لەلایەن کێڵگەکەیەوە هەڕەشە لە داودکەی من دەکرێ و ئەو جۆرە نقیشکە ناپەسەندەی بۆدەنێرن! ئەو لەو رۆژانەی دواییدا زۆر سەرقاڵە و دەبێ خواردنی باش بخوا تا خۆی لەسەر پێیان رابگرێ. تکایە نقیشکەکە بپشکنەو لە ئەنجامەکەشیدا ئاگادارم بکەرەوە.»

لە دوا ڕۆژەکانی ماندانتدا هەواڵی خۆش و ناخۆش دەهاتن.
لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئامریکدا چەکفرۆشتن و ڕەوانەکردنی چەکیان بۆ وڵاتەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا قەدەخە کردووە. چونکە عەرەبەکان لە ژێدەری دیکەوە لە ڕاستیدا ئەوەندەی ویستویانە چەکیان بەدەستخستوە، ئەو قەدەخەکردنەی ئامریکا بۆ ئەوان گرنگ نەبوو، بەڵام بۆ پەیمانگای سۆنەبۆرن زەبرێکی کوشندە بوو.
مارشال Marshallی وەزیری کاروباری دەرەوەی ئامریکا نامەیەکی بۆ بنگۆریۆن نوسیبوو، هەرچەندە پەسندنامەی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئامریکاشی هەیە، بەڵام واباشە جاڕێ دەوڵەتی جولەکان ڕانەگەیەنرێ و بیوەخرێنی. هەندێ بەندوباویش پەیدابوون کە خودی سەرۆک ترومان فرۆکە تایبەتیەکەی خۆی کە «مانگای پیرۆز»یان پێدەگوت، خستۆتە خزمەتی نوێنەری جولەکات گەر بێت و ئامادە بێ لە فەلەستینەوە بڕواتە واشنتۆن، بەڵکو بیرۆکەی ڕاگەیاندنی دەوڵەتی پێبگۆڕێ.
تاکە هەواڵێکی خۆش گەیشتنی کەشتیەکی هاگانا بوو، کە توانیبوویان بە شەوێکی نوتەک لە گەمارۆی ئینگلیزەکان دەرباز ببن. کەشتییەکە نیوەی ئەو چەکانەی لە چیکۆسلۆڤاکیاکان بەڕاداندابوو، بارکردبوو؛ هەرزو بارەکە دابەزێنراو بەسەر یەکە سەربازیەکانیاندا دابەشکرد.
کەمێک پێش ١٥ی مانگ بنگۆریۆن لە کۆبوونەوەیەکی داخـراودا قسەی بۆ سەرکردەکانی زایۆنیزم کرد. هەشت مانگ پێشتر ڕاستیەکانی پێگوتبوون. بەڵام زۆریان بڕوایان نەکردبوو. هەنوکە بە مکوڕبوون و لێبڕاوانە گوتی:
«لە هـەزارو هەشتسەد ساڵی ڕابـردودا هەرگیز پێشهاتەکان وا هەڕەشەئامێز نەبوونە.»
لەسەری ڕۆیشت کە لەسەر کۆمەڵگای جولەکە پێویستە «هەمو پشکێکی ئابوری، هێزی چەکداری، توانستی گواستنەوە، زانست و تەکنیکەکانی، کەرەستەکانی دارایی هێزی ورەیان، ڕۆژنامەو تەواوی ژیانی جەماوەریانەیان» بخەنە تای تەرازو.
«هۆکاری یەکلاکەرەوەی سەرکەوتن توانستی گواستنەوەو هاتوچۆ و گەیاندن، پارە ورە و زیرەکایەتییە.»
لە کۆتایی دوانەکەیدا گەیشتە ئەوە بڵێ:
«هەرچەندە پسپۆڕەکانیش دەربڕینی خۆیان هەبێ، بەڵام من دەوێرم بڵێم بڕوام بە سەرکەوتن هەیە.»
لەدوا ساتدا ڕێکخراوی ئیرگۆن و هاگانا ڕێکەوتنامەیەکیان واژۆکرد بەوەی بەڵێن بەیەکدی بدەن لەسەر گۆڕەپانی شەڕدا بە تەواوی هاوکار و پاڵپشتی یەکدی بن.
لە دواییدا نەرمڕۆ و توندڕەوەکان، دژە زایۆنیستەکان و هەوادارانی زایۆنیزم، ئۆرسۆدۆکسە جوەکان و ئەوانەی فریان بەسەر دینەوە نەبوو، ئاکنجیانی شارە گەورەکان و کیبۆتنشینەکان، جوەکانی ئاوڕوپا و ڕۆژهەڵاتیەکان، چەپ و ڕاستەکانیان، سابراییەکان و ئەوانەی بەدوا کەشتی گەیشتوون، یەکێتییەکەی گەورەیان لەو هەمو جیاوازکاریانەی کە هەبوو، پێکهێنا.
فەلەستینی جولەکە لەسەر پێ بوو. بەڵام هێشتا بۆ زۆرانبازییەکە ئامادە نەبوو.

هێشتا بە باشی چەکدار نەبوو. بەڵام لەسەرپێ بوو. ئاخر وڵاتەکە سەرکردەیەکی هەبوو.

د. وایزمەن کە بە قورسی نەخۆش کەوتبوو، ئەو ماوەی لە نیویۆرک بەسەربرد. ژابۆتینسکی و کاتزێنسلۆن مردبوون. ئەوانی دیکە بێ بڕیار مابوونەوە. تەنها پیاوێک سەری بەرزی راگرتبوو، بەهەر دوو دەستی ئاراستەی سوکانەکەی روەو ئاسۆ چەسپ راگرتبوو، هەندێ جارانیش وەک سەراب دەهاتە پێشچاوان.

لە ماوەی ئەو شەش مانگەدا بنگۆریۆن لە دەوڵەتمەدارێکی تیژبینەوە ببووە بیچمێکی جیهانیی و سەلماندی کە تیایدا هەیە وڵاتی بابوباپیران بۆ گەلە دێرینەکەی بگەڕێنێتەوە.

بەڵام هەنوکە دەبێ ئەوە دەربکەوێ ئاخۆ بەڕاستی ئەو خاسیەتە حاشاهەڵنەگرانەی شوانەی تێدان کە هاوواتای ناوەکەیەتی.

# بەشی

## (١٣)

ئینگلیزەکان گوتبوویان شەوی ١٤ لەسەر ١٥ی ئایاردا وا دادەنرێ کە ماندات کۆتاییپیهاتووە و کەلوپەلەکانی خۆیان تێکدەنێن و بارگەو بنەیان دەپێچنەوە. ئەوەش شەوی هەینی لەسەر شەمە بوو.

بنگۆریۆن لە چوارشەممەی هەمان هەفتەدا کۆبوونەوەی بە ئەنجومەنی نیشتمانیی کرد. گرنگترین پرس ئەوە بوو ئایا هێشتا زۆرینە لەگەڵ ئەوەدایە کە ساتی جاڕدانی دەوڵەتی جولەکان هاتووە. بنگۆریۆن نەیدەویست دواتر لۆمە بکرێ گوایە ئەو بڕیارەکەی خوێندۆتەوە و ئۆپۆزسیۆنیش لە ئاستیدا بێدەنگ بووە.

بەڵام سەرەتا هەواڵێکی پێڕاگەیاندن. هەواڵێک دەربارەی گوش ئێتزۆن Gush Etzion کە دەستەیەکی چوار نشینگەییە کەوتۆتە بیست کیلۆمەتر لە خوارووی ئۆرشەلیم، عەرەبەکان هەرچوار دەوریان گرتووە. لە هەوڵێکیشدا بۆ خۆگەیاندنە ئەو نشینگانە و ئابلۆقەشکاندندا سیو پێنج سەربازی هاگانا کوژراون. لەو کاتەوە ئازوقەیان بە فڕۆکە بۆ بەردەدرێتە خوارەوە. نشینگە جوەکان بەردەوام لەلایەن تاقم و باندی عەرەبەکانەوە تەنگەتاو دەکران.

بنگۆریۆن لەو بڕوایەدا بوو دوو قۆشەنی هێزی عەرەبان کە لە لایەن ئینگلیزەکانەوە ڕێنمایی دەکران، هێرشێکی سەربازییانەیان بۆسەر گوش ئێتزۆن دەستپێکردووە، هەرچەندیشە هێشتا ماندات کۆتایی نەهاتووە.

ئەندامانی ئەنجومەنی نیشتمانیی بە سەرسامییە گوێیان بۆ رادەگرت.

دواتر موشێ شیرتۆک داوای دەرفەتی قسەکردنی کرد؛ ئەو هەر سعاتێک زوتر لە ئامریکاوە گەڕابووەوە، زۆر پێی لەسەر ئەوە دادەگرت کە جارێ جاڕی دەوڵەتی جولەکان نەدرێ.

گۆلدا میرسۆن (مایەر)یش دەربارەی سەردانەکەی بۆ لای شا عەبدوڵا قسەیکرد. ئەوان بە نهێنییەوە لە فەلەستین یەکدیان دیتبوو؛ هەنوکەش دەبووایە ئەو بچێتە لای شا عەبدوڵا بەڵام ئەمجارەیان لە عەممان. گۆلدا مایر بە دەمامکی تەواوەوە خۆی وەک خانمێکی عەرەب هەڵخستبوو، ئەنجا چووبووە عەمان. پاشای ئوردن دۆستانە پێشوازی لێکردبوو، بەڵام ئەو خەمبار و دەمارگیر بوو.

پاشا پرسیبووی: «باشە بۆچی جولەکەکان لە جاڕدانی دەوڵەتەکەیان ئەوەندە پەلە دەکەن؟»

وەڵامی گۆلداش ئەوە بوو : «ئەرێ تۆ ئێمە بە پەلە دەزانی؛ ئێمە وا دوو هەزار ساڵە چاوەڕێدەکەین.»
شا عەبدوڵا دژی هەر دابەشکردنێکی فەلەستین بوو. ئەو دەیویست هەمو وڵاتەکەی لەبن رکێفدابێ، ئەوەشی نەشاردەوە کە بە کۆمەکی لەشکەرە عەرەبییەکان دەیەوێ وڵاتەکە داگیر بکا.
دواتر یادین گوتی سەرچاوە هەواڵگرییەکان ئەوە رادەگەیەنن کە یەکە سەربازییەکانی وڵاتە عەرەبە دراوسێکان خۆیان ئامادە کردوەو وا بە خێرایی بەرەو سنور دەکشێن. مرۆ پێیوابوو کە لە شەممەدا لە هەمو لایەکەوە هێرش دەکرێتە سەریان و بە فڕۆکەش تەلئەبیب بۆمباران دەکرێ.
دوای ئەوەی بنگۆریۆن قسەکانی خۆی تەواوکردن، مرۆ لەسەر ئەوە کۆکبوو کە نەخشەی جاڕدانی سەربەخۆبوونی جولەکە هەر پێشنۆرەیە.
ئیدی هەنوکە پرس ئەوە بوو ئاخۆ چ سعاتێک بۆ جاڕدانی سەربەخۆبوون دەستنیشانبکەن.
هەر وەک پسپۆڕێکی قانونی رونیکردەوە، نابێ ئەو کارە بەر لە نیوەشەوی رۆژی هەینی لەسەر شەممەدا ئەنجام بدرێ. بەڵام لە هەینیدا کاتێ رۆژ ئاوادەبێ شابات (شەممە) دەستپێدەکا، ئەوسا ئەندامانی ئۆرسەدۆکس لە ئەنجومەنەکەدا واژۆی خۆیان ناخەنە سەر جاڕنامەکە، هەروەها ئەوان لەو کاتەدا چیدیکە ناگەڕێن و هیچ کارێک ناکەن، چونکە لەگەڵ پشوی شەباتدا یەکناگرێتەوە.
ئەندامە ئۆرسۆدۆکسە جوەکان سەیری رۆژمێری خۆیان کرد و حیسابیان کرد کە دەکرێ بۆنەنامەکە لە سعات چواری دوای نیوەڕۆی رۆژی هەینی دەستپێبکا، ئەوسا تا رۆژ ئاوا دەبێ بۆنەکە تەواودەبێ و تێدەپەڕی.
کاتێک ئەنجومەنەی نیشتمانیی بڵاوەیلێکرد، کابینەی داهاتو کۆبوونەوەی خۆی سازدا، تیایدا داڕشتنی جاڕنامەی سەربەخۆبوونەکە بە چوار قانونزان سپێردرا. ئەندامێکیان سکاڵای هەبوو:
«ئەرێ چۆن دەتوانین ئێمە جاڕی دەوڵەتێک بدەین گەر سنورەکانی دیارنەکەین؟ ئێمە سەرەتا دەبێ دەوڵەتی جولەکە بە تەواوی لەسەر نەخشە دەستنیشانبکەین و بە رونی هێڵە سنورییەکانی بکێشین، بۆئەوەی راشاکاوانە بڵێن کە دەوڵەتەکەمان چیەو و لەکوێ دەستپێدەکا و بە کوێش کۆتایی پێدێ.»
بنگۆریۆن ئەو سکاڵانامەی بەلاوە نا، چونکە جاڕنامەی سەربەخۆبوونی ئامریکای بەبیرهێنانەوە کە هیچی دەربارەی سنوری باس نەکردبوو.
دوا خاڵی سەر ئەجێنداکەیان پرسی ناونان بوو. زۆریان پێیان وابوو دەبێ ناوی دەوڵەتەکەیان بەبێ راڕابوون جودیا Judea بێ. ( بە عیبری یاهودا Yahuda ی پێدەگوترێ ). بەڵام لە روی جوگرافییەوە یودیا تەنها ئەو دەڤەرەی دەورەبەری ئۆرشەلیمی دەگرتەوە، بۆیە ناکرێ ئەو ناوە بۆ دەوڵەتی جولەکان بەکار بهێندرێ.
یەکێک لە وەزیرەکان پێشنیازی ئیڤەر Everی کرد، بەڵام بۆ ئەو پێشنیازەش کەسی لەگەڵدا نەبوو، هەرچەندە رەگی پەیڤەکە بۆ ئیڤری ivri واتە عیبری دەگەڕایەوە.

دەستەواژەی ئێرتز ئیسرائیل ErtezIsrael قسەی زۆری لەسەرکرا، چونکە هەر بەو شێوە مرۆ وڵاتی باپیرانی جولەکەی دەناسی، بەڵام بەو دەستەواژەیە مرۆڤ واتیدەگەیشت کە هەمو ئەو هەرێمەی بەرێی  کە جولەکەکانی لێیدەژیان، دەگرتەوە، کەواتە دەبووە مایەی تاوانبارکردنیان بە گێڕانەوەی قەڵەمڕەویێتی دێرینیان.

«من پێشنیازی ؛ئیسرائیل Israel» دەکەم»

ئەوە دەنگی  بنگۆریۆن بوو کە پێشنیازەکەی بۆهات.

ئەوانی دی ناوەکەیان هەندێ پێ نامۆ بوو. ئەوان بە نزمیەوە لەبەرخۆ وشەکەیان دەگوتەوە تا لێیڕابین.

«ئیسرائیل.»

«حکومەتی ئیسرائیل.»

«مارینزی ئیسرائیل.»

«نێردەی ئیسرائیل.»

«هاوڵاتیی ئیسرائیل.» (بەگوێرەی زمانەوانان مرۆ دەکارێ وشەی ئیسرائیلیی تەنها بۆ ئەوە بەکاربهێنێ کە واتاکەی هاوڵاتیەکە، هاوڵاتی ئیسرائیلە، نەوەک سیفەت.)

بنگۆریۆن ناوەکەی دایە دەنگدان. ئەو و شەش کە سی دیکە دەنگیان بۆدا، سێ ئەندامیشیان دژ بوون و چوار ئەندامیش هەر لەوێ نەبوون

بەو شێوەیە ئەو پیاوە ماندونەسانە  کە بۆ ئایندەی  دامەزراندنی دەوڵەت تێکۆشا و لە هەمو ئەوانی دیکە پتر ئیشیدەکرد، ناوی دەوڵەتەکەش هەر بە پێشنیازی خۆی بوو  کەچی بە تەنها بە دەنگی نیوەی کابینەکەی پەسەند کرا.

کاتێک کۆبونەوەکەش دوایی هات، کات نیوەی شەو بوو. زێیف شارێف کە لە ئایندەدا بووە سکرتێری کابینەکە بە خانمە تایپیستەکەی گوت؛

«من دەزانم کە رۆژەکە هەموی بە ئیشکردن شەکەت و ماندوو بوون، بەڵام پێش ئەوەی بڕۆنەوە دەبێ ئەو یاداشتەش تەواوبکەن.»

کاتێکیش لە دواییدا تەواو لە تایپکردنەکە بوونەوە، شارێف تەواوی راپۆرتەکەی لەگەڵ خۆیدا برد. ساڵانی دوایی رایگەیاند:

«من دەمزانی کە تەلئەبیب بەلای کەمەوە ئێوارەی شەمە بۆمباران دەکرێ. گەر هاتبا و سەرکردەکانی حکومەت و تایپیستەکان و ئێمە هەمومان بە رێکەوت بەرکەوتبایـن و مردباین، ئەوکات جیهان هەرگیز نەیدەزانی کە دەوڵەتی ئیسرائیل دامەزراوە. بۆیە من راپۆرتی دانیشتنەکەی ئەنجومەن و کۆبوونەوەی کابینەکەم لە رۆژی هەینیدا لە قوڵترین ژێرزەمینی تەلئەبیبدا شاردەوە، تا مەترسیەکان بەسەردەچن.»

رۆژی پێنجشەممە بنگۆریۆن نزیکەی هەمو رۆژەکەی بۆ کاروباری سەربازییانە تەرخانکرد. تا سعات چواری شەو لە بارەگای سەرەکیدا مایەوە.

لە هەمان پێنجشەممەدا بانگهێشتنامە بۆ دووسەد جولەکەی فەلەستین نێردرا. لێیان داواکرا نیو سعات بۆ شکۆی بۆنەکە کە لە سعات چواری پاشنیوەڕۆ دەستپێدەکا، لە مۆزەخانەی شارەوانی  کە دەکەوێتە سەر رۆتشیلدبولیڤار Rothschildboulevard بە جلی تۆخی ئاهەنگەوە ئامادەبن. بەڵام لە بانگهێشتنامەکەدا جەختیان لەسەر

ئاگادارینامەیەک کردبووەوە کە دەبێ شوێن و وادەکە زۆر بەنهێنی بپارێزن. گەر هاتو میسرییەکان بیانزانیبایەوە و لەوەدا سەرکەوتووبوونایە لە کاتوساتی خۆیدا کۆمەڵە بۆمبێکیان بەسەر مۆزەخانەکەدا بەربدابایە خوارەوە، ئەوا لە کاتێکدا ئیسرائیل لەدایک دەبوو کە هەمو سەرکردەکانی مردبوون.

گرنگترین ڕۆژی داود بنگۆریۆن لە سعات ٧ی بەیانی کە لەخەو هەڵسا دەستێکی بە پرچە سپیەکەی داهێنا، دەستییێکرد. پاولا بە چەند ووشەیەکی نەرمونیان بەیانیباشی لێکرد و ئەنجا چوونە ئاشپەز و لەسەر مێز بۆ قاوەخواردنەوە دانیشتن. لەگەڵ قاوەخواردنەوەدا چاوێکی بە رۆژنامە عیبرییەکان و رۆژنامەی پۆستی فەلەستینی کە بە ئینگلیزی دەردەچوو، داگێڕا.

بنگۆریۆن پرسی: «ئەرێ هیچ زەنگێک دەربارەی گوش ئیتزون لێدرا؟»

«نەخێر، ئەرێ لەوێ چی قەوماوە؟»

بە خانمەکەی راگەیاند کە نشینگەی ناوبراو لە شەوی رابردوودا پەلاماردراوە. ئەو دووسەد چەکدارەی ئەوێ کە چەکەکانیشیان باش نەبوو، زۆر مەردانە ماوەیەکی درێژ لە بەرامبەر قۆشەنی عەرەبەکان خۆیان راگرتووە و بەرگری دەکەن.

«ئەرێ، تەلەفونێک کرا، کە دەبێ سعات نۆ لە بارەگای سەرەکی ئامادە بی.»

لە بەردەم ماڵەکەی جیبێکی سەربازی وەستابوو.

لە بارەگای سەرەکیدا دەیان ئەفسەری لێبوون سەریان بەسەر نەخشەدا داگرتبوو. ئەو زیاتر گوێیدەگرت لەوەی بدوێ. زۆربەی کات بە نیوچاوانە دیارەکەی چاوی مۆلەق رادەگرتن. لە دەمارگیرییدا هەراسان ببوو چەند جارێکیش مستی دەستی خاودەکردەوە.

تەتەرەکان دەهاتن و دەڕۆیشتنەوە. هەندێ هەواڵی فەرماندەکانی سەرگۆڕەپان ورەبەخش و ئەوانی دیکە نەخێر ئەژنۆشلکردن بوون.

لە لاتورندا تۆپخانەی دوژمن هەمو شەوەکە شوێنپێگەی جولەکەکانی دابووە بەرتۆپان. لەوێدا تۆپیکی هاگانا تێکشکا بوو.

لە پڕێکەوە دەنگی ماتۆڕی فڕۆکەیەک هات. بەلەز بنگۆریۆن بەرەو لای پەنجەرەکە غاریدا. فڕۆکەکە بەنزمی بەرەو باکور دەفڕی.

یەکێک هاواریکرد: «ئینگلیزە».

ئەفسەرێکی دیکە هەڵیدایەو گوتی: «وا دەردەکەوێ ئینگلیزەکان بە ڕاستیان بێ، باردەکەن.»

یادین پێشنیازێکی خستە بەردەم بنگۆریۆن تا داوا لە گەل بکا مشوری ژێرزەمین بخۆن، حەشارگە لێبدەن و یارمەتی هێزەکانیان بدەن بۆ رێگاکردنەوە.

پیرەمێردەکە چوە سەرکاری خۆی.

لە سعات دوانزەدا جیبەکە هێنایەوە ماڵەوە. پاولا دەرگای لێکردەوە.

«ئەرێ دەنگوباس چیە؟»

پوختەیەکی بۆ باسکرد.

شێرتۆک لە ژوری ئاشپەزدا چاوەڕیی دەکرد. لەو کاتەی بنگۆریۆن سەوزەی

دەخوارد کە پاولا بۆی پاککردبووەوە، شێرتۆک پێیڕاگەیاناد کە پسپۆڕانی بواری سیاسەتی دەرەوە دەڵێن هەرچەندە مارشال دژی جاڕدانی دەوڵەتی ئیسرائیلە، بەڵام بە شێوەیەکی سەربازییانە خۆی تێهەڵناقورتێنێ.

لەو کاتەی شیرتۆک خواحافیزیکرد، ئامۆس بگنۆریۆن لەگەڵ خێزانەکەی و منداڵەکەیدا بەسەرردان گەیشتنە ماڵی باوکی. ئامۆس هەنوکە فەرماندەی فەوجێکە. لەگەڵ باوکیدا ئەگەری بۆمبارانکردنی بەفڕۆکەی تاوتوێکرد.

باوک پرسی؛ «ئەرێ بۆچی هیج حەشارگەیەک لە تەلئەبیبدا نیە؟» هەرخۆیشی زیاتر لەسەری ڕۆیشت» من لەمێژە لە ئەگەری بۆمباران ئاگاداریان دەکەمەوە، بەڵام کەس گوێ ناگرێ. هەمویان من وادەبینن کە کاروبارەکان بە خەمباریەوە لێکدەدەمەوە.»

بوکە ئینگلیزەکەی پرسی:

«ئەرێ بەراست وایە کە ئێمە تەنها یەک تۆپمان هەیە؟»

بنگۆریۆن پێکەنی، چونکە بوکەکەی وشەی «ئێمە»ی بەکارهێنا. ئیدی ئەو چیدیکە لایدە نەماوە؛ خانمەکە هەست دەکا لەماڵی خۆیەتی.

«هاتنی تۆپخانە لە ئانوساتدایە، گەر هەر نەشهات ئەوا لە دوژمنەکانمان دەدزین.»

بنگۆریۆن چووە ژورەکەی تا خۆی بگۆڕێ؛ قاتێکی شینی تۆخی لەسەر کراسێکی سپی لەبەرکرد و بۆینباخیکی پەشمینی تۆخیشی بەست، گۆرەوی و پێڵای ڕەشیشی لەبەرکردن. لە هیکەوە بانگی پاولای کرد:

«ئەرێ کەس بە دوای رابی فیشماندا چووە؟»

رابی فیشمان ئێستا لە لاتورن گیریخواردووە، دەیان ساڵە بۆ دەوڵەتی جولەکان تێدەکۆشی، هەنوکەش ئەوێ بە سەرباز دەورە دراوە. کەس ناتوانێ لەوێوە بۆ ئامادەبوون لە بۆنەکەی ئەو دوای نیوەڕۆیەدا بەڕێبکەوێ. بەڵام بنگۆریۆن دەیویست دەموچاوی برادەرەکەی لە هۆڵەکەدا ببینێ. بۆیە دەبێ ئەو بە فڕۆکەی پیپەر کوبس بگەیەنرێتە شوێنی بۆنەکە.

هێشتا زۆر وردەکاری دیکە مابوون، دەبوایە بنگۆریۆن مشوری بخواردبان. ئایا هۆڵەکە پارێزراوە؟ خۆ کەسمان ناپاک دەرناچی؟ ئایا کورسیەکان دانراون، ئاڵا و وێنەی هێرزل ئامادەیە؟

بنگۆریۆن زەنگێکی بۆ شارێف لێدا، پێیگوت کەوا لە ژێرزەمینێکدا ئەشکەوتێکی لێیە وێنەیەکی سەرنجراکێشی ئەو پیاوەی کە «دەوڵەتی جولەکانی» نوسیوە دۆزیوەتەوە، دەکرێ لەوێ مێز و ستێنسلێک وەربگرێ تاکو جاڕنامەکە و یەکەمین بڕیاری حکومەتی سەرهەڵدراو بۆ ڕۆژنامەکان کۆپی بکا.

تەتەرێکی بارەگای سەرەکی هات. دۆستڕۆڤسکی سەرکردەی هێزەکان بردراوەتە نەخۆشخانەی حەیفا. یادین جێگەی ئەو دەگرێتەوە و ئەرکەکانی لە ئەستۆدەگرێ. کەشتییەکی بار فیشەک و تەقەمەنی لە بەرامبەر تەلئەبیبدا لەلایەن کەشتیەکی تێکدەری ئینگلیزەوە وەستێنراوە. هەنوکە بردراوەتە حەیفا.

له سعات یەکدا ئەنجومەنی نیشتمانیی کۆبۆوە. پرسێک کە هەمویانی سەرقاڵ کردبوو بڕیاردانی کابینە بوو لەسەر ناوی دەوڵەتە تازەکە.
دەنگێک هاواریکرد: «ئایا ناوی وڵاتەکە چییە؟»
بنگۆریۆن بە شانازییەوە نەڕاندی «ئیسرائیل».
لە هەمولایەک دەنگەدەنگ پەیدا بوو.
بنگۆریۆن چەکوشەکەی لە مێزدا.
شێرتۆک و رابی فیشمان داکۆکیان لەسەر وشەی «ئیسرائیل» کرد، دوای چرکەساتێک دەنگی نارەزایی کپبووەوە.
دەقی دارشتەی جارنامەی سەربەخۆیی خوێندرایەوە. ئەندامێکی ماپام کە لەسەر شێوەی پارتی کۆمۆنیستی روسیابوو، دەربارەی بەکارهێنانی وشەی «خودا» لە دوادێڕدا» پشت بەخوا» نارەزایی دەربڕی..»
رونیکردەوە کە ئەوانەی بیروباوەڕی دینیان نیە، راستەوخۆ بە دانانی ئەو ڕستەیە ئەوەیان بەرگوێ دەکەوێ کە ئیسرائیل دەوڵەتێکی تیۆکراتییە (ئۆلییانەیە).
بنگۆریۆن چاوێکی دایە سەر کاتژمێرەکەی دەستی. کەمتر لە سێ سعاتی ماوە تا بۆنەکە بە راشکاوانە دەستپێبکا. گەر هاتو دەرگای وتووێژێکی ئایینایە بکاتەوە ئەوا چەندان رۆژ دەخایەنێ.
یەکێک پیشنیازیکرد لە جیاتی «خودا» واژەی «پەروەردگاری مەزن» بەکاربهێندرێ. بەو رێکەوتنە بێدینەکەی ماپام رەزامەندبوو؛ ئیدی باقی جارنامەکە قسەی لەسەرکرا.
پاشان بنگۆریۆن جارنامەکەی دایە دەنگدان. جارنامەکە بە کۆی دەنگ، تەنها دەنگێک نەبێ کە دژی وەستایەوە، وەرگیرا.
بنگۆریۆن گوتی: «من دەیدەمە دەنگدان. هیوام وایە لەسەر خواستی مێژو هەموتان دەنگی بۆبدەن».
هەر ئەوەش رویدا.
کاتێک ئەوان هۆڵەکەیان جێدەهێشت، رابی فیشمان لە بنگۆریۆنی پرسی:
«ئایا شەڕ لەگەڵ عەرەبدا بەرپادەبێ؟»
بنگۆریۆن سەری ئەرێی بۆ لەقاند.
«ئەرێ تۆ بڵێی ئێمە شتی باشترمان لەو ماشێنە چەپرەکەی کەمن پێیهاتمە ئێرە لە هەوادا دەستنەکەوێ.»
رابیە بە ساڵاچووەکە وا وێنای هاتنی لە ئۆرشەلیمەوە بۆ تەلئەبیب کرد.» پیاوێک هاتە لام گوتی گوایە فەرمانی لە سەرەک وەزیرانی ئایندەوە پێیە کەمن لەگەڵ خۆی بەرێ. ئەو منی بردە گۆڕەپانیک، کە ماشێنە چەپرەکەکەی لێبوو.»
رابیکە بایەخی بۆ پیپەرکلوبەکە دانەنا و بە فرۆکەی ناوی نەدەبرد. ئەو بەردەوام لەسەر ماشینە چەپرەکەکە قسەیدەکردن. فرۆکەوانەکە ئەوی بە پەت بەستبووەوە دواتر «ئێمە ئەو هەمو پێچانەمان لێدانەوە بەرەو باکور هەڵکشاین دواتر بۆ باشور ئەوسا زانیم من بەرەو کوێ دەڕۆم.» ئەو لەسەر ئەو بڕوایەی نەدەهاتە خوارەوە کە

بۆ ماوەی شەست و پێنج کیلۆمەتر ی درێژی ڕێگایەکە «دوو سعات» ی پێچووە.

زۆر جاران بە متمانە بەخۆبوونەوە سەری دەهەژاند و دەیگوت: «من تێناگەم چۆن بەو ئۆتۆمبێلە بالگرە دەتوانین عەرەبەکان ببەزێنین.»

بنگۆریۆن ڕۆیشتەوە ماڵەوە تا سعاتێک پشوبدا. لەو کاتەی بەناو شارەکەدا بە ئۆتۆمبیل دەڕۆیشت، شەقامەکانی پڕئاپۆرە دەبینی. لەهەمو لایەک دەستە و کۆمەڵە وەستاون هەندێکیان ڕۆژنامەیان لەدەستدایە دەربارەی نەبەردی باب ئەلواد Bab-el-Wad کە تازەدەستی پێکردبوو، هەر پەنجا کیلۆمەترێک لە تەلئەبیبەوە دور بوو، بۆئەوەی ڕێگای ئۆرشەلیم بکەنەوە، دەدوان. چایەخانەکانیش گرمەیان دەهات. ئۆتۆمبێلەکان لە سەربازە گەنجەکان باردەکران، کچ وکوڕ بەیەکەوە بە شەقامەکاندا بەرەو سنور دەڕۆیشتن.

فرۆشیارانی شەربەتی پرتەقال ئەو مێردمنداڵانەی ئاڵایان پێبوو، ئیشیان باش دەڕۆیشت.

کە بنگۆریۆن گەڕایەوە ماڵ، پاولا دوو هەواڵی بۆ هەبوون. کەشتیە بار تەقەمەنییەکە گەیوەتە حەیفا، بەڵام هێشتا ئینگلیزەکان نەیانپشکنیوە، ڕەنگبێ نەزانن بارەکەی چییە. هێشتا هیچی دیکە دەربارەی ئەو فڕۆکانە کە چەند هەفتەیەک لەمەوبەر لە باشوری ئامریکا بەڕادان دراون، نەزانراوە.

چرکە ساتێک پێش سعات چواری دوای نیوەڕۆ ئۆتۆمبێلێکی کەشخەی نمایشئاسای جامداری ئامریکایی (کە بۆ ئەو مەبەستەیان بەکرێ گرتبوو) لەبەردەم مۆزەخانەکە وەستا.

بە وەستانی ئۆتۆمبێلەکە بەرەبەرە بۆنەکە ئاشکرا دەبوو، چونکە ببووە مایەی تامەزرۆی زانینی خەڵکی. زۆر لە تەماشاکاران بە ئاڵای شین و سپی کە ئەستێرەی داودی لە نێوەڕاستدا بو، دەستیان بۆ رادەوەشاند. ئەوان بەخێرهاتنیان لە هەمو بیچمێکی بەرچاو کە سواری ئۆتۆمبێلەکە یان کە لێیدادەبەزی دەکرد.

لە هۆڵەکەدا تابلۆ ئاساییە هەڵواسراوەکانی مۆزەخانەکەیان لە دیوارەکان کردبوونەوە. وێنەیەکی گەورەی هێرزل لە سەروی سەکۆکە کە ئەندامانی حکومەتی لێدادەنیشتن، دانرابوو. لە بەرامبەر ئەوانیش ئەندامانی ئەنجومەنی نیشتمانیی و دو ڕابی بەرچاوی تەلئەبیب کە شەپقەی قیتیان لەسەر بوو دانیشتبون، هەروەها میوانەکان و کۆمەڵێکی زۆری هەواڵنێر و وێنەگرانی ڕۆژنامەوانیی لە هۆڵەکە بوون.

سێ ئەندامی چەپی ئەنجومەنەکە بەبێ بۆینباخ هاتبوون، بەڵام بێجگە لەوانە هەمویان لەبەرگی ئاهەنگئامێزدا بوون.

مایەی تێبینی بوو کە بنگۆریۆن دواکەس بوو هاتە ژوورەوە. ئەو سەرنجی شێلگیرانە و بەهاداری لای ئامادەبوان وروژاند. هەواڵنێران خەریکی شت یاداشتکردن بوون.

ئۆتە والش Otte Wallish هونەرمەندێکی تەلئەبیب بە پەلەپروزێ، بەغاردانەوە بەخۆی و جاڕنامەکە بەدەرکەوت. ئەو چوارچێوەیەکی ڕازاوەی بۆ پارچە پێستەیەکی لەسەر نوسین (دەستنوس) تەواوکردبوو، بەڵام وشەکانی دەبوایە خۆی

پڕکردبایەوە.
بیچمێکی خاکیپۆش خۆی بـەژوردا کرد و کورتە ئاماژەیەکی سەربازییانەی کرد. ئیسڕائیل گالیلی فەرماندەی هاگانا بە دوای سەربازەکەوە بوو تا دەرگاکە. لە دەروازەکـەدا پستەپستێکیان کرد پاشان گالیلی شتێکی لە پارچە کاغەزێکدا نوسی و دایـە دەستی بنگۆریۆن، ئەویش بە خەندەوە خوێندییەوە. دوای بەسەرچونی سروتی بۆنەکە بە ئەوانی دیکەی گوت کە نامەکە چی تێدابووە. لە ڕۆژئاوای گالیلیادا سەرکەوتنێکی باش بەدەستهاتووە و ئیدی ئەو بەشەی ئیسڕائیل زۆرینەکەی کەوتۆتە بەردەست هاگانا.
لە ژورێکی هاودیواری هۆڵەکەدا ئۆرکێسترای فیلهارمۆنیش Filharmonisch ی تەلئەبیب هاتیکڤا Hatikvaیان دەژەنی، کە خۆکردییانە بووە سرودی نیشتمانیی ئیسرائیل.
«وڵاتی ئیسرائیل لانکەی  گەلی جولەکە بووە. لێرە...»
دەستی بنگۆریۆن کەدەقی جاڕنامەکەی پێگرتبوو دەلـەرزی. هەمو توانایەکی بەکارهێنا تادەنگی لەکاتی خوێندنەوەی جاڕنامەکەدا لەنگ نەبێ.
جاڕنامەکە باسی ڕۆژگاری ئاوارەبوون و راوەدونانی دورودرێژی دەکرد، کە مێژوی جولەکایەتی  تیایدا لەدایک بوو، لەچەند رستەیەکی کورت و پوختدا خاڵە وەرچەرخانە چارەنوسازیانەکەی دیرۆکی بەبیر هێنانەوە هەر لە سەدەی رابردوی هێرزل، بەڵیننامەی بلفۆڕ، کردەوەی هیتلەر، تا گەییە رۆژگاری بنگۆریۆن وپێغەمبەرە زیندووەکان.
ئیسرائیل دەبێ ببێتە دەوڵەت، دەوڵەتێکی ئازاد، ماف و ئاشتی تێدا بەرقەراربێ. لەنێویدا یەکسانی سیاسیانە و کۆمەڵایەتیانە باڵکێش دەبێ و هیچ جیاوازیەکیش لەسەر بنەمای رەگـەز، توخم، یان ئایینەوە ناکرێ. ئـازادی ویـژدان و ئازادی ئۆلییانە مسۆگەر دەکرێ. ئیسڕائیل هاوکاری نەتەوە یەکگرتووەکان دەکا و ڕێز لە بنەماکانی پەیماننامەکەشی دەگرێ. مرۆ دەبێ شوێنەواری پیرۆزی کریستیانەکان و موسوڵمانەکان بپارێزی. مرۆڤ دەیەوێ لەگەڵ هەمو عەڕەبان بەئاشتی بژی.
تا دەهات دەنگی بنگۆریۆن قەبەتر دەبوو. باری سۆز بەسەر هەندێ لە ئامادەبووان‌دا زاڵ بوو. ڕێگاکەی گەیشتن بەم رۆژە درێژ و قوربانییەکانیش زۆروزەوەند بوون.
«... ئێوارەی شابات، پێنجەمی ئیار Iyar، ٥,٧٠٨ کە دەکاتە چواردەمین رۆژی ئایاری ١٩٤٨.»
بنگۆریۆن حەڤدە خولکەی پێویست بوو تا لە خوێندنەوەی جاڕنامەکە بووەوە. ئیدی یەکەمین ڕێنمایی دەوڵەتە تازەکەی دەرکرد. کتێبی سپی ١٩٣٩ی هەڵوەشاندەوە. هەروەها هەمو ئەو قانونانەی کۆسپی دەخستنە بەردەم کۆچی جوەکان هەڵوەشاندەوە. قانونەکانی ماندات دەیانخوارد تا ساتی پێداچوونەوە قانوننامەی جوەکان دادەڕێژرا.
دامەزرێنەرانی دەوڵەتی تازەزاو یەکەبەیەکە دەستنوسی جارنامەکەیان واژۆکرد کە تیایدا جاڕنامە تایپکراوەکەیان سەلماند.
بە دەقاودەقی لە سعات½ ٤:٣٧دا بنگۆریۆن چەکوچەکەی بە مێزەکەدا داو بە

دەنگێکی شکۆداریانەوە رایگەیاند:

«من لێرەدا رادەگەیەنم کە کۆبوونەوەکە کۆتایی هات. ئیدی دەوڵەتی ئیسرائیل دامەزرا.»

کاتێک بە سەری بەرزەوە لە هۆڵەکە دەردەچوو، لە پەیامنێرێکی ناسراوی ئینگلیز رەتبوو، چرپاندیە بنگوێی:

«ئاها، خۆ دیتت، ئێمە ئیشەکەمان بەجێگەیاند!»

بۆنە شکۆدارەکە بە ڕادیۆ راگەیەنرا. ئەوەبوو هەرزو خەڵک دارڕژانە سەر جادە و شەقامەکانی رۆتشیلد بۆلوڤوار، بن یەهودا، رێگای ئەلنبی و هایراکۆن، لەویَ لە سەر زیَ، قاوەخانەکان و خواردنگەکان پڕی ئاپۆرەی خەڵک بوون.

لە ماڵەوە بنگۆریۆن بە پاولای گوت:

«من خۆم بە شینگێڕێک لەنێو ئەو هەمو ئاهەنگێڕانەدا دەبینم.»

ئەو بیری لە شەڕەکان دەکردەوە، بیری لە بەرە جیاوازەکانی پێشەوە دەکردەوە. هەرزو دەستبەجیَ جلەکانی داکەندن و جلە خاکیەکەی پۆشی؛ بە سواری جیێبێک خۆی گەیاندە بارەگای سەرەکی.

«ئەریَ بارودۆخی پایتەخت چۆنە؟»

ئاخر هاوکارانی بنگۆریۆن هەرگیز گوێیان لێنەبووە ئۆرشەلیم بە پایەتەخت ناوببریَ.

ئێوارەکەی خۆی لەگەڵ چوار ئەندامی دیکەی پارتەکەی کە لەحکومەتدا بوون، تێلگرامێکیان  بۆ د. حایم وایزمەن کە لە نیویۆرک نەخۆش کەوتبوو، . لێدا. لە تێلگرامەکەدا پەسنیاندابوو، ئەو پیاوەی «کەلە هەموان زیاتر» بۆ پاشەرۆژی ئیسرڕائیل تێکۆشا.

هەمان ئێوارە بنگۆریۆن بە تەلەفون قسەی لەگەڵ گێولای کیژی کرد. هیچ کام لە منداڵەکانی لە بۆنەکەدا ئامادە نەبوون. ئامۆس لای هێزی سەربازیی بوو، رینانا لە ئۆرشەلیمی گەمارۆدراودا بوو، لەویَ لە زانکۆدا دەیخوێند، گێولا زراسکێکی سیَ مانگانەی هەبوو، نەدەکرا ئەویَ بەجێبهێڵیَ. بنگۆریۆن کورتە باسێکی بۆنەکەی بۆ کچە گەورەکەی کرد. دواتر گێولا بە برادەرەکانی گوت:

«وام هاتە بەرچاو کە باوکم هەرگیز وابەختەوەر نەدیوە.»

کاتێک بنگۆریۆن بۆ رازان چووە سەرجێگا، نێرەری ( رادیۆ )کی نهێنی هاگانا کە لە خانوێکدا بوو زۆر لە بارەگای سەرەکی هێزە چەکدارەکان دور نەبوو، پەیامێکی لە ئامریکاوە بۆهات.

یاکۆڤ یانای Yaakov Yanai سەرۆکی دەستەی بەیەکەوەبەستنی پەیوەندییەکانی هاگانا بە ڕێکەوت پەیامەکەی وەرگرتبوو. هەواڵەکەش داوایەک بوو لە بنگۆریۆن کە لە رادیۆدا پەیامیک بۆ وڵاتە یەکگرتووەکانی ئامریکادا بنێری.

یانی بانگی یارمەتیدەرێکی بنگۆریۆنی کرد. «نابیَ جاریَ هەر باسی لێوەبکەی. پیرەمێرد ئێستا لە حەفت خەوان راستبۆتەوە.»

سعاتێک دواتر – کە تازە لە نیویۆرکدا ئێوارەیەکی زو دەستپێکردبوو– رادیۆکە

ی گاهانا هەواڵێکی وەرگرت کە ترومان ددانی بە ئیسرائیلدا ناوە.
ئەمجارەیان یانای رووی نەکردە هیچ کەسێک؛ راستەوخۆ بەرەو ماڵی بنگۆریۆن لە کێرن کایەمەت بۆلوڤور Keren Kayemet Boulevardدا لێیخوڕی، لە دەرگەیانیدا.
پاش کەمێک پاولای لە ناخەوە تورەبوو دەرگای کردەوە.
«ئەرێ چۆن بە مێشکتدا هات ئەو هەمو غەڵبەغەڵبە بکەی؟ زۆر نەمابوو بنگۆریۆن لەخەو هەڵبستێنی. ئەو-»
یانای پێشهاتەکەی بۆ پاولا رونکردەوە.

پاولاخان گوتی جا ئەوە چ لە شتەکان ناگۆڕێ؛ کەس نابێ پیاوەکەم تەنگەتاو بکا. یانای داوایلێکردەوە لە دواییدا لێیگەڕا بچێتە ژوری بنگۆریۆن و بێداری بکاتەوە.
پیاوە پرچ سپییەکە لە دواییدا بە چاوی خەواڵوەوە کە یانای هەواڵەکەی پێراگەیاند، رابوو.
پیرەمێردەکە گوتی: «باوەڕناکەم!»
لە کاتێکدا رستەکەی گوت لەناو جێگاکەی هەڵستا.
«گەر ئەوە وابێ، پێویستە وتەیەک ئاراستەی ئامریکا بکەم.»
کاتێک چاکەتێکی لەسەر کراس و بیجامەکەی کرد، پاولاش گۆرەوی و پێڵاوی بۆهێنا.
دواتر بە بێدەنگی سواری ئۆتۆمبێلەرکە بوو؛ ئەو هەر راوێژەی دەکرد ئاخۆ لە پەیامەکەیدا چیبڵێ.
کاتێک بنگۆریۆنی سەرەک وەزیران پەیامێکی ئاراستەی ئامریکا کرد، لە تەلئەبیبدا سعات ٥:٢٠ خولەکی بەرەبەیان بوو، کەچی لە ئامریکادا ١٠:٢٠ خولەکی شەوی رۆژی پێشتر بوو.
پێنج خولەک دواتر کاتێک ئەو لە رادیۆدا هەر بۆ ئامریکا قسەیدەکردن، لەهیکەوە دیوارەکانی خانوەکە لەزرانەوە و دەنگێکی هەژێنەر هات. میکرۆفۆن هەر دەهاتو دەچوو. لە سەرمێزی کۆنترۆلی دەزگاکەدا گڵۆپ داگیرسان.
بنگۆریۆن کەمێک بێدەنگ بوو، پاشان بە هێواشی وەک هەواڵنێریکی بەرەی جەنگ دەستی پێکردەوە:
«ئەو دەنگەی ئێستا گوێتان لێبوو، دەنگی تەقینەوەی بۆمبابارنی فڕۆکەکانی دوژمن بوو کە بەسەر شارەکەماندا دەسوڕێنەوە.»
کاتێک بنگۆریۆن خەریکی قسەکانی خۆی بوو، یادین لە تەلەفون گوێی لێبوو کە فڕۆکەکانی میسر فڕۆکەخانە نهێنییەکەی دۆڤی هاگانایان داوەتە بەر بۆمبان.
بنگۆریۆن پێیڕاگەیاند: «من دەبێ بچمە ئەوێ تا زیانەکان ببینم.»
دەیانەویست بە ئۆتۆمبێلی یانای بچنە ئەوێ، بەڵام کاتێ بنگۆریۆن ئۆتۆمبێلیکی دیکەی لە رێگا دی بەرەو بارەگاکە دێ. دەستێکی بۆڕاگرت و یادینی دیت.
«ئایا دەچییە فڕۆکەخانەکە.»

«بەڵێ»
«منیش لەگەڵ تۆ دێم.»
«ئاخر نابێ!»
یاداین بە توندی رایگەیاند کە سەرکردەی هێزە چەکدارەکان دەبێ پشویەک بدا چونکە رۆژی سەخت و تەنگانەمان لە پێشن. ئەوسا یادایـن لێیداو رۆیشت و بنگۆریۆنی بەجێهێشت.
نیو کاتژمیر دوای یەکەمین بۆمبارانکردن دیسان فڕۆکەکانی میسر بەسەر ئاسمانی تەلئەبیب بەرەو فڕۆکەخانەی دۆڤ دەچوون. کاتێ گەیشتنە ئەوێ یادایـن و سەربازەکانی دیکەی هاگانا سەیریکی فڕۆکەخانەکەیان کرد و پشێکیان هاتەوەبەر.
کاتێک فڕۆکەکان رۆیشتنەوە، یادایـن پیاوێکی سەرسپی بەدیکرد کە تەماشای دەکا.
«بنگۆریۆن!»
پیرەمێردەکە پێکەنی.
«ئەرێ بەچی گەیشتیە ئێرە؟»
خوێندکاریکی بزۆز بە سەرکردەی گشتی هێزە چەکدارەکانی راگەیاند کە چاوەڕێی ئەوەی دەکرد یادایـن بڕوا، ئەوسا یەکێک لە شوێنی ئێشگری پۆستدا پێیگوتبوو کە بنگۆریۆن بگەیەنێتە فڕۆکەخانە. بەڵێ لە کاتی خۆیدا گەیشتبووە ئەوێ.
ئیدی کاتی ئەوە هاتبوو بەرنامەی رۆژێکی نوێ دەستپێبکا، بۆیە بە شوفێرەکەی گوت بیگەیەنێتەوە کەنار. یەکەمین کاروانی کۆچبەران کە نزیکەی دوو هەزار ساڵە چاوەڕێ دەکەن بگەڕێنەوە دەوڵەتی ئازاد وسەربەخۆی جولەکان، ئەوان بە کەشتی گواستنەوە گەیەنرانە وڵات. ئەو دەبوایە لە ساتێکی دیرۆکییانەدا وەک سەرەک وەزیرانی دەوڵەتە ( نەتەوە )یەکی نوێ بەخێریان بهێنی، هەرچەندە هێشتا لەبن پاڵتۆکەی بێجامەی لەپێدابوو.
لە دواییشدا کاتێ بنگۆریۆن گەڕایەوە ماڵ، پاولا چاوەڕێی دەکرد و بەرکوڵی بەیانی بۆ ئامادەکردبوو. پاولاش هەواڵی بۆ بنگۆریۆن پێبوو.
یوسف باراتز Joseph Baratzی برادەری دێرینی بە پەلە داوای لێکردبوو کە بەرگری لە میترالیۆزەکەی کیبۆتی دێگانیا بکەن.
ئەو کەشتییە بارتەقەمەنییەی لەلایەن ئینگلیزەکانەوە دەستی بەسەردا گیرابوو بەردرا و بەرەو تەلئەبیب بەڕێوەیە.
بنگۆریۆن زەنگێکی بۆ گێولا لێدایەوە. کاتێک گوێی لە بۆمبەکان بوو، بیری لە کچەکەی کردەوە. ئەرێ خۆهیچ بەسەر خۆی و منداڵەکەی نەهاتووە؟ تۆ بڵێی حەشارگەیەکی باشیان هەبێ؟
«سڵاوم بگەیەنە هەموویان.»
یادایـن کە لە بەقوڵی پەشۆکابوو هاتە ژورەوە.
«لەشکری میسر لە سنور پەڕیوەتەوە و دەستی بە بۆمباباراکردنی نشینگەکانمان کردووە.»

بنگۆریۆن پێیگوت: «ئێمە ئەوەمان چاوەڕوان دەکرد.»
«قۆشەنی عەرەبەکان بەرەو رومان دەکشێن، هەروەها سوپای سوریاش.»
«من لەگەڵ تۆدا دێمە بارەگای سەرەکیمان.»
یاداین سەری لەقاند.
پیرەمێردەکە چووە ژور تا یەکبەرگی بپۆشێ.
یادایین چاوەڕێی دەکرد.
پاولاش دەستی بە قاپشوشتن کردەوە.

# بەشی
# (١٤)

هەر لەو ساتەی کە یەکەمین بۆمبی فڕۆکەکانی میسری بەسەر فڕۆکەخانەی دۆڤی هاگانا بەردرایەوە، تا راگەیاندنی ئاگربەستی نێوانیان دوای تێپەڕینی بیست و حەفت رۆژ، بنگۆریۆنی سەرەک وەزیران، تەنها سەرقاڵی جەنگ بوو. پاولای هاوسەری بە کەمی دەدی. هەندێ جاران بە مەبەستی کورتە پشویەک دەهاتەوە ماڵ، گەر هاتباو تەواو شەکەت ببایە ئەوا لە بارەگای سەرەکی دەمایەوە و دوو سعات هەر لەوێ لە سەرجێ و بالنگی سەربازیانە پاڵی دەدایەوە.

کەمێک دوای جاڕدانی سەربەخۆیی، زێیڤ شارێف هاتە لای، تاکو دەربارەی پرسە پێویستەکانی رێکخراوەکانی دامودەزگای حکومەتی نوێی قسەی لەگەڵدا بکا.

«بنگۆریۆن بە بێزارییەوە پێیگوت: «تۆ نابێ لەو کاتەدا بێزارم بکەی، ئەو جۆرە باسانەم لەگەڵدا بکەیتەوە.»

«بەڵام هەڵبەت ئێمە دامودەزگای دەوڵەتمان پێویستە-»

بنگۆریۆن بە کورتی لێیبڕیەوە: «ئەو جۆرە کاروبارانە بەلای منەوە گرنگ نین.»

شارێف چیدی لەسەری نەڕۆیشت.

«کەواتە تۆ سەرەک وەزیران نی!»

بنگۆریۆن لەو قسەیەی توڕەنەبوو، وەڵامەکەی وابوو:

«بەڵێ راست دەکەی. من ئێستا سەرەک وەزیران نیم. من تەنها سەرکردەی گشتیی هێزە چەکدارەکانم. هیچ شتێک لە بردنەوەی شەڕەکە بایەخدارتر نیە. دواتر وەرە بەو پرسانەی دیکەت هەراسانم بکە.»

پەنجا ساڵی دورودرێژ بوو یەک بیرۆکەی سەرمەشق لە کەللەی دابوو، دەبوایە هەمو شتێکی لە پێناودا دابنێ: ئەویش کۆمەکردنی دامەزراندنی دەوڵەتی جولەکان بوو. هەنوکە ئامانجەکە هاتۆتە دی، بەڵام بیرۆکە سەرمەشقێکی دیکە هاتۆتە جێی: ئەو دەیەویست بیسەلمێنێ کە بەهای ناوەکەی لە شوێنی خۆی دایە، دەیویست ئەو داودە نوێیە بێ کە گۆلیات (زەبەللاح)ی عەرەبەکان بشکێنێ. بەڕاستیش ئەوان گۆلیاتێک بوون. لە رۆژی شابات (شەممە)ی ئایاردا لەشکرەکانی میسر، لوبنان، سوریا، رۆژهەڵاتی ئوردن و عێراق لەو دیوی سنور بڵاوبوونەتەوە. گەنجەکانی هاگانا لە هەندێ شوێندا بەرپەرچیان داونەتەوە. بەڵام هەڕەشە قەبەکەی گۆلیاتەکە شتێک نەبوو شکستی پێبێ، بەتایبەتیش کە جێپێیان لەسەر خاکی جولەکان دانابوو.

هەرچەندە بنگۆریۆن بەتەواوی سەرقاڵی جەنگ بوو، کاتێکیشی بۆ کارێکی بەخشندەییانە هەر هێشتەوە. چل و هەشت سعات دوای راگەیاندنی دەوڵەتەکە، بانگی ئەنجومەنە کاتیەکەی کرد و کۆبوونەوەیەکی لەگەڵدا کردن. لە کۆبوونەوەکەدا پەسنی ئەو پیاوەی هەڵدا کە خەریک بوو لەو سەرقاڵییەیاندا لە بیر دەچۆوە.

ئەوەش هەر بیرۆکەیەکی بنگۆریۆن بوو کە د. حایم وایزمەن بە زۆرینەی دەنگ وەک سەرۆکی دەوڵەت، کە حکومەتێکی کاتی هەبوو، هەڵبژێرن. بەڵام ئەو دەیزانی کە پێڕاگەیاندنی هەڵبژاردنەکە بۆ وایزمەنی نەخۆش و لە جێدا کەوتوو لەسەر زاری د. فێلیکس رۆزەنبلوت D.Felix Rosenbluethی وەزیری داد، کە هەر لە سەرەتای جەنگی جیهانیی یەکەمەوە دۆستایەتییەکی گەرمیان هەبوو، باشترە.

ئیدی ئەو پێشنیازەکەی کرد، کە بنگۆریۆنیش پشتیگرت، بەڵام ئەوەشی نەشاردەوە کە سالآنی دورودرێـژە جیاوازی بیروڕایان لەگەڵ یەکدا هەیە. ئەو زیاتریشی خستەسەر:

«من گومانم هەیە ئاخۆ د. وایزمەن پێویستی بە پایەی سەرۆکایەتی هەبێ، بەڵام من لەوە دڵنیام کە بۆ ورەی ئیسرائیل کارێکی پێویستە ئەو سەرۆک بێ.»

هەر کە بروسکەکە بۆ د. حایم وایزمەن نێردرا، بنگۆریۆن گەڕایەوە سەر کاروباری سەربازیانەی.

ئێوارەیەکیان تەتەرێک بە خۆی و زەرفێکەوە کە پڕی دۆکیۆمێنتی دەستکەوتوو بوو لە بارەگای سەرەکی پەیدابوو. وەرگێڕێک نوسراوەکانی کردنە عیبری. بەڵگەیەکیان نەخشەیەکی کاتبەندی بوو. دەبوایە حەیفا لە ٢٠ی ئایاردا بکەوتبا، تەلئەبیب و ئۆرشەلیمیش پێنج رۆژ دواتر. لە ٢٥ی ئایاردا شا عەبدوڵا دەیەویست شارە پیرۆزەکە بگرێ تا لەوێ تاجی شاهانەی لەسەر بنێ و خۆی بە پاشای هەمو ئەو ناوچانە کە لەلایەن سوپاکانی عەرەبییەوە داگیرکراوە، رابگەیەنێ.

کە بنگۆریۆن گوێی لەو شتانە بوو بە بێزارییەوە مستی دەستی خاو دەکردەوە.

گرفتەکەش لـەوەدا بوو ئۆرشەلیم لە ساتە بڕیاردەرەکانی بنگۆریۆن دابوو. نەتەوە یەکگرتوەکان رایانگەیاندبوو کە شارەکە دەبێ ببێتە شارێکی نێودەوڵەتیی. ئەو راگەیەنراوەکەی رێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکانی پشتگوێخست. بەڵام کە عەرەبەکان پەلاماریان داو لە هەوڵی ئەوەدا بوون ئۆرشەلیم بگرن، کەسێک نەبوو کە بەریان پێبگرێ. هەنوکە ئەو خۆی بە هیچ رێکەوتنێک نەدەبەستەوە کە لەلایەن ئەوانی دیکەوە پێشێل دەکرا. ئیدی بڕیاریدا سەرباری دژایەتی عەرەب، ئینگلیز و نەتەوە یەکگرتووەکان بەرگری لە ئۆرشەلیم بکا و بە دەوڵەتی ئیسرائیلی بلکێنی.

هەنوکە بۆ ماوەیەکی کاتی ئۆرشەلیم هێشتا هەر ئابلۆقە دراو و سەربازانی دوژمن دەورەیـان داوە و لە ئیسرائیل دابڕاوە. دەبێ رێچکەیەکی گەیشتنە ئەوێ بدۆزرێتەوە. بۆیە بەردەوام جەختی لەسەر ئەوە دەکردەوە کە دەبێ لە لاتورنەوە نەبەردییەک دژی قۆشەنە سەربازەکانی عەرەبەوە بکرێ، چونکە لەوێوە رێگای تەلئەبیب ئۆرشەلیم کۆنترۆڵ دەکرێ.

بۆ رازیکردنی بنگۆریۆن بەتالیۆن(برگێید Brigade کەیەکەکی سەربازییە لە ٣٠٠٠

سەرباز پێکهاتووە) ی ٧ی زرێپۆش پێکهات و رەوانەی بەرەی شەڕ کرا. لە ڕاستیدا سەربازەکان هیچ تانکێکیان نەبوو، هەروەها بەتالیۆنێکی تەواویشیان پێکنەدەهێنا. هەندێکیان تەنها چەند رۆژێک بوو، چوبوونە راژەی سەربازییەوە، هەندێکیشیان لە کۆچبەرەکان بوون، هەر یەکدوو رۆژ بوو، گەیشتبوونە وڵات. ئەوان بە هەشت زمانان دەدوان. زۆریان هەر لە عیبریش نەدەگەیشتن. سی رۆژ دوای ئەوەی بەتالیۆنەکەیان لێپێکهێنان و رەوانەی بەرەی شەڕی لاتورن کران. ئەوسا دەرکەت کە ئەوان هێشتا بوتڵە ئاوی گۆرەپانی شەڕیشیان پێ نیە، بۆیە بەناچاری بیست و هەشت سعات دواخران.

یادین لەسەر ئەوە سوور بوو، ئەوەی کرا تاکتیکێکی شاشبوو. ئەو لەگەڵ بنگۆریۆندا سەر لەبەیانیەکەی دوو سعاتان مشتومڕی بوو، لە درێژەی مشتومڕە گەرمەکەیاندا بنگۆریۆن مستی بەمێزدا داو یەکدوو پەرداخ بەربوونەوە.

لە دواییدا بنگۆریۆن یادینی ناچارکرد فەرماندەی بەتالیۆنەکەی بۆ  بانگ بکا.

بنگۆریۆن بەفەرماندە گەنجەکەی گوت: «بەختی ئۆرشەلیم لە بندەستی تۆدایە. ئایا بڕوات وایە کە لاتورن دەگریتەوە؟»

وەڵامەکەی  فەرماندە لاوەکە ئەوبوو: «ئێمە ملکەچی هەمو فەرمانێکین کە پێمان دەدرێ.»

بنگۆریۆن بە هەموو بایەخێکەوە  بیری لێدەکردەوە. بەندوباوی ئەوە هەبو کە ئاگربەست رابگەیەنرێ. بارودۆخەکە لە گەمەی دامە دەچێ. گەرهاتو موزیکەکە راوەستا- کاتێک کە رێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان فەرمانی شەڕڕاگرتنیدا- ئەوا سنورە یەکلاکەرەوەکەی ئیسرائیل دەکەوێتە پشتی ئەو هێڵانەی کە شەڕیان لێکراوە. ئەوسا گەر هاتو جولەکەکان هیچ رێگەی ئۆرشەلیمیان لەبەردەستدا نەبێ، رەنبگێ هەمو شارە پیرۆزەکە بۆ هەتا هەتایە لەدەستبچێ.

لەبەر ئەوە بەتالیۆنی ٧ی زرێپۆش بە پاس گەیەنرانە بەرەی شەڕ و فەرمانیانپێدرا لەو هەشت کیلۆمەترەی لاتورندا هێرش ببەن. هەنوکە سەربازەکان چوار سعات لەپشت نەخشە دیارکراوەکەی بەڵگەنامەکاندان.

بنگۆریۆن بەو بڕیارەی تورەبوونی ستافی ژەنەراڵەکانی لە ئەستۆی خۆگرت. یادین گەڕایەوە بەرەی شەڕو  ئەو بروسکەیەی  لێدا:

«من داوات لێدەکەم هێرشەکە بیست و چوار سعات بوەخرێنێ.»

وەڵامەکە زۆر کورت بوو:

«نەخێر.»

ئیدی بەتالیۆنی زرێپۆشیی٧ لە هەمان شەودا هێرشی بردە سەر دوژمن، لە شەڕەکەدا بەتالیۆنەکە حەوتسەد کەسی لە دەستدا و ناچاریشکران بکشێنەوە.

شەوی داهاتو بنگۆریۆن فەرمانی دا، دوبارە هێرش بکرێتەوە. ئەمجارەش شکستیان خوارد.

ئەوە وەنەبێ سەرڕەقی بنگۆریۆن بێ. فەرمانەکان لە پێزانینی مێژویانەوە هات. بناوانەکەی بۆ خۆشویستنی بایبل دەگەڕایەوە. بۆ ئەوەش دەگەڕایەوە کە بەردەوام

له دۆڤ یوسفی فەرماندەی سەربازیی شارە پیرۆزەکە هەواڵی بۆدەهات کە:
«لە ئۆرشەلیمدا هەڕەشەی برسێتی هەیە..»
لە دوایيدا یادین داوای کۆمەکی لە ئیگال ئالۆنی باشترین فەرماندەی سەر گۆڕەپانی سوپاکەی کرد. سێهەمین هێرشیش هەر سەرنەکەوت.
لاتورن هەر نەگیرا و هەر لەبەردەستی عەرەبەکاندا مایەوە، بەڵام لە سۆنگەی هەستیاریێتی بنگۆریۆن بوو، هەنوکە ئۆرشەلیم لە بندەستی ئیسرائیل دایە، چونکە قۆشەنە لەشکرییەکانی عەرەب ناچارکران سەربازەکانیان لە گەمارۆی ئۆرشەلیمدا بکێشنەوە و بەرەی لاتورنی پی بەهێزبکەن، ئیدی لەو کاتەسدا سەدان ژن و پیاوی جولەکە هێڵێکی تەریبیان لەگەڵ ڕێگای لاتورن ئۆرشەلیم لێدا، کە بە چەندان سەدە بوو تەنها بۆ بزن و کەر و ولَسات دەشیا. ئەوان تولە ڕێیەکەیان بەرینکرد و هەردوو سەریشیان بە ڕێگای سەرەکی بەستەوە. ئەوان بە شەوی تاریک کاریاندەکر، چونکە بە ڕۆژ لە ژێر سێرەی تەقەی عەرەبەکاندا بوون. ئا بەم شێوەیە بە دەستی روتەوە ڕێگایەکی دە کیلۆمەتریان بەناو گردەکاندا کێشا. ناویان لە ریگەکەیان نا ڕێگای بیرما Birma، ئیدی هەر زو ئۆتۆمبێلی بار، مێگەلە ئاژەل، باری وشتر و پیادەی خەڵک لە تەلئەبیبەوە بە گونیەی ئارد بە کۆڵەوە، بەو ڕێگایەدا بۆ ئۆرشەلیم دەڕۆیشتن.
لە نێوچاوانی نواڕینە سەربازییانەکەی بنگۆریۆن و بڕیارە لێبڕاوانەکەیدا ڕێچکەکە دروستکراو بە گوێرەی ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکانیش بەهۆیەوە ئیسرائیل بە ئۆرشەلیم بەسترایەوە.
لەو بیست و حەوت رۆژە دەستپێکانەدا ترسی بنگۆریۆن لە ئینگلیز زیاتر دەبوو:
«ئێمە دەبێ پەیوەندیمان لەگەڵ جیهانی دەرەوەدا گرێبدەینەوە. چونکە دەسەڵاتی ماندات خراپی بەسەردا هێنایـن، چونکە یەکەی گەیاندنی نێودەوڵەتی رایگەیاندبوو کە لە دوای ١٥ی ئایاردا فەلەستین لە بەیندا بوونی نەماوە.»
ئەوەی لە سارافاند Sarafandیش قەوما، هێشتا تاڵتربوو. ئینگلیزەکان لە جەنگی جیهانیی دوهەمدا بە شانزە کیلۆمەتر لە خواروی تەلئەبیبدا گەورەترین دامەزراوی سەربازییان دروستکردبوو. پێش ئەوەی باسوخواسی کۆتایهاتنی دەسەڵاتی ماندات بێ، ئاژانسی جولەکان داوای لە ئینگلیزەکان کردبوو کە خاک و دامەزراوەکانی بداتێ. لە دوایيدا لەسەر بڕە پارەی کڕینەکە ڕێککەوتبوون کە شەش پنتی هەبوون. لەدوا ساتدا وەزیری کاروباری کۆلۆنەکان لە لەندەندا کردەی گواستنەوەکەی لەپڕیکدا بێ هیچ رونکردنەوەیەک هەڵوەشاندەوە. دواتر سارافاند بە خۆڕایی درایە عەرەبەکان.
لە ئێوارەیەکی ئایاردا بنگۆریۆن بروسکەیەکی دڵخۆشکەرانەی بۆ هاتە بارەگای سەرەکی، تیایدا نوسرابوو:
سارافاند گیرا
«ئەرێ چەند گیانی جولەکەی لەپێناودا بووە قوربانی؟»
کەس بە دەقاودەقی نەیزانی.
هەفتەیەک دوای جاڕدانی سەربەخۆیی، بنگۆریۆن لە بروسکەیەکیدا داوای یارمەتی لە مارکۆس سیف Marcus Sieff، گەنجێکی ئینگلیز کە لە جەنگی جیهانیی

دوهەمدا لە هەڵمەتی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا خەڵاتکرابوو، کرد. داوایلێکرد کە سێ تا چوار مانگ مۆڵەتی کاروبارەکانی خۆی لە لەندەن بخوازێ و بۆ کاروباری کارگێڕی کۆمەکیان بکا.
نوسینگەیەکیان لە تەنیشت ژوری بنگۆریۆن لە بارەگای سەرەکیدا دایە سییف، ئیدی رۆژانە لەمەڕ کێشەی سەربازیانە راوێژیان لەگەڵ یەکدیدا دەکرد. لە میانەی گفتوگۆکانیاندا چەند جاران بنگۆریۆن سەرسامی خۆی بۆ گریمانەکانی پیاوە ئینگلیزەکە دوپات دەکردەوە.
زۆر جاران بنگۆریۆن دەچووە لای سییف تا سەبارەت بە شێوازەکانی ئینگلیز بۆ سیستمی باجداندا زانیاری لێوەربگرێ؛ یاخود ئایا سییف لە بارەی سیستمی ئابوریی بەریتانیای گەورەوە دەزانێ. هەندێک جارانیش پرسیاری زەقوزۆپی وایلێدەکرد:
«ئەری چۆن دەبێ حکومەتی تۆری ئاوا توانیویەتی خۆی لەگەڵ یەکێتی سەندیکا پیشەییەکانی بەریتانیا بگونجێنێ و بە باشی لەگەڵیاندا هەڵبکا؟
هەرچەندە ئیسرائیل لەلایەن وڵاتە یەککگرتووەکانی ئامریکا، یەکێتی شۆرەوی و چەندان دەوڵەتی بچوکی دیکەدا ددانپێدانرا، بەڵام لەندەن هەمو پەیامە دیپلۆماتەکانی بەردەوام بە ناونیشانی «بۆ دەسەڵاتی جولەکەکان لە تەلئەبیبدا» رەوانە دەکرد. ئینگلیزەکان هەر وەک عەرەبەکان تەنانەت ناوی وڵاتە نوێکەشیان بەکارنەهێنا. ئەو جۆرە نامانەش لە دەزگای پۆست و گەیاندنی ئیسرائیلدا پولێکیان لێدەدرا کە لەسەری نوسرابوو «ناونیشانەکە نەناسراوە»و رەوانەی شوێنی لێهاتنی دەکرانەوە.
لەگەڵ ئەوەشدا رۆژێکیان بنگۆریۆن بە سییفی گوت:
«من لەو بڕوایەدام کە بەریتانیا شارستانیترین نەتەوەی سەر دنیایە.»
یەکەمین راپۆرتی سەربازییانەی سییف لە پانزە لاپەڕەی چاپکراوی بێ نێودێر پێکهاتبوو. بنگۆریۆن شەوێکیان راپۆرتەکەی لە بنهەنگڵدا دانا و بەرەو ماڵ گەڕایەوە. بەیانیەکەی زو بەخۆی و راپۆرتەکە هاتەوە بارەگا. پێدەچوو بە شەو لەسەر جێگەدا چەند سعاتێک خەریکی خوێندنەوەی بووە، چونکە ئەو هەمو وردەکانی دەزانین.
لێیپرسی: «مارکۆس تۆ زۆر رەخنەگری.
وەڵامی دایەوە؛ «بەڵێ، من ئەوە دەزانم.»
«تۆ رەخنەشت لە هەندێ لە پیاوەکانی دەستەی ژەنەراڵەکانی خۆشم گرتووە.»
«ئەوەش دەزانم.»
«هەروەها لە سەرکردەی گشتی هێزە چەکدارەکانیش.»
«بەڵێ»
«بێگومان ئەوەش دەزانی کە من سەرکردەی هێزەکانم؟»
«بە دڵنیاییەوە.»
پیاوە پرچ سپییەکە لەسەر کورسیەکەی پاڵکەوت و دەنگەکەشی خەمباریانە بوو: «مارکوس، من نزیکەی شەست و دوو ساڵم، من پیاوی ئاشتی بووم. ئەوەش تەمەنێکە.. ئایا ناکرێ یەکدوو هەڵە لە مانگی یەکەمی جەنگەکەدا بکەم؟»
ڕۆژێکیان سییف بە سەرکردەی هێزەکانی گوت، وا باشە چەند کەشتیەک لە

بەندەری تەلئەبیبدا لەنگەر بگرێ و باری خۆی دابگرێ، تا پێشینەیەکی نێودەوڵەتییانە دروستبکا.

بنگۆریۆن بە نارەزاییەوە گوتی: «بەڵام چۆن من دەتوانم فەرمان بەو کەشتیانە بدەم کە ئێستا گەیشتونەتە حەیفا بێنە تەلئەبیب و باری خۆیان دابگرن؟

سییفی لاو بێ دودڵی و لەسەر خۆوە گوتی:

«گەر هاتباو وینستۆن چەرچڵ با کارێکی وای دەکرد.»

بنگۆریۆن چاوەکانی لێکدان وەک ئەوەی زللەیەکی سرەویندرابێتە بناگوێی؛ دەستی دایە تەلەفون، زەنگی بۆ داود لاندمان Daved Landmanی بەرپرسی بەندەرەکان لە حەیفا لێدا و پێیگوت:

«گوێبگرە، چوار لەو کەشتیانەی کە هەنوکە لە حەیفان بارەکانیان دادەگرن، بۆ بەیانی سەر لەزو دەبێ لە تەلئەبیب بارەکەیان بە تەواوی دابگرن.»

کاتێک پیاوەکە لەو دیوی تەلەفونەوە ویستی رونکردنەوەیەک بدا، بەوەی بڵێ کە کارێکی ئەستەمە و ناتوانرێ کەشتیەکان بگەیەنرێنە ئەوێ؛ بنگۆریۆن تەلەفونەکەی داخستبوو.

چوار کەشتیەکە بۆ بەیانی گەیشتنە تەلئەبیب.

سییف وای بەباشزانی چەند جارێک بۆ ماوەیەکی کورت بگەرێتەوە لەندەن. لە کاتی خواحافیزیکردندا بنگۆریۆن پێیگوت:

«مارکوس پێش ئەوەی برۆی ناونیشانی چەندکتێبێکت دەدمێ کە تازە چاپ بوونە، بەڵکو بیانکرِی و لەگەڵ دەستی خۆت بۆم بێنیتەوە.»

کاتێ کە سییف لێیدەپرسی؛ ئاخر تۆ لە نێوەڕاستی جەنگدای و ئیسرائیلیش لە دنیا دابرِواە، چۆن ناونیشانی کتێبە تازە چاپکراوەکانت زانی؟ بنگۆریۆن فریشتەئاسا بە خەندەوە ئاورێکی لێدەدایەوە و هیچی نەگوت.

دوای ئەوەی بیست و حەفت رۆژ شەرکردن، بۆ یەکەمین جار فەرمانی ئاگربەست هات. ئەوەش ئیشی رێزدار فۆلک بێرنادۆتە Folke Bernadotte بوو. هەفتەیەک پێشتر ناوبراو لەگەڵ بنگۆریۆن بۆیەکەمین جار یەکدیان لەبارەگای سەرەکی هێزە چەکدارەکانی حکومەتی ئیسرائیلدا دی. شارێت ( کە هەنوکە ناوە جولەکەیەکەی لە جیاتی ناوی رەسەنی خۆی شێرتۆک بە فەرمیکردووە) لە کاتی گفتوگۆکاندا لەگەڵ د. رالد بونچ D.Ralf Bunch کە رەشپێستێکی ئامریکایی بوو یاریدەدەری بێرنادۆتە بوو، ئامادەبوون.

پیاوە سپییە درێژەکە ئەندامێکی خانەوادەی شاهانەی سوئێد بوو، کەسێکی زۆر پێشکەوتوو شارستان بوو، بەلای ئەو بزۆزێتی پیاوە جوە بچکۆڵە تێکسمراوە سەر گەورەکە جێی سەرنج نەبوو و هیچی نەکەوتە بەردڵ.

بنگۆریۆن بە نیگای بێمتمانەیی دەیروانیە میوانەکە.

بێرنادۆتە بە ئینگلیزیەکی ئەکسێنت ئەسکەندەناڤیانە بە بنگۆریۆنی راگەیاند: «من تەنها بۆ پێشنیازی شەڕراوەستاندن هاتووم. سەبارەت بە پاشەرۆژی فەلەستین من هیچ ناڵێم.»

تۆنی دەنگی قسەکانی، بنگۆریۆنی پەستکرد.
بێرنادۆتە پێیوابوو کەوا رابەری ئیسرائیل سەرنجێکی تاڵ و ناخۆشی دروستکردووە.
«دووجار حکومەتەکەم ئامادەیی بێمەرجی خۆی بۆ شەڕوەستاندن دەربڕیوە»ئەمە قسەی بنگۆریۆن بوو، زیاتر لەسەری رۆیشت و گوتی: «عەرەبەکان رەتیانکردەوە. لەگەڵ ئەوەشدا ئەنجومەنی ئاسایش هیچ سزایەکی بەسەر عەرەبەکاندا نەسەپاند.»
هەمو وردەکارییەکانی کێشەکە تاوتوێکران. پاشان بنگۆریۆن گوتی:
«گەر هاتو ئاگربەست راگەیەندرا، پێویستە ئەو جولەکانەی کە لە خانەوادەکەی ئۆرشەلیمیان دابڕاون، مۆڵەتبدرێن تا بچنەوە نێویان.»
کاتێک لەسەر ئەو پرسە بێرنادۆتە هەڵوێستی نەبوو، لایی لێنەکردەوە، بنگۆریۆن زیاتر درێژەیپێدا و ئەوەندەی لێزیادکرد:
«کچەکەی خۆشم رێنانا لە ئۆرشەلیمە. دەمەوێ بچمە لای. ماوەیەکی درێژە نەمدیوە.»
بێرنادۆتە وەڵامی دایەوە: «پایەی تۆ وەک سەرکردەی هێزەکان، ناکرێ ئەو جۆرە سەردانانە بکا.»
وتوویژی زۆرکرا، بەڵام هیچ ئەنجامێک بەدەست نەهات. لە دواییدا ناوبژیکارەکە تەماشای کاتژمێرەکەی دەستی کرد، واینیشاندا پێویستە هەڵبستێ چونکە کۆنسێرتێک لە تەلئەبیبدا هەیە، دەبێ لەوێ بێ.
کاتێکیش لە کۆتاییدا ئاگربەست بووە راستیەک؛ بۆ بنگۆریۆن دەرکەوت کە بڕیاری دژواری دیکەی لەبەردەمدایە.
نۆ رۆژ دوای ئاگربەستەکە کەشتییەک بەناوی ئالتالێنا Altalena لە کانارەکانی ئیسرائیل نزیکبووەوە. ئەوەش کەشتییەک بوو کە زۆر کەس پێشکات ناوەکەیان دەزانی.
کەشتیەکە لە سایەی LSTیەوە بە حەفتاو پێنج هەزار دۆلار لە بروکلین لەلایەن کۆڕبەندی ئامریکایی بۆ فەلەستینێکی ئازاد کە رێکخراوێکە لەلایەن شانۆنوس بێن هێخت Ben Hecht دامەزراوە، کڕدراوە. سەدان ئامریکایی کە غەیرە جولەکەشیان تێدابووون، ویستویانە کۆمەکی ئیسرائیل بکەن، بۆیە بە پارە باربوویان کردووە، زۆریان هەر نەشیاندەزانی ئاخۆ کۆڕبەندییەکە ناوێکی خوازراو و دەمامکداری ئامریکایی رێکخراوی ئیرگۆنی مناحیم بێگنە.
لە بەندەری بۆک Port-de-Bouc ی فەڕانسەدا، ئالتالێندا پێنجسەد تۆن چەک، گوللە و تەقەمەنی دیکەی بارکرد، کە کۆڕبەندییە ئامریکاییەکە چوار ملیۆن دۆلاری پێدا بوو. ئیدی کەشتیەکە بەرەو ئیسرائیل بە ڕێکەوت. لە ڕێگادا بە ڕادیۆ پەیامێکی بۆ چوو کە بگەڕێتەوە، چونکە تازە ئاگربەستەکە واژۆکراوە. دواتر پەیامەکە کێشراوە. سێهەمین جار بانگەوازی بۆکرا کە بەرەو کفار ڤیتکن، کە شوێنێکە دەکەوێتە سەرکەنار، چل کیلۆمەتر لە سەروی تەلئەبیبەوە، ئاراستەکەی بگۆرێ.
زۆرینە دەیانزانی کە ئاتالینا بەڕێوەیە.

بەڕێز بێرنادۆتە و نێردەکەی ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان بەتەواوی لە پرسەکە ئاگادار بوون. نوێنەری نەتەوە یەکگرتووەکان هەر لەو کاتەی کەشتییەکە گەیشتبووە بەندەری بۆکی فەڕەنسیەوە، دەیزانی کە بەچی بارکراوە و کەیش کەوتۆتەڕێ.

جێگری بنگۆریۆن، وەزیری بەرگری ئیسڕائیل گالیلییش هەمو شتێکی لە بارەوە دەزانی، چونکە پێشتر جارێکیان لەسەر ئەو باسە لەگەڵ مناحیم بێگن، سەرکردەی ڕێکخراوی ئێرگۆندا سەبارەت بە چارەنوسی چەکەکان قسەی کردبوون.

هەفتەیەک بەرلەوەی ماندات کۆتایی پێبێ، ئیرگون ڕێکەوتننامەیەکی واژۆکردبوو، تیایدا ئامادەیی خۆی دەربڕیبوو کە گوێڕایەڵی فەرمانەکانی هاگانا بێ و ددان بەسەرکردەکانیشی دابنێ. دوای جاڕنامەی سەربەخۆیش بنگۆریۆن فەرمانێکی فەرمی دەرکردبوو کە هەمو هێزێکی جەنگاوەریانەی تایبەتیی  قەدەخە کردبون، تەنها یەک سوپا، یەک کەشتیگەل، یەک هێزی ئاسمانی ددانی پێدانرا، کە لە ژێر ڕکێفی حکومەتدا بوو. بیست ڕۆژ لەمەوبەر دەبووایە ڕێکخراوی ئیرگون هەمو چالاکییە سەربەخۆکانی خۆی بەمەرامی بەدەستهێنانی چەک و تەقەمەنی بوەستاندبا.

ئیدی گالیلی داوایکرد باری کەشتییەکەی ئالتالینا بە حکومەت بسپێردرێ. بەڵام بێگین گوتی گوایە لایەنگرانی ئیرگون پارەی کڕینی چەکەکانیان داوە، خاوەنداریێتی خودی کەشتییەکەش هی ئیرگۆنە، کەشتیوانەکانیش پیاوانی ئیرگۆنن، ئەوان چەکەکانیان بارکردووە، بۆیە دەبێ هەر ئەوانیش دایببەزێنن و لەنێوخۆیاندا دابەشی بکەن.

لە دواییدا بێگین ئامادەبوو کەمێک سەر بۆ حکومەت دابنوێنێ بەوەی ٢٠٪ی چەکەکان بۆ ئیرگون بنێرێتە ئۆرشەلیم و بەسەر شەش بەتالیۆنەکانی ئێرگون کە لە ڕاژەی حکومەتدان دابەشبکرێ باقیەکەشی بدرێتە حکومەت.

لەسەر فەرمانی بنگۆریۆن خستنەڕوەکەی بێگین ڕەتکرایەوە.

وتوویژ و مشتومڕەکان درێژەیان کێشا، لەو ماوەیەشدا  ئالتالینا لە کفار ڤیکتین Kfar Viktin نزیک دەبووەوە.

لەو کاتەی زۆر لەو هەشتسەد پەنابەرەی ئاڵمان و ئەو خۆبەخشانە لە فەرەنساوە ڕەگەڵ ئێرگون کەوتبوون لە کەشتیەکە دابەزین، ئیدی ئاگادارینامە بۆ کەشتییەکە دەستیانپێکرد.

بنگۆریۆن لە بارەگای سەرەکی ڕایگەیاند:

«ئەو کێشەیە هەڕەشەیەکی کوشندە لە دەوڵەت دەکا، بە ناچاریش ڕێگا بۆ شەڕی براکوژی خۆشدەکا.»

هەندێ لە ئەفسەرانی بارەگا سەرەکییەکە کە دەیانزانی چەندیان پێویست بە چەکە، خستنەڕوەکەی بێگنیان هەڵدەسەنگاند، بەڵام بنگۆریۆن لەو پرسەدا یەکلاکەرەوە بوو، ڕەتیکردەوە. «هیچ دەوڵەتێک ڕێگا بەوە نادا هاوڵاتیی یان ڕێکخراوی تایبەت  ئەو بارە قەبە چەکەیە لە دەرەوەڕا بهێنن...»

کەواتە هەواڵ بۆ کفار ڤیتکین نێردرا کە دەبێ ئاتالینا  بە حکومەت بسپێردرێ.

لەو ماوەیەدا نزیکەی پێنجیەکی بارەکە دابەزێندرابوو. لەهەمو بەرەکانی شەڕەوە پیاوانی ئێرگون ڕایانکربوو تا لە دابەزاندنی بارەکەدا کۆمەک بکەن. لەشکری حکومەت

دەستەوەستان تەماشای دەکرد، کەس لەو بارە نائاساییە تێنەدەگەیشت.
بیرنادۆتە نوێنەرێکی نارده کەنار بۆ بەدواداچون، ئاخۆ بە ڕاستی باری چەکەکان دادەبەزێندرێن، بێگومان کردەکەش پێچەوانەی ڕێکەوتننامەی ئاگربەستەکە بوو. نوێنەرەکە ڕێگای پێنەدرا بچێتە سەر کەناری زێ.
لەو ئێوارە گەرمەی حوزەیراندا بنگۆریۆن داوای کۆبوونەوەیەکی بە پەلەی کابینەی حکومەتەکەی کرد. بارودۆخەکەی رونکردەوە؛ داوای لە وەزیرەکان کرد پشتی بڕیارەکەی بگرن تا شێلگیرانە بەسەر دۆخەکەدا زاڵ بین.
هەمو هاوکارەکانی لەگەڵ هەڵوێستەکەی هاوڕا نەبوون. بەڵام لێبڕاوانە دڵنیا بوو کە دەبێ لەو ساتەدا دەسەڵاتی ئەو بالکێش بێ و بخوا، هەرچەندە دوژمنەکانی ئیسرائیلیشی پێکەیفخۆشبن. ئەوەی رویدا  فرمێسکی بە چاوی ملیۆنان جولەکەدا هێنا.
گەر لە چاوەڕوانی بەدیهاتنی خەونەکەیدا بە چەندان سەدە وەستابێ و خەباتی کردبێ، بەڵام هەنوکە پێویستە هەمو وزەی بۆ پاراستنی ئەوەی بەدیهاتوە بەکاربێنێ.
زۆرینەی کابینەکەی پاڵپشتی بوون کە فەرمانیدا سەربازانی ئیرگون لە کفار ڤیکتیندا چەکبکەن و بە هێزی سەربازیشەوە دەست بەسەر کەشتیەکەی ئالتالێناشدا بگرن. لە هەردوو باردا گەر پێویستبکا توندوتیژی بەکاربهێنرێ.
بارداگرتنەکە وەستێنرا. ئالتالینا بە یاوەری دوو بەلەمی جەنگی ئیسرائیلی روی لە دەریا کردەوە. بارەکە واپێدەچوو کە بنگۆریۆن بەبێ خوێنڕشتن سەرکەوتنی بەدەستبێنێ.
سەر لە بەیانییەکەی رۆژی پاشتر ئالتالێنا لە تەلئەبیبەوە سەری دەرهێنا و لەنگەریگرت. لەو میوانخانەی بێرنادۆتەی لێبوو، لە پەنجەرەکەی ژورەکەی کەشتییەکە بە جوانی دیاردەکرا. بە بەلەمێکی بچوک چەکدارانی ئێرگون چوونە سەر پشتی کەشتییەکە و مەترەلۆزیان دامەزراند. ئیرگون رایگەیاند کە نە بنگۆریۆن، نە لەشکری حکومەت، نە نەتەوە یەکگرتووەکان و نەهیچ کەسی دیکە دەرفەتیان پێنادرێ جڵەوی کەشتییەکە و بارەکەی بگرنەدەست.
سەرلەنوێ بنگۆریۆن کۆبوونەوەی بە کابینەی حکومەتەکەی کردەوە. داوای لێکردن و ڕێگەی پێدرا کە دوا ئاگادارینامە بداتە ئالتالێنا بەوەی خۆی بەدەستەوە بدا ئەگینا خۆی بەرپرسیارە لە گرتنەبەری هەر ڕێکارێکی سەربازیانە.
بەیانی زو شەڕی براکوژی دەستپێیکرد. سەربازەکانی ئیرگون وهی حکومەت لە بەرامبەر یەکدا تەقەیان دامەزراند.
دواتر لە بارەگای سەرەکیدا بانگی ئیگال ئالڵۆن فەرماندەی پالماخ کرا. فەرمانی پێدرا تۆپێک بێنێ و جبەخانەی کەشتییەکەی پێبتەقێنێتەوە.
کاتێک ئالڵۆن رۆیشت، بنگۆریۆن  بڕیارێکی بۆ هەمو هاوڵاتیانی تەلئەبیب دەرکرد، ئەوانەی ماڵیان لەسەر زێیە، ماڵەکانیان بەجێبهێڵن. ماڵی خۆشی لە کەناری زێوە دوور نەبوو بۆیە زەنگێکیشی بۆ پاولای هاوسەری لێدا و بارودۆخەکەی بۆ رونکردەوە.

«بە دراوسێکان بڵێ پێویستە لە ماڵەکانیان نەمێنن و خۆشت دەربچۆ.»
کەسایەتیی پاولا وابوو کە هەر نیوەی یەکەمی فەرمانەکەی بنگۆریۆنی جێبەجێکرد. پاولا ماڵ بەماڵی دراوسێکانی گەڕاو ئاگاداری کردنەوە. دواتر خۆشی چوە ژوری ئاشپەز و بە کاروباری ماڵەوەی خەریک بوو.
ئەوەش هەر لە پاولا دەوەشایەوە کە بەلای تەلەفونەوە نەچوو، نەخاسمە دوای نیوەڕۆ کە زەنگی تەلەفونەکەشیان لێدرا.
«من لەوە دەترسام کە بنگۆریۆن لەسەر هێڵی تەلەفون بێ، لە خەمی ئەوەدا بێ ئاخۆ من هێشتا لە ماڵ ماوم یان نا.»
دوای نیوەڕۆیەکی زو ئاللۆن تۆپەکەی دامەزراند. ئیدی تۆپەکەی تەقاند و جبەخانەکەی کەشتییەکەی چوە ئاسمان و تەقیەوە. تەقینەوەکە و مەشخەڵی گڕتێبەربوونەکەی لە گەمە ئاگرینە دەچوو. ئەو نۆهەد پیاو و ژنەی لەسەر پشتی کەشتییەکە بوون بە پەلەپڕوزێ بە هیوای ئەوەی بە مەلەوانی بگەنە کەنار خۆیان فڕێدایە ناو زێ.
کاتێک تاریکی داهات نزیکەی سەد کوژراویان ژمارد. لەنێو کوژراوەکاندا ئابراهام ستاڤسکی Abraham Stavsky تێدا بوو. ستاڤکسیش ئەو پیاوە بوو کە پانزە ساڵ پێشتر حوکمی دادگای بەسەردا درابوو، چونکە لە هەمان لێواری زێدا حایم ئارلۆسۆرۆف Chaim Arlosorofی کوشتبوو. هەر لەو ساتەی کەشتییەکە لە بروکلین کڕدرا جڵەوی ئالتالینای گرتبووە دەست. دانیشتوانی تەلئەبیب لە ناخەوە حەپەسا بوون. خەڵک تازە هەناسەی ئۆخەیان هەڵدەکیشا کە شەڕ لەگەڵ عەرەبەکان راوەستا هەر هیچ نەبێ بۆ ماوەیەکی کاتیش بێ. ئەرێ بۆچی ئەوەی ئێستا رویدا؟
لەو کاتەی ئاتالینا لە کەنار گڕی تێبەربوو، لە شەقامی تەلئەبیبدا سیناریۆی سەرلێشێواو هەبوون، مناحیم بێگین دێوانەئاسا لە رادیۆی نهێنی ئێرگوندا دوانی تورەییانەی دەدا. دو سعاتی درێژ لە میکرۆفۆندا تا دەنگی کەوت هەر جوین و نەفرەتی دەباراند.
بنگۆریۆن پیاوەکانی خۆی باش دەناسین، کە بە هۆی ئەو دوانەی رادیۆوە لەخۆڕا رەگەڵ ئێرگون ناکەون. ئەو بڕوای هەبوو کە زۆرینە پشتی دەگرن لە بڕیاری سیاسیدا بۆیە فەرمانێکی دەرکرد راوی ئەندامانی ئێرگون بنێن و بیانگرن. بە سەدانیان گیران.
رۆژی پاشتر لەبەردەم ئەنجومەنە کاتییەکدا وەستا. ئەو هیچ پۆزشێکی بۆ کردەوەکەی نەهێنایەوە. دوو لە وەزیرەکانی دەستیان لە کارکێشایەوە. هیوایان وابوو بەو کارەیان گوشار بخەنە سەر بنگۆریۆن. بەڵام ئەو چۆکی بۆ دانەدان.
«لەوانەیە مرۆ من بە ترسنۆکی ئیسرائیل دابنێ، بەڵام من زۆر لە چەکی دەستی کەمینە دەترسم... چەک بۆ کوشتن دروستکراوە، تەنها بۆ ئەوەی خەڵکی پێبکوژرێ، بەدەر لەوە هیچ کەڵکێکی دیکەی نیە. بە داخەوە هێشتا مرۆڤایەتی پێویستی بە چەکی کاولکاریەوە هەیە!... زیاتر لە جارێک دەستی ئێرگون بە خوێنی جولەکە سوربووە.. بە پێنج هەزار تفەنگ تەواوی کۆمەڵگەی جولەکە بەرامبەریان بێبەرگری دەمێنیتەوە،

مەگەر بیانەوێ قڕانیان تێبخەن، دەنا پێنج هەزار تفەنگیان پێویست نیە.»
دوایی دوانەکەی بە چەند وشەیەک هێنا کە بۆ ئیرگون هەرگیز مایەی لێخۆشبوون نەبوون»
«دە ڕێگەمان بدەن با ئەو تۆپەی کەشتییە خۆبەدەستەوەنەدەرەکەی گڕتێبەردا پیرۆزبکەین!»
ئەنجومەنەکە متمانەی بە ٢٤ دەنگی لەگەڵ بەرامبەر ٤ دەنگی دژ بە حکومەتەکەی بنگۆریۆن نوێکردەوە.
ئەو دوو وەزیرەی دەستیان لەکار کێشابووەوە، زۆری نەبرد گەڕانەوە ناو کابینەی حکومەت. یەکێکیان ئۆرسۆدۆکسە بە ساڵاچوە برادەرەکەی بنگۆریۆن رابی فیشمان بوو. ئەو زۆر جاران دەستی لەکارکێشانەوەی رادەگەیاند، بۆیە لە دواییدا بنگۆریۆن ناوی «وەزیری دەست لەکارکێشاوەی» لێنا.
گەمەی ئەو شانۆگەریەی کە جوەکان هاوڕەگەزی خۆیان لە کەناری زێوە لە تاکە شاری جولەکان لە دنیادا، کەمێک دوای جاڕدانی دەوڵەتیان کە مرۆڤ نزیکەی دووهەزار ساڵ بۆی چاوەڕێ بوو، مایەی سەرنجی خراپ بوو، بەڵام بەتێپەڕینی رۆژ جیهان تێگەیشت کە بنگۆریۆن لێبڕاوانە بوو، بەری شۆڕشێکی گرت و بەم کارەی کۆتایی بە رێکخراوێکی تیرۆرستی هێنا کە ساڵان بوو دەسەڵاتدار بوون.
هەنوکە جیهان پێیزانی کە ئیسرائیل وڵاتێکە ئاشتی و ئارامی تێدا سەقامگیر دەبێ، حکومەتێکی بەرپرسیاری هەیە و لەلایەن هاوڵاتیەکانی رێزی دەگیرێ و ملکەچی بڕیارەکانێتی.
ئەوەی رەخنەگرەکان بە کەتنێکی گەورەی بنگۆریۆنیان دادەنا، دەرکەوت زیرەکانە لە ئانوساتی خۆیدا کودەتای سەر کارنامە سیاسییەکەی خۆی دامرکاندەوە، تا ئەو کاتەی مرۆ رەنگدانەوەی فەلسەفیانە بەسەر ئامانج و ئامرازەکانی نەبینێ هەر ئاوا بیردەکاتەوە. لە هەفتەی سەرەتاکانی تەموزدا رەفتاری دوژمنکارانە دەستپێکرانەوە؛ ئەمجارەیان عەرەبستانی سعودیشی رەگەڵ کەوت، ئیدی ئەمجارەیان هەر پێنج بەرامبەر یەک نەبوو بەڵکو شەش دەوڵەت بەرامبەر یەک. بەڵام لەو نێوەدا ئیسرائیل هێزی ئاسمانی دەستکەوتبوو. فڕۆکەکان لە ئامریکاوە بەرەو ماکسیکۆ، لەوێشەوە بەسەر زەریالوش فڕۆکەکان لەگەڵ ئەوانەی چیکۆسلۆڤاکیا گەیشتنە رۆژهەڵاتی ناوەڕاست. فڕۆکەکان لەلایەن فڕۆکەوانی گەنجە ئامریکایی، کەنەدی و ئوسترالیەکان کە تیایدا هەبوون جولەکەش نەبوون، لێدەخوڕان.
فڕۆکەخانەی لیدا Lyddaیـان گرت، هەروەها شاری رامەڵلای عەرەبنشین و پاشانیش نەزارەتیان کەوتە بەردەست. ئەمجارەیان فڕۆکەکانی ئیسرائیل قاهیرە و دیمەشقیان بۆمباباران دەکرد. کەشتیگەلی سەربازییانەی ئیسرائیل شاری تیروس Tyrusی لوبنانیان دایە بە ئاگری تۆپەکانیان. ئەو قۆشەنە لەشکریە «لە شکان نەهاتوەی» عەرەبان پاشەکشەیان پێکرا. رێچکەی بەرەو ئۆرشەلیم بەرینتر کرا. دوای دە رۆژ شەر، روبەری خاکی ئیسرائیل لە هەمو لایەکەوە بەرفراوان بوو؛ ئاگربەستی دوهەمی بەسەردا هات. لەو ئاگربەستەدا بنگۆریۆن لەبن گوشاری

راوێژکاره سیاسیەکانی  لەگەڵ ئەوەی راوێژکاره سەربازییەکانی ناڕازی بوون، ئاگربەسەکەی راگەیاند.
له حوزەیراندا سەرۆک ترومان یەکەمین نوێنەری دیپلۆماتیانەی خۆی رەوانەی ئیسرائیل کرد.  بنگۆریۆن هەرگیز حەزی به چارەی دیپلۆماته پیشەدارەکان نەکردووه، بەڵام هەرزو نوێنەرەکه ئامریکایەکەی چوه دڵەوه. جێمس ماکدۆمنالد James G.McDonald پێشتر  هەرگیز وەک دیپلۆماتێک ئیشی نەکردبوو. ئەو ئامریکایەکی سنگخرێکی ناوەڕاستی رۆژئاوای ئامریکابوو، له خانەوادەیەکی سکۆتی ئاڵمانی بوو. به خەندەوه به بنگۆریۆنی گوت کەوا له نەریتی وەزارەتی کاروباری دەرەوەی ئامریکا شارەزا نیه.
ماکدۆنالد هەواداریتی خۆی بۆ جولەکه وئیسرائیل نەدەشاردەوه. کرانەوەی ئامریکاییه درێژو لاوازەکه (ماکدۆنالد ١مەترو ٨٥ سانتیمەتر درێژ بوو) پرچیشی وەک هی خانەخوێکه سپی بوو، لەبەرچاوی بنگۆریۆن سەرنجی دڵخۆشکەرانەی ئافەریده کرد.
تەواو به پێچەوانەی رێنمای پرۆتۆکۆلیانه و بەر له پێشکەشکردنی نامەی پەسندکردن، بنگۆریۆن ماکدۆنالدی بەجیا بانگهێشتکرد. لەو کاتەی ئەوان سەرگەرمی قسەکانیان بوون، دەنگی فیکەی ئاگادارکردنەوه هات. پاولا به پەشۆکاوی هاواریکرد «زەنگی ئاگادارکردنەوەی هێرشی ئاسمانییه! پێویسته هەمومان  بچینه ژورەکەی تەنیشتمان که حەشارگەکەمانه. ئێمه بانێکی چیمەنتۆڕێژی قایمان بۆ دروستکردووه.»
به نابەدڵی بنگۆریۆن چوه ژورەکه.
«ئەوانه فڕۆکەی میسرییەکانن. سەربازانی میسریی هەر پەنجاو شەش کیلۆمەتر لێرەوه دورن. هەر لەبەر ئەوەیه جاری واهەیه پێش لێدانی زەنگی هۆشدارییەکەش فڕۆکەکان لەبان سەرمانن.»
ئەو وتوویژی لەگەڵ ماکدۆنلاد له ژورێکی دیکەدا بێئەوەی میوانەکەی له پەلاماره ئاسمانیەکه ئاگادار بکاتەوه، درێژەپێدا.
رۆژێکی هاوین که قرچەی گەرمابوو، نوێنەری یەکێتی شۆرەوی پاڤێل ییرشۆڤ Pavel Yershov نامەی متمانەی خۆی پێشکەشکرد. ئەمجارەیان یەکەمین جار بوو که بنگۆریۆن وەک سەرۆکی دەوڵەتێک پابەندی رێوشوێنه پرۆتۆکۆلەکانی دیپلۆماسییانه بێ. بۆ پێشوازی و بەڕێکردنی نێرده دیپلۆماتەکه، پسپۆڕەکان هۆشداریان دایه سەرەک وەزیران که ییرشۆڤ جله ئەستوره یەکرەنگیه دیپلۆماسییانەکەی دەکاتەبەر. یەکبەرگیی سەرکردەی هێزەکانیش بەردەوام له کراسێکی خاکیی و پانتۆڵێکی کۆنی کورتیله پێکهاتبوو. ئەو جلپۆشیەشی لەو بۆنەیەدا بۆ نەدەچووه سەر، بۆیه ئەو، شارێت سەرۆکی پرۆتۆکۆلەکان و ئەوانی دیکه، ئەو ئێوارەیه جلی بۆنەنامەکەیان به جوانی پۆشی که بریتیبوون له پاڵتۆیەک، پانتۆڵێکی هێڵدار و شتی وا، له هەمانکاتیشدا فەرمان به هێزی سەربازیانەش درا به جلی  جەنگاوەرانه دەربکەون.
بەلای بنگۆریۆن بۆنەکه زۆر لەخۆکردن و هەراسانکارانه بوو. روسەکان که هەرگیز له ئاوهەوای گەرمی بیابان رانەهاتبوون، هیچ کەیفیان به بۆنەکه نەهات.

تەنانەت ئیسرائیلییەکانیش پێوەخۆشحاڵ نەبوون. بەڵام بە هەناسە بڕکێ و ئارەقە لەخۆستڕینەوە بۆنەکە کۆتایی پێهات. نێردەی یەکێتی شۆرەوی هەر دوای دوا دەنگی دەستە سەربازیەکە هۆڵەکەی جێهێشت، ئەوانیش خواحافیزییان کرد.

ڕۆژێک دواتر کارمەندە دیپلۆماتەکانی ئامریکا سەردانێکیان کردن تا لە بارەی بۆنەی هاوشێوەوە باس وخواس بکەن و خۆیان ئامادە بکەن، بۆ ئەوەی ماکدۆنالدیش نامەی متمانەی خۆی بە فەرمی و بە شێوەیەکی پرۆتۆکۆلیانەی دیپلۆماسیی پێشکەش بکا. بنگۆریۆن بەوە دڵخۆش بوو کە ماکدۆنالد رایگەیاند بەو ڕۆژە گەرمە جلی هاوین لەبەر بکا پێویست ناکا خۆیان بە «پرۆتۆکۆلە بێواتاکە»ببەستنەوە.

بەهۆی ئەوەی ماکدۆنالد هیچ ئەزمونێکی لە بواری دیپلۆماسییدا نەبوو، چارلس Chales F.Knox ی ڕاوێژکاری یەکەم، کە هەمو ژیانی لە دیپلۆماسیدا بەسەربردبوو، بۆ باڵوێز ڕێوشوێنی ڕێکارە سروتیانەکەی ڕونکردەوە: هەشت یا ئەو پەڕی دە خولەک دوای بۆنە شکۆدارە فەرمییەکە دەبێ ماکدۆنالد خواحافیزی بکاو ئەوێ بەجێبهێڵێ. وێڕای ئەوەش لە بۆنەکەدا نابێ هیچ پرسێکی گرنگ باسی لێوەبکرێ.

دوای بەسەرچونی لایەنی فەرمیی بۆنەکە، شەربەتی میوە و کێک گێڕدرا. دیپلۆماتکارە لاوەکانی هەردولا بە تەواوی بەپێی پرۆتۆکۆل چونە دیوەکەی دیکەی هۆڵەکە، هەمویان بەیەکەوە ڕۆیشتن تا جوتەکە واتە بنگۆریۆن و باڵوێزی ئامریکا بە تەنها بمێننەوە.

بنگۆریۆن دەستی ماکدۆنالدی گرت و بردیە گۆشەیەکی ئارامی هۆڵەکە، لەوێ لەسەر سەکۆیەکی دانیشتنی بێ پشت دانیشتن.

ماکدۆنالد گوتی: «هیوام وایە جەنابتان پرۆتۆکۆڵەکە لەبیر بکەن، .» تا من یەک دوو خولەک قسەت لەگەڵدا بکەم».

بنگۆریۆن بەو قسەیە گەشایەوە. پیاوە درێژەکەی ناوەراستی ڕۆژئاوای ئامریکا لەوە زیاتر بنگۆریۆنی پێدڵخۆشتر نەدەکرا.

دواتر چل خولەکی رەبەق بەیەکەوە لەو گۆشەیە دانیشتن، کەچی شارێت و کنۆکس هەمو هەوڵێکی دیپلۆماسیانەیان خستەگەڕ بەڵکو قسەکانیان دوایی پێنێن. بنگۆریۆن لەسەر بێمتمانەیی بە بێرنادۆتە بە ڕەوا دەزانی، کاتێک لە سێپتێمبەردا ناوبراو وەک نوێنەری ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان دەیویست ئاشتی لە ڕۆژهەلاتی ناوەراستدا بژیێنێتەوە. بەگوێرەی ئەو دەبووایە ئیسرائیل واز لەهەمو بیابانی نەقەب، رامەللا و شارە نوێکەی ئۆرشەلیمیش بهێنێ؛ حەیفا دەبووە بەندەرێکی ئازاد، لیدیاش فڕۆکەخانەیەکی ئازاد و هەمو پەنابەرە عەرەبەکانیش دەبوایە بگەڕابانەوە ئیسرائیل.

لە ١٧ی سێپتێمبەردا بنگۆریۆن لە بارەگای سەرەکی بوو، کاتێک لە ئۆرشەلیمەوە زەنگێکیان بۆلێدا:

«بێرنادۆتە کوژرا.»

ناوبژیوانەکە لە ڕێگا بەرەو دۆڤ یوسف Dov Josephی فەرماندەیی سەربازیی شارە نوێکە دەڕۆیشت.

چوار چەکدار بە جێبێکەوە ڕێگەکەیان گرتبوو. بە تفەنگی دەستیان بێرنادۆتە و

هاوکارێکی فەڕەنسی کارمەندی نەتەوە یەکگرتووەکان کە لە تەنیشتیەوە دانیشتبوو، درانە بەر گوللە و کوژران.

هەر چوار پیاوە خاکی پۆشەکە توانیان هەڵبێن، بەڵام دەستەی ئەستێرە رایگەیاند کە بە شانازییەوە ئەو نەبەردیە سیاسیانەی ئەنجامداوە و نامەیان بۆ کونسولخانەکانی بەشە جوەکەی ئۆرشەلیم نارد، تیایدا هەڕەشەی ئەوەیان کردبوو هەرکەسێ دژی بەرژەوەندییەکانی ناسیۆنالیزمی جولەکان بجولێتەوە، هەر ئەو چارەنوسەی لێچاوەڕواندەکرێ.

بنگۆریۆن بەبێ راڕابوون دەستی بەسەر بارەکەدا گرت. رێنمایی دایە ئەو فەرماندە سەربازییانەی لەبارەگای سەرەکی بانگی کردبوون کە :

١- هەمو ئەندامانی تاقمی ئەستێرە بگیرێن.

٢- گەمارۆی هەمو بنکەکانی تاقمی ئەستێرە بدرێ و چەکبکرێن.

٣- هەرکەسێکیان دەستبکاتەوە تەقەی لێبکرێ.

٤- باری ناکاو رابگەیەنرێ، سنورەکان بگیرێن، هەمو رێگاکانی بۆ شار دەچن بگیرێن.

٥- واز لە رێکخراوی ئیرگون بهێنرێ، مەگەر بە هانای تاقمی ئەستێرەوە بچن، ئەوسا بە هەمان پێوەر لەگەڵ ئەوانیش بجولێنەوە.

٦- هەر کاتێک هێزی سەربازی گونجاوتان لەبەردەستدا بوو، دەستبەکاربن.»

ئێوارەی هەمان رۆژ کابینەی حکومەت لەسەر پێشنیازێکی سەرۆکەکەیان کۆک بوون بەوەی رێکخراوی ئیرگون ئاگادار بگرێتەوە تا سعات دوانزەی نیوەڕۆی سێشەممە مۆڵەتی بدرێتی کە خۆی بەدەستەوە  بدا و وەک یەکەیەکی سەربازی خۆی هەڵبوەشێنێتەوە. پاداشتێکی بیستهەزار دۆلاریش بۆ ئەوکەسانە راگەیەنرا کە بکوژانی بێرنادۆتە دەستگیر بکەن. سەرکردەی تاقمی ئەستێرە ناتان فرێدمان یەللین Nathan Freidman Yellin لە بەندەری حەیفا لەکاتی هەڵاتنی بە نیازی لە وڵات دەرچوون، گیرا. دەیان لایەنگری تاقمەکە خرانە بنچاوان. رێکخراوی ئیرگونیش گوێرایەڵی مۆڵەتنامەکەبوو، خۆی هەڵوەشاندەوە.

بکوژەکان هەرگیز نەدۆزرانەوە، بەڵام بنگۆریۆن ئەمجارەشیان بەسەر تەنگژەکەدا زاڵبوو، زیاتر لە جاران  وەک سەرکردەیەکی جیهانیی دادەنرا، تەنانەت وایتهالیش رێزیان گرت. ئەمجارەیان تەواوی گەلەکەی لە پشت بوو.

لەو دەمانەدا لە تەلئەبیب چیرۆکێکی هەڵبەستراو دەگێڕدرایەوە کە نمایشی گرفتێکی دیکەی دەکرد، گوایە بنگۆریۆنی پێوە ئالودەبووە.

رۆژێکیان هاوکارێکی سکاڵای لە دەست لێشاوی بروسکەکانی لە ئامریکا نێردراوەکان هەبوو کە هێڵی پەیوەندییەکانی بەگیرهێناوە، لەوەڵامدا گوتی:

«داوا لە دۆستەکانم لە دەرەوەی وڵات دەکەم، پێشنیازەکانی خۆیان سەبارەت بەوەی چۆن ئیسرائیل بەرێوەبەرین، بە نوسراو بۆمان بنێرن.»

دوو هەفتە دوای لەناوبردنی بێرنادۆتە، د. حایم وایزمەن  لە دواییدا گەیشتە ئیسرائیل. هەرچەندە دوای نەشتەرگەرییەکی چاو کە لە جنێڤ بۆیکرابوو، هەستی

دەکرد باشتر بووە، بەڵام زۆر بە هێواشی ڕێیدەکرد و بنگۆریۆن چووبووە بنپاڵی تا گەیاندیە سەر سەکۆ بۆئەوەی بۆ یەکەمین جار سەرۆکایەتی ئەنجومەنە کاتیەکە بکا.

بۆ سەرەک وەزیران ڕەنگبوایە ببایە مایەی تەنگژەیەکی نوێ، گەرهاتبا د. حایم وایزمەن خواستی سەرۆکێکی دەسەڵات زۆری بەسەر کاروبارە سیاسییەکاندا بە وێنەی سەرۆکی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئامریکا هەبووایە.

بنگۆریۆن پایەی سەرۆکی زیاتر وەک پایەکی شەرەفمەندانە دەدی کە لە لایەن دەوڵەتمەدارێک بەڕێوەچووبا، بە فەرمی نوێنەرایەتی وڵاتەکەی کردبا، بەڵام لەوە زیاتر دەسەڵاتی نەبووبایە.

گەرهاتبا و وایزمەن گەنجتر بووبایە یان چاوی لە گۆڕەپانی سیاسییانە بڕیبووبایە، ئەوسا لەوانە بوو کێشەی لەگەڵ سەرەک وەزیران پەیدا بووبا، چونکە ئیسرائیل نە دەستوری هەبوو نە سنوری دەسەڵاتەکانی پایە بەرزەکانی دەوڵەتە تازەکەش بە ڕونی لە یەک جیاکرابوونەوە.

کاتێک بە جوتە پێکەوە دەڕۆیشتین، ئەوە روشن بووەوە کە جیاوازییە توندەکەی ساڵە دورودرێژەکانی رابردوییان کۆتایی پێهاتووە. بۆ بنگۆریۆن قەیدی نەبوو کە وایزمەن لە روی فیزیکیەوە هێشتا بە قەدەر سەرێک لە سەروی سەری ئەوەوەیە.

زانا نیوە نابیناکە گوتی:

«بۆ من ئەوە مایەی گەورەترین بەرفراوانترین ساتەوەختە.»

لەلایەن گەلەوە پەسنی د. وایزمەن کراو ئەویش گەڕایەوە پەیمانگاکەی و ڤیللا پانوپۆڕەکەی لە ڕێهۆڤۆت Rehovoth.

بنگۆریۆنیش گەڕایەوە لای کاروباری سەربازی لە بارەگای سەرەکی هێزە چەکدارەکاندا.

دوهەمین ئاگربەست هێشتا هەر لە گۆڕێدابوو، بەڵام ئۆرشەلیمی کۆن لە بندەستی عەرەبەکاندا بوو. لاتورنیشیان هەر لە بندەستدا بوو، ڕێگای کێوی سکۆپ کە زانکۆ و نەخۆشخانە گەورەکەی لێیە چاوەڕوانی رۆژانی باشتریان دەکرد. عەرەبەکان وا چوبوونە نێو خاکی ئیسرائیل خەریک بوو، لەناو قەدەوە بیکەنە دەوڵەت.

گەر هاتبا و شەڕ هەڵبگیرسابایەوە، بنگۆریۆن دەیویست هێزەکانی هەوڵێکی وایان دابووایە هەمو ئۆرشەلیمیان رزگارکردبا. یادینی جیگرەوەی سەرۆکی دەستەی هێزەکان گوتی: «گەر هەوڵێکی دیکەمان دا و سەرنەکەوتین، ئەوا دەبێتە مایەی کارەسات.» ئەو داکۆکی لەسەر ئەو گریمانە دەکرد کە میسریەکان لە پێشترین دوژمنی ئیسڕائیلن، بۆیە گەر شەڕ دەستپێکرایەوە دەبێ هەمو هەوڵێک بخرێتە گەڕ بۆ ئەوەی زەبرێکی کوشندەی شکتهێنیان لێبدرێ.

بنگۆریۆن کۆنفرانسیکی لەگەڵ دەستەکەی سازدا. ئیگال ئاللۆن کە لەو نێوەدا ببوە فەماندەی هێزەکانی باشور بە دارێک لەسەر نەخشەکە رونیکردەوە:

«گەرهاتو ئێمە میسریەکانمان لە نەقەب شکاندن، دەتوانین بە جوڵەیەکی بادانەوەی خێرا پەلاماری ئۆرشەلیم بدەین. سەیرکە...»

به پەرۆشیەکی شێلگیرانەوە تاکتیکەکەی روندەکردەوە.
«دەتوانین لە لاتورن بکشێینەوە و ئەگەری نوشستیەکەی راستەوخۆ لەخۆمان دوربخەینەوە. ئەگەر ئێمە ئەوسا کشاین..،
«بەڵام سەرەتا لەسەر ئێمە پێویستە دەسەڵاتمان بەسەر نەقەبدا بشکێ.»
ئاللۆن دەیزانی کە هەمیشە بنگۆریۆن ئامادەیە گوێ لە کەسێک بگرێ کە دینامیکیانە داکۆکی لە نەخشەیەک بکا و پلانی ئۆپەراسیۆنی نەقەبیش کە دواتر بە دە سزایەکان ( سزاکان ) ناوی دەرچوو، پلانێکی دینامیکیانە بوو.
کاتێک ئاللۆن گەڕایەوە بیابان فرۆکە بچوکەکەی خستە خزمەتی ئەو نشینگەنشینانەیی بیابان کە ئامادەبوون بەرەو لای بنگۆریۆن لەبارەگای سەرەکیدا بڕۆن، بەڵکو خولیای بارودۆخە سەربازیانەکەی نەقەبی لا بەجۆشتر بکەن.
لە ئۆکتۆبەری ١٩٤٨دا رەوشەکە وابوو کە هەمو نەقەب لەلایەن رێکخراوی نەتەوە یەکگرتوەکانەوە درابووە ئیسرائیل، بەڵام پانزەهەزار سەربازی میسری سێ شوێنی گرنگی بیابان هەروەها لەگەڵ شارە کۆنەکانی غەززە gaza و بیئر ئەلسەبعە Beersabhaیان گرتبوو. ئیسرائیل هیچ پەیوەستیەکی لەگەڵ نشینگەکانی خواروی بیابان نەمابوو، چونکە تاکە رێ کە بۆ ئەوێ دەچوو بە ناو یەکێک لەو شوێنانەی کە سەربازی میسری لێبوو، دەڕۆیشت. میسر زۆر بە زەحمەت دەیتوانی ئازوقە بگەیەنێتە سەربازەکانی لە بێت لەحم، چونکە سوپای ئیسرائیل ئەو ناوچەیەی گرتبوو کە رێگای رۆژهەڵات بۆ رۆژئاوا دەچوو. لێرەوە بە یارمەتی کۆمیتەی ئاگربەستی رێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان چارەسەرێکی سەیروسەمەرە دۆزرابووەوە. میسریەکان دەبوایە هەمو رۆژێ بۆ ماوەی شەش سعات دەرفەتیان بدابایە کاروانی لە باکور بۆ باشور دەچێ، ئیسرائیلیەکانیش بە هەمان شێوە دەبوایە ریگای کاروانی لە رۆژهەڵات بۆ رۆژئاوا بکەنەوە.
میسریەکان چەندان جار دژی ئەو رێکەوتنە جوڵانەوە، بۆیە پاکانەیان دایە دەست ئیسرائیلییەکان تا ئۆپەراسیۆنی دە سزایەکەیان دەستپێبکەن.
شارێتی وەزیری کاروباری دەرەوە دژی دەستپێکردنەوەی کردەی دوژمنکاریانە بوو، چونکە لەوە دەترسا زیان بە نمایشی ئیسرائیل لە دەروەدا بگەیەنێ.
بنگۆریۆن گەیشتە بڕوایەکی نیگەران بەوەی مرۆڤ لە جیهانی سیاسەتدا زیاتر راستیەکانی سەر زەوی بە هەند هەڵدەگرێ نەوەک مافەکان. گەر هاتباو نەخشەی بیرنادۆتە چووبایەسەر دەبووایە ئیسرائیل هەمو گالیلیای دەستکەوتبا، نەوەک لەبەر ئەوەی مافی زیاتری بەسەر ئەوێوە لەبەرامبەر نەقەبدا هەبوو، بەڵکو ئەوێی بە باشی کۆنترۆڵ کردبوو.
بۆیە خودی سەرەک وەزیران فەرمانی دا، دەست بە هەڵمەتی رزگارکردنەکە بکەن.
ئۆپەراسیۆنەکە زۆر بە باشی سەرکەوتنی بەدەستهێنا. بیئرسەبعە کەوتە بەردەستیان. لە ماوەی هەفتەیەکدا میسریەکان راونران؛ ئەوان توانیان تەنها لە ناوچەیەکی دیارکراودا بەرگری بکەن؛ ئەوێ فەلوجە Falujaی سەروی نەقەب بوو.

لەنێو ئەفسەرە میسرییەکاندا کە لەوێ فەرماندەیی هێزیکی دووهەزار و پێنجسەد کەسی سودانییان دەکرد، لاوێکی بە پلەی کاپیتان (Captain) کە ئەوکات نەناسراو بوو، جەمال عەبدولناسر بوو کە دواتر کتێبێکی بە ناوی «فەلسەفەی شۆڕش» نوسی.

پاشان لە نۆڤیمبەردا بنگۆریۆن دەرفەتی خوێندنەوە و نوسینی بۆ پەیدا بووەوە. لە وتارێکیدا دوبارە سکاڵا لە دەست ئینگلیزەکان دەردەبڕێتەوە.

«لەشکری بەریتانیا، مارینزو هێزی ئاسمانیان، تەواوی هێزی پۆلیسی حکومەتی فەلەستینی، هەمو گوشارە دیپلۆسییەکانی بەریتانی، هەمو ئامرازەکانی دەزگای نهێنی بەریتانی بەردەست، بەڵێ نزیکەی هەمو هێزی دەوڵەتی بەریتانیا بۆ ئەوە خرایە گەڕ کە ڕێ لەوە بگرن جولەکەکان دەردەست چەک پەیدا بکەن بەرگری لەخۆیان بکەن..

«لە دوایدا ئینگلیزەکان هەرچەندە لەوەدا سەرکەوتن کە هێز و دەسەڵاتی دیکە هاوکاریان بکا تاکو گەمارۆی سەر ئیسرائیلی پێ تۆکمەتربکەن، بەڵام بە مەرەدی فەلەستینیەکان چون کە نەیانتوانی فڕێیبدەن.»

ئۆپەراسیۆنی دە کەتنەکە ئەوەندە سەرکەوتو بوو، وای لە بنگۆریۆن کرد مرخی خۆی لە کردەیەکی دیکەش خۆشبکا.

بۆ ئەوەی ڕاستەوخۆ سکاڵاکانی شارێت و ئەوانی دیکە نەیانگرێتەوە کە خەمی ڕای گشتی جیهانیان سەبارەت بە پرسە دیپلۆماتیەکان بوو، کارێکی وایان کرد کە ئەمجارەیان هێزەکانی میسر وا لێبکەن دەست بە کردەوە دوژمانکارییەکان بکا، واتە دنە و ختوکەی بدەن تا دەستپێشخەر بێ، ئەوسا ئەوان چالاکی سەربازیانەی زیاتر بکەن. ئەمەشیان بە دەستکەوت کە ڕێ بە کاروانی میسریەکان نەدەن کەلوپەلەکەنیان بە ناو ئەو شوێنانەی ئیسرائیل داگیریکردبون بگوازێتەوە ئەو هێزەی خۆی کە فاجودا Fajudaی داگیرکردبوو. میسر لە نێوان دو بژار دابوو سیهەمی بۆ نەبوو، یان لێگەڕابا ناسر و سەربازەکانی لە برساندا بمردبان، یان هێرشی کردبا؛ ئەوەبوو، مژاری دوهەمی هەڵبژارد و دەستی بە پەلاماردانکرد.

ئەمەش هێمایەک بو کە ئۆپەراسیۆنی ئاین Ayin دەستپێبکا. دیسان یادینی ئارکیۆلۆژ و ئاللۆنی جوتیار ئۆپەراسیۆنەکەیان ڕێکخست و جێبەجێیان کرد. ئالۆن دەبووایە بەرەو بیئرسەبعای بایبل بکشێ، بەوپەڕی خێراییەوە بەرەو سنوری نەقەب-سینا بکشێ، لە ڕێگاکەشیدا شکست بە هەمو بەرگرییەکی میسری بهێنێ.

پەرۆشی یادین نەوەک هەر هی جەنگاوەریک بوو، بەڵکو وەک ئارکیۆلۆژێکیش هەڵمەتەکەی مەبەست بو. تاکە ڕێگای بیئر سەبعە بەرەو سنوری سینا پێچێکی گەورەی دەکرد. پێبەپێ ڕێگاکە هێزی گەڕۆکی میسری چالاک بوون. هەردو دیوی ناوچەکەش ئەوەندە وێرانەو سەخت بوو، تەنها ڕێگای وشترەکان بوو.

بەڵام یادینی ئاکیۆلۆژ وێنەی لە ئاسمانگیراوی ئەوێی دیتبو کە ڕێگایەکی کۆنی ڕۆمانیەکان بەناو بیباندا دەڕوا، ڕاستەوخۆ بەرەو ئامانجەکە دەچێ.

ئیدی ڕاوێژ لەگەڵ ئەندازیارە ئیسرائیلیەکان کرا و بە زویی ڕێگایەکە وا نۆژەنکرایەوە کە ئۆتۆمبێلی بار و تۆپخانەی سوکی پێدا بڕوا. کەمێک بەر لە دەستپێکردنی

ئۆپەراسیۆنەکە یادین لە بارەگای سەرەکییەکەدا رایگەیاندبوو کە دەیەوێ بە جیێبەکەی بەرەو بیئیر سەبعەدا بڕوا.
بنگۆریۆن پێیگوت دەیەوێ لەگەڵیدا بڕوا، چونکە تامەزرۆی دیتنی قۆناخی یەکەمی ئۆپەراسیۆنەکە بوو. ئیدی بنگۆریۆن، یادین، هاوکارێکیان و شوفێرێک بە سواری جیێب بەڕێکەوتن. کەمێک پێشتر تاوەبارانی بەخوڕ باریبوو، ڕێگاکەی سەخت کردبوو، شوفێرەکە بڕیاریدا قەدبڕ تا دواشوێن بڕوا. کاتێک ئەوان بە پێچاوپێچ دەڕۆیشتن، گەیشتنە سی کیلۆمەترێک لە نزیک بیئر سەبعە، ئیدی گەیشتنە سەر رۆچونێکی خاکەکە وابەرین بوو جیێبەکەیان نەتوانێ بپەڕێتەوە.
یادین هاواری کرد: «پێویستە پردێک دروست بکەین.»
سەرکردەی هێزەکانی ئیسرائیل، یادین، شوفێر و هاوکارەکەیان بەرەو گوندێکی چۆڵکراوی عەرەبان بەناوی کاوکابا Kaukaba کە تازە لێوە رەتبون، گەڕانەوە. چەند دەرگایەکی داری خانوی کێڵگەکانیان هەڵتەکاند و خستیانە سەر مل و هاتنەوە لای ئۆتۆمبێلە چەقیوەکە. کاتێک جیێبەکە بەسەر پردە دارینە دروستکراوەکە دەپەڕیەوە، کەوت و لەناو قوڕەکەدا چەقی، ئیدی دەرنەهات.
زۆری نە دەبرد کە ئۆپەراسیۆنی ئاین دەستی پێکردبا، بۆیە بە ناچاری هەر چوار پیاوەکە بە پێ هەشت کیلۆمەتر ڕێیان کرد. بنگۆریۆنی پیر وەک ئەوانی دیکە هەناسەبڕکێ بوو، بەڵام لێیان بەجێنەما.
کاتێک گەیشتە سەر جادە ئۆتۆمبێلێکیان بەدیکرد، بە ڕێکەوت بە ئاراستەی تەلئەبیب دەڕۆیشت.
یادین لێپرسی: «ئەرێ دەکرێ لەگەڵ خۆت بمانگەیەنیتە بیئر ئەلسەبعە؟»
«ئاخر، ڕێگای من-»
شوفێرە گەنجەکە هێشتا وشەکانی تەوا دەرنەبڕین، بە حەپەساوی چاوی مۆلەق راگرتن. پاشان داوای لێبوردنی لە سەرکردەی هێزەکان و سەرۆکی دەستەی هێزەکان کرد. کاتێک گەیشتنە بیئر ئەلسەبعە، پێیان گوترا کەوا خانوی ئەو گوندانەی دەرگاکەیان بۆ پرد هەڵتەکاندبوو، بۆمبی راکێشراویان لێبەسترابوو، ئیدی ئاخۆ چ پەرچوێک ئەوانیان رزگارکردووە دەنا لاشەیان بە هەواوە پارچەپارچە دەبوو.
ئۆپەراسیۆنەکەی ئاین ئەوەندە سەرکەوتو بوو، ئاللۆن و هێزەکەی پێش کاتی دیاریکراویان شوێنە مەبەستەکانیان گرتبوو، بەو هۆیە توانیان بەرەو هەمو بیابانی سینا بکشێن. لە دە کیلۆمەتری کە هێزەکانی میسری بارەگای خۆیان لێدانابوو، هەروەها فرگەیەکیشیان لێدروست کردبوو، کەوتە بەردەستی ئیسرائیلیەکان. ئەوان لە بارێکی وادابوون کە هێرش بکەنە سەر ناوچەی غەززە و زەبرێکی گورچکبڕ لە میسریەکان بدەن و تەواوی ناوچەکەیان لێپاک بکەنەوە؛ لەو ساتەدا بروسکەیەک لە بارەگای سەرەکییەوە هات تیایدا هاتبو:
«تەواوی ئۆپەراسیۆنەکان راگرن.»
ئالۆن بە ئەفسەرە پلە لەخۆ خوارترەکانی گوت: «مشوری ئەوە بخۆن کە هەمو شتێک ئامادە بێ، تاکو بەیانی هێرش بکەین.»

ئیدی سواری جێبێک بو بە ڕێگای ڕۆمانیەکاندا بەرەو بیئرئەلسەبعە لێخوڕی، لەوێوە سواری فڕۆکەکەی خۆی بوو بۆ تەلئبیب.
گەرهاتبا و رەوشی جیهان و کاردانەوەی بەسەر رێنمایەکەی سەرکردەکەی زانیبا، کەمتر سەری سوڕدەما لەو کاتەیدا کە سەرقاڵی تێکشکاندنی هێزەکانی میسری بو.
بنگۆریۆن لەگەڵ هاوسەرەکەی بۆ ئەوەی چەند سعاتێک پشو بدەن، چووبونە تیبەریاس Tiberias. بارەگای سەرەکی لەهەر پێشهاتێکدا ئاگاداری دەکردەوە، بەڵام لەنێوان تەلەفونکردنەکاندا دەکرا بنگۆریۆن چێژ لە گوڵە شینباوەکەی ئەوێ ببینێ و کتێب بخوێنێتەوە زیاتر بێتەوە سەرخی بەهۆی کانیاوە سروشتیەکانی ئەوێ.
لە ئێوارەی هەینی، دوا رۆژی ساڵنامەی کریستیانیدا شارێت بە بارێکی تەواو پەشۆکاویەوە زەنگێکی بۆلێدا بوو. ماکدۆنالدیش بە تەلەفون دەقی ئەو بروسکە کۆدەدارەکەی بۆ خوێندەوە کە لەلایەن ترومانەوە نێردرا بو.
وەزارەتـی کاروبـاری دەرەوەی بەریتانیا ( تا ئـەو کاتیش هێشتا پەیوەندییە دیپلۆماتەکانی لەگەڵ ئیسرائیلدا نەبەستبوو ) داوای لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئامریکا کردبوو کە بە ئیسرائیل رابگەیەنێ بەریتانیای گەورە بێ ئەوەی میسریش داوای لێبکا، بە گوێرەی پەیمانێکی کۆنی لەگەڵ میسردا، ئەوا شەڕ لە دژی ئیسرائیل رادەگەیەنێ، گەر هاتو دەستبەجێ سەربازەکای ئیسرائیل لە خاکی میسریدا نەکشێتەوە.
وڵاتە یەکگرتووەکانی ئامریکاش داوایان لە ئیسرائیل کرد بکشێنەوە، گەرهاتو داواکەشیان جێبەجێنەکەن ئەوا واشنتۆن ناچار دەبێ چاو بە هەڵوێستەکانی سەبارەت بە دەوڵەتی جولەکاندا بخشێنێتەوە.
رونکردنەوەی شارێت بڕوای بە ماکدۆنالد نەهێنا. بۆیە نوێنەری ئامریکا ئۆتۆمبێلێکی بە کرێگرت ١٨٤ کیلۆمەتری مەترسیداری نێوان تەلئەبیب و تیبەریسیای بڕی تا راستەوخۆ پرسەکە لەگەڵ بنگۆریۆندا باسبکا.
ئێوارە درەنگ ماکدۆنالد گەیشت. لەلایەن بنگۆریۆن و هاوسەرەکەی لە ژورێکی تەنیشت راڕەوی میوانخانەکە پێشوازی لێکرا. ئەوان سعات و نیوێک قسەیانکرد. بنگۆریۆن ماکدۆنالدی دڵنیاکردەوە کە لەمێژە فەرمانی بە هێزەکانی ئیسرائیلدا داوە بکشێنەوە.
ماکدۆنالد داوای دەستەیەکی چەکداریانەی پاراستنی بۆ گەڕانەوە کرد. سعاتێکی خایاند تا دەستەکەیان پێکهێنا، لەو ماوەیەشدا باسی بابەتی جۆراوجۆریان کرد.
کاتێک دەستەی پارێزگاریش لە دواییدا گەیشت، ئامریکایە درێژە ناقۆڵایەکە گەڕایەوە تەلئەبیب.
لەو نێوەدا ئالۆن لە بارەگای سەرەکیدا تەنها ئەفسەری راژەداری لێبوو. پرسی یادینی لێکرد. گوتیان نوستووە. ئالڵۆن ئەوی لەخەو هەڵستاند.
بە دلێرپەرستیەوە پێگوت: «ئێمە دەرفەتێکی باشی تێکشاندنی لەشکری میسری لەدەست دەدەین.»
یادین بەرسڤی دایەوە: «ئاخر ئەوە پرسێکی سەربازیانە نیە. سەرۆک ترومان هەڕەشەی کردوە گەرهاتو ئێمە لە سینا نەکشێینەوە، ئەوا چاو بەهەڵوێستیان

دەربارەی ئیسڕائیل دەخشێنەوە.»
ئالۆن گوتی: «کەواتە دەمەوێ لەگەڵ بنگۆریۆندا قسە بکەم.»
«ئەو لە تیبێریاسە.»
ئەوکات ئاللۆن بڕیاریدا شارێت بێدار بکاتەوە.
«لێمگەڕێ با ئەلعەریش El`Arish بگرم.»
شاریت لە کورتیدا بڕیەوە: «مەحاڵە؛ قسەمان داوەتە حکومەتی ئامریکا و لەسەر قسەی خۆشمانین.»
«دە کەواتە ریگام بدە با زەنگ بۆ پیرەمێرد لێبدەم!»
تەلەفون لەگەڵ تیبێریس لێدرا.
بنگۆریۆن بە بێدەنگی گوێی لە رونکردنەوەکەی ئاللۆن گرت. دواتر بە چوار وشە وەڵامی دایەوەو دەسکی تەلەفونەکەی دانایەوە: «لە ماوەی بیستوچوار سعاتدا بکشێوە.»
دیسان بنگۆریۆن راستەڕێی لەنێو رێگای سەربازیانە کە دەیانەویست سوپای دوژمن لەناو ببەن و لەنێوان خۆپارێزی شارێت کە ئیسڕائیل دەبێ هەڵوێستی شیاو نیشان بداو پێگەی لەنێو خانەوادەی گەلاندا بکاتەوە، هەڵبژارد.
کاتێک یەکەمین هەڵبژاردنی ئیسڕائیل بۆ سەدوبیست کورسی پەڕلەمانێکی یەکژوری بەناوی کەنیست سازدرا، بیست و یەک پارتی سیاسی لیستی خۆیان پێشکەشکرد، بەمە سەلماندیان کە تاکایەتی و سەربەخۆی سیاسیانە هەمیشە بە زیندویی ماونەتەوە. بە نوکتەئامێزیەوە بنگۆریۆن بە ماکدۆنالدی دۆستی گوت:
ئەرێ پرسیارێکمان لە سەرۆک ترومان بۆناکەی، ئاخۆ رازی سیستمی دوو پارتییمان پێنالێ.»
ماپای بنگۆریۆن چل و شەش کورسی بەدەستهێنا، دوو جاران لە گەورەترین ئەو پارتەی بەدوایانداهات زیاتر بوو. لایەنگرانی بێگین پیاوەکانی ئیرگون کە هەنوکە هیروت Herut(ئازادی)یان پێکهێناوە، چواردە کورسیان بەدەستهێنا. لەو بەربژارانەی کە کورسیان بەدەستهێنا سێ عەڕەب و ژنێکیشیان تێدا بوو.
پارلەمان وایزمەنی بەسەرۆکی دەوڵەت هەڵبژارد، ئەویش داوای لە بنگۆریۆن کرد کابینەی حکومەت پێکبهێنێ. دوای هەفتەیەک لە سەرکەوتنی دانوستانەکاندا؛ ماپای هاوپەیمانییێکی لەگەڵ چوار پارتی ئەرسەدۆکسی و دو کۆمەڵەی بچوکی دیکە پێکهێنا.
بەم شێوەیە سەرکردەی سەندیکای پیشەیی بووە یەکەمین سەرەک وەزیرانی هەڵبژێردراوی ئیسڕائیل، کە هەر زو  پیاوە بچکۆلەکەی تایین بووە مایەی سەرنجی جیهان، کە بە شێوەیەکی بنەڕەتیانە بڕوای بە ئایندەی  ئەو حەفتسەدهەزار ( لە ماوەی شەڕەکەدا پەنجاهەزاری دیکەشی هاتەگەڵ ) کەسە هەبوو، بۆ ئەوان لە ناوچەیەکی بیاباندا کە بچوکتر بوو لە ولایەتی ماسۆشێت Massachusets مافی خۆیان بەدەستهێنا.

# بەشی
# (١٥)

بـەردەوام تابلۆكێشان مەیلیان بە لای بنگۆریۆندا دەچـوو، چونكە لە راستیدا پەیكەرداڕشتنی ئەو لە بەرد، ئاسن و دار لەبەر قژ بژیەكەی و رەنگدانەوەی چاوەكانی ئەستەم بوو.

نوسەران ئاوا دەربارەی پرچی ئەویان نوسیووە:

«پرچی ئـەو  بۆ ســەرەوە رۆیشتوە و بەهەمولایەكدا لە شوێنێكی روتەنیدا بڵاوبۆتەوە.»

«تاڵە پرچە دڕەكانی هەڵچونێكی لولەییانەیان پێكهێناوە.»

«پرچێكی رەقی سپی شكۆدارانە كە چوارچێوەی بۆ پەڵە روتەنەییەكانی كێشاوە، هەروەك یەخەیەكی پەشمینی ملی ئەریستۆكراتیەكی سەردەمی ئالیزابێتە.»

بەڵام زۆر جاران سەبارەت بە چاوەكانی سەرنجی هەڵەیان لا دروستبووە. لە ماوەی مانگێكدا لە لایەن راپۆرتنوسێكی رۆژنامەیەكی نیویۆرک، لەلایەن هەواڵنێرێكی گۆڤارێكی ئامریكایی، لەلایەن دیپلۆماتێک كە بووە نوسەر و شانۆنامەنوسێكی رادیۆ، بە شینی وێناكرا، لە كاتێكدا نوسەرێكی ناودار كە كەمێک پێشتر سەردانی كردبوو چاوەكانی بە كەسک ناونابوو، هەروەها هەفتەنامەیەكیش هەفتەیەک چاوەكانی بە قاوەیی لە پۆرترێتی سەر هەفتەنامەكەی دانابوو كەچی لە بۆنەیەكی دیكەدا بە شینی دانابوون. ئەوەش مایەی لێتێگەیشتن بوو، هەرچەندە چاوەكانی قاوەیی بوون، بەڵام هەندێ جاران بریسكەی كەسكایی وەک ئاسنێكی رەقی دەدا. چاوەكانی چاوی دۆستانە بوون بەڵام نەرم و نیان نـەبوون.        نەرم ونیانی نەدەچوونە ریزی خاسیەتە باڵكێشەكانی كەسایەتی  بنگۆریۆن.

هەندێک جـاران گەرهاتباو كاژێرێک یان دوان  بە تەنها بووبایە و خەریكی خوێندنەوە یان بیركردنەوە بووبایە، چاوەكانی لە چاوی شاعیرانە دەچوون، كە بە تەواوی لە جیهانی ماتریالیستی دوور دەكەوتەوە.

داوە مووە رەقەكانی سەر برۆكانی بۆز و رێک رادەوەستان. چەناگەیەكی بە هێز و لێبڕاوانەی هەبوو وەک ئەوە وابوو كە لە مەڕمەڕ دروستكرابێ. رەنگی دەموچاوی سورباو بوو، نزیكی سورێكی قاوەییانە بوو. لێوەكانی تەنک بوون، زۆر جاران لێوی دەگیرساندن، بەڵام كە ژێیەكانی دەمی خاوكردبانەوە، بریسكەی چاوەكانی دەركەوتبایە كوریشكی لە لاڕومەتی دەركەوتبان، ئەوا خەندە و مسكەبوونەكەی

تەواو لە ناخەوە بوو.
دەستە بچوک و لاواز و چورچەکانی لە کاتی ئاخاوتندا بەردەوام لە جوڵەدابوون. دەستەکانی بۆ پێهەڵستان لە نوسینگەکەی، بۆ چەپڵەلیدان بە پاڵدانەوە لەسەر کورسییەکەی، بۆ ئاماژەپێکردن و تۆمەتبارکردن یان دەستەکانی خۆی لە یەکدەخشاندن وەک ئەوەی بیرۆکەیەک لەنێو لەپەکانی هەڵبقوڵێ، بەکاردەهێنان.
بە دەگمەن بە قیتی لەسەر کورسیەکەی دادەنیشت. زۆرجاران بەلای پشتیەوە پاڵی دەدایەوە یان دەچەمایەوە بۆ ئەوەی تەرکیزی بۆ بەردەم بێ.
کە بە پێ دەڕۆیشت، لێبڕاوانە ڕێیدەکرد، وەک ئەو پیاوەی کە بە دەقاودەقی ئامانجی پێشخۆی دیار بووبا.
ئـەو ئاساییانە بە نـەرمی دەدوا، تەنانەت بۆ جـەمـاوەریش ئاساییانە و بێ زۆرلەخۆکردن،ماندوانە دەدوا.
سەبارەت بە پۆشاک حەزی لە جلی فراوان بوو، گوێی بە نەریت نەدەدا. هەندێک جاران دەبوایە شەپقەی بەرزوقیت لەسەر بنێ، پانتۆڵێکی هێڵدار لەبەر بکا وچاکەتێک و بۆینباخێکی لەسەر بپۆشێ. بەڵام لەو بۆنانەندا وا دەبینرا کە خواخوایەتی بۆنەکە تەواو بێ و کراسێکی بێ بۆینباخ، پانتۆڵێکی کەمێک فش وجوت پێڵاوێکی شیاو لەبەر بکا تاکو بە ئارەزوی خۆی دابنیشێ.
لە ماوەی شەڕی ١٩٤٨دا بنگۆریۆن بەرگی شەڕی دەپۆشی تا دوای شەڕیش بۆ ساڵێک خوی پێوەگرتبو هەر داینەدەکەندن. کاتێک لە سەر شاشەی تەلەفزیۆنێکی ئامریکایی لەگەڵ ناسر دەرکەوت، دەنگی ناڕەزایی لە بەرامبەردا بەرز بوونەوە چونکە جلی «کابرایەکی ئاشتیخوازانەی» نەپۆشیبوون. دوای ئەوە ئیدی بە دەگمەن بە جلی سەربازییەوە دەردەکەوت.
کەمێک دوای جاڕدانی سەربەخۆیی دەبووایە لە دانیشتنێکی بەیانیانەی کۆنگرەیەک کە هیستادروت سازیدابوو، قسەی بکردبانە. ئەو بە هەناسەبڕکێ، کەمێک دواکەوتبوو پانتلۆنێکی هێڵداری لەبەردابوو، شەپقەیەکی بەرز و بە دەستکێشیشەوە چونکە تازە پێشوازی لە نێردەیەک کردبوو. لەو کاتەی جێگای لەسەر سەکۆی کۆنگرەکەدا گرت بۆینباخەکەی کردەوە، ئەنجا دەستی بەدوان کرد:
«هاوڕێیان لێم مەگرن کەوا من بە بەرگی کارەوە هاتووم.»
لە ئیسڕائیل سەرۆکی وەزیران بوو کە رایدەگەیاند کەی بەهار و پایز بە فەرمی دەستپێدەکەن. گەر بنگۆریۆن بە شێوەیەک دەربکەوتایە قۆپچەی سەرویی کراسەکەی کرابایەوە، ئەوا هەموان دەیانزانی کە بەهار هاتووە، هەرکاتێکیش قۆپچەکەی داخرابا ئەوا نیشانەی پایز بوو.
موچەی مانگانەی سەرەک وەزیران خۆی هەر لە چوارسەد دۆلارێک دەدا، واتە کەمتر بوو لە شوفێرێکی تاکسی نیویۆرک.
لە سەردەمی کەمی ئازوقە لە ئیسڕائیلدا، جارێکیان ژنێک لە ریزگرتنی تەلئەبیبەوە هاتە پێشەوە، لەو کاتەی کە خەڵک نۆرەی بەشە ئازوقەکەیان گرتبووو. ئیدی هەمویان ناڕازی بوون تا دەنگێک لەنێویاندا بەرزبووەوە:

«ئای ژنینه، ئەو خانمە لە ماڵی بنگۆریۆن کاردەکا. کرێی ئەو لە ماڵی بنگۆریۆندا بە سعاتە، بنگۆریۆن مزی زۆری ناداتێ. گەر ئێوە ئیسرائیلی راستەقینە بن، رێگای دەدەن پێشبکەوێ.»

سەرەک وەزیران خاوەنی ئۆتۆمبێلی خۆی نەبوو. حکومەت ئۆتۆمبێلێکی گەورەی دۆگی Dodge خستبووە بەردەست، ئۆتۆمبێلەکە لەبەر تەمەندرێژی بایەخێکی وای نەمابۆوە، بەڵام لای ئەو زۆر پێشچاو بوو. دەیەویست سواری جێب ببێ. پزیشکەکەی لەسەر ئەوە ناڕازی بوو:

«سواری جێب بۆ جومگەی نێکەکانت خراپە.»

بنگۆریۆن بەوە دژی ئەو رایەی دکتۆرەکەی بوو: «باشە چۆن نمونەیەکی باش پێشکەش هاوکارانم بکەم. گەر هاتو هەموتان پێتان گوتم کەچی باشە چی باش نیە.»

دواتر چارەسەریەکی مامناوەندی دۆزرایەوە. سەرەک وەزیران رایگەیاند کە بە ئۆتۆمبێلێکی بچوکی ئاوروپایی رازییە، لە راستیدا لە جێب هەرزانتر دەکەوێ. بەڵام ئارەزوی ئەو هێشتا هەر زیاتر بەلای جێبدا دەڕۆیشت، چونکە قێزی لە بالیف وپشتملە نوێ و نەرمەکانی ئۆتۆمبێلە نوێکان بوو.

ئەو سادەیەیی بنگۆریۆن داوای دەکرد و لەسەری دەڕۆیشت زەحمەتی خستە بەردەم توندڕەوەکان تا تۆی قینەی چینایەتی لە ئیسرائیلدا بچێنن. ئەوە هۆکارێکی سەقامگیری کۆمەڵگایەکی فرە زمان و رەگەز و لایەن بوو.

وەک سەرۆکی حکومەت، بنگۆریۆن نمونەیەکی باشی نمایشکرد. ئەو دەیتوانی وەک تیتۆ هەمو بەرۆکی خۆی بکاتە نیشانە و میدالیا، دەیتوانی ناو و وێنەی خۆی ببخاتە سەر پارەوپول وەک دواتر یەکەم سەرۆک دەوڵەتی گانا کردی، ئەو دەیتوانی لەسەر بودجەی دەوڵەتەوە سواری ئۆتۆمبێلی زرییۆشی گوللەبەند ببێ و ژمارەیەکی زۆری پاسەوان داخوازبکا وەک دەسەڵاتدارە تازەکان وایاندەکرد، یان ئەو دەیتوانی داوای رۆمانتیکیانە بکا وەک هەندێ لە دەسەڵاتدارانی دەوڵەتە نوێکان دەیانکرد. بەڵام شێوە ژیانی ئەو لە زوهدی راهیبێکەوە نزیک بوو.

بنگۆریۆن کەمتر بە لای موزیک، تابلۆ و هونەری پەیکەرتاشینەوە دەچوو. دوای گەیشتنی ماکدۆنالد بۆ ئیسرائیل هاوسەرەکەی ئەو زۆر جاران لەگەڵ پاولا بە یەکەوە دەچوونە کۆنسێرتی موزیک، کەچی بنگۆریۆن دەچووە سەر جێگەی نوستن و سەرقاڵی کتێب خوێندنەوە دەبوو.

کاتێکیش پێشەنگ(مایسترۆ)ی دەستەی مۆزیکی ئامریکایی لیۆنارد بیرنستاین Leonard Bernstein بۆ یەکەمینجار سەردانی ئیسرائیلی کرد، بە بنگۆریۆنی گوت:

«خۆ دەبێ ئەمجارەیان بێیتە کۆنسێرتەکە.»

بەڵی بنگۆریۆن ئەو جاریان چوو لە کۆنسێرتەکە ئامادە بوو، لە کۆنسێرتەکەشدا نە خەوی لێکەوت و نە هیچ سەرنجێکی هەراسانکەرانەشی دەربڕی. بەڵام کاتێ بێرنستاین لەسەر سەکۆیەکە نەما، بنگۆریۆن گەڕایەوە ماڵەوە لای کتێبەکانی.

دوای نەخۆشییەک بۆ پشودان کەمێک لە بۆدەنهایمەر Bodenhaeimer لە حەیفادا مایەوە، لەوێ ژورێکی گەورەیان دابویێ کە تابلۆیەکی ئەزمونگەری ئاڵمانی لێبوو. بەڕێوبەرەکە بە شانازیەوە دوای سێ رۆژان پێی گوت:

«ئەرێ پێت چۆن بوو؟»

«چی؟»

«تابلۆکانمان.»

«ئاخر من چۆن بزانم، خۆ لە ژورەکە دەرنەچووم.»

بەڕێوبەرەکە بە سەرسوڕمانەوە نەوەک بە گلەییەوە هاواری کرد: «بەڵام تابلۆکان بە دیواری ژورەکەوە هەڵواسراون!»

دوو رۆژ دواتر بنگۆریۆن بانگی بەڕێوبەرەکەی کرد.

«بە داوای لێبوردنەوە، پێویستە تابلۆکان هەڵبگری. من بە تۆقینەریان دەزانم.»

هەوڵ وتەقەللای بنگۆریۆن هەرگیز بۆ ئەوە نەبوو سەرنج لای خەڵک بوروژێنێ. ئەوان دەبووایە وەک هەیە وەریبگرن. جارێکیان گوتێ:

«من لەوە تێناگەم خۆم لەوە باشتر بکەم کە هەم.»

سەبارەت بە فیلمیش زۆری بەلادا نەدەڕۆیشت، چونکە لە ڕوی گشتییەوە وات لێدەکا بە گرفتە کەسیەکانەوە سەرقاڵ بی.

شەترەنج تاکە یارییەک بوو کە کردویەتی. بنگۆریۆن پێیوابوو شەترەنجکردن بۆ مێشک وەک دەستاڕ بۆ ئامێرەکان زۆر بەسودە. سەبارەت بە یارییەک کە رێکەوت رۆڵی گرنگی تێدا بگێڕی، زۆری بەلاوە پەسەند نەبوو. گەر ئەو بەبەرزیەوە یاری بکا، ئیدی تەرخانکردنی ژیانی خۆی و سەدان هەزاری دیکە بوو. لەو بارەدا گرەوی لەسەردا دەکا و دەیباتەوە. پێش ئەوەی ببێتە سەرەک وەزیران هەرگیز ئاهەنگ، چێشت و فراوینی بۆ میوانان سازنەدەدان، بە دەگمەنیش بانگهێشتی ئەو جۆرە بۆنەو ڤیستڤالانەی دەپەژراندن.

هەندێک جاران پاولا یەک دو کەسی بانگهێشت دەکردن و لە هاوسەرەکەی دەپرسی بەڵکو جارێ واز لە کتێبەکانی بهێنێ و بەلای کەمی نیو کاژێر بۆخۆشی لەگەڵیاندا دابنیشێ. بەڵام گەر هاتباو لە نێو میوانەکاندا کەسی وای تێدا نەبووایە ختوکەی بیرۆکەی نوێی بدا و راستیە بایەخدارەکانی بۆ باسکردبان، ئەوا پێش بەسەرچوونی نیو کاژێرەکە داوای لێبوردنی دەکرد و دەگەڕایەوە خزمەت کتێبەکانی.

کاتێک جۆرج گارسیا گاراننذۆس Jorge Garcia Granados کە وەک ئەندامێکی UNSCOP زۆری بۆ پرسی جولەکان کردبوو، بووە یەکەمین نوێنەری وڵاتەکەی لە ئیسرائیل، سکرتێری بنگۆریۆن گوتی: «وا پێویست دەکا شتێکی باشی بۆ بکەین.»

سەرەک وەزیران پرسی: «مەبەستت چییە؟

«بۆنەیەکی بۆ سازبدەین، بانگهێشتی سەر فراوینێکی بکەین، ئاهەنگۆکەیەکی بۆ بگێڕین- شتێک کە بە هۆیەوە بەخێرهاتنێکی گەرمی لێبکەین.»

هەرچەندە بنگۆریۆن ریزێکی زۆری بۆ پیاوەکەی گواتامالا Guatamalaوە هەبوو، بەڵام تەنها شانی هەڵتەکاند. لەگەڵ ئەوەشدا ئاهەنگێکیان هەر بۆسازدا و

وایان لە بنگۆریۆنیش کرد تیادا دەربکەوێ.
کاتێک بنگۆریۆن هاتە هۆڵەکە، یەکەمین کەس بوو کە نوێنەرە ماکسیکییەکەی بینی، پیاوێک بوو کە باش دەیناسی و کەیفیشی بە چارەی دەهات. ئیدی دەستی گرت و بردیە گۆشەیەک و پرسکوتی کرد:
«ئەرێ دراوسێکانت چۆنن؟»
«ئەرێ کۆمۆنیستتان زۆر هەن؟»
تا بنگۆریۆن هاتە شوێنێکی دیکە، سکرتێرەکەی چەند جاران هاتە لای تا خەڵکی پێبناسێنی، بۆ ئەوەی سەرۆک وەزیرانی یەک دوو قسەیان لەگەڵدا بکا.
دوای دە خولەک بنگۆریۆن داوای لێبوردنی کرد و لێیداو رۆیشت.
ئەو بارە زۆری بۆ کارمەندی پرۆتۆکۆلییانە هێنا کە زۆر بە زەحمەتەوە توانی بنگۆریۆن بهێنێتەڕا، هەر هیچ نەبێ ساڵانە بەلای کەمیەوە بانگهێشتێکی نێردەکان بپەژرێنێ، بە تایبەتیش لە پرسی ئاهەنگی وڵاتەکەیاندا.
بنگۆریۆن جارێکیان بە یاریدەدەرێکی گوت: ئەوە دەکەوێتە نێوبازنەی ئەرکەکانم کە ئەوکاتەی بۆ کاروباری حکومەت پێویستم نیە، لە خوێندنەوە، نوسین و بیرکردنەوەدا خەرجی بکەم.»
ئەوە وزەیەکی تورە و دەمارگیریانە نەبوو کە پاڵی بە بنگۆریۆنەوە دەنا بەرەو پێشەوەی بەرێ. بەڵکو هێزێکی ناخەوەی بوو وەک وایەرێکی کارەبا لە ناوەوە بارگاوی دەکرد، تا ئەو کاتەی خانەکانی مێشکی باشتر لە بەرامبەر خەڵکی دیکەدا بکەونە گەڕ، چاوەکانی پڕشنگیان دەدا و داوەموەکانی قژە بژەکەشی قیت رادەوەستان.
توندڕەوەکان هەندێک جاران بە دیکتاتۆریان لە قەڵەم دەدا، لەبەر ئەوەی پۆستی سوپاسالاری لەنێو لەشکردا هەبوو. ( بەڵام سەرۆکی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئامریکاش سوپاسالاری هەمو هێزەکانە.)
ئەوەش وایە لەنێو بۆتەی دیموکراسیدا دەیەویست بۆچوونەکانی سەرئاو بکەون. کاتێک نەخشەی ساڵیادی دەیەمی سەربەخۆبوونی ئیسرائیل لە سەروبەندی ئامادەکردندا بوو، ئەو بەوشێوە کەسیانە سەرنجی خۆی لەمەڕ یادکردنەوەکە دەربڕێ:
«من پێ لەسەر ئەوە دادەگرم کە ئۆرشەلیم بە مەڵبەندی ڤیستڤاڵەکانی بۆنەکە هەڵبژێردرێ، بەڵام بێگومان کەنیست ( پەرلەمان ) لەوەدا دەسەڵاتدارە کە کوێ دابنێ.»
لە ١٩٤٩دا سەربردەیەکی تەوسئامێز لە تەلئەبیبدا بەخۆشیەوە لەو نێردەیەی کە کەمێک پێش بەسەرچوونی ماندات دەچنە لای بنگۆریۆن؛ دەگێڕنەوە گوایە لێیان پرسیوە یاخۆ ئامادە نیە خۆی بکاتە پاشای ئیسرائیل. بەڵام ئەو رەتیکردەوە، چونکە بە بیرۆکەیەکی نە پەژراوی دانا کە بە داودی دووەم بناسرێ.
ئەو هەرگیز هێزی وەک مەبەسەت نەویستووە. لە ماوەی دە ساڵی یەکەمی سەربەخۆیی دەوڵەتدا ئەوەی سەلماند کە هەوڵەکانی بۆ هێز و دەسەڵات بۆئەوە بووە خەونەکانی پێبەدیبێنێ.

ئەو پیاوێکی خاکیانە بوو بێئەوەی ببێتە رەعیەت، تێگەیشتوێکی نەرم و نیان، وەلێ هەرگیز خەواڵو نەبوو، شەرمن بەڵام نەترس.

بەو نوکتانەی کە لەسەری دەکران پێدەکەنی، ئەوەشی دەسەلماند کە هەرگیز سەبارەت بە بیر لەخۆکردنەوەدا زێدەڕۆیی نەکردووە. هەر لە سەرتاوە زۆر لەو نوکتانەی دەربارەدا هەڵبەستراون. لە بەرامبەر ئەو چیرۆکەی لە ١٩٤٩ کە لە تەلئەبیبدا لەسەری بڵاوبووەوە گوایە پیاوێک خۆی لە ریزێکی پیاوان پەستاوە و تاکو بتوانێ دەمانچەیەک بکڕێ بەڵکو بنگۆریۆنی پێبکوژێ، چونکە سەرچاوەی هەمو نەگبەتییەکانە، بنگۆریۆن لە پێکەنینی زیاتر هیچی دیکەی بۆ نەمابۆوە.

رۆژێک دواتر برادەرێک پیاوەکەی دیتەوە، لێیپرسی ئاخۆ بەسەرهاتەکەی بەچی گەیشت.

«من دەمانچەکەم کڕی و بۆ لای نوسینگەی بنگۆریۆنیش رۆیشتم، بەڵام لەوێ ریزە پیاوێکی زۆر وەستابوون تا نۆرەیان بێ و بیدەنە بەرگوللان، بۆیە منیش بە کلکی بارگیرم دادا و گەڕامەوە ماڵ.»

بنگۆریۆن ناونانی شەقامەکانی بە ناوی زیندووەکان بە شاشی دەزانی.

«جارێ راوەستە بەڵکو دوای مردنی ناودار دەبێ.»

ئەو زۆر لەو کەسانە پەست دەبوو کە رێگر بوون لەوەی بە هێواشی بیربکاتەوە و ئەو قسەکەرە بێسەروبەرانەی کە هەروەها هەروەهایان زۆر یان بەکاردەهێنا. هەروەها ئەو کەسانەشی خۆش نەدەویستن کە کلێشەئاسا قسەیان دەکرد و بیرۆکەکانیان بەشێوەیەکی ئاسان دەرنەدەبڕی.

بنگۆریۆن لەگەڵ ئەو پیاوە هاوڕابوو کە دەیگوت؛ گیانە نارۆشنەکان دەربارەی خەڵک قسەدەکەن، گیانە مامناوەندییەکان دەربارەی روداوەکان دەدوێن و گیانە مەزنەکان سەبارەت کۆنسێپتە ئەبستراکتەکان دەئاخڤن.

دواندەرە نارۆشنەکان گەر دەربارەی پرسگەلی گرنگیش قسە بکەن، پەستیان دەکرد. هەر بۆیە ئاهەنگەکانی بە کات بەفیرۆدان لەقەڵەم دەدا. دەیەویست لەبنەوە دەربارەی مژارێک قسە بکا، خۆگەر نەیتوانیبا، ئەوا بێدەنگی پێباشتر بوو.

تۆقەکردنی بە «خوییێکی بەربەریانە»دەزانی چونکە هیچ سودێکی کردەیی لەوەدا نیە کە پێویست بە سەلماندن بکا کەوا خەڵکی هاوچەرخ خەنجەریان لەبەر پشت نابێ تا بە تۆقە کردن بیسەلمێنن کەوا ئاشتی خوازن.

ئەو لەگەڵ ناسیاوەکان بە «شالۆم» سڵاوکردن دەستی پێدەکرد، بەڵام بە پێویستی نەدەزانی ئەوشتانەی لێ زیاد بکا «ئەرێ خێزانەکەت چۆنە؟» یان «ئەمڕۆ رۆژێکی خۆشە، وانیە؟» ئەو تێبینی دەربڕینانە بە بێواتای دەژماردن؛ چونکە دەبووە لەمپەر بۆ بیرکردنەوە و رێگەیان لە ئاخاوتنێکی روناکبیریانە دەگرت.

ئەو هەمیشە لە هەوڵی ئەوەدا بوو گەنجینەی زانیارییەکانی لە ڕێگەی دەوروبەرەکەی زیاد بکا و بەهرەکەی بە باشترین بیرۆکەی ئەوانی دیکە بگرێتە خۆ و بیانخاتە نێو بۆتەی فەلسەفیانەکەی خۆی.

ئەو مرۆڤناسێکی باش نەبوو، پێوەری توندی بۆ ئەو پرسە دادەنان. سەبارەت

ئەو کەسانەی لە هەرشتێکەوە کەمێکی لێدەزانن بە خۆڕسکیەوە ئێرەیی پێدەبردن. گیانێکی زیرەکانە بە تەنها بۆ ئەو بەس نەبوو.

ئەو پسپۆڕەکانی زۆر پێپەسند نەبوون، هەرچەندە زۆرجارانیش پەنای بۆدەبردن.

جارێکیان گوتی: «پسپۆڕەکان راستییەکان دەزانن، بەڵام بە دەگمەن دەزانن کە خزمەتی چی دەکەن.»

لە بۆنەیەکی دیکەدا بە هاوکارێکی گوت:

«گەرهاتو پسپۆڕێک پێی گوتی کەوا فلانە شت مەحاڵە بکرێ، ئەوا واتای ئەوە دەگەیەنێ کە پسپۆڕەکە هیچ رێگەچارەیەکی دیکەی بۆ نەدۆزراوەتەوە. هەرکاتێک پسپۆڕەکە وشەی «مەحاڵە»ی لەدەم هاتە دەرەوە، ئیدی کاتی ئەوە هاتوە کە پەنا بۆ پسپۆڕێکی دیکە ببەی.»

بنگۆریۆن لە بەرامبەر رەخنەدا سنگی فراوان بوو بەڵام تەنها گەر بیزانیبا کەوا رەخنەگرەکە بابەتی پرسەکەی وەک خۆی دەناسێ.

توانا رژدبوون (تەرکیز)یەکەی ئەفسانەییانە بوو.

لە ساڵی ١٩٤٩دا دەبوایە چارەسەری کێشەگەلێکی بێژمار بدۆزێتەوە، برادەرێکی کتێبێکی قەبارە چوارسەد لاپەڕەیی سەبارەت بە فەلسەفە بە قەرز پێدابوو. دوو رۆژ دواتر کتێبەکەی بۆ هێنایەوە.

دۆستەکەی پێیگوت: «بە دڵنیاییەوە دواتر گەر کاتت هەبوو دەتوانی جارێکی دیکە وەریگریەوە.» سەرەک وەزیران بۆی پێکەنی. ئەو کتێبەکەی لە ئەلفەوە و تا یا خوێندبووەوە، ئەوەش لەوەدا دەرکەوت کە گفوگۆی سەبارەت بە ناوەڕۆکی کتێبەکەدا لەگەڵدا کرد.

لایەنە گیانیەکەی زوتر بیری لە تۆپ دەکردەوە لەوەی لە تفەنگێکی دەستی بکاتەوە، نەخاسمە لە جەنگدا زۆر جاران بڕیاری وای داون کە لای هەندێکیان نامۆ بوون، چونکە مەبەستەکەیان بۆ هەڵنەدەهێندرا. کە تۆپێک دەتەقێنی پێویستی بە لێکدانەوەی پێوەرە ورد و ئاڵۆزەکانە، دوای هەر تەقاندێکیش دەردەست نازانی ئاخۆ ئامانجەکەی پێکاوە، مەگەر لای ئامانجەکە بێ.

بە خەڵک رابواردن و نوکتەهێنانەوەی بە دەگمەن پەسنددەکرد، بەڵام ئامادەبوو بە چەندان کاژێر گوێ لە کەسێکی وەک ماکدۆنالد بگرێ کە ئەوەی بن بەڕێی بۆ بێنێتە سەر بەرێ سەبارەت بە روداوێک کە پێویست بە بڕیارلێدانێک بکا.

ئەو کەسایەتییێکی دینامیکیانەی هەبوو کە کەس نەیدەتوانی دوای دانیشتنێک بڵێ: «پێموایە بنگۆریۆنیش لەوێ بوو.»

زۆر خەمی بڵاوکردنەوەی ئەو نوسینانەی سەر خۆی نەبوو. جارێکیان بە رۆژنامەنوسێکی ناسیاوی خۆی گوت:

«من زۆرم پێباشترە وتارێکی خۆم بخوێنمەوە لەوەی وتارێک لەسەر خۆم بخوێنمەوە.»

لە ماوەی جەنگی ١٩٤٨دا بانگهێشتنی بوک گواستنەوەی یەکێک لە تەتەرەکانی

پەژراند، بەڵام لەدوا ساتەکاندا بەهۆی تەنگژەیەکی سەربازیانە بۆی نەکرا لە بۆنەکە ئامادە بێ.
کاتێک جۆزێفی تەتەر لە گەشتی ژنهێنانەکەیدا گەڕایەوە، بنگۆریۆن پێیگوت:
«شاییەکەتانم لە دەستچوو، وەلێ هەر دێم بۆ ماڵەکەتان، پێکە شەڕابێکتان لەگەڵدا بخۆمەوە. سپێدەی بەیانی کاژێری دە من لەلاتانم.»
سەرۆک وەزیران رۆژی پاشتر چارەگێکی دەویست بۆ دە تەماشای کاتژمێری دەستی کرد، ئەوسا روی لە هەر سێزدە ئەندامەکەی کابینەی حکومەتەکەی کرد کە دەبوایە کێشەیەکی گرنگ تاوتوێ بکەن: «داوای لێبوردنتان لێدەکەم، من دەبێ سەرەتا سەرێکی جۆزێف و خانمەکەی بدەم، دوای کاژێرێک دێمەوە لاتان.»
ئەوەندە لە روی روناکبیریی و جەستەییەوە ئازابوو ئەوەی سەلماند کە زۆر گەشتی تەنیایی بیرکردنەوەی بە ناو وڵاتەکەیدا کردوون و بەهۆیەوە بەناو ئاگردا چووە و شەڕی لەسەر بیرۆکەی ناجەماوەریانە کردووە و داکۆکی لە بڕیاری ناشیاوێشدا کردووە.
ئەو تەنیاییەی کە پشکێکی زۆری ژیانی داگرتبوو، بەشێکی زۆری بۆ ئەوە دەگەڕایەوە کە بەبیرکردنەوە لە گەلەکەی تەکانی بەرەوپێشەوە دەنا. ئەو تەنیاییەش بەختی هەمو مەزنە پیاوان بوو. کاتێک  جوەکانی دیکە هێشتا هەر بە جیدیشی دەپەیڤین، بنگۆریۆن لەمێژ بوو دەستی بەعیبری کردبوو، کارپێیدەکرد. کاتێک ئەوانی دیکە لە چاوەڕێی فریادڕەسێک (ماسیاس Messias) دابوون تا وڵاتی پیرۆزیان بۆ بگرێ، ئەو لەمێژ بوو خەباتەکەی دەست پێکردبوو. بۆ ئەوانی دیکەی دیاسپۆرا ناوی خۆیان دەبردەوە سەرناوی هۆزە کۆنەکانیان، ئەو لەمێژ بوو ناوێکی بایبلیانەی لەخۆنابوو. کاتێک هیچ کەسێک بیری لە پارێزگاری لەخۆکردنەوە(لەسەرخۆکردنەوە) نەدەکردەوە، ئەو یەکێک بوو لەوانەی کە جوەکانی بۆ بیرۆکەی داکۆکی لەخۆکردن جۆشدەدا. کاتێک کە تیرۆر لە برەودا بوو، ئەو کۆتایی پێهێنا.
دوای ١٩٤٨یش زۆر جاران خەریک بوو رومەتە سیاسییانەکەی خۆی بکاتە سەنگی محەک و سەرکردایەتی لە دەست بدا. گەر بیزانیبا لەسەر راستییە، ئیدی سوپەرێک بوو بەرامبەر نارازایەکان تەنانەت بۆ پێکدادن و تەقینەوەی مەترسیداریش بۆسەر ژیانی. بەهۆی ئەو تایبەتمەندییانەوە، ئەو هەرگیز کەسێکی دیماگۆکی نەبوو.
ئەو هەر دانی بەوەدا نەدەنا کە شتێکی ئەفسانەییانەی هەیە، بەڵکو دنەی ئەو خاسیەتەی لای ئەوانی دیکەش دەدا. جارێکیان نوسیبووی: «رێگامان بدەن کە چەمکەکانی ئەفسانەیی و ریالیزمی  وەک دو دژ دانەنێین... ئێمە دەبێ ریالیستی بین، ریالیستێکی رەخنەگرانە بەرامبەر هەر هەنگاوێکی ئێستاو داهاتومان. لێ ئێمە پێویستە ئەفسانەییش بین، بەوەی بە قوڵی متمانەیەکی بێسنور بە پاشەرۆژمان هەبێ و لە هێزی ئیرادەش نەتۆقین.»
هەرچەندە بە نابەدڵیش کۆمەڵە هەڵبژێر و بەربژارەکانی دەنگدان بەسەر زۆر گروپی بچوک بچوکدا دابەش ببوون، لای ئەو پرسێک نەبوو کە لەگەڵ  گروپە بچوکەکاندا هاوپەیمانێتی حکومەت پێکبهێنێ. ململانیی پارتایەتی و بگرەوبەردەی

سیاسیانە ڕەگەزێکی بەردەوامی متمانەداری ئەو بوو. لە بێنەوبەردەی نێوان پارتە سیاسییەکانیشدا بەردەوام وەستا بوو.

هەرچەندە لە لاوێتیدا سۆسیالیست بووە، بەڵام هەرگیز نەچۆتە ریزی دۆگمایەکان. ئەو ئامادە بوو دەستبەرداری بنەمایەکی پارتیانە بێ گەرهاتبا و بە کردەوە نەشیابا پەیڕەو بکرێ.

ئەو دەکرا بەقەد هێستریک کەللە رەق و جەنەگرتو بێ بە تایبەتیش کاتێ بەرامبەرەکەی بە دەرەنجامێکی هەڵە دەگا. ئەو باوەڕی بە دیموکراسی و مافی زۆرینە هەبوو، بەڵام بۆ بڕیاریکی گرنگ بەڵگەوبەند دێنێتەوە، داوادەکا، هەرادەکا و دەفەلسەفێنێ تا ئەوکاتەی بەرامبەرەکەی دێنێتە رایێ و کەمینە دەکاتە زۆرینەو دەباتەوە.

ئەو پیاوانەی پێیان کارانگەز بووە لەوانەی لە ژیاندان و لەوانەی مردون، ئەو ژن و پیاوە ئایدیالیستیانە بوون کە ژیانیان بۆ ئامانجێکی بەرز تەرخان کردبوو.

بنگۆریۆن ئەو کەسانەی کە بارێکی مامناوەندی رازیدەبوون خۆشنەدەویست، هەروەها کەیفیشی بە ئەوانەی بە دوای پارەکۆکردنەوە، خواردنی خۆش، خانوبەرە و ئۆتۆمبێلی کەشخە، قازانجکردن و بەخشینەوە و کۆکردنەوە و کەڵەکەکردنی سەرمایەدا دەگەڕان، نەدەهات. هەرچەندە ئامادەبوو دەرفەتی دوهەم بداتە ئەو کەسەی کە هەڵەی یەکەمی کردووە، بەڵام هەرگیز لە درۆ و پاشملە خۆش نەدەبوو.

بێدادی ئەوەندە پێ ناقۆڵاو جاڕسکەر بوو وەک ئەوەی مێشولە لە بناگوێی گیزەگیز بکا.

گەوجێتی وای لێدەکا دەستەکانی لە بێئومێدی پی بەرزبکاتەوە، شانەکانی هەڵبتەکێنێ و بێئومێدیانە سەری بابدا.

بنگۆریۆن ئەو بارەی زۆر بە ناشیاو دادەنا کە خەڵک لە بەرابەر یەکدیدا بقیڕێنێ، چونکە وەک دەیگوت هاوارکردن بەسەر کەسێک واتای وایە سوکایەتی پێبکەی، کەسیش مافی ئەوەی نیە یەکێکی دیکە سوک بکا، هەتا برادەکانی یەکدیش بۆیان نیە ئەو کارە قێزەونە دەرهەقی یەکدی بکەن.

گەر هاوسەرەکەی جارێک لە جاران لە بەرامبەریدا دەنگی بەرز بکردبایەوە و بیقیژاندبا، خێرا دەستێکی لەشان دەدا پێی دەگوت:

«بەڵام من تۆم خۆش دەوێ، خۆشت ئەمە باش دەزانی!»

بنگۆریۆن تەڕدەستانە کاردانەوەی لە بەرامبەر خەڵک و روداوەکاندا هەبوو، بەڵام بە دەگمەن کاردانەوەکەی کەسایەتیانە بوو. گەر پاولا پێیگوتبا کە فلانە خانم یان فیسارە خانم کۆرپەیەکیان پەیدا بووە، ئەوا لەناخی ناخەوە دەیگوت:

«زۆر باشە، دیسان ئیسرائیلییەک، کە دەکرێ یارمەتی ئاوەدانکردنەوەی وڵات بدا، هاتە سەر دنیا!»

ئەو هەمو ساتەکانی ژیانی بۆ کاری باش تەرخانکردبوو. هەرچی رویدابا ئەوەندە بە لایەوە گرنگ بوو ئاخۆ تاچەند رەوتی بەدیهاتنی خەونەکانی بەرەوپێشەوە دەبا.

هەرچەندە هەواداری کارانگازی زۆر هەبوون، بەڵام لە ناخەوە هی ئەوە نەبوو لەگەڵیاندا هەڵبکا. گەر هاتبا و بیزانیبا کە خێزانی ناسیاوێکی زۆر نەخۆشە، ئەو

هەرگیز بەلای ئەوەدا نەدەچوو کە بپرسێ: «ئەرێ ئەمڕۆ باری لەشساخی چۆنە؟»
زۆر جاران هاوکارانی لە بارەی کاردانەوە کەسایەتیەکەی دواون و پەرچەکرداری ئەویان بە پەرجوئاسا لێکچواندووە. ئەوەی کەیفی بە چارەی دێ، دەکرێ ئازاری بدا، هەروەک ئەو پیاوەی کە ئازاری ژنەکەی دەداو لەگەڵ ئەوەشدا خۆشی دەوێ. گەر هاتو قینیشی لە یەکێک ببێتەوە، ئەوا نایەوێ گوێی لێڕابگرێ گەرهاتو ئەوەی دەشیڵێ راستی زۆری تێدا بێ.
لە گەوهەردا ئەو زۆر حەزی بە لایەنی تاکایەتی مرۆڤ نەبوو، بەڵکو بە لایەنە کۆمەڵبوونەکەی.
هەرچەندە پیریش دەبوو زیاتر دەیتوانی بیرۆکە و خەونی نەوە نوێیەکەی ئیسرائیل بهێنێتە گۆ. ئەو وەک سابرایەک قسەی دەکرد، هەرچەندە خودی خۆی سابراش نەبوو. ئەو لە جیاتی گەنجان قسەی دەکرد هەرچەندە تەمەنیشی لە هەرواز حەفتاوە بوو. بۆ ستافە تایبەتیەکەی خۆی کەسانی گەنجی هەڵدەبژاردن، چێژی لەوە وەردەگرت کە ئەو لاوانە نەوەک هەر لە باری گیانییەوە بەڵکو لەباری جەستەیشەوە بیانسەلماندایە کە گرنگ و بەهادارن.
ساڵێک پێشتر لە کۆنفرانسیکی کشتوکاڵیدا ئامادە بوو، کە هیچ شوێنی پاڵدانەوەوی نەبوو، ئەندامانی کۆنفرانسەکە گواستبوویانەوە شانزە کیلۆمەتری ئەو لاوەتر. ئیدی بنگۆریۆن رایگەیاند :» لەو باوەڕەدام کە بە پێیان لێرەوە تا شوێنی کۆبوونەوەکە بڕۆم.»
تێدی کۆلێک Teddy Kollek یەکێک لە هاوکارە سیاسیە گەنجەکانی پێیوابوو پێویستە رۆژانە زیاتر لە ٣٠ سی کیلۆمەتر بەپێیان بڕوا، مەگەر ددان بەوەدا بنێ کە هاوکارە پیرەکەی لەو پێشڕەوترە.
«گەر من بڕۆم، هەست دەکەم لەوانی دیکە ئازادترم.»
ئەو هەرگیز بچوک و کورتهێنەر نەبوو. هەرچەندە لەو پەنجا ساڵەی رابردووەدا نزیکەی هەمو روداوە گرنگەکانی مێژوی جوەکانی پێیشبینی کردبوو، بەڵام بە دەگمەن دەیگوت:
«من ئەوە دەزانم.»
دوای ئەوەی د. وایزمەن بووە سەرۆکی دەوڵەت، ئیدی بنگۆریۆن لە گرێ کۆنە خۆبەکەمزانینەکەی رزگار بوو. بێئەوەی پۆز لێبدا و لەخۆبایی بێ پێیبەپێ و هاوشانی بیچمە ناودارەکانی جیهانی دەڕۆیشت، هەرچەندیشە ئەو سەرکردەی وڵاتێکی بچوکتر لە ئالبانیا بوو.
لە ڕێگەی خوێندنەوەی بایبلدا بـڕوای بەخۆ پەیداکرد. هەرکاتێک لە مێژوە دورودرێژەکەی گەلەکەی قوڵ دەبووەوە، بۆی دەردەکەوت کە ئیسرائیل لەوە زیاتر دەگەیەنێ کە تەنها کۆمەڵە کەسانێک بن و بە ڕێکەوت لە دەستی ژوری گازی هیتلەر دەربازیان بووە و هەنوکەش دەیانەوێ لەو بیابانە وشکەدا بەردەوامبوونی خۆیان بسەلمێنن.
کاتێک رۆژی سەربەخۆیی ئامریکایان لەسەر کەنار لە تەلئەبیب یادکردەوە،

بنگۆریۆن لە بۆنەکەدا بەرایی بە زمانی عیبری دەستی بە دوان کرد، پاشان لە پڕێکەوە بێدەنگ بوو ئەنجا بە زمانی ئینگلیزییەوە درێژەی بە وتارەکەیدا: «لێم ببوورن من بە زمانێک دوام کە پێش چوار هەزار ساڵ لێرەدا قسەی پێکراوە و بیستراوە.»

بەو کورتە تێبینیە، مێژوی وا بە کارهێنا کە پێگەی خۆی پێ بەهێز بکا و بیسەلمێنێ گەلەکەی هاوشانی نەتەوەی ئینگلیززمانە. کاتێ نێردە پایەبەرزەکانی دەرەوە سەردانیان دەکرد، یەکدو خولەکی پێشتری بۆ بیرکردنەوە لەو پیاوەی پێشوازی لێدەکا، لە رەچەڵەکی، لە وڵاتەکەی، لە مێژویەکەی بەکار دەهێنا. گەر هاتباو میوانەکەی ئامریکایی بووبایە ئەوا بەو تێبینییە دەستیپێدەکرد:

«ئەوە مایەی سەرسوڕمانە کە بیری لێبکەینەوە، تەنها ١٠٢ کەس لەسەر پشتی بەلەمی مایفلاوەر Mayflower بوون... گەشتێکیان دەستپێکرد، ئەو دەستپێکە بچوکە بووە مایەی ئەو دیاردە مەزنەی کە ئێستا ئێمە بەناوی ئامریکاوە دەیناسین...وڵاتەکەت رەنگ و واتایەکی نوێی دیموکراسی بەخشیە جیهان.»

هاوکات و هاوشان بەرێکوپێکی روی قسەکانی دەباتەوە سەر وڵاتەکەی خۆی. «ئەرێ دەزانی کە چەند کۆچبەر دوای دامەزراندنی ئیسرائیل، هاتنەوە وڵات؟ هەست دەکەی بە بەراورد لەگەڵ ئەوانەی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئامریکادان چەندن؟»

بۆ زۆر لە میوانەکان ئەو جۆرە وتوویژانە لەگەڵ بنگۆریۆندا مایەی تازەکردنەوەیەکی رۆحیانە بوو.

هەر لە بەرایی ژیانییەوە ئەو هێمایانەی خوارەوە بەسەر ژیانیدا زاڵ بوون:

سەربازەکە.

دایکەکە.

کرێکارەکە.

دەستپێکەکە.

بۆ ئەو روخسارە ناوهێنراوانەی سەرو هێمای هێز بوون. ئەو خوازیار بوو گەلەکەی هێزدار بکا، بۆئەوەی دەرەقەتی بەدیهێنانی خەونەکانی بێ. زۆر جاران لە دوانەکانیدا ئاراستەی قسەکانی بەرەو ئەو هێمایانەی سەرو وەردەگێڕا. یاخود هەر لە بارەیانەوە دەدوا. لە نێوچاوانی ئەوەوە هێمایەکان لە ئیسرائیل گرنگ و مایەی رێزلێنان بوون.

هەرچەندە ئەو لەناخەوە جولەکە بوو، بەڵام هەندێ خەسڵەتی نا جولەکانەشی هەبوون.

ئەو دەیتوانی لە کۆبوونەوەکاندا بە سعاتان بێدەنگ بێ، لە کاتێکدا هەموان دەمەتەقێ و هەرایان بوو. بەڵام کاتێ ئەوان شەکەت دەبوون و لە کۆتاییدا بێدەنگ دەبوون، ئەوسا بنگۆریۆن کە بوخچەیەکی نەکراوە بوو دەهاتە قسە، هێوری دەکردنەوە و لەنێو گرفت و تەنگەبەرەکاندا رێگاچارەی پێنیشاندەدان.

ئەوە خەسڵەتی جولەکە نەبوو کە دەست بەکاتەوە بگرێ، بەڵام بنگۆریۆن بە کردەوە هیچ ساتێکی بە فیڕۆ نەدەدا. بەردەوام لە وادەی خۆی ئامادە دەبوو، گەرهاتبا کۆبوونەوەیەک لەبەر دواکەوتنێکی یەکێک بوەخرابا، نارازی دەبوو. ئەو زۆر جاران

دەیگوت «تاکە شت کە نەتوانی بە پێشی بکەویتەوە کاتە.»
هەروەها خەسڵەتێکی دیکەی ناجولەکانەی ئەو شێوازە چڕوپڕەی دواندان و نوسینەکانی بوو. بە گشتی جولەکەکان حەز لە درێـژدادڕیَ دەکەن. دەقەکانی بنگۆریۆن بە ڕێکوپێکی داڕێژراون و هەرگیز وا نەکەوتۆتەوە بەهۆی درێژە دادڕییدا ڕێگای دەرچونی لە بابەتەکەی لیَ ونبوبیَ. هەرچەندە دوانی درێژی دەدان و وتاری بە هەزاران وشەوە دەنوسی، بەڵام هەرگیز لە بابەت دەرنەدەچوو.
هەروەها ئەوەش خەسڵەتی کەسایەتی جولەکە نەبوو لەساتە تەنگەتاو رەخنەییەکاندا هێوری خۆی بپارێزیَ کە بنگۆریۆن بەردەوام وایدەکرد.
زۆرینەی جوەکان مەیلی خانەوادەییان پێوە دیار بوو، بەڵام بنگۆریۆن نەیبوو. برایەکی ئەو بە ناوی ناحوم گرین Nahum Green بە ساڵان لە گۆشەیەکی شەقامی بن یاهودا و ناردو بۆلیڤاردا عەرەبانەیەکی شەربەتفرۆشی هەبوو. ڕۆژێکیان ڕایگەیاند:
«ئەریَ خۆمن شتێکی ناوازەم لێداوانەکرد کە ڕەتی بکاتەوە. من تەنها دەمویست پێگەیەکی باشترم هەبیَ.»
دواتر شانەکانی هەڵتەکاندن و گوتی:
«ئەو هەمیشە هەروا دین ( شێتانە ) بووە.»
لە بۆنەیەکی دیکەدا بێگانەیەک لێیپرسیَ، ئاخۆ بۆچی شەربەتی پرتەقاڵ دەفرۆشیَ، لە کاتێکدا برایەکەی دەوڵەتمەدارێکی بەناوودەنگە.
وەڵامی دایەو : «پەکو پەکو، تۆ نابیَ باوەڕ بە قسەی ئەو خەڵکەی ئێرە بکەی. لە پلۆنسک هەمیشە دەیانگوت گوایە من لەو زیرەکترین کەسی خێزانەکەم.»
لە بارەی ڕوناکبیرییەوە بنگۆریۆن لە زۆر ڕووەوە بیچمێکی پاردۆکس بوو. ئەو لە هەمانکاتدا لە ڕابردو، ئێستاو ئایندەشدا بوو.
کاتێک یادین بریکاری سوپاسالار بوو هاتە لای هەندیَ پرسی گرنگی هەبوون، بنگۆریۆن ناچاریکرد زیاتر لە کاژێرێک لەسەر ئیسرائیلی نێو بایبلدا قسە بکەن، بۆ ئەو تەنها پێنج خولەک مابوونەوە کە هەلومەرجی ئەستەمی سەربازیی لە سەدەی بیستەمدا تاوتویَ بکەن.
ئەو ڕوناکبیرێکی وابوو بەردوام بە دوای کردەدا دەگەڕا. بەڵام وەک پیاوێکی کردەیی هەمیشە هەوڵی دەدا لە باوەشی گیاندا خاوبێتەوە.
لەبەرئەوەی لە گەوهەردا پیاوێکی تەنها بوو، بۆیە هەوڵی دەدا خزمە گیانییەکانی لە مێژودا بدۆزێتەوە.
سخیلەر Schiller (١٧٥٩-١٨٠٥ شانۆنوس، فەیلەسوف و شاعێرێکی ئاڵمان بوو-وەرگێڕ) جارێکیان گوتبووی کە بەهێزترین کەس کاتیَ تەنیابیَ نەرمرۆترینیانە. ئەوەش بەسەر بنگۆریۆندا دەچەسپا.
هۆشە مێژوینییەکەی بەرچاوڕونی ژیانی بوو. بەلای ئەوەوە دیرۆک شتێکی مردو، چەمکێکی بێجوڵە نەبوو، بەڵکو ڕوبارێکی مەزنی بەخوڕ بەردەوام بەرەوپێشەوە دەڕوا کە مرۆ بیەویَ لە ژێدەرە پەنهانەکانی بگەڕیَ.

بۆئەوەی بەبێ بەربەست روبارەکە بڕوا، بەشێکی زۆری وزە رۆحیانەکەی ئاراستە کردبوو: هەوڵی دەدا دنەی بەردەوامیێتی مێژوویی گەلەکەی بدا. ئەمەش لە وڵاتێکدا زەحمەت نەبوو کە مرۆڤ بە دنیادا گەڕاوە و نوسینی تێدا دوو هەزار ساڵ کۆنە لەو شوینەی کە ئێستا پاسی بۆ نەزارەت، بیئر سەبعە و ئۆرشەلیم لێدەردەچن. بۆ ئەو بایبل تەنها کتێبێکی مێژویی ئیسرائیل نەبوو، بەڵکو ئینسکلۆپێدیا، رێنامە، قانوونامە، کتێبێکی دەستی بوو، تیایدا هەمو تیرەو هۆزەکانی سەرجەم جوەکانی دنیای لەخۆ گرتبو.

بنگۆریۆن لەو بڕوایەدا بوو بەبێ زانیاری نێو بایبل مرۆ لە هیچ رۆژنامە و نەبەردییەک تێناگا، نەشارەزایی سەبارەت بەو بەڵگەنامە دیرۆکییە وایکردوە کە زۆر لە دیپلۆماتە بێگانەکان و دەوڵەتمەدارانی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست هەڵەو شاشی بکەن.

هۆشە مێژوییینیەکەی بەقەد ئەوەی سۆزاوی بوو، ئەوەندەش روناکبیرییانە، زێدپەروەرەری و پراکتیکیانە بوو.

لەو کاتەی جارێکیان لە تیبیریاسەوە دەگەڕایەوە تەلئەبیب، دوای ئەوەی ماوەیەک لەبەر گەرمی چاوکانییەکانی بەسەربردبوو، درەختێکی سێدەر Ceder (الارز)ی بینی دەمەتەقێیەکی درێژی لەگەڵ هاوسەرەکەی و زییڤ شارێف کە لە گەڵی لە ئۆتۆمبێلەکەدا بوون، دەستپێکرد.

«ئایا ئێوەش هەست دەکەن کە درەختی سێدەر(ئەرز) لە لوبناندا پێنج هەزار ساڵ کۆنە؟ لەو درەختە ئورزانەدا دار بۆ دروستکردنی پەیکەرەکە هاتووە. پێنج هەزار ساڵ! کەواتە ئەوەش پێش نوح، پێش- کەوتووە»

«من دەزانم ئەم دوای نیوەڕۆیە لە کابینەی حکومەتدا کێشەگەلی گرنگ باس دەکەین، بەڵام ئەو دار ئورزانە! ئەوانە لە سەردەمی گرتنی جودێیاوە، پاشا، ماکابێین Maccabeeen هەر هەبوونەو . ئەرێ ئەو درەختانە چیان نەدیوە!»

کەمێک بێدەنگ بوو، لە پشتەوەی ئۆتۆمبێلەکە هەنیشکی دابووەوە. بەڵام زۆری نەبرد بەرەو پێشەوە چەمایەوە.

«گەر هاتو لە دواییدا ئاشتی بەرقەرار بوو-نەوەک هەر ئاگربەس، بەڵکو ئاشتییەکی راستەقینە- ئەوا دەمەوێ سەردانێکی لوبنان بکەم بڵێم: دەوەرن، یەکێک لەو درەختە ئورزانەمان بدەنێ، تاکو ئێمەش لە ئیسرائیلدا بیڕوێنین.»

تیژبینی بنگۆریۆن وایلێکردبوو بە شێوەیەک بژی هەروەک ئەو چاخەی دروستکردنی پەیکەری یەکەم و دوهەم تازە تەواوبووبێ، وا لەنێو شەقامەکانی ئۆرشەلیمدا دەڕۆیشت کە توشی یەکێک بێ هەروەک کەمێک پێشتر لەگەڵ شا داود دوابێ. بەلای ئەو کەسەکانی نێو بایبل بیچمی تارماوی نەبوون –بوکەشوشەی نێو مۆزە و بونیادێکی لە دارو ئاسن نەبوون. ئەو ئەوانی (مەبەست کەسەکانی نێو بایبلە-وەرگێڕ) لە زۆرینەی وەزیرەکانی نێو خودی کابینەکەی خۆی باشتر دەناسین. ئەو بە شێوەیەک دەربارەی یۆزوا Jozua و یێسیا(ئیسحاق) Jesaja دەدوا هەروەک برادەری بن، زیاتری متمانەی بەوان دەهات تا ئازنهاوەر Eisenhower و ماکمیلان Macmillan.

خەڵکانی دیکە نمونە لە میژو دەهێننەوە، بنگۆریۆنیش بانگی روداوەکان دەکا.
ئەو لە یەک کاتدا هەم قسەکەری پێشهاتە دێرینەکانی بایبلە و هەم پێشەوای گەلەکەیەتی لە سەردەمی هاوچەرخماندا و هەمیش دەنگی پاشەڕۆژە.
رۆژێکیان ئەندامێکی پارتەکەی کە زۆری لەگەڵدا قسەکردبوو ژورەکەی بەجێدێڵێ بە بێئومێدی ئاماژەی بەوە دەکاو دەڵێ:
«من ناتوانم لەگەڵ ئەو پیاوەدا بدوێم. گەر من سەبارەت بە روداوێک بدوێم کە دوێنێ رویداوە، ئەو دەیباتەوە سەر دوو هەزار ساڵ پێشتر. گەر من دەربارەی بەیانی قسە بکەم، ئەو دەستپێدەکا بە باسی دوهەزار ساڵ دواتر. وا هەست دەکەم وەک کەسێکم لەگەڵ موسا قسە بکەم و لەگەڵ یەکێک کە تازە دوای هەزار ساڵ لە دایک دەبێ.»
یەکێک لە هۆیەکان کە بە رابەرێکی تەواوی سەیردەکەن، ئەوەیە کە خەڵک وەک بیچمێکی راستەقینەی بایبلی دەبینن. ئەو نەوەک هەر بایبل پەڕ بە پەڕ دەزانێ بەڵکو وەک ئەوەی لەوێ هاتبێتەوە وایە.
ئەو لە لێکۆڵینەوە مێژوییەکاندا هەر بە بایبل  بە تەنها لێنەگەڕاوە. ئەو زۆر بیرۆکە و تەوژمی دیکەشی لە روبارە مەزنە بە خوڕەکە کە لقوپۆپی لێبوونەوە ناسیوەو هەڵێنجاون. لەبەر ئەوەی تەوژمی گریکەکان بەرینترو قوڵتر بوو، بۆیە دوای بایبل بە وردی لێیکۆڵیوەتەوە، ئەو بە دوای هەمو خاڵە گرنگەکاندا گەڕاوە کە بیری مرۆڤایەتی دەربارەی شارسیاتی نوسیویەتی.
بنگۆریۆن روناکبیرێکی وا نەبوو کە خۆی لە بورجێکی عاجدا ببینێتەوەو و دەرچوونی نەبێ. لە کاتێکدا لە ئەفلاتون  قوڵدەبێتەوە، ئەنجا دەچێتە سەر گۆڤارە زانستییەکانی روسیی یان ئامریکایی ئەوسا دەڕواتە سەر گۆرەپانی سەربازی و مەشقیان لەگەڵدا دەکا.
لەوانەیە ئەو تاکە سەرۆکێک بێ کە میوانە فەرمییەکانی سەرسام بکا و لەپڕ لە بابەتێکی سیاسیانە دەیانباتە سەر باسکردنی ژیان لە ناخی زێدا یان بابەتێکی ئەبستراکت وەک پەیوەندی نێوان گیان و مادەدا.
تەنانەت ستافی کارمەندە نزیکەکانی، کە دەیانزانی سەرۆکەکەیان چی دەخوێنێتەوە و لەگەڵ کێدا دەدوێ سەریان لە زانابیە پەرەسەندووەکەی سوڕدەما.
کاتێک نیگای دەخاتە سەر ئایندە، تێڕوانینەکەی وا لەناخ و بە قووڵەوەیە کە لە بڕواو متمانە لە بنەهاتووەکەی توانای مرۆڤەوەوە سەرچاوە دەگرێ تا سەرەداوێکی دەرچون و پەرەسەندویی لێدەربهێنێ.
رۆژنامەنوسان کە دیداری لەگەڵدا ساز دەدەن، زۆر جاران بە پیرێکی ماندوکەری دەزانن، تا لە کاتی دیدارەکەیاندا پرسێکی وای لێدەکەن پەیوەندی بە پاشەڕۆژەوە هەبێ، ئەوسا تێهەڵدەچێتەوە و چاوەکانی بریقە دەدەن و تروسکاییان لێدەڕژێ، دەستەکانی کەسایەتیانە دەجوڵێنێ، دەنگیشی دلێرانە سەدا دەداتـەوە، ئیدی ئەوە بنگۆریۆنە مەزنترین پێشبینەکەری ئەو سەردەمەمان.
گەر بێت و دەربارەی ئایندە قسە بکا، ئەوا هەر بە تەنها بیر لە ئیسرائیل ناکاتەوە

کە جارێکی دیکە شارستانیەتیە کۆنەکەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست بژیێنێتەوە، بەڵکو دەیەوێ وڵاتەکەی نمونەیەکی دادپەروەری کۆمەڵایەتیانە بێ لە ناوچەیەکدا کە بێدادی بەسەردا زاڵە. لە پاڵ ئەوەشدا باوەڕی بە وزەی ناوەکی هەیە، ئەو ئەگەری کردەیی دەبینی کە تینوتاوی ڕۆژ بکرێتە وزە، بۆئەوەی ئاوی سوێری زێ بپاڵێوێ. ئەو بە سەدان ساڵ پێش خۆی دەبینێ، وادەبینێ کە ئاسیا و ئافریکا مەکۆی بزێوی (دینامیکێتی) ئایندەن.

زۆر کەس هەن پێشبینی ئایندە دەکەن، بەڵام بنگۆریۆن لە ئایندەدا پڕۆژە دادەڕێژێ، ئەو سروشێک(بینینێک) لە ئایندەدا ئافەریدە دەکا دواتر وا لە گوێگرەکانی دەکا هاوپشکی بن.

کاتێک ئیسرائیل لەبن باری کەمی خۆراک، پەلاماری دوژمنەکان و کورتهێنانی پەیوەندییەکانیان لەگەڵ زلهێزەکان دەیناڵاند؛ بنگۆریۆن پێشبینی ئەوەی بۆ هاوڵاتیان دەکا کە وڵاتەکە چۆن دەبوژێتەوە: ئەو گردو گردۆڵکانەی بە گیاڕواون لە بۆرەییوە و کەسک دەبنەوە، بەشێکی ئیسرائیلی دێرین وەک جاران سەرلەنوێ دەبوژێتەوە. سود لە وزەی ڕۆژ وەردەگیرێ. پیاوەکانی زانست ڕەنگبێ بتوانن سەقا بگۆڕن. هەر کاتێک متمانەیان بەخۆ بوو، تواناکان بێسنور دەبن. ئیسرائیل دەبێتەوە سەرچاوەی هێزی ژیانەوە. ڕاچەنینی (ڕینیسانسی) ڕۆژهەڵاتی ناوین!

ئەوە بنگۆریۆن بوو، پەیامبەرێک لە ڕەچەڵەکی ئیسیا(ئیسحاق)، یێرمیاJermia، ئێزکیل Ezekiel، هوسیا Hosea، جول Joe`l، ئامۆس Amos، ئۆبادیا Obadja، میخا Micha، ناحوم Nahum، هاباکوک Habakuk، زێفانیا Zefania، هاگای Haggai، زاخەریا(زەکەریا) Zacharia، مالیاخی Maleachi و دانیێل Daniel.

ئەو حەزی لە ڕێساکانی خواردن نەبوو، بە گوێرەی ڕێنماییە دینییەکانی جوە ئەرسەدۆکسیەکانیش نەدەژیا. بە حوکمی سیاسەتکردن لەگەڵ پارتە سیاسیە دینییەکان هاوکاریدەکرد و هەندێ قانونامەشی پەسەندکردن کە بە هۆیەوە ئیسرائیلیان بە دەوڵەتێکی تیۆکراتی نیشاندەدا، بەڵام ماپای دژی حومکی دینی و خۆشی لە ماپای دژترتر بوو.

بەڵێ ئەو لە گەوهەردا ئۆلدار بوو، کەمێک ڕازدار و بڕوای زۆری بە بەهاکانی ڕەوشتی باوەڕە توندەکەی عیبریان هەبوو.

یەکێ لە ستافە نزیکەکەی لە دوا ساڵەکاندا یاکۆڤ هێرزۆگ Yakov Herzog ی کوڕی گەورە رابایینی کە هەرخودی خۆشی زۆر بە دین بوو، زۆر جاران بە بنگۆریۆنی دەگوت:

«لە ڕەفتارەکانتدا وا پێدەچی کە تۆ زیاتر لە زۆرینەی ئەرسەدۆکسەکان بڕوات بە پەڕجووەکان هەبێ.»

بنگۆریۆن لە کایەی گیاندا بەردەوام بەدوای شتێکدا وێڵ بوو کە پێدەچوو هەرگیز نەیدۆزێتەوە. ئەوەش ئەوە ڕووندەکاتەوە کە بە لایەکی دیکەیەوە لێکبدرێتەوە کە مایەی لێتێگەیشتنە، هەروەک ئەو دۆستایەتیە درێژەی لەگەڵ رابی فیشەرماندا هەبوو، لەگەڵیدا بیروڕاوای زۆری جیاوازیان لە بواری فەلسەفەو ئایندا هەبوو. ئەو

بۆ ئەو کەسانەی لە نزیکەوە دەیناسین، رونیکردەوە کە حەزدەکا وەک پیاوێکی ئەندێشەدار سەیر بکەن.
لە سەرەتادا فەلسەفە بۆ ئەو ماسیگرتن بوو بۆ کۆلیگە Coolidge (جۆن کالڤن کۆلیگە ١٨٧٢-١٩٣٣ John Calvin Coolige سیەمین سەرۆکی ئامریکا بوو، فەرمانڕەوایەتیەکەی کەوتە نێوان ١٩٢٣-١٩٢٩) وەرگێڕ) و هوڤەریش Hoover(هێربەرت هوڤەر Herbert Hoover سیو یەکەمین سەرۆکی ئامریکا بوو لە ١١٩٢٩-١٩٣٣ وەرگێڕ) تەنگەیەک بوو بۆ ئایزنهاوەر، بەڵام بە تێپەڕینی رۆژگار لێکۆڵینەوەیەکی قوڵ و جدی لەسەر فەلەسەفەدا پەیداکرد.
جارێکیان پرۆفیسۆرێکی فەلسەفەناس لە ئاتینا هاتە ئیسرائیل تا لەگەڵ بنگۆریۆندا باسوخواسی سیاسیانە بکا. هیچ ماندووبوونێکی وای نەدی تا قسەوباس لەگەڵ سەرەک وەزیراندا گەرم بکا، بەڵام دوای دەمەتەقێیەکی دوو کاژێری کابرا لە ناخەوە نیگەران بوو.
«سەرەک وەزیرانی لەسەر نوسینێکم دەربارەی ئەفلاتون و سوکرات دوا دوایی قسەکانمان تەواو بوون.»
بنگۆریۆن لە ئەفلاتونەوە فێر بوو کە فەیلەسوف پیاوێکە «لە هۆشمەندی فراژییە، لێتێدەگاو زانیاریی هەیە، لایەنگری دادپەروەرییە، حەزی لە ڕاستی و کەسێکی خاکییانەیە، چاکەی خۆش دەوێ و لەسەر ریگای هێز لادەدا.»
لە گرێی حەوتەمی ژیانە جەنجاڵیەکەیدا ئاراستەکەی وابوو گەر بۆی بلوێ لە باقی ژیانەکەیدا بەپێی لێتێگەیشتنی رۆحیانە(ئەفلاتونیانە) ببێتە فەیلەسوف.
هەر لە خۆڕسکیەوە کەسێکی ئاشتیخواز بووە. لە بەرامبەر هەواڵنێرانەوە جارێکیان گوتی: «من وەزیری بەرگرییم. ئەوەش قورسترین کارمە کە لە ژیاندا وەرمگرتووە، چونکە من دەبێ باشترین سالانی گەنجەکان بە فیڕۆ بدەم، پارە (بەهەزاران ملیۆن) بە فیڕۆ بدەم، بۆچی؟ تۆ وا بیردەکەیتەوە کە من پێمخۆشە ئەو هەمو پارەیە بدەمە تانک و تۆپ و فڕۆکە؟ تۆ پێتوایە کە من پێمخۆشبێ ئەو هەمو گەنجانەمان بکەمە سەرباز؟ من پێمباشترە ئەو پارەیە لە کشتوکاڵ و پەروەردە خەرج بکرێ. ئەو کارەی من دەیکەم قێزەونە، بەڵام هەر دەشبێ رایبپەڕێنم.»
بنگۆریۆن هەگیز لە دوژمنانی کەم نەبوو. سەرەتا ئینگلیزەکان بوون، ئەوسا عەڕەبەکان، ئەنجا بە بەردەوامی سیاسەتمەدارە دوودڵەکانی وڵاتە زلهێزەکان، دژەزایۆنیزم، کۆمۆنیستەکان، فاشیستەکان، ئەوانەی دژی ئابوریەکی ئاراستەکراو بوون، تالانکەر و قازانجویستەکان، ئۆلدارە توندڕەوەکان، مادییەکان(ماتریالیستەکان) ئیدی لیستەکە دورودرێژە.
ئەو خالی لاوازی هەبوون و هەڵەشی کردوون. بەڵام یەکێک لەو کەسانەی کە زۆرترین رەخنەی لێگرتووە لە کنێستدا(پەڕلەمان) دوای ئەوەی یەک دوو هەڵەو کەتنی گەورەی ئەوی ژماردن گوتی:
«بەڵام لە دواییدا تەنها مەزنە پیاوان هەڵەی مەزن دەکەن.»
نەیارەکانی بە «دڕندە»، «جلەونەگیر(ئەو کەسەی کە کۆنترۆل ناکرێ)» و

«خەونبینەر» یان وێنا دەکرد. کاتێکیش خەونەکانی بهاتبانە دی، ئەوا دەیانگوت کەوا بەختی هەبووە.

یەکێک لە خاڵە لاوازەکانی وەک سەرۆکی حکومەت بێهەستی بوو بەرامبەر وردەکارییەکانی دیپلۆماسیی. هەندێک جاران لەگەڵ دیپلۆماتێک ئەوەندە راشکاوانە دەدوا کە نوێنەرەکانی خۆی بە مانگان کاریان بۆ کردووە و توشی شڵەژانی کردوون.

هەروەها بەوەشی تۆمەتبار دەکەن گوایە برادەرە سیاسیەکانی پایەی حکومەتی بۆ دەدۆزینەوە (کە لە نەتەوە کۆن و گەورەکانیش ئەوە رویداوە)، هەروەها بەوەش کە توشی گرێی مێسیاس (فریادڕەسی) بووە(لە یەکێک لە دوانەکانی دەستەواژەیەکی وای بەکارهێنا، بۆیە ئەو سەرنجەی لەسەردا درا)، هەروەها ئەوەش کە ئەو کات بۆ هەندێ کەسی نادیار بە فیڕۆ دەدا هەر لەبەر ئەوەی کۆنە دۆستی بوونە ئەوانەی سەردەمی بزوتنەوەی زایۆنیزمی.

سەرکردەکانی پالماخیش بەردەوام لۆمەی ئەوەیان کردووە کە سەرکەوتنە سەربازییەکانی ١٩٤٨ ی بە تەواوی نەقۆستۆتەوە. ئەوان مەبەستیان بوو بڵێن کە دەیانتوانی تەواوی فەلەستین رزگار بکەن، گەر هاتبا و گوشارەکەی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئامریکاو ریکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکانی بەلاوە نابا.

بەڵام زۆرینەی رەخنەگرەکانی پێ لەوەدەنێن، هەنوکە گەر داود بنگۆریۆن نەبووبا لەوانە بوو سەربەخۆیی ئیسرائیل نەهاتبا کایە، و زۆریش زەحمەت بوو جێگرەوەیەکی پەیدا کرابا.

نهێنی هێزە راکێشەرەکەی لەوەدا بوو کە مێژوی سێ هەزار ساڵەی جولەکانی بەرجەستە دەکرد، ئەو بە تەواوی لەگەڵ هارمۆنیە جڵەونەکراوەکەی سەردەمی خۆی دەهاتەوە و بیچمێکیش بوو کەبۆ هەموانی شت پێبوو.

جوەکانی یەمەن، دیندارە زۆر ئەرسەدۆکسییەکان کە شارستانێتی رۆژئاوا هیچ کاری تێنەکردبوون و نەیبزواندبوون، لەو پیاوە بیرئازادەی پۆلۆنییە پێشەنگ و نمونەی خۆیان دۆزیبووەوە.

جوێکی ئینگلیزی زۆر پێگەیشتوو وەک مارکوس سییف ددانی بە باڵادەستێتی رۆحیانەتیەکەی ئەو دادەنا.

ئامریکاییەکان، ئەوانەی کە زایۆنیش نەبوون هەندێکیان هەر جولەکەش نەبوون، ئەویان بە یەکێ لە دە بیچمە سەرکردە ناسراوەکانی جیهاندا دەنا، زۆر لە وڵاتان لەلایەن سەرۆکە بچوکەکانیان رابەرایەتیان دەکرا کەچی کەم کەس هەبو بە سەرکردەی راستەقینەیان دابنێ.

# بەشی

# (١٦)

جارێکیان یەکێ لە پیتچنەکان(تایپیستەکان) لە بنگۆریۆنی پرسی:

«ئەرێ هەرگیز تۆ کاتی پشودانت هەیە؟»

لێیپرسیەوە: «مەبەستت خەوتنە؟»

«نەخێر، پشودان.»

«هەنوکە ئەز زۆر دەخوێنمەوە.»

«نەخێر، مەبەستی من بە تەواوی پاڵدانەوە و پشودانە.»

بنگۆریۆن ئاوڕێکی لە کچە شۆخەکە دایەوە و هەروەک بە بوونێکی تێنەگەیشتووی بزانی، ئەوسا گوتی:

«گەر تۆ مەبەستت ئەوە بێ من بە تەواوی بوەستم، لە جوڵە بکەوم و تەماشای دیواران بکەم، نەخێر، من هەرگیز واناکەم.»

بنگۆریۆن لەو دەمانەدا نەوەک هەر سەرەک وەزیران بوو، بەڵکو وەزیری بەرگریش بوو؛ ئەو سەرۆکایەتی هەشتاو دوو بەشی وەزارەتی دەکرد و لە پاڵ ئەوەشدا بیست تا سی کاژێری لە هەفتەدا بۆ خوێندنەو ولێکۆڵینەوە بە هەند هەڵگرتووەکانی تەرخاندەکرد. ڕۆژی ئاسایانەی لە کاژێر حەفتی سپێدەوە دەستپێدەکرد، دوای ئەوەی چوار یان چوار کاژێر و نیو لە خەو هەڵدەستا، چونکە لەوەی زیاتری لەو هەمو ساڵانەدا پێویست نەبوو. پاولا کە لە خەو هەڵدەستا بەرچاییەکی سادەییانەی بۆ ئامادە دەکرد. ئەو کاژێری یەکەم بە ڕۆژنامە بەیانیەکان بەسەردەبرد، ئەوسا کەمێکیشی بۆ نوسینە فەرمییەکان تەرخان دەکرد. ئیدی دوای ئەوە ئاسایی بەپێ بەرەو وەزارەت دەکەوتە ڕێ کە دوو کیلۆمەتر و نیو لە ماڵەکەیەوە دور بوو (وەزارەتی بەرگری گوازرابووەوە ئەپارتمانێکی دوو نهۆمی لە هاکیرای سەر سنوری تەلئەبیب) ئەوسا کات دەبووە کاژێر نۆ و دەچووە پشت مێزەکەی لە نوسینگەکەی. چوار کاژێر و نیو لەگەڵ بەش و هۆبە جۆربەجۆرەکان ڕوبەڕودەبووەوە. کاژێر یەکونیو دەگەڕایەوە ماڵ تا خواردنێکی سوک بخوا و بۆ ماوەی نیو کاژێرێک چاو گەرم بکا؛ پاشان لەسەر ئەو ڕاپۆرتانەی کە لەگەڵ خۆی لەناو هەگبەکەیدا بۆ ماڵەوەی هێنابوونەوە ئیشیدەکرد بۆ سعات چواریش دەگەیشتەوە نوسینگەکەی. ئەوسا کاروبارەکانی سەرەکایەتی ئەنجومەنی وەزیرانی ڕایی دەکردن؛ لەوێ میوانی پایەبەرزی دەدیتن، دیداری لەگەڵ ڕۆژنامەنوساندا ساز دەدا، ڕاوێژی لەگەڵ کارمەندەکاندا دەکرد، قسەی

لەگەڵ دیپلۆماتەکانی دەرەوە دەکرد، دوان و وتاری دەنوسین، هەمو ئەو کارانە دەچونە نێو چوارچێوەی ئەرکەکانی کە ئەنجامی دەدان.

کاژێر هەشت دەگەڕایەوە ماڵەوە، هەمیشە هەگبەکەی بنهەنگڵی پڕ بوو لە نوسراو و راپۆرتەکان لەگەڵ هاوکارێکی کە خوازیاربوو لە ڕێگادا بە یەکەوە هەندێ قسە بکەن دەگەڕایەوە. پاولا تا ئەوکات خواردنی ئێوارەی بۆ ئامادە کردبوو، ئاساییانە بریتی بوو لە پەنیر، نان و کەرەی سوێر و کاهو. هەر کێ میوان بووایە لە ئاشپەزەکە نانی دەخوارد.

ئەوەی لەسەر سفرەی بنگۆریۆن دانیشتبا تێدەگەیشت کە پاولای هاوسەری گۆشتی مانگا و ماسی پێشکەشدەکا، بێئەوەی بنگۆریۆن هەست بە جیاوازییەکانیان بکا. گەر چاوی لێنەبێ ئەوا ئەو هەر هیچی نە دەخوارد. چاکەی مانەوە و لەشساخی بنگۆریۆن بۆ هاوسەرەکەی دەگەڕێتەوە کە مشوری تەواوی دەخوارد.

ساڵانێکی دورودرێژ بوو بنگۆریۆن لەسەر رێسایەکی جێگیر دەڕۆیشت، هەروەها کە بووە سەرەک وەزیرانیش هەر لەسەری دەڕۆیشت بەوەی میوانەکانیش نۆرەی قاپشوشتنیان بەردەکەوت. گەر هاتبا و ئێوارە دەرەنگ بووایەو زۆر بە پەلەی نان دەخوارد، هەرچەندە گەر میوانیشی هەبووایە، ئەوسا هەڵدەستا قاپەکەی خۆی دەشوشت و بە دڵەراوکێوە دەوەستا تا ئەوانی دیکەش خواردنەکەیان تەواکردبا. گەر هاتبا و میوانەکەش هەر سوربا لەسەر قاپشوشتن، ئەوا دەکرا هاوکارییان بکا. بە کردەوە هەمو هاوڵاتیە پێشچاوەکانی ئیسرائیل لە ئاشپەزەکەی بنگۆریۆندا یارمەتی قاپشوشتنیان داوە.

دوای ژەمی رۆژئاوا و بە ڕێکردنی میوانەکانی گەر هەبوبان، بنگۆریۆن تا نیوەی شەو کاری لەسەر کاروبارە فەرمیەکەی دەوڵەت دەکرد. پاشان بۆ ئەو باشترین کات دەهات ؛ ئەویش ئەو کاژێرانە بوو کە دەکەوتە نێوان دوانزەی نیوە شەو تا دوو سێی دوای نیوەی شەو. لەسەر جێگای پاڵی بە بالیفەکانی دەدایەوە و گڵۆپەکەی لە ژور سەر هەڵدەکرد و دەستی بە خوێندنەوە دەکرد، خوێندنەوەیەکی ئاساییانە دەربارەی رەهەندێکی فەلسەفی کە لەو دەمانە پێیخۆش بوو، سەرنجی رادەکێشا. بۆ ئەو ئەو چەند کاژێرانە پشودانی رۆحیانەی بوو، ئەو چەند کاژیرانەی بۆ وەک نوستن باش لێدەهاتن.

ماڵی بنگۆریۆن لە بەشی باکوری تەلئەبیبەوە نزیکەی هەشتسەد مەتر لە زێوە دوور بوو. خانویەکی دونهۆمی بوو، خانوەکە لە سەد خانوە رەسەنەکەی دەوروبەری تەنها بەو جێئێشکگرەی دارینەی پێشەوەی کە دەوڵەت بۆی دروستکردبوو، جیادەکرایەوە. لە ماوەی جەنگدا جامی پەنجەرەکانی نهۆمی یەکەم بۆ خۆپارێزی لە بۆمب و ساچمەکانی توند گیرابوون. لە نهۆمی یەکەمدا ژورێکی دانیشتن، ژورێکی خواردن، کتێبخانەیەکی بچوک، کە تیایدا دوو لادیواری پڕ کتێب بوون لەگەڵ ژورێکی پاولادا؛ لە نهۆمی دوهەمیشدا چوار ژور هەبوون، کە سیانیان هەر لە زەویەکەوەوە تا بنمیچ پڕی کتێب بوون، لانیکەم چوار هەزار کتێب دەبوون، چونکە بنگۆریۆن خاوەن باشترین کتێبخانەی تایبەتی بوو لە رۆژهەڵاتی ناویندا. تەنها سەبارەت بە فەلسەفەی

هیندی سەدان کتێبی هەبوون. لە گەورەترین سێ ژورەکاندا مێزی نوسینگەی بنگۆریۆنی لێبوو؛ لە ژورەکەدا نەخشەی گۆی زەویش هەبوو. لە ژورەکەی تەنیشتیدا چەند کورسیەک داندرابوون. لەوێ هەندێ جاران پێشوازی لە ناسیاوە باش و دیپلۆماتەکان دەکرد. بەدەر لەوە سادەیی باڵی بەسەر مۆبیلیاتی ژوری نوستنەکەیدا کێشابوو.

لە زستاندا زۆر لە پیاوان لە ئیسرائیلدا پاڵتۆ لەبەر دەکەن، ئیدی پلەی گەرما دادەبەزێت دەوروبەری بەستن و لە زۆربەی خانوە نوێکانیش گەرمی مەڵبەندیی (شۆفاژ) دادەگیرسێ. ساڵانێکی دورودرێژ تاکە گەرمیە ناوەندییەکەی بنگۆریۆن بریتیبوو لە سۆپایەکی کۆنینەی نەوت.

رۆژێکیان نێردەی ئامریکا ماکدۆنالد هاتە لای کە بانگێشتی چێشت کرابوو، پاولا فانیلەیەک و پالتۆڵیکی ئەستوری درێژی لەبەردابوو. سۆپا نەوتیەکەیان داگیرساند تاکو پلەی گەرمی ژوری نانخواردن لە رادەی پلەی گەرمای بەفرگرەکەیان بەرزتربکەنەوە، دوای نانخواردنیش سەرەک وەزیران و نێردە ئامریکاییەکە خۆیان رێک هەڵێنابوو دەستەکانیان هەڵدەگلۆفتن و باسی کێشەگەلی جدیانەیان دەکردن.

لە بۆنەیەکی دیکەدا ماکدۆنالد ئێوارەیەکی زوو چووە لای بنگۆریۆن تا سەبارەت بە پرسێک راوێژی لەگەڵدا بکا. پاولا دەرگەی لێکردەوە پێیگوت:

«ئەو لەسەرەوە ئیشدەکا. برۆ سەرەوە لای ئەو.»

کە چوە ژوری سەرەوە بنگۆریۆنی لەناو جێگەدا بینی، سێ چوار لێفی بەخۆدادابوون خەریکی واژۆکردنی نوسینە فەرمییەکانی بوو.

لە بنەوەی چاویلەکەکەیەوە نیگایەکی برِیە سەر میوانەکەی و گوتی:

«من ئەو بژارەم هەیە یان لە خوارەوە بمبەستێ یان لێرە لەبن لێفەکاندا گەرم ببمەوە.»

ژورەکەی وەزارەتی لەو سەردەمانەدا زۆر سادەییانە مۆبێلرێژ کرابوو. لە نوسینگەکەیدا ئامێرێکی کۆنی گۆڕینی هەوا هەبوو، کە بۆ ئەو زۆر پێویست بوو. هەر کاتێ نوسراوێکی چاپکراو یان بەدەست نوسراوی بەدەستکەوتبا زۆر لای گرنگ بووبایە، ئەوا دوو کونی تێدەکردن و لە دۆسیەکدا هەڵیدەگرتن کە دەستی کەسی دیکەی نەدەگەیشتێ.

ئەو بروسکانەی وەزارەتی کاروباری دەرەوە کە حەزی کردبا هەڵیان بگرێ، هەمیشە لەسەری دەنوسین: «بۆ ب.گ(B.G پیتە یەکەمەکانی ناوە لێکدراوەکەی بوو- وەرگێڕ) دەگەڕێنەوە»، دواتر کە ژمارەیەک خڕ دەبوونەوە لە دۆسیەکەی هەڵدەچنین.

لە دوا رۆژی هەر مانگێکدا، پێش کاژێر هەشتی دوای ئێوارە بنگۆریۆن لەسەر دیوی دەرەوەی دۆسیەکەی ناوی مانگ و ساڵ دەنوسی و نیشانەی دەکرد، ئیدی بە لەخۆڕازیبوونەوە هەڵدەستاو دەڕۆیشت چونکە کاری ئەرشیفیانەشی بەباشی بەجێگەیاندووە.

جارێکیان بە یاریدەرێکی خۆی گوت:

«ئاوەها، کاتی هاتوە سەرلەنوێ دەستپێبکەینەوە.»
دۆسیەی مانگی پێشو شوێنێکی جێگیری لەنێو هەگبەکەیدا هەبوو، بەهەر کوێش ڕۆیشتبا لەگەڵ خۆیدا دەبرد.
وەک وەزیری بەرگری بنگۆریۆن ئەفسەرێکی سەربازی وەک سکرتێر و لەپایەی سەرۆکی حکومەتیشدا سەرۆکی ستافەکانی تیددی کۆللێک Teddy Kollek بوو. کۆللێک لە کیبۆتێکی سەر گۆلی گالیلیا گەورە بووە. بۆ کاروباری پەیوەندییە گشتییەکانیشPublic Relations موشی پیرلمان Moshe Pearlman (ئینگکلیزناسێکی ڕۆژنامەنوس، نوسەری زۆر لە کتێب ونامیلکەکان) ڕاوێژکار بوو، سکرتێری تایبەتیشی یەکەمجار ئێلکانا گالی Elkana Gali( ئەویش لە سەر گۆلی گالیلیا پەروەردە ببوو دواتر لە وەزارەتی کاروباری دەرەوەدا کاری دەکرد) بوو؛ بەدەر لەو کەسانەی سەرو دوو بەردەستی نوسینگەکەشی لەگەڵ ستێنۆگرافێک ( ئەو کەسەیە کە خیرا دەنوسێ کە لە دوان و نوسینەکانیدا یارمەتی دەدا لەگەڵ پیتچنێک(تایپیستێک) هەبوون.
لەو هەمو کەسە گەنجانەیدا بنگۆریۆن داوای مەیلی خۆبەخشانە(خۆقوربانیکردن) ی لێدەکردن، ئەوانیش یەکیان زۆر و ئەویدیکەش کەم دەیانکرد.
سکرتێرە سەربازییانەکەی کە بۆ هەموان نمونەی سەرنجڕاکێشانی دەنواند Lietenant–Colonel (پلەی سەربازی موقەددەم کە پلەیەک لەخوار کۆلۆنێلەوەیە) ناحێمیا ئارگۆڤ Nahemia Argov بیستوهەشت ساڵ لە بنگۆریۆن گەنجتر بوو. ئەو نیمچە سابرایەک بوو، چونکە زارۆکیکی بچوک بوو کە لە وڵاتێکی ئەودیو دەریای ڕۆژهەڵاتەوە هاتبووە فەلەستین. ئەو لە ئاین گێڤ Ein Gev گەورەببوو وەک لاوێکیش ژنی هێنابوو بەڵام دوایی لە خێزانەکەی جودا ببووەوە، باسی جیابوونەوەکەشی لەو هەمو ساڵانەدا تەنها یەکجار لەگەڵ بنگۆریۆن و کارمەندەکانی دیکەیدا باسکردووە.
ناوبراو وەک سکرتێری سەربازیانەی سەرەک وەزیران لەلایەن دۆستروۆڤسکی جێگرەوەی سوپاسالارەوە ڕەوانەی لای ئەو کرابو، چونکە نەحێمیا ئارگۆڤ کە دە ساڵ لە ڕاژەی هاگانا بووە یاردیدەدەری زۆرینەی ئەفسەرەکان بووە دواییش هی دۆستروۆڤسکی خۆی. مانگێک پێش هێرشی عەرەبەکان لە ١٩٤٨دا ئارگۆڤ خرایە ریزی ستافەکەی بنگۆریۆن.
ئارگۆڤ تەنها ١,٦٩ سانتیمەتر بوو، هەروەک سەرەک وەزیران باڵا کورت بوو. بەڵام پرچە ڕەشەکەی ڕێک دەهاتەوە لەگەڵ پرچە سپیە لە گڕوزەکەی سەرەک وەزیران. ئەو دەموچاوێکی گۆشەییانەی لەگەڵ کەپوێکی پنتپنت و چاوێکی قوڵبینانەی هەبوو. بە دەگمەن پێدەکەنی. لە جەستەدا لاواز بەڵام ژێدار بوو. گەر لە شوێنێک چاوەڕوانی سەرۆکەی کردبا، هەمو سەرقاڵی کاتەکەی بۆ ئاگایی دەرگا تەرخاندەکرد.
هەرزو هەمو کەسێک لە ئیسرائیل زانیان کە چەند باش لە ڕاژەی بنگۆریۆن دایە. گەر سەرەک وەزیران تا درەنگانێک کاریبکردبا ئەوا ئەندامانی ستافەکەی لەگەڵ یەک پێدەکەنین و نوکتەیان دەگێڕایەوە بەیەکەوە دادەنیشتن و لەخۆیان دەپرسی ئاخۆ بۆچی نەچن سەیری فیلمێک بکەن و دەیانگوت ، «گەر بنگۆریۆن دوامان نەخا»، ئیدی

ئارگۆڤ بەگرژی و دەمارگیریەوە دەهاتودەچوو. دوای ئەوەی بۆیدەردەکەوت کە بنگۆریۆن بەبێ وەی گەیوەتە ماڵ، جاربەجار لەگەڵ برادەرەکانی دەچووە سینەما، بەڵام زۆرجاران لەنیوەی فیلمەکەدا داوای لێبوردنی دەکرد: «بمبورن، بەڵام من لەخەمی (ب.گ) دام. من هەردەبێ برۆم تەماشاکەم ئاخۆ هەمو شتێک لەجێی خۆیدایە.»

لە چۆنێتی یاریدەریدا ببوە ئەڵقەیەکی بەیەکەوە بەستنەوەی (ب.گ) و لەشکر. بێجگە لەوەش فەرماندەیی دەستەی پاسەوانانی بوو، بیست و چوار کاژێری رۆژ و شەو لە مشورخواردنی ئاسایشی کەسایەتی سەرۆک وەزیراندا بوو. زۆر عەرەب لە وڵات دەژیان، سنورەکان لەیەک نزیک بوون، هێرشی ناپاکانەی ئاسمان هەمو دەم ئەگەرێکی لە پێشبوو لە رۆژهەڵاتی ناویندا، هەروەها ناوچەکەش شوێنگەی تیرۆرستان بوو کە لە لە ناوبرنی تاکەکاندا وەستا بوون، بۆیە ئارگۆڤ بەردەوام لەسەر پێ بوو. بەڵام ئەو لەو ئەرکەی زیاتر دەکرد کە لێی چاوەڕوان دەکرا. خۆبەخشینەکەی ئەوەندە گەورەبوو، لە دواییدا خەریک بوو وەک خزمەتکارێکی کەسی لێبێ، کە پەرداخە ئاو بۆ سەرۆک وەزیران لە کاتی لەسەر سەکۆ وەستانی کەنیست بۆ دابنێ، کە دوای نیوەڕۆوانیش ئیستکانە چایەکی بۆ ئامادە بکا و وەک خزمەتکارێکی ماڵەوەش جلەکانی بۆ دابوەشێنێ.

ئارگۆڤ زۆر قینی لە ناونیشانی «یاریدەدەر» (مەبەست یاریدەدەری ئەفسەر-وەرگێڕ) بوو، کە لە رۆژنامەکانیشدا بەو ناوە ناویان دەهێنا، بەردەوام زەنگی بۆ سەرنوسەرەکەیان لێدەدا تا بڵێ: «تۆ دەبێ ئەوە بە هەند هەڵبگری کەمن سکرتێری سەربازییانەی جەنابی سەرەک وەزیرانم.»

ئەو خۆتەرخانکردنەی بۆ سەرۆک وەزیران بەشێکی بەوە پاداشتی دەدرایەوە کە بەرەبەرە کاریگەری گەورەی پەیدا دەکرد. ئەو زیاتر لە ئەڵقە پەیوەندییەک تەماشادەکرا. گەر یەکێک بیویستبا لەگەڵ سەرەک وەزیراندا بدوێ، دەبووایە ئەو پەسەندی بکردبایە، خۆگەر «نەخێر نابێ» شی گوتبا، ئەوا هیچی لەگەڵدا نەدەکرا.

ئارگۆڤ ئەوەی پەیوەندی بە بنگۆریۆنەوە هەبووایە پەرەی بە هەستی شەشەمی خۆی دا. ئەو گەیشتە رادەیەک لە خۆیەوە بزانێ ئاخۆ بنگۆریۆن چۆن کاردانەوەی لە بەرامبەر کەسەکان، تێبینییەکان و روداوەکاندا دەبێ. گەر گومانی لەوەدا هەبووایە کە بنگۆریۆن کەیفی بە چارەی کەسێک نایەت، ئەوا ئەویش رکی لێدەبووەوە.

ئارگۆڤ لێبڕاوانە کەسایەتییەک بوو، بەڵام بە تێپەڕبوونی رۆژگار بووە سایەی سەرەک وەزیران. هەندێک جاران بە چەند هەنگاوێک لە دوای بنگۆریۆنەوە دەڕۆیشت، هەروەک ئەوەی سێبەرەکەی بێ. ئەو باری هەمەلایەنی سەرۆکەکەی لەخۆگرتبوو تا دواتر بووە سەدای ئەو. بنگۆریۆن هیچ خولیاو ئارەزوییکی نەبوو، بۆیە ئارگۆڤیش رێگەی بەخۆی نەدا لەو شتانەی هەبێ. بنگۆریۆن حەزی لە جلوبەرگ نەبوو ئارگۆڤیش بەهەمان شێوە. گەر بنگۆریۆن قۆپچەی سەروی کراسەکەی بکردبایەوە ئەوا یەکەمین شوێنپێهەڵگر ئارگۆڤ بوو.

بنگۆریۆن وردبینی خۆی بۆ یەک ئامانج تەرخان دەکرد، ئارگۆڤیش هەمو وزەی

خۆی بەرەو یەک ئاراستە دادەنا: ئەویش رازیکردنی سەرۆکەکەی بوو. هەمو کەسێک گەر هاتبا و مشوری پیرەمێردەکەی نەخواردبا دەکرا پێی پێبکەنێ و بە شاشی لێیتێبگا. ئەو شتەی ئەو بە شێوەیەک لە شێوەکان لەگەڵ بنگۆریۆن نەیتوانیبا باس بکا، بە هەندی هەڵندەگرت و گوێی پێنەدەدا.

لە سەرەتاوە ئارگۆڤ بە ئەنقەست لاسایی ئاماژە و شێوە قسەی کەسایەتی سەرۆکەکەی دەکردەوە. بەڵام دوای بەتێپەڕبوونی رۆژان نەیدەزانی ئاخۆ بە ئەنقەست لاسایی کردنەوە یان بە تەواوی خوی پێوە گرتووە.

ئەو لەمەیاندا بەهۆی ئێرەییەوە سەرکێش نەدەکرا. ئارگۆڤ هەولۆتەقەللای نە بۆ دەوڵەمەندی، نە بۆ ناو و ناوبانگ نەبوو. ئەو موچەیەکی زۆری نەبوو دەبوایە زۆر ئیشبکا.

ئەو تەنها ئێرەیی بە کەسێک دەبرد کە سالانێکە کۆچی دوایی کردووە. ئەوەی باش دەزانی کە برادەرایەتیەکی گەرم لە نێوان هەردوکیان بێرل کاتزێنسلۆن و سەرۆکەکەیدا هەبوو. جارێکیان لەلای دۆستێکی لە تەلئەبیبدا سکالای ئەوەیکرد کە ئەو هەرگیز لە بواری روناکبیرییدا کۆمەکی پێناکرێ.

پاش ساڵە یەکەمەکانی دوای جاڕدانی سەربەخۆیی چەند جاران لەسەر یەک بنگۆریۆن سکرتێرە کەسییەکانی خۆی گۆڕیون، بەڵام ئەوە بۆ هەموان ئاشکرا بوو کە ئارگۆڤ هەر لە شوێن خۆی دەمێنێتەوە.

زۆر رونکردنەوە هەبوون سەبارەت بەو گرنگیدانەی پیرەمێرد بە گەنجەکە. یەکێکیان ئەوەبوو کە بنگۆریۆن لە کەسی ئارگۆڤدا نمونەی گەنجێکی سەرمەشق دەبینێ.

هەروەها ئەوەشیان دەگوت کە بنگۆریۆن ئەوکوڕە قۆزە دەستپێکەیە کە لە گالیلیا هاتوە بەو خەسڵەتە دڵسۆزانەییەی خۆبەخشینەی نمونەی کەسێکی ئیسرائیلی ئایندەی دەبینێ کە حەقە هەمویان وەک ئەو بن و منداڵەکانی ئیسرائیلی ئازاد وەک ئەو پەروەردە وگۆش بکرێن.

باقی ئەندامانی ستافەکەی دەیانزانی کە بنگۆریۆن هەندێ قسە بۆ ئارگۆڤ دەکا لەگەڵ ئەوانی دیکەدا نایکا، تەنانەت لەگەڵ پاولاشدا باسیان ناکا. ئەوەش پەیوەندییەکەی یەک لایەنە بوو. لەو کاتەی بنگۆریۆن دەدوا ئارگۆڤ گوێیلێدەگرت و هەرگیزیش قسەی لە قسە نەداوەتەوە، بنگۆریۆن ئارگۆڤی وەک تاقیگەیەکی دەنگ بەکاردەهێنا. بنگۆریۆن زۆر بە جدی بیری لێدەکردەوە.

گەنجەکە وەک بیچمێک شوێنپێهەڵگری سەرۆکەکەی بوو تەنانەت هەندێ جارانیش بە دەقاودەقی کۆپیەکی ئەوبوو، نەخاسمە کە گوێی بۆ رادەگرت ئیدی پێشبینی و کاریگەری قسەکانی لەسەر دەمو چاوی ئارگۆڤی شاگردا بەدەردەکەوتن.

لەبەر ئەوەی ئیسرائیل وڵاتیکی بچوک بوو، خەڵکی یەکدیان دەناسی، لە ماوەی شەڕیش لەگەڵ عەرەبان و روداوەکانی سەرسنور زۆر قسەوباس لەسەر ئارگۆڤ دەکران.

زایۆنیستە دێرینەکان و روناکبیران لە نێویاندا سەرکردەکانی بزوتنەوەی

سەندیکاکان هەستیان بە سوکایەتی دەکرد کاتێ دەیاندی یاریدەدەرێکی سەربازی بە چاوتروکانێک ناوی لەگەڵ ناودارێکی وەک کاتزێنسلۆن بێ، ئەوەیان پێ هەرسنەدەکرا کە ئەو برادەرایەتیە لە نێوان ئەفسەرە گەنجێکی سوپا و سەرکردە بە ساڵاداچووەکەی کرێکاران هەبوو. ئارگۆڤ و کاتزێنسلۆن هیچیان بە یەک نەدەچوو، بەڵام هەردووکیان دوو برادەرە تاقانە و نەوازەکەی بوون کە بنگۆریۆن لە ژیاندا هەیبوون، ئەوان ئەو کەسانە بوون کە بنگۆریۆن بڕواو متمانەی پێبوون، هەریەکێکیش بەهۆیەکی جیاوازەوە هۆی بە هەند هەڵگرتنی بڕواپێکردنی بوو.

ڕەنگبێ ئارگۆڤ لەبن کاریگەریی هاوناوە بابلیانەکەی پیشخۆی بێ. نەحێمای ڕەسەن بیست و چوار سەدە پێشتر ساقی پاشا بووە؛ مۆدێرنەکەش ئیستکانی چای بۆ سەرەک وەزیران دادەنا. نەحیمای کۆن ئێشکی لە باڵەخانەی پاشا دەگرت و لە مەترسیەکانی دەپاراست. نەحیمای ئێستاش دوای سەدەی زۆروزەوەند بە هەمان شێوە سەرۆکی دەوڵەتێک دەپارێزێ. نەحیمای بابیل سۆشیالیست بوو، لە بەرامبەر تاڵانکەران داکۆکی لە هەژارو نەدارن دەکرد، لە ڕۆژگارێکدا بانگەشەی بۆ زمانی عیبرییانە دەکرد گەلەکەی بە زمانێکی دیکەدا دەئاخاوت، ئەو بە قەڵەمێکی ڕەوان دەینوسی. نەحیمای بابیل لە وڵاتێکی دورەوە هاتبووە فەلەستین، ئەو ئۆرشەلیمی نۆژەنکردەوە تەکانێکی بەهێزی دایە شەپۆلی بە خوڕی گەڕانەوەی کۆچبەران. ڕەنبگێ دایک و باوکی ئارگۆڤ جارێک خەونێکی وایان دیبی کە کوڕەکەیان ببێتە نەحیمای سەدەی بیستەم. لەو گۆشەنیگاوە ئەو بەپێی شتە ڕەچاوکراوەکان نەهاتەوە. وەلێ ئەو بە هەمو تواناوە خزمەتی پیاوێکی دەکرد کە گەیشتە ئەو پایەی باسکرا، ئەو پیاوەی زۆر خاڵی لەیەکچوونی لەگەڵ نەحیمای بابیلدا هەبوو.

بنگۆپریۆن لەسەر ئەوە ڕاهاتبوو هەمو کارمەندە گەنجەکانی بە پێشناوی خۆیانەوە بانگ بکا، هەروەها نەحێمیاش. دەشیەویست ئەویش هەر بە ناوی خۆی «بنگۆریۆن؛ بانگبکرێ. ئەوەش شتێکی زەحمەت بوو بۆ ئەندامانی ستافەکەی، تاپیستە لاوەکە زۆر جاران بە شاشی دەیگوت «جەنابی بنگۆریۆن». گەر کچەکە وایکردبا، ئەویش بە تۆنە دەنگێکی تەوسدارییەوە پێیدەگوتەوە: «بەڵی مینا Mina خان؟»

سکرتێرێکی گەنج لە یەکەمین ڕۆژی ئەرکەکەیدا ئەو هەڵەیەی کرد و پێیگوت «جەنابی پایەبەرز Excellentie».

سەرەک وەزیران یەکسەر قسەی پێبڕێ: ئەز بە پێشناوی خۆتەوە بانگت دەکەم، تۆش من بە بنگۆریۆن ناوبێنە.»

کاتێ جارێکی دیکە گەنجەکە هەمان شاشی دوبارە کردەوە و بە «جەنابی پایەبەرز» بانگی کردەوە» بنگۆریۆنیش لە کاردانەوەدا پێیگوت «بەڵی جەنابی خاوەنشکۆ؟»

کاتێکیش خانم روس هاڤیلیۆ Ruth Havilio یەکێک لە کارمەندەکانی دوای وەرگرتنی لە کارەکەیدا لە ژورەکەیدا لە چاوەڕوانیدا بوو، بنگۆریۆن هاتەژورەوە. دەستبەجێ خانمەکە لە سەرۆک وەزیران چووە پێشەوەو بانگی کرد: شڤی Shvi (دانیشە).

لەو کاتەی هێشتا دودڵ بوو بنگۆریۆن بە خەندەوە چاوێکی لە ئارگۆڤ کرد،

ئەنجا گوتی:

«ئەوە سەربازێکە، منیش فەرماندەکەیم، کەواتە من دەتوانم فەرمانی پێبکەم کە دابنیشێ. بەڵام من دەبێ بە رێزگرتنەوە داوا لە تۆ بکەم.»

رۆژێکیان بنگۆریۆن بانگی خانم هاڤلیۆی کردە ژورەکەی تا لێی بپرسێ ئاخۆ هیچ ئەندامێکی کابینەکەی هاتووە.

کارمەندە کچەکە وەڵامی دایەوە: «بەڵێ وەزیرەکە دوێنی لێرە بوو.»

بنگۆریۆن لێیپرسی:

«بۆچی دەڵێی» وەزیرەکە»؟ تۆ دەربارەی پیاوێک قسە دەکەی. ئیدی بەناوی خۆیەوە ناوی بهێنە.»

هاڤلیۆخان ئەو رۆژە بە دەنگێکی راپەڕیوانە گوتی:

«بەڵام لە ڕاستیدا ئەو وەزیرە، وانیە؟»

چاوەکانی بنگۆریۆن پێکەنین.

«ناوی باوکت چییە؟»

«نسیم Nissim»

«تۆش کەواتە روس Ruthی، کیژی نسیمی. ئایا وانیە؟»

«بەڵێ»

«بەڵام ئایا پێویستە ئێستا کە هەر جارێک بمەوێ پرسیارێکت لێبکەم، وات ناوبێنم روسی کچی نەسیم؟»

کاتێک کارمەندێکی نوێ هاتبایە، هاڤیلۆخان و سکرتێری تایبەتی دەسکەگوڵێکیان دەکڕی و لەسەر مێزی نوسینگەی کارمەندە نوێکەیان دادەنا و کارتێکیشی لەگەڵدا بوو لەسەر نوسرابوو:

«لەلایەن سکرتێری تایبەتی سەرەک وەزیران پێشکەشکراوە.»

بۆ ئەوەی زیاتر بیکەسێنن پێشناوی خۆشیان لەبندا دەنوسی. بنگۆریۆن بە نوسینگەکەدا چو، گوڵەکانی دیتن و نوسینی سەر کارتەکەشی خوێندەوە، ئەنجا پرسی:

«ئەرێ ناوی من لەکوێیە؟»

هالیڤاخان وەڵامی دایەوە: «تۆ سەرەک وەزیرانی».

«مەبەستت لەوەدا چییە، کەمن سەرەک وەزیران بم؟ ئایا هەرگیز ئەوە فێر نەبووی کە هاوکارایەتی چۆنە؟»

« بەڵێ ، من ئەوەش فێر بووم کە سەرەک وەزیرایەتیی چۆنە؟»

بنگۆریۆن بە توندی بەرسڤی دایەوە: «سەرەک وەزیران، ئەرکە نەوەک کەس. دوای تێپەڕینی کات یەکێکی دیکە دەبێتە سەرەک وەزیران. بەڵام من پیاوم!» ئیدی قەڵەمێکی دەستدایە و لە بن کارتەکە ناوی خۆی نوسی، کە بەدەگمەن بوو بنوسێ «داود». ئەو هەرگیز بەو ناوە بانگ نەدەکرا.

لەسکرتاریەتەکەیدا شێوازێکی سادە پەیڕەودەکرا. هاڤیلۆخان و یاریدەدەرەکەی تەماشای پۆستیان دەکرد هەمو نامە گرنگەکان و نامە کەسییەکانیان دەخستە

سەرمێزی بنگۆریۆن. ئەوانی دیکەیان بەخۆیان وەڵامیان دەدانەوە. کەمێک دوای جاڕدانی سەربەخۆیی هەندێک جاران وا دەردەکەوت کە زیاتر لە نیوەی دانیشتوانی ئیسرائیل پێویستیان بەوە بووە سکاڵا یان داوایان بۆ بنگۆریۆن بەرز بکەنەوەو و ئەویش بەکەسیی خۆی وەڵامیان بداتەوە.

نامەکان بەلێشاو دەهاتن- لە پیاوێک کەزیانی بەهۆی دزەکردنی بۆڕی ئاو لێکەتبوو، هی خانمێک کە مێردەکەی لەلا تۆراوە و ڕۆیشتووە، هی ئەو کەسانەی کە دەیانەویست بە سەرەک وەزیران بڵێن کە چۆن پێوستە وڵات بەڕێوەببرێ، بێژمار لەو نامانە کە دەبوایە خاوەنەکانیان ڕەوانەی وەزارەتەکانیان بکربایە نەوەک خودی سەرەک وەزیران. ئەوەش زۆر لەسەر بنگۆریۆن دەکەوت تا وەڵامی هەمویان بداتەوە، هەر بۆیە ستافەکەی وایان دەکردو بە ناوی «سکرتێری تایبەتی سەرەک وەزیران» واژۆیان دەکرد. ئەو سیستمە زۆرباش کاری خۆیدەکرد، گەرهاتباو خودی سەرەک وەزیران نامەکانی لەسەر مێزی هاڤیلۆ هەڵنەگرتبان تا بەخۆی وەڵامیان بدابایەوە. هەمو نامەیەک بەلای ئەوەوە گرنگ بوو، مایەی پەرۆشی ئەو بوو کەنەیدەتوانی یەکەبەیەکەیان بخوێنێتەوە.

کەمێک دوای جاڕنامەی سەربەخۆیی نامەیەک لە سێ عەرەبی رەوەندی دروزەوە هاتبوو. نوسیبوویان کە ئێستا دەوڵەت دامەزراوە، دەیانەوێ کارێکیان دەستکەوێ. بنگۆریۆن نامەکەی لەسەر مێزی هیڤیلۆخاندا بینی لەگەڵ خۆیدا برد. لەو ڕۆژەدا زەنگی دورودرێژی بۆ کارمەندانی وەزارەتەکان لێدا تا کارێکی شیاو بۆ ئەو بێکارانە بدۆزێتەوە.

ئـەوەش بیرۆکەیەکی وایخستە مێشکی ستافەکەیەوە، گـەر نامەیەک هـات و بنگۆریۆن حەزی لێبوو بیبینێ، ئەوا لەسەرەوی مێزەکەی هاڤیلۆخاندا دابنرێ، چونکە دەرفەتێکی باش دەبێ بنگۆریۆن بیبینێ و بیبیا. کارمەندەکانی فێڵێکی دیکەشیان دۆزیبووەوە، بەوەی گەر نامەیەک بە پەلە بێ و بیانەوێ سەرنجی بنگۆریۆنی بۆ ڕابکێشن؛ دەیانخستە نێو ڕوپەڕەکانی ئەو کتێبنامە نوێیەی کە ناونیشانی کتێبە چاپکراوە تازەکانی تێدا بوو، ئەویش لەگەڵ پۆستدا دەهات.

گەر بنگۆریۆن خەمی لەهەلومەرجێکی سیاسیانە بخواردبایە، ئەوا کارمەندەکانی بەوە هەستیان پێدەکرد کە عەوداڵی کتێبان دەبوو. ئیدی بە دەستە کتێبێکی بنهەنگڵی دەهاتە ژورەکە و بانگی دەکرد:»

«ئەوانە ئەو کتێبانە بوون کە هەفتەیەک بەر لە ئێستا داوام کردبوون، هەنوکەش نا؟»

بـنگۆریـۆن خـودی خـۆی بروسـکـە کـۆدەدارەکـانـی نـێردە دیپلۆماتەکانی دەخوێندنەوە.

هەرچەندە بەسەر حەفت زمانانیشدا زاڵبوو، هەرگیز نامەکانی پێنەدەنوسسینەوە. ئەو دەفتەرێکی تێبینی بەکاردەهێنا کە بە قەڵەمدارێک بە زمانی عیبرییانە وەڵام دەدانەوە، ئەوسا لاپەڕەکەی لێدەکردەوە و دەیدایە پیتچنەکە.

ئەو شێوازێکی ئاسانی لە نامەکانیدا پەیڕەودەکرد، تا بکرابا وشە و ڕستەی

ئالۆزوبلۆزی بەکار نەدەهێنا. بەهەر زمانێک وەڵامی نامەکەی بۆ چووبا، ئەو بەعیبری دەینوسییەوە. سکرتاریەکەی نامەکانیان وەردەگێڕانە سەر زمانی مەبەست. بەڵام بەخۆی بەسەر وەرگێڕانەکەدا دەچووەوە راستی دەکردنەوە.

رۆژێکیان نوسەرێکی ئینگلیز کە بە شێوە داڕشتنەکەی ناسراو بوو، لە نوسینگەکەی پەیدا بوو، رێک لەوکاتەدا هاڤیلیۆخان دەستنوسێکی پێبوو کە دەبوایە بەئینگلیزی چاپکرابا و رەوانە کرابا. هاڤیلیۆ نوسینەکەی دایە دەست ئینگلیزەکە و بەڕێزەوە داوایلیکرد چاوێکی پێدا بخشێنی و «کەمێکی بڕازێنێتەوە». ئەویش بەڕێزەوە دواکەی پەسەند کرد و لەهەمو رویەکەوە راستی کردنەوە.

ئەو ئێوارەیە بنگۆریۆن نامەکەی لە دەستدا بوو هاتە لای هاڤیلیۆ.

«کێ ئەو نوسینەی وەرگێڕاوە؟»

هاڤیلیۆخان سەروبەری پرسەکەی بۆ گێڕایەوە.

بنگۆریۆن گوتی: «بەڕاستی نوسینەکە زۆر جوانە، بەڵام ئەو لێرەدا قسەدەکا نەوەک من. جارێکی دیکە بە شێوازەکەی خۆم وەریبگێڕەوە.»

سەرەک وەزیران دوان و وتارەکانی لەسەر کارتێکی ٧,٥ بە ١٢,٥ سانتیمەتر دەنوسیەوە، بەدەگمەنیش وابوو ژمارەبەندییان بکا، ئیدی زۆرجاران بۆ پیتچنەکان دەبووە مایەی کارەسات و دەبووایە زۆر لەهەڵەکانیان بسڕنەوە.

ئەو هەمو دوانێکی وا بەسەروبەر دەنوسیەوە وەک ئەوەی یەکەمین دوان یان دوا دوانی بێ، هەروەک ئەوەی گرنگترین بەڵگەوبەندی کارنامەکەی بێ. ئەو بەسەر هەمو راستی و تێهەڵکیشەکانیشدا دەچووەوە، دەبووایە هەرچی تێیدا هاتوە بیسەلمێنی.

ئەوەی وتارێکی وای نوسیبایە هێرشی بکردبایە سەر کۆنسێپتەکەی بنگۆریۆن بۆ زایۆنیزمی نوێ، رۆژێک هەر روبەڕوی ئەوە دەبووەوە کە وەڵامیکی لەبەر دەستدایە لە سەرەک وەزیرانی ئیسڕائیلەوە نوسراوە.

جولەکەیەکی نەناسراوی لۆس ئەنجلز ساڵێک دواتر نامەیەکی بۆ بنگۆریۆن نوسیبوو پرسی ئەوەی لێکردبوو ئاخۆ لەسەر زایۆنستەکانی ئامریکا ئەرکە بەرەو ئیسڕائیل کۆچ بکەن. نامەو نامەکاری نێوانیان سێ مانگ و نیوی خایاند تا لێیوەستان.

ئەو نوسەرانەی کە دەرفەتیان نەبوو وتارەکانیان بۆ چاپبکرێ، زۆرجاران نامەونامەکاریان لەگەڵ بنگۆریۆندا دەقۆستەوە و بە گۆڤارەکانیان دەفرۆشتنەوە.

بۆ بنگۆریۆن وشەی نوسراو زۆر بەهادار بوو، وەک شتێکی پیرۆز بوو لای. کاتێک کە بووە سەرەک وەزیران زۆر جاران وتاری بۆ رۆژنامەیەکی جیدیشی زمان لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئامریکادا دەنوسی کە تەنها پێنج هەزار ئابۆنەدەری هەبوو. چەندان کتێبی جۆربەجۆری بە نوسین و بە ملیۆنان وشەشی بۆ گۆڤارو رۆژنامەکان دەنوسین. بێژماریشی پێشەکی بۆ ئەو نوسەرانە بەبێ بەرامبەر دەنوسی کە دڵیان پێخۆش دەبوو.

ئەو توشی نەخۆشی پیشە ببوو کە هەمو نوسەرێک گرتبووی: دەیەویست بە زوترین کات ئەو نوسینانەی دەنوسین بە چاپکراوی ببینێ. گەر وتارێکی بۆ بڵاوکردنەوە دابنابایە، سەرەتا دەیپرسی:

«ئەریَ کەنگی دەردەچیَ؟»
شێوازی نوسینەکەی کەم وابوو پچڕپچڕ بێ. شێوە رستەهەڵهێنانەکەی دەیخستیە سەر یادی بایبل. کەم نوسەر هەبوون لە گەنجینەی وشەدانی عبرییدا شان لە شانی بدەن. بەردەوام وشەی پڕبەپێستی مەبەستەکەی دەدۆزیەوە. زۆر بە چڕی بەڵام بە رازاوەیی نەدەنوسی. رستەکانی زۆرجاران وەک لێدانی کوتک وابوون. عیبریەکەی وایلێکدەکرد شێوازەکەی کەمتر باش بێ چونکە زمانەکە زمانێکی جولەو دەستکردنەوە بوو تیایدا ئەبستراکتیێتی واژە دەقەودەقەکان بەلاوە بەدوردەگیران.
پانزە ساڵ پێش ئەوەی ببێتە سەرەک وەزیران دەستی بە نوسینی کتێبێک کردبوو، کە لەوانەیە بەهادارترین کارە چاپنەکراوەکەی سەردەمەکەمان بێ. بەرهەمەکە لە سی وپێنج بەش پێکهاتووە، بەلای کەمیەوە پێنج ملیۆن پەیڤ دەبێ. کەم کەس هەبوون لەکاتی نوسینیدا بنگۆریۆن ببینن، بەخۆیشی کەمی لەبارەیەوە رادەگەیاند و هەرگیزیش هیچ بەشی بۆ هیچ کەس نەخوێندۆتەوە. کەمیش بوون ئەوانەی بەرگی دەرەوەی کتێبەکەیان بینیبوو. نوسینەکەی زیاتر لە گۆڤار دەچێ لەوەی لە یاداشتنامە بچێ، چونکە بیرۆکە بەرزەکانی نوسەرانی دیکەی هێناوە و تێهەڵکێش کردووە، تێبینییە سەرنجڕاکێشکانی میوانەکانی، لە پاڵ پەرچەکرداری خۆی لەهەمبەر روداو و بیرۆکەکانیشدا تێدا نوسیوە. ئەو هەمو شەوێک کە دەگەڕایەوە ماڵ کەمێک پێش نیوەی شەو ئیشی تێدادەکرد.
هاوکارەکانی بە «کتێبەکەی ئەو» ئاماژەیان بۆ دەکرد. ئەو هەرگیز سەبارەت بە کتێبەکە قسەی لەگەڵدا نەدەکردن و هەمو بەشەکانی لە کتێبخانەکەی خۆی لە تەلئەبیبدا هەڵدەگرت.
لەسەر مێزەکەی بەردەوام کتێبێکی دیکە پەرەسەند و هەبوو، کە رەنگبێ بۆ مێژوی هاوچەرخی جولەکان زۆر گرنگ بێ.
کە بنگۆریۆن لەگەڵ میوانێک قسەی دەکرد بەردەوام دەفتەرێکی تێبینی پێبوو هەندێک جار سەرنجەکانی تێدا دەنوسین. گەر هاتباو میوانەکەی نەناسیبا، ئەوا ئاساییانە سەرەتا زانیاریی وای لێدەپرسێ: «ئەریَ بەڕاست ناوەکەت بە تەواوی چۆن حنجە دەکریَ؟»
ئەوسا بە زمانی عیبری پوختەیەکی وتوویژەکەی لەگەڵ میوانەکەدا لە دەفتەرەکەدا تۆماردەکرد. کە میوانیش دەڕۆیشت، تێبینییە نوسراوەکانی لە دەفتەرێکی هەرزانبەهای دیکە بە قەڵەمێکی رەش دەنوسییەوە. کاتێکیش دەفتەرەکە پڕ دەبوو، هەر بەخۆی پێڕستی بۆدادەنا.
گەرهاتبا و هەمان ناوەڕۆک دوو ساڵ دواتر لە میانی گفتوگۆکاندا هاتبایە پێشەوە ئەوا دەستنوسی گۆرینی لە ئەرشیفەکەی دەردەهێنا و چاوێکی پێدادەگێڕایەوە و دەیگوت:
تۆ لە مەیاندا شاشی. جاری پێشو تۆ وات گوت، من وشەکانتم وەک خۆی تۆمارکردوون، بەوەی کە وتووتە...»
ئەوەشی لە پاڵدا دەنوسی کە خۆی لەوکاتەدا چی گوتووە، تا کو لێکحاڵینەبوون

لەسەر پرسێک کە نەیگوتووە یان بەڵێنی پێنەداوە، رونەدا.
جارێکیان باروخ تال Baruch Tal کە ناسیوێکی خۆی بوو لە ماپای پێیگوت:
«ئـەرێ بۆچی تۆ ئەو هەمو زەحمەتیە (بە نوسینەوەی تێبینیەکان–وەرگێڕ) دەبینی؟
بنگۆریۆنی لێهاتە وەڵام:
«ئەز زۆر جاران ئەرک و کاری گرنگترم هەن، بەڵام کاتێ تێبینی و سەرنجەکان دەنوسمەوە ئەوا خۆم ناچار دەکەم تەرکیز بخەمە سەر میوانەکە و پرسگەلەکەی.»
بۆ بنگۆریۆن خوێندنەوە خۆشەویسترین شت بوو، دواتر بەبێ سێودوو قسەکردن بوو بۆ خەڵک. ئەو زۆر چێژ لەوە وەردەگرت کە نەیارەکانی ژێربێژیانە بەڵگەوبەندکوت بکا و ریزی بەرگەگرتنی داکۆکیان بە راستیە مێژوییەکان بشکێنی و لەبن باری قسە تەوسدارەکانی دەرنەچن.
زیاتر حەزی بەوە بوو بەبێ مایکرۆفۆن قسە بکا، چونکە لە کاتێکدا ئەو وەک دواندەرێکی باشی لێهاتبوو تاکنیکەکانی خستبووە ژێر رکێفەوەکە ئامێری دواندن نەهاتبووە کایە. کاتێک سەرۆکی دانیشتنێک داوای لێکردبا قسەکانی لە کورتیدا ببڕێنیتەوە، بە ئاسانی وەڵامیدایەووە:
«بۆچی پێتوایە قازانجی زیاترە؟»
ئەو هەرگیز لە دواندا لەگەڵ ریکۆردی د. وایزمەندا هاوتەریب نەبووەوە ( وایزمەن لە بازل، سویسڕا بەشداری گفتوگۆکانی دەکرد کە دوو رۆژو شەوان درێژەی کێشا)، بەڵام وابووە بە سعاتان لەدوای یەک بێ پشودان قسەیکردووە. لە کۆنفرانسێکی هیستادروتدا کە بەکردەوە هەر خۆی قسەکەر بوو، هەر لە کاژێر دەی بەیانییەوە تا کاژێر پێنجی دوای نیوەڕۆ لەسەریەک بێ بڕین بێ پشودان بۆ چاو خواردن بەردەوام بوو.
بە بـەراورد لەگەڵ ئابا ئیبان Abba Ebanی نێردەی ئیسڕائیل لە ئامریکادا کە رەوانبێژێکی بایبلانە بوو، بنگۆریۆن بەهێزتر قسەی دەکرد بەڵام سادەییانەتر. بنگۆریۆن هیچ رێڕەوە زۆرزانییەکانی دواندەرانی بەکار نەدەهێنا و ریزپەڕانەش نەبووایە تۆنی دەنگی بەرز نەدەکردەوە.
لەگەڵ ئەوەشدا کاتێ لەسەر سەکۆی کەنیست (پەرلەمانی ئیسڕائیل) بۆ قسەکردن دەوەستا؛ هەمویان بەبێ جوڵە گوێیان دەگرت، ئەوەش چ لەبەر ئەوەی پیاوێکی خاوەن کەسایەتیەکەی دینامیکیانە بوو یان لەبەر ئەوەی شتی گرنگی پێبوو. هەمو دوانەکانی بانگەشەکردن بوون. ئەو زیاتر وەک فەیلەسوف نەوەک سیاسەتمەدار دەدوا.
بە گشتی ئەو بە زمانێکی رازاوەی نەدەنوسی، بەڵام قسەی نەستەقیشی هەبوون وەک: «لە دیاسپۆرادا جوەکان بەشە ئەندامی مرۆڤایەتین کە هەوڵ دەدەن بە یەکەوە بلکێن...»
هەروەها ؛
«ئیسڕائیل هەمو شتێک دەکا کە جولەکایەتی مرۆڤایەتی بێ و مرۆڤایەتیش جولەکایەتی.»

## بەشی
## (١٧)

گەر ساڵێک بۆ دواوە بگەڕێینەوە، بنگۆریۆن و هاوسەرەکەی لە ئاهەنگۆکەیەکی میوانخانەی شارۆن لە هێرزیلیا بوون، بۆ ئەوەی میوانە ئامریکاییەکانیان بەخێربهێنن. لە نیوەی بۆنەکەدا بنگۆریۆن خەریک بوو خواحافیزی بکا و بڕوا، بەڵام پاولا شتێکی چرپاندە گوێ و لە شوێنی خۆی دانیشتەوە. ئەوسا گوتی: پاولا دەڵێ پێویستە هەندێکی دیکە بمێنینەوە، منیش هەمیشە بەگوێی دەکەم، »

گوتنەکە هیچ زێدەڕۆییەکی بنگۆریۆن نەبوو. لە هەندێ بواری دەستنیشانکراودا دوا وشە بۆ پاولای هاوسەری بوو.

پاولا ئایدیالیستێک بوو، وزەدارو ئازاد؛ ژنێک بو لە پشت پەردەبوو، بەڵام لە هەمان کاتیشدا هێزێکی پارێزەر بوو. خانمێک بوو خاوەن کەسایەتییەکی بەهێز بوو هەروەک پیاوەکەی کە زۆر جڵەونەگیر بوو.

زیاتر لە چل ساڵە گۆرەویەکانی لە پێدەکا، کراسەکانی دەشوا، منداڵەکانی بۆ هێناونەتە سەردنیا و بەخێویان دەکا و هەنوکەش چێژ لە بەخێوکردنی نەوەکانی دەبینێ.

یەک جاریان رونیکردوە کە بۆچی پارچە بچوک و وردەکان بەخۆی دەشوا: «ئەز بەتەواوی لە کراسەکانی بنگۆریۆن دەزانم.»

بنگۆریۆن هەرچییەک بووبایە، سەرکردەی سەندیکای پیشەگەرەکان، سکرتێری گشتی هیستادروت، ئەندامی سایەی کابینە یان سەرەک وەزیران، پاولا بەردەوام دایکئاسا فەرمانی بۆ دەردەکرد و ناچاریدەکرد بۆینباخ لەکاتی پێویستدا ببەستێ، جزمە لە کاتی باران لەپێبکا، پەرداخی شیری بۆ ئامادە دەکرد، بە باشی مشوری خواردنەکەی دەخوارد و ئەوەی لەشساخیەکەی پێویست بوو، دەیکرد.

کە دەیزانی مێردەکەی دەچێتە کنێست و دوان دەدا، ترمزێکی پڕ لە چاو کوپەی لەگەڵ خۆیدا دەبرد، لە پشت پەردە نزیک سەکۆی دوان رادەوەستا. هەرکاتێک بنگۆریۆن لە دوانەکەی ببایەوە یەکسەر کوپە چایەکی بۆ تێدەکرد تا بیخواتەوە.

بەردەوام لە ماڵەوە تەلەفونی هەڵدەگرت، گەرهاتبا و تەواو دڵنیا نەبوبایە کە ئەوەی زەنگ لێدەدا پێویستە قسە لەگەڵ مێردەکەیدا بکا، لێنەدەگەڕا هەر لە خۆڕا سەرقاڵی بکەن.

«هەرچەندە ئەوەشم بەگران لەسەر دەکەوێ، بەڵام هەندێ جاران زۆر لەو

تەلەفونانە پڕم، بواریان نادەم؛ بەمجۆرە کاتێکی زۆری بۆ دەگێڕمەوە.»
لە بارەی گرفتە داراییەکانیماڵەوە هەرگز باسی لەگەڵدا نەدەکردەوە، بۆئەوەی سەرئێشەی بۆپەیدا نەکا.
«گەر ئەو بزانێ کە پارەیەکی کەممان هەیە، ئیدی خەمی لێدەخوا.»
هەرکاتێکیش چاوی گەرم کردبان پاولا وەک سوپەرێکی ماڵی لێدەهات و فەرمانی بەسەر منداڵەکاندا دەکرد کە هاروهاجیتی نەکەن و بێدەنگی بپارێزن. گەر هەر بۆشی سەرنەگرتبا بەخۆی دەچوە دەرەوە بە منداڵەکانی دەگوت : «شەکەت، شەکەت Sheket، Sheket! (دە وس بن دەی).
جارێککیان لەو کاتەی سەرەک وەزیران لە ماڵەوە پاڵیدابووەوە دەستەیەک لە منداڵان لەبەردەم دەرکەی ماڵیان تەپڵیان دەکوتا. بە یەکەوەش دەیانگوتەوە:
«ئێمە دەمانەوێ بنگۆریۆن ببینین! دەمانەوێ هەر بیبینین!»
ئەوان لە پاولا نەسڵەمینەوە کە بەگەسک بە دوایان کەوتبوو.
تا ئەوەی باوکیان پێیئاگاداربێ، منداڵەکانی ئامۆس، ڕێنانا و گێولا بەکردەوە نەخۆش نەکەوتن. چونکە هەمیشە هەر پاولا مشورخۆریان بوو لێنەدەگەڕا مێردەکەی پێبزانێ و سەرئێشەی بۆ پەیدا ببێ.
جارێکیان ئەندامێکی حکومەتەکەی بنگۆریۆن کە ساڵانێکە دەیناسی گوتی:
«کلتوری کاسۆلیکی لەسەر گۆی زەیدا لەسەردەستی راهیبەکانی کەنیسە، ئەوانەی وەک پیاوەکانی دیکەی توشی گێچەڵی خاووخێزان و کێشەگەلی منداڵیان نەبووبوونەوە، بڵاوبۆتەوە.»
«پاولا بە ژیری و خۆبەختکردنەکەی خۆی بوارێکی وای بۆ بنگۆریۆن رەخساندبوو کە چێژ لە هەمو لایەنێکی خۆشی خاووخێزان وەربگرێ، بێئەوەی لایەنە ناخۆشەکانی سەری لێتێکبدەن. ژیانێکی وای بۆ رەخساندبوو وەک راهیبێک بێئەوەی کێشەگەلی ماڵەوەی هەبێ، بەمە پاولا ژیانی خۆی بۆ ئەو تەرخانکردبوو.»
ساڵێک پێشتر پاولا بابەتێکی لە ژێرناوی «ژیانی من لەگەڵ بنگۆریۆندا «بۆ گۆڤاری ریمۆن Rimon کە بەعیبری نوسیبوو، بڵاوکرایەوە، هەفتەیەکیشی نەبرد وەرگێڕدرایە سەر زمانی ئینگلیزی.
لە چاپە عیبریکەدا پاولا بە وردی باسی ئەوەی کردبوو کە چۆن لەگەڵ بنگۆریۆندا لە بەردەم فەرمانگەی کاروباری هاوڵاتیاندا لە نیویۆرک وەستان و مارەییناەی هاوسەرێتیان بۆ یەکدی واژۆکرد.
دوای بڵاوبوونەوەی هەفتەنامەکە یەکێک پاولا و بنگۆریۆنی لەوە بە ئاگاهێنا کە لە مەیاندا ختوکەی ئۆرسۆدۆکسەکانی ئیسرائیلی دراوە. پەرچەکرداری ژن و پیاوەکە زۆر کەسییانە بوو. سەرەک وەزیران لەسەر ئەمە لۆمەی ژنەکەی نەکرد، بەوە خۆی لە پرسەکەدا دوا کەبلێ: بەڵێ ئاوا شتەکان رەویاندا.»
بەڵام پاولا بەوە نیگەران بوو کە هەر چەندە بە ئەنقەستیش نەبوو کە هاوسەرەکەی شەرمندەبکا، بۆیە زەنگێکی بۆ دەستەی نوسەران لێدا، داوای لێکردن بەڵکو لاپەڕە پەیوەندیدارەکان لە چاپە ئینگلیزیەکەدا دەربهێنن.

لە سەر دیواری ژوری میوانانی ماڵی بنگۆریۆندا پۆرتریتێکی هێلن کێللەر Helen Keller (١٨٨٠-١٩٦٨) لە تەمەنی نۆزدە مانگیەوە نابینا و کەڕە بوو. خانمێک بوو خۆی فێرە خوێندن و نوسینی نابیانایان کرد، لەو بوارەدا ناوێکی دیاری هەیە و چەندان کتێبی نوسیون- وەرگێر) هەڵواسرا بوو. کاتێک هەر میوانێک نیگای بخستبایەسەر، ئەوسا پاولا دەیگوت: «کاتێ بنگۆرینی دی بەدەستی خۆی سەری بنگۆریۆنی گرت و چەندجاران گوتیەوە: پەکو چ جۆرە سەرێکە! پەکو چ سەرێکە!» ئەو دەیزانی کە سەرەکە کەللەی پیاوێکی مەزنە.

چل و دوو ساڵ بەر لە ئێستا کە پاولا هێشتا هەر پاولا مەنوایس Paula Munweis بوو (واتە کە هێستا شوی بە بنگۆریۆن نەکردبوو)، بە ناسیاوەکانی دەگوت:

«بنگۆریۆن جارێکیان دێت دەبێتە پیاوێکی مەزن.»

دوای بەسەر چوونی ماوەیەک، وشەی جارێکیشیان هەڵگرت و گوتی «بنگۆریۆن دەبێتە پیاوێکی مەزن.»

دوو ساڵ دواتر وشەی دەبێتەشی لابرد و کردیە «بنگۆریۆن پیاوێکی مەزنە»ئەو دەم مەزنایەتیی بنگۆریۆنی لەلا ببووە راستی.

لە بەراییدا کاتێک خەڵک وایان دەبینی پێیان سەیر بوو. تەنانەت هەندێکیان لە پاشملە پێی پێدەکەبنین. چونکە پاولا بە کارمەندانی دوکانەکان، دراوسێکان، دیپلۆماتە دەرەکییەکان، بەمنداڵەکانی خۆی، بە جولەکان، کریستیانەکان تەنانەت بە عەڕەبەکانیشی دەگوت:

«لێم تێدەگەی، بنگۆریۆن پیاوێکی مەزنە.»

لە ئیسرائیلدا نە سەدان چیرۆک و سەربردە بەسەر بێکۆتوبەندی پاولادا بڵاوبوونەتەوە؛ بە پێکەنینەوە ئەو سەربردانە بەڵام بەبێ ئێشاندن دەگێڕدرانەوە، چونکە هەموان پاولایان خۆشدەویست. پاولاش هەرگیز بەرامبەر ئەو کورتە چیرۆکانەدا ناڕەزایی دەرنەدەبڕی. هەر بەخۆی بەدرێژایی رۆژگار گەنجینەی ئەو جۆرە قسانەی پردەکردنەوە.

لە وتارێکدا بۆ هەفتەنامەی ریمۆنی نوسیبوو:

«ئێمە میوانگەلێکمان دێن کە لەسەر ئاستی نێودەوڵەتیدا ناسراون، وەک داگ هامەرکشۆلدDag Hammerskjold و د. رالف بونچە D.ralph Bunche. من رای خۆم بە تەواوی بە داگ هامەرکشۆلد(١٩٠٥-١٩٦١ دیپلۆماتێکی ناسراوی سوێدی بووە لە نێوان ١٩٥٣تا ١٩٦١دا سکرتێری گشتی نەتەوە یەکگرتووەکان بووە-وەرگێڕ) گوت، ئەو کەسەی کە هەڵوێستە سیاسیانەکەی لە ژێر کاریگەری ئەوەدایە کە تائستا ژنی نەهێناوە. پێمگوت : «بۆچی تا ئێستا ژنت نەهێناوە؟» ئەوسا کێشەگەلی خۆت دەبوون لە بیرت نەدەما سەرئێشەمان بۆ پەیدا بکەی. هەمان شتیشم بە دکتۆر بونچە(١٩٠٣-١٩٧١ دیپلۆماتێکی بە ناوبانگی وڵاتە یەکگرتوەکانی ئامریکا و هەڵگری خەلاتی نۆبل بۆ ئاشتی بوو، لە پەنجاکانیشدا ناوبژیکاری کێشەی عەڕەب-جو بووە لە فەلەستیندا-وەرگێڕ) گوت بەوەی کە لەو دوادواییانەدا جاڕستر بووە.»

داگ هامەرشکۆڵد و د. بونچە پاولایان باش دەناسی بۆیە هەستیان بە

سوکایەتیپێکردن نەکرد. دەیانزانی کە دڵێکی باشی هەیە و هەرگیزیش بەرکوقینەوە باسی ئەو جۆرە پرسانە نایەنێتە سەر زمان. بەڵام لە وەزارەتی کاروباری دەرەوەی ئیسرائیلدا لەو کاتەدا مرۆ دەڵەرزی، چونکە لەوە دەترسان ئەو ڕاشکاوەییە لە جیهانێکدا لێکبدرێتەوە کە واژەی «دیپلۆماسی» بۆتە هاوواتای تەواو لەسەرهەق نەبوون، بە شاشی لێکبدرێتەوە.

لە ١٩٤٨دا هێنری مۆرگنتهاو Henry J.Morgenthau وەزیری کاروباری دارایی پێشوی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئامریکا بە سیفەتی سەرۆکی کردەی ناوەندی ئیسرائیلی سەردانێکی ئیسرائیلی کرد و وەک سەرۆکێک پێشوازیلێکرا. پێش ئەوەی بشرواتەوە کۆنگرەیەکی رۆژنامەوانی لە تەلئەبیبدا بەست. پاولا بنگوریۆن لە تەنیشتی دانیشتبوو، بە پێکەنینەوە سەری رەزامەندی بۆ قسەکانی دەلەقاند، بەوەی ئەو پارەوپولەی لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئامریکادا بۆ ئیسرائیل کۆکراوەتەوە بۆ ئەوەیە کە پشکیان هەبێ لە بەرەنگاربوونەوەی کۆمۆنیزم لەناوچەکەدا.

ئیدی لە پڕ دەنگێک هاواری کرد:

«ئێمە پێویستمان بە دۆلارەکانی تۆ نییە! تۆ ناتوانی ئێمە بکڕی. ئێمە دزانین کە یەکێتی شۆرەوی دۆستانە لە ئیسرائیل دەڕوانێ.»

دەنگەکەش هی سەرنوسەرێکی گەنجی رۆژنامەیەکی کۆمۆنیستی بوو. کاتێک هەندێک دەیانەویست بێدەنگی بکەن، مۆرگەنتاهو بە هێواشی گوتی:

«لێیگەڕین، ئا ئەمەیە دیموکراسیی و کەواتە تۆ مافت هەیە بیروڕاکەت دەرببڕی.»

لێرەوە وا کەوتەوە وەک ئەوەی روداوەکە کۆتایی بە کۆنفرانسەکە بهێنێ. بەڵام پاولا بە شێوەیەکی دیکەوە بیریلێکردەوە. دوای بەسەرچوونی کۆنفرانسەکە پاولا خۆی گەیاندە کابرای کۆمۆنیست و گلەیی لێکرد چونکە میوانێکی بەڕێزی ئیسرائیلی سوککرد.

کەسیش کارێکی واینەکرد پاولا بێدەنگ بکا چونکە دەبووە کارێکی ناشیاو.

پاولا گوتی: «ئەز لە خۆرسکییەوە راشکاو و کراوەم. من بە هەمو کەس هەر لە گەورە تا بچوک ئەوە دەڵێم کە هەیە.» کاتێکیش جارێکیان لە دانیشتنێکی کەنیستدا ئامادە بوو، مناحیم بێگن بێ ئەوەی سڵاوی لێبکا بە بەردەمیدا رەت بوو. یەکسەر پاولا هاتە وەڵام و پڕی دایە بێگن و بە ئامادەبوونی ژمارەیەک لە ئەندامانی پەرلەمان رای خۆی نەشاردەوە و پێگوت:

«جەنابی بێگن دە گوێبگرە، جیاوازییە سیاسییەکان هەرچەند بن، هیچ پۆزشێک بۆ بێڕێزینواندن نین.»

لە دواییدا بێگن داوای لێبوردنی کردو لەبەر دەستانی قوتار بوو هەڵات. رەفتارە خۆنەبەستنەوەکانی بەرێساکان زۆرجاران تازەگەرییەکی لەگەڵ خۆیدادەهێنا. رۆژێکیان یەکدوو میوانی ئامریکی کە سەرەک وەزیران و خانمەکەیان ناسی، میوانخانەکەیان جێهێشت و بەرەو فرۆکەخانە کەوتنەڕێ، کاتێک پۆلیسێک هاتە لایان و پێیگوتن کە خانمەکەی بنگوریۆن ئەوی ناردۆتە لایان تا پرسێکی گرنگیان لێبکا:

سەرەک وەزیران لە سەردانە جۆربەجۆرەکانیدا بۆ وڵاتە یەکگرتووەکانی ئامریکادا بەتامەوە هەمبەرگەری دەخواردن، هەنوکەش پرسیاریان لێدەکا ئایا دەتوانن شتێکی وای بۆ بکەن. دەکرێ بە پۆلیسەکەدا راچێتەی دروستکردنی ئەو هەمبەرگەرانەی بۆ بنوسنەوە؟

دوای ئامادە کەمەکانی لە ئاهەنگۆکە تایبەتیەکاندا  کە بنگۆریۆن تیایدا ئامادە دەبوو، پاولا تەماشای ئەو سەندەویچە زۆرو میوە و کێکانەی دەکردن. کاتێکیش سکرتێری مێردەکەی لەسەر رۆیشتن بوو، پاولا پێیدەگوت: «من کیسەکە ئامادەدەکەم بۆ ئەوەی لەگەڵ خۆتیدا ببەی.»

هەڵبەت سکرتێرەکە توانی خۆی لە دەستی قوتار بکا بێ ئەوەی هیچ لەگەڵ خۆیدا ببا، بەڵام دوای نیوسعات پاسەوانێک بە یەکبەرگی فەرمییەوە لەبەر دەکەی ماڵیان بوو بە خۆی کیسێکی پڕی پاشماوەی  ئاهەنگەکە.

درێژی بەژنی پاولا هەر بەقەد مێردەکەی دەبوو. پرچیکی رەشی چڕی هەبوو، زۆر جاران لەنێوەڕاستی تۆقی سەریەوە دەیکردەو دوولەت بەمە لەگەڵ دیمەنی پرچە سپیە گروازییەکەی مێردی لەیەکدەهاتن.

ئەو زۆر گرنگی بەخۆی نــەدەدا، کەمترین مـۆرومـوری لـەبـەرخـۆی دەکرد، بەردەوامیش جلی تۆخی دەپۆشین.

«ئاوا پیاوەکەم حەز دەکا.»

پاولا ساڵێ یەک جوت پێڵاو دەکڕێ، بەڵام گەر گەشتی دەرەوەی کردبا ، پێش دەرچوونی ئەوە زانرابوو کە رێگەی بەخۆی دەدا جوتێکی دیکەش لەگەڵ خۆیدا ببا.

هەندێ جاران شتێکی لەسەر دەنا، بەڵام زۆرجاران وەک پیاوەکەی سەرکۆت بوو. ئەو زۆر بە وردی  لە ماڵەکەی وەشابووەوە.

«ئەوەش لەبەر ئەوەیە کە من پەیامنێر بووم. من حەزم لە رێکوپێکیە.»

پاولا دایکێکی دلۆڤان بوو، هەنوکەش داپیرەیەکی  شانازە. باشترین چێرۆکۆکە لەسەر نەوەکانی ئەو سەرنجانەی مەشیک Mushik ی کوڕی گێولایە. باوکی مێردمنداڵەکە  ئیمانوئێل بێن ئێلیازەر Imanuel Ben Eliezer ی سەرپەرشتیاری وەزارەتی بەرگرییە. رۆژێکیان موشیک بە باوکی گوت:

«باوکە، تۆ گەورەو قۆزو زیرەکی، بەڵام هێشتا نەبویتە ئەفسەر. باپیرە  بچوک و پیاوێکی پیریشە کەچی سەرەک وەزیرانە. ئەمە چۆنە؟»

یەکێک لـە نوکتەکانی خـودی پـاولا ئـەوەیـە: «ئێمە خـانـەوادەیـەکی نەتەوە یەکگرتووەکانین، ئەدی ئەوە نیە؛ گێولا لە نیویۆرک لەدایک بووە، ئامۆس لە لەندەن و ریناناش لە ئیسرائیل.»

لە دوا مانگەکانی ساڵی ١٩٤٨دا لە ئیسرائیلدا لەسەر  پێشنیازی بنگۆریۆن رێسای ناسنامە دەرچوو، کە بە هۆیەوە هەمو کەسێک ناسنامەیەکی هەبوو کە وێنەیەکی نوێی لەسەر بوو.

رۆژێکیان ئارگۆڤ بە سەرۆکی بەشی وێنەگرانی گوت کە لە نوێژی نیوەڕۆدا بچێتە ماڵی بنگۆریۆن و وێنەیەکی نوێی بگرێ تاکو لە ناسنامەکەی بدرێ.

سەرەتا پاولا ویستی دەرگەی لێنەکاتەوە.
«بنگۆریۆن نوستووە.»
ئاندەرمانی وێنەگر بە نارەزاییەوە گوتی : «ئاخر ئارگۆڤ رایسپاردوم.»
«هەنوکە باشە، بەڵام ئەم کارەیان سەرلێشێوانە. ئاخر ئێوە بە سەدان وێنەی ئەوتان هەیە، ئەمەتان لەچی.»
بنگۆریۆنیش پێیخۆش نەبوو. ئەو هەرگیز دانووی لەگەڵ وێنەگراندا نەدەکولا. گەر هاتباو بە پەلە وێنەکەی خۆیان گرتبا و رۆیشتبان، ئەوا باش بوو، وەلێ کاتێ کە خۆیان ئامادە دەکرد و کامیرایان دەچەسپاند، دەستی بە منگەمنگ دەکرد.
کاتێک ئەو لە ژوری سەرەوە هاتە خوارەوە، تەنها چاکەتێکی لەسەر بێجامەکەی لەبەرکردبوو. بەلای وێنەگر دەبووایە کراسەکەی و بۆینباخیش ببەستێ.
پاولا بە پەستیەوە هەڵیدایە : «ئێ بەو جۆرە زۆر جوانە ، دە وێنەکە بگرە.»
لە کاتێکدا کە سەرەک وەزیران جارێکی دیکە چووە سەرەوە تا کراسەکە و بۆینباخەکەی بپۆشی، ئاندەرمان ئامێرەکەی لە ناوەڕاستی ماڵەکەدا دامەزراند. کاتێک پێچکی ستاندی کامیراکەی لەسەر رایەخی ژورەکەدا چەقاند، پاولای لێهاتە وەڵام:
«تۆ بەو شێوەیە رایەخەکەم بەو پێچکە قوڕاویانە لێدەدڕێنی.»
ئیدی مافورەکەی لولدا و هەڵویژنی.
کۆنفڕاسە گرنگە سیاسییەکان لە ماڵی بنگۆریۆندا سازدەدران، پاولاش هەمیشە دەروازە بوو. لە کاتی گفتوگۆکاندا بەخۆی و کوپی چاو و ژێرجگەرەی پاکەوە دەهاتودەچوو. پیاوەکەی متمانەیەکی تەواوی پێبوو. ئەو دەیزانی کە پاولاش وەک هەمو ژنانی دیکە حەزی لە قسانە، بەڵام هەرگیز ناپاکیی لەگەڵ نهێنییەکەی دەوڵەت نەکردووە و هیچی لەبارەیەوە نەدرکاندووە.
لە رەخنەگرتن لە خەڵکی دیکەدا زۆر تیژ بووە، جڵەو نەدەکرا و هەندێ جارانیش رەخنەی تێکدەرانەی دەگرتن. زۆر قینی لەو کەسانە بوو کە ناوی لێنابون «خۆڕەپێشکەران». دڵی پاولا بەقەد نەقەب فراوان و وەک تاوی دوای نیوەڕۆیەکی بیابانیش گەرم بوو.
لە سەردەمی کەمی خۆراک و ئازوقەدا، ئەویش وەک ژنانی دیکە لە نۆرەی ئازوقە وەرگرتندا دەوەستا، وەک هاوسەری سەرەک وەزیرانیش باسی لە گرفتەکانی ناماڵ دەکرد. هەندێک جاریش وشەی بچوککراوەی جیدیشی بۆ پیاوەکەی بەکاردەهێنا: ئەز دەبێ ئەو شتە یان ئەوی دیکە بۆ دۆڤیدە لە Dovidle (داودۆکەکەم) بەدەستبێنم.»
دڵپاکی پاولا هەرگیز پاسیڤیانە نەبوو. کاردانەوەی توندی دەبوون، وەک ئاگر هەڵدەچوو بەقەد خۆتەرخانکردنەکەی بۆ مێردەکەی.
جارێکیان کە هاوسەری کارمەندێکی حکومەت زۆر نەخۆش کەوت، پاولا پاسەوانەکانی ماڵەکەی بە جلی فەرمییەوە هەندێ جاران دوسێ جاران بۆ سۆراخپرسینی دەناردن، ئاخۆ باری لەشساخیەکەی بەچی گەیشتووە و دەکرێ چی بۆ بکا. کاتێک کارمەندەکە سوپاسی دەکرد، پاولا تەریق دەبووەوە و سور هەڵدەگەڕا. سوپاسگوزاری تەریقی دەکردەوە.

جیاوازییە روناکبیریەکەیان دەکرا ببێتە مایەی جیابوونەوەیان، گەر هاتبا ژن و مێرد ئەوەندەیان یەکدی خۆش نەویستبا.
خۆشەویسترین نوسەر بەلای پاولا، لۆنگفێلۆو Longfellow(١٨٠٧-١٨٧٢ شاعیری ئامریکی) بوو. لە سەردەمی زو زۆر لە شیعرەکانی لەبەربوون. سەبارەت بە رۆمانیش حەزی لە خوێندنەوەی رۆمانەکانی جاک لەندەن Jack London بوو. ئەو هیچ داخوازییەکی رۆشبیرانەی نەبوون. حەزی لە بیبینی فیلم و گوێڕاگرتنی رادیۆ بوو. جیهانی بنگۆریۆن ئەفلاتون، بودا، فەیلەسوفەکانی رۆژهەڵات بوون، ئەفسانەو لایەنە رازدارییەکانیش بۆ پاولا گۆڕەپانێکی نەناسراو بوون. کاتێک مێردەکەی لە دوانزەی شەودا چووبایەوە ژورەکەی خۆی و گلۆپی سەری داگیرساندبایە، ئەوا جیهانەکەی دەستپێدەکرد و بۆ چەند کاژێریک ریگاکانیان لەیەک دەبوونەوە. بەڵام بەیانیان لە کاژێر حەفتەوە یەکدیان لە ئاشپەزخانەکە دەبینیەوە، ئەویش لەسەر خواردنی بەیانیان و بەرچایەکەیان و نۆشکردنی کوپێک قاوە.
هەروەک چۆن بنگۆریۆن بە هاوکارەکانی لە حکومەتدا رادەگەیاند کە چۆن بەدەر لەوەی چ پایەیەکی بەرزیان هەیە چۆن ئاسایانە بمێننەوە، پاولاش لە سادەیەتیدا نمونە سەرمەشقێکی ژنە بەرپرسە باڵاکان بوو. لەو چل ساڵەی بە یەکەوە ژیانیاندا هیچ نەگۆڕان. هەنوکە لەگەڵ پاسەوانەکان لەسەر زەحمەتیەکانی ناوماڵ قسەدەکا، زۆر بە باشیش لەگەڵ دراوسێکانیدا دەهاتەوە و لە ژیانی لوکسەییشدا رانەهات. هیچ هۆیەکی وا نابینێتەوە کە بە جۆرێکی دیکەی جیاواز خۆی نمایش بکا هەرچەندە کە هاوسەری سەرەک وەزیرانیش بوو.
هەرگیز خزمەتکارێکی شەو و رۆژی نەبووە هەرچەندە لەو بەشەی جیهانەیەدا لە مرۆڤی بەردەست کەم نەبوون و ئاستی ژیانیشیان وا بەرز نەبووە کە پێویستیان بە ئیشێکی وا نەبووبێ.
ئەو هەمیشە دەیگوت: «ئەز هەر وەک بنگۆریۆن سۆشیالیستم. من دژی روتاندنەوەم.»
پاولا کرێگرتەیەکی هەبوو. یەکێک لە شتە کەمەکان کە هەیبوو ریگەی بەخۆیدا بوو، ئەوەبوو کە هاوینان لەبەر هەواگۆڕکێیەکی کارەبایی پشت سەری دەنوست.
کەمێک دوای جەنگ ئامۆزایەکی لە نیویۆرکەوە بۆی نوسی کە دێتە ئیسرائیل. لێیپرسی ئاخۆ چی لەگەڵ خۆیدا بۆ بێنێ. لەو هەمو داهێنراوە تاکنیکیانەی نوێ داوای ئەو تەنها: «دوو دەستە سابون» بوون.
پاولا دەڵێ کە هەرگیز خۆی لە کێشە سیاسییەکانی میردەکەی هەڵنەقورتاندووە، هەرچەندە گەر بۆ چەندان ساڵی زوتر بگەڕێنەوە بە توندی دژی شەڕوەستانی سیاسیانەی مێردەکەی بوو لەگەڵ ژابۆتنسکی. هەمو نامەیەکی کە دەهاتە ماڵەکەی و کەسیی نەبوون، بەبێ کردنەوە و دەستلێدان دەیناردنەوە وەزارەت.
گەر هاتباو زۆریش نەخۆش کەوتبا، پیاوەکەی بە کتێبێکەوە لە ژور سەری دەبوو، تا گەر بۆ پێویستیەک بانگی کردبا، لەلای بووایە.
کاتێکیش نەخۆشکەوت و کەوتە نەخۆشخانەی تەلئەبیب و مێردەکەشی لە سدێ

بۆکەر Sde Boker بوو، بنگۆریۆن نامەیەکی بۆ نوسی و نیشانەی زۆر خەڵکی دا. ئەوەش نامەیەکی دڵدارییانە بوو کە هەر لە کوڕێکی گەنج دەوەشایەوە، کە پڕ بوو لە باسی هەورو چڕینی بولبلان و شیعرو رۆمانسی. ئەوەش دەەقاودەق ئەو شتە بوو کە پاولا بۆ زو چاکبوونەوەی پێویستی پێبوو. جارێکیان یەکێک بە نیمچە نوکتەئامێزیەوە پێشنیازی کرد کە میدالیایەکی شانازییانە بدرێتە ئەو ژنە نائاساییەی کە ناڕاستەوخۆ ئیسرائیل زۆر شتی قەرزبارە.

بەڵام کاتێک بە کردەوەوە رویدا، دەرفەتێکی باش پەیدا بوو پاولا بنگۆریۆن بە سەرۆکی لیژنەی بۆنەنامەکە بڵێ:

«چ بیرۆکەیەکە! ئەریٚ ئێوە کەسی دیکەتان نەدۆزیەوە تا میدالیاکەی بدەنیٚ؟»

# بەشی
# (١٨)

هەڵمەتی هەڵبژاردن بەسەرچوو، دکتۆر وایزمەن بووە سەرۆک، لەسەر سنورەکانیش جارێ بۆ ماوەیەکی کاتی ئارامی بەرپابوو و بنگۆریۆنیش دەیتوانی خۆی بۆ جۆرە کاری دیکە تەرخانبکا تا بۆ گەلەکەی و جیهان بسەلمێنی کە لە سەردەمی ئاشتیشدا وەک مانگە ئاڵۆز و پڕ شەڕەکان هەر سەرکردەیەکی کارامەیە.

هەنوکە دەردەکەوێ ئایا بە ڕاستی ئەو مەزنە پیاوە.

هێشتا زوە تا مرۆ شمشێرەکان بتوێنێتەوە و ئامێری دیکەیان لێدروست بکا. مرۆ پێویستە سوپا لاواز نەکا بەڵکو بەهێزتری بکا. لە هەمان کاتیشدا مرۆ لەسەریەتی گەلێک و وڵاتێک رۆبنێ کە تا ئێستا لەبن باری کێشەکان دەناڵێنێ. هێشتا ئاشتیەک لەگەڵ شەش دەوڵەتە دراوسێکەیان سەقامگیر نەبووە، بەڵکو تەنها زنجیرە رێکەوتنێکی ئاگربەست و بە شێوەیەکی کاتی گرمەی چەکەکان بێدەنگ بوون.

بەریتانیای گەورە لە دواییدا بە دوودڵی ددانی بە ئیسرائیلدا نا، بەڵام دەوڵەتە عەرەبییەکان هەر وشەی ئیسرائیلیان بەکار نەدەهێنا. (رادیۆی قاهیرە هەر دەیگوت «ئەو گروپە جولەکەیە».)

کۆچبەرەکان بە تێکرایی بە تەوژمێک دەهاتنە ئیسرائیل لە هەر خولەکێکدا یەکێک دەهاتە نێو وڵات، کەسیش نەیاندەزانی لە کوێیان جێبکەنەوە. بنگۆریۆن هێشتا هەر هانیدەدان و ئەزمونێکی بوێرانەی بەکارهێنا.

هەمیشە بزوتنەوەیەکی بەهێزی زایۆنیزمی لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئامریکادا هەبوو، لێشی چاوەڕواندەکردن هەر کاتێ ئیسرائیل سەربەخۆ بوو، ژمارەیەکی زۆری زایۆنیستەکانی ئامریکا بەرەو ئیسرائیل کۆچ بکەن؛ پیاو و ژنان بە پیشەزانی و کارامەییان، دەیانتوانی لە هەمو لایەک ئەرکە گرنگەکانی وڵات رابییبکەن. بەڵام لە ١٩٤٩دا لێتێگەیشت ئەو پێنج ملیۆن جولەکەی ئامریکا لەوێ هەست بە ماڵی خۆیان دەکەن وهەڵناقەنێن، شتێکی پەرجوئاساییە گەر زیاتر لە چەند سەد کەسێکیان بێنە ئیسرئیل بژین. بێئومێدیەکەی سەبارەت بە نەهاتنی ئەوان زۆر گەورە بوو، بە شێوەیەک بەساڵانێکی دورودرێژ لە دوان و وتارەکانیدا هەر شتی لەبارەوە دەگوت.

بۆ بنگۆریۆن ئەم نەهاتنەیان مایەی تەنگژەیەکی دیکەی ژیانی بوو. هەروەک هەندێک لەوانی دیکە لەو بارەدا نەدەکرا بڕیارێکیان بۆ دەربکا و دواتر لێیان بێدەنگ

بێ. ئەو پرسە هەر بەکێشە مایەوە، لە میانەی ڕاستگۆیەتی دەربارەی ئەوانەی بە پارە یارمەتی دارایی گرنگیان بۆ ئیسرائیل دەکرد، مژارەکەی نە دەشاردەوە.

بنگۆریۆن دەیزانی کە بڕە پارەکە پێویستە بۆ ئەوەی بە ملیۆنان کۆچبەری جو نیشتەجێ بکرێن، خانویان بۆ دورستبکرێ، هەلومەرجی ژیانێکی وایان بۆبڕەخسێندرێ کە وا لەوانەی وڵاتە یەکگرتوەکانی ئامریکاش بکا، چاویان لێبکەن. هەروەها پارە بۆ پشگیریی دەوڵەتیش پێویست بوو. گەر هاتباو لە بەرامبەر جولەکەی ئامریکادا بیگەیاندبایە رادەی دوژمنایەتی ئەوا لەوانە بوو خەونەکەی بە تەواوی بەرجەستە نەبووبا.

ئەوەش بڕیارێکی ئاسان نەبوو. دیپلۆماتێک، پیاوێک کە لە بنگۆریۆن ڕاستگۆتر و ئازاتر نەبووبا، ئەوەندە پۆزشت و پاکانەی هەبوون هەر هیچ نەبا جارێ بیروڕای خۆی لەمەڕ ئەو پرسەدا دەرنەبڕێ. بەڵام بنگۆریۆن بێئومێدی خۆی لەبن کورسی و مێزدا نەدەشاردەوە، ئەو دەیزانی کە وشەکانی دنەی لێشاوی کۆچبەران لە نیویۆرکەوە بەرەو تەلئەبیب نادەن.

لە ١٩٤٩دا کێشەگەلی دیکەش هەبوون.

بێگومان پارەیەکی ئەوەندە لەبەردەستدا نەبوو کە پەنابەرە ڕەشوروتەکانی وڵاتە دراوسێکانی پشتەوەیان لە باکوری ئافریکا، گێتۆکانی ڕۆژهەڵات، ئاوارەکانی ئاورووپا بیانخەنە بارێک کە شانازی بەوە بکەن بوونەتە هاوڵاتی نەتەوەیەکی درکبەخۆکردوو.

هەر چەندە سیا CIA لەوەدا سەرکەوت کە لەنێو جوەکانی ئامریکادا باروبویی لە هەر تاکێکیانەوە ئەوەندە کۆکردوەوە کە زۆر زیاتر بوو لەو پارەکۆکراوەی هەر گروپەگەلێک لەو وڵاتەدا بۆ بۆمەبەستی خێرخوازی کۆکراوەتەوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا باری دارایی دەوڵەت زۆر لاواز بوو، کە گاڵتەجاران لە ١٩٤٩دا لەوەدا سەرکەوتن نوکتەیەک لەسەر ئەو کەسە دابنێن کە داوای لە بنگۆریۆن کردبوو کارێکی بۆ بدۆزێتەوە، ئەویش کاری وەزیری کۆلۆنییەکانی پێسپارد.

«بەڵام خۆ ئێمە هێشتا هیچ کۆلۆنیمان نین؟»

بنگۆریۆن وەڵامی دایەوە« «نەخێر، بەڵام ئێمە پارەشمان نیە کەچی وەزارەتی داراییمان هەیە.»

دوانزە پارتی سیاسیی نوێنەرێک یان زیاتریان لە کەنیستدا هەبوو. لەهەر بابەتێکیشدا کە گفتوگۆی لەسەر دەکرا دوازدە هەڵوێست دەهاتنە پێش و ریز دەکران، بۆیە زۆر جاران دیموکراسی بە لەسەرخۆیی دەڕۆیشت.

ئیسرائیل وڵاتێک بوو بێ پایەتەخت. دامودەزگاکانی حکومەت کە هێشتا هەر لە هاکیرا بوون، بەڵام دەبووایە کەنیست (پەڕلەمان) لە باڵەخانەی سینەمایەک لە تەلئەبیب کۆببێتەوە.

بە هەزاران ژن و پیاو بوونە کارمەندی دامودەزگا تازە دامەزراوەکانی حکومەت، بێگومان هێشتا بە کردەوە ئەزمونیان نەبوو، بەڵام خەڵک لە پایەتەختە کاتیەکەدا زۆر نوکتە و سەربردەی خۆشیان لەسەر هەڵەی بیرۆکراسییەکەیاندا دەگێڕایەوە.

بەناوبانگترینیان ئەو نوکتەیەی دەربارەی دوو شێرەکە بوو کە لە باخچەی ئاژەڵان رزگاریان بووبوو. یەکێکیان پێی ئاسایشتر بوو بگەڕێتەوە نەقەب. ئەوی دیکەیان هەر لە تەلئەبیب مایەوە. دوای هەفتەیەک ئەو شێرەی چووبووە نەقەب بە لەڕولاوازی وبرسێتی و شەکەتیەوە گەڕایەوە تەلئەبیب و گوتی لە بیاباندا مرۆڤی بە دەگمەن لێبوون کە پەلاماریان بدەم و بیانخۆم. بەڵام شێرەکەی تەلئەبیب قەڵەو و کەیفساز بوو، گوتی : «من هەمو بەیانییەک لە کاژێر هەشتەوە دەچمە هاکیرا لەوێ لە دەوروبەری دامودەزگاکانی حکومەتدا پێنج کارمەندی چەور دەخۆم و دەگەڕێمەوە. «شێرەکەی نەقەب لێیپرسی: «پەککو پەککو، چۆن ئەوەندە خەڵکی زۆری لێهەن کە کەس حیسابی لە دەستدانی چەند دانەیەکیان نەکا.»

ئەوانەی کە سەرپەرشتی دامودەزگاکانیان دەکرد سەرقاڵ بوون. رۆژی کاری بنگۆریۆن تادەهات درێژتر دەبووەوە. دەربارەی ئەودا دەگوترا کە مرۆ دەتوانی بە ئاسانتر قسە لەگەڵ پاپا بکا نەوەک ئەو.

یەکێک لە داهێنراوەکانی نەخشەیەکی چوارساڵیانە بوو بۆ پەرەپێدانی لەخۆگرتنی کۆچبەران لە ئیسرائیلدا. لەبارەی پلانەکەی نەخشەیەکی دروستکردبوو کە هەمو فەرمانبەرێک لە نوسینگەکەی خۆی هەڵیواسی بوو. وەک بنگۆریۆن بۆیچووبوو، ئەوە زۆر باشدەبێ کە هەمو بەیانییەک کاتێ فەرمانبەرەکە دێتە سەر کار نەخشەکە بخوێنێتەوە و لەخۆی بپرسێ تۆ بڵێی ئەمڕۆ چەندمان بۆ جێبەجێبکرێ تا زیاتر لە مەبەستی کۆتایی نزیک ببینەوە.

لە مانگە بەراییەکاندا دامودەزگاکان لەسەرسەری بنگۆریۆن دەسوڕان، بەڵام هەر بەهۆی ئەوەوە وەزیرەکان دەسەڵاتی بەرفراوانیان وەرگرت، بەڵام هیچ بڕیارێکیان بە بڕیار نەدەژمێردرا گەر لە «رۆژنامەی دەوڵەتدا» بڵاونەکرابایەوە. ئەوەش تەنها لەوبارەدا پەخشدەکرا کە بڕیارەکە لە کابینەکەدا پەسند کرابا و بنگۆریۆنیش تەنها یەک دەنگی وەک ئەوانی دیکە هەبوو، بەڵام ئەو ئەجێندای کارەکانی کابینەی دادەڕشت. لەوەش گرنگتر ئەو بەهۆی کەسایەتیەکەی بەسەریاندا زاڵ بوو هەمو ئەندامانی کابینەکە بەرێزەوە سەیری تێڕوانینیە ئایندەیەکانی ئەویان دەکرد.

یەکێک لە گرفتەکان کە بنگۆریۆن لە ١٩٤٩دا پێی ئالودەببوو، ئەو سازشانەی بوو بۆ بلۆکی دیندارەکان، چونکە لە کنێستدا پێویستی بە شانزە دەنگی دیکە هەبوو تا زۆرینە بەدەست بهێنی.

بنگۆریۆن ئەوی پەژراند کە لە ناو سوپادا رینماییەکانی کۆشیەر Kosjer ( رێنمایی ئاینی جولەکە لەمەڕ حەڵاڵ و حەڕامی جۆرەکانی خواردن-وەرگێڕ) پەیڕەوبکرێ. لەوەیاندا مەبەستی هەبوو چونکە گەر لەنێو سوپادا دوو جۆر سیستمی خواردن هەبوایە یەکیان بە کۆشیەر و ئەوی دیکەیان بێکۆشیەوە ئەوا ئاشپەزخانەکانیشیان لەیەک جیادەبوونەوە، بەمجۆرە لە یەکترازانیک دروست دەبوو، بۆیە نەیویست وابێ، بەڵکو هەمویان ملکەچی یەک سیستم بن.

هەروەها ئەوەشی پەسەندکرد کە پرسی مارەبڕین و تەڵاقدان لای رابیەکان ببڕدرێنێتەوە. کریستیانەکان، عەڕەبەکان و جولەکە ئازادەکان (لادینەکان) دەبێ یان

لەسەر پشتی کەشتیەک یان لەدەرەوەی وڵات مارەی یەکدی ببڕن یان یەکدی تەڵاق بدەن.( چونکە کەشتی بە سنوری ئیسرائیل نازاندرێ-وەرگێڕ). لەوەشیاندا نەیدەویست گەلەکەی دابەش ببیتە سەر دوو بەرە، بە هۆیەوە ئەندامەکانیان هەرگیز لەگەڵ یەکدا ژن و ژنخوازی لەگەڵیەکدا نەکەن. لەبەرامبەر هەوڵی دیکەدا کە ئیسرائیل بەراستی بکەنە دەوڵەتێکی دینی (تیۆکراتییانە) بنگۆریۆن بەرپەچی دانەوە. لە ئیسرائیلدا بە شابات (شەممە) هیچ پاس و شەمەندەفەرێک کارناکەن، سینەماکان دادەخرێن، بەڵام لە هەندێ شوێنی دیارکراوی تەلئەبیبدا میوانان هێلکە و هام (گۆشتبەراز) یان بۆ ئامادەکراوە، یاخود داوایان لێدەکرا کە زۆرینەی ئیسرائیلییەکان لە ماوەی نێوان خۆرئاوابوونی رۆژی هەینی و شەممەدا جگەرە ناکێشن، بەڵکو تەنگەتاو نەکرێن.

گەورەترین کێشەی بنگۆریۆن لەگەڵ بلۆکی ئۆلدارەکاندا دەربارەی راژەی سەربازییانە بوو، کە کچانی (ئەوانەی مێردیان نەکردووە) تەمەن نێوان هەژدە تا بیست وشەش دەبووایە بچنە ژێر راژەی سەربازییەوە. لەمەیاندا پارتە ئەرسەدۆکسییەکان لەبەر گەلێک هۆوە دژی وەستانەوە و بەڵگەوبەندەکانیشیان لە بایبلدا هەڵدەهێنجا بەوەی بایبل ئەو شتەی قەدەخە کردووە کە ژنان خۆیان وەک پیاوان لێبکەن و جلی ئەوان لەبەربکەن. لە کاتی گفتوگۆکاندا دەبووایە سەرەک وەزیران پێیان بڵێتەوە کە :

«پێتانوایە کە ژنێک لە پشت مەترالیۆزێکەوە کەمتر سەرنجراکێشە لەو ژنەی لە پشت ئامێرێکی چاپدایە؟»

بنگۆریۆن لەگەڵ پارتە ئۆسۆدۆکسەکان لەسەر پرسی نوسینەوەی دەستوردا هاوڕابوو بەڵام لە بەڵگەوبەندهێنانەوەدا لەیەک جیاواز بوون.

قانونزانیکی زیرەکی ئیسرائیلیی کە لە دەستوری زۆربەی وڵاتانی کۆڵیبووەوە، رەشنوسێکی دەستوری ئیسرائیلی دارشتبوو.

کاتێک بنگۆریۆن کۆنسێپتەکەی خوێندەوە، تیایدا بەدیکرد کە ئەنجومەنێکی باڵای تێدا پێشنیازکرابوو، ئەنجومەنەکە لە دەسەڵاتی دابوو قانونەکانی کنێستەوە هەڵبسەنگێنی تەنانەت دەیتوانی هەڵیشیانبوەشێنێتەوە، ئەوسا گوتی :

من هەرگیز لێنا گەڕیم لە وڵاتەکەماندا پارێزەران دەمڕاست بن.»

ئەو نمونەی بەریتانیای گەورەی هێنایەوە کە دەستورێکی نوسراوی نیە. هەروەها ئەوەشی بەبیر هێنانەوە کە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئامریکا لە نێوان جاڕنامەی سەربەخۆیی و هاتنەکایەی دەستوریانەوە یانزە ساڵی رەبەقی خایاند. سەرەڕای ئەوەش دەستور لەڕوی کردەییەوە کاریگەرییەکی نادیموکراسیانەی دەبێ، چونکە هەموارکردنەکەی بە زەحمەت دەکەوێ. هەرچۆنێک بێ بەلای ئەو باشتر بوو جارێ چاوەڕێ بکەن تا تاراوگەییەکان زیاتر بگەڕێنەوە وڵاتی باب و باپیرانیان ، ئەوسا هەمو کۆمەڵگای جولەکەوە بەیەکەوە لە پرسەکە بڕوانێ.

هەروەها زۆریش لەسەر ئەو قانونە قسەکرا کە مافەکانی هاوڵاتیان لەخۆ بگرێ. لەمەیاندا بنگۆریۆن بە بێئۆقرەی گوتی:

«جارێ وا پێویستە بیر لە قانونێک بکەینەوە کە ئەرکەکانی هاوڵاتیان دیاریبکا.»

کاتێکیش مرۆ پرسی ئەوەی دەکرد ئاخۆ قانونی مافەکانی هاوڵاتیان چی لەخۆ بگرێ، هاتە وەڵام و گوتی:

«لە زمانی ئینگلیزیدا زۆر وشەی بۆ پێویستن، بەڵام لە زمانی عیبریدا تەنها سیانمان هەن : ڤیهاڤتا رەکها کامۆها Veahavta re-ekh`a kamoh`a (نزیکەکەت وەک خۆت خۆش بوێ).»

ئایا پێویستە ئیسرائیل لە شەڕی ساردا لایەنگری کامەیان بێ؟ ئەم باسەیان زۆرترین باسوخواسی لە رۆژئاوا لەسەردەکرا، بەڵام کە بەراشکاوانە باسی لێوەکرابا و هەڵوویست وەرگیرابا، رەنگبایە بە خراپی بەسەر ئەو ١,٨٠٠,٠٠٠ جولەکەی روسیاو ئەو ٨٠٠,٠٠٠ کەسەی بلۆکی رۆژهەڵات شکابایەوە. هەندێکیان لەوان دەیانەویست گەر دەرفەتیان پێبدرێ بەرەو ئیسرائیل کۆچ بکەن. نزیکەی ژیانی سێ ملیۆن کەس لەسەنگی محەک دابوو.

بنگۆریۆن هێشتا هیوای هەر هەبوو. لە دواییدا روسەکان لە لییک سوکسێس ( بارەگای نەتەوە یەکگرتووەکان ) دەنگیان بۆ دەوڵەتی جولەکان دا. بۆیە لەوانەیە...

ئەو زۆر بە ئارامی بۆیدەچوو.

«لەسەر هێڵێ ئێمە ئەوەیە کە پەیوەندی دۆستایەتیە سیاسیانەییەکانمان لەگەڵ هەمو دەوڵەتیکی ئاشتیخوازردا ببەستین، مافیشمان نیە خۆمان لە کاروباری ناوخۆیاندا هەڵبقورتێنین.»»

بنگۆریۆن گۆلدا مایرسۆن (گۆلدا مایر)ی ناردە مۆسکۆ، ژنێک کە لە میلاوکیی Milwaukee گەورە بـووە. بۆ پراگیش ئێهود ئاڤریل Ehud Avrilی گەنجە سۆشیالیستە بییرتیژەکەی بەڕێکرد. رێوڤن روبین Reuven Rubinی نیگارکێشی کە لە رۆمانیا لە دایک ببوو، لەگەڵ ئاننا پاوکەر Anna Paukerی وەزیری رۆمانیای کاروباری دەرەوەدا لە قوتانخانە بوو، ناردە بوخارست. هەر زو گۆلدا مایرسۆن بەهیوابڕاوی گەڕایەوە.

کاتێک لەنێو جوەکانی رۆمانیا زانرا کە ئیسرائیل کونسولخانەیەکی خۆی لەوێ دەکاتەوە، ئاپۆرەی جوەکانی بەخەونی سەوزوسورەوە بەسەردا باری کە بووە مایەی رێگای هاتوچۆ گیران. هونەرمەندە لەڕولاوازەکە بە بەخەڵکانێکی زۆر دەوردەدرا دوای ڤیزەیان لێدەکرد. لەسەرەتادا پێدەچوو ئاننا پاوکەر ئامادەی کۆمەککردنیان بێ و رۆبین بنتوانێ سەرپەرشتی لێشاوی کۆچبەران لە رۆمانیاوە بەرەو حەیفا بکا. لە ڕاستیدا ئەوان کەسانێکی بە تەمەن، پەککەوتو، نەخۆشەکان بوون: ئەو کەسانە بوون کە ئاننا پاوکەر و سەرۆکەکەی هێچیان بۆ رۆمانیا لێچاوەڕێ نەدەکردن. بەڵام ئەوانە جوەکان بوون کە بۆ وڵاتی زێدیان دەگەڕانەوە.

لە پڕێکەوە وەزیری کاروباری رۆمانیا سنورەکانی داخستن؛ هیچ جوێکی دیکە بۆی نەبوو وڵات بەجێبێڵێ، ئیدی رۆبین لە دواییدا بە ورەیەکی شکاوەوە گەڕایەوە نمایشگاکەی لە تەلیەبیب.

کۆچبەرەکان ئەمجارەیان لە ئاراستەیەکی دیکەوە بە شاڵاو دەهاتن؛ نەخۆش و لەشساخ، رۆژئاوای و رۆژهەڵاتی، جولەکەی سپی پێست و رەشپێست، هەندێکیان

سیلداریش بوون، ئەوانی دیکە دەستێکیان یان قاچێکیان لەدەستدابوو، لەنێویاندا جولەکەی بەخەندە و گرینۆک هەبوون، ژنە دووگیانەکان، پیاوە رەنگ دابزڕکاوەکان، بەڵام خۆ هەر هەمویان جولەکە بوون. بۆ ئەوان ماوەی بیست سەدە بوو دەرگای وڵاتی کتێبە پیرۆزەکەیان لەسەر داخرابوو، ئێستاش بەخێرهاتنەوەیەکی گەرمیان لێدەکرێ چونکە قانونێک دەرچووە، رایگەیاندووە کە هەمو جوەکانی دنیا مافیان هەیە بگەڕێنەوە، هەرچەندە گەر ڤیزا یان کاخەزەکانیشیان مۆرنەکرابێ.

خەمبارترین قۆناخی گەڕانەوە هی جوەکانی یەمەن بوو، وڵاتێکی سەدەکانی ناوەڕاست، وڵاتێک بە تاوی رۆژ رەشهەڵگەڕاوە و کەوتۆتەسەر دەریای سور، بە کردەوە هێشتا ئۆتۆمۆبیلیان نەناسیوە، مرۆڤ لەوێ جوەکانی لەوانی دیکە بە ئاستەم لە یەک جیادەکاتەوە. ئەرسەدۆکسە توندەکان کە خەڵکی زۆر بەرایی بوون بە پێنج فڕۆکەی Skymaster گواسترانەوە؛ فڕۆکەکان دەیانتوانی دوو ئەوەندەی گەشتی ئاساییانەی خۆیان سەرنشین هەڵبگرن، چونکە بەبێ ریزپەڕ هەمویان زۆر لەڕولاوازو چورچە بوون.

بۆ ئەوان و بۆ کۆچبەرانی باکوری ئافریکیا بنگۆریۆن داودی نوێ بوو. راستە ناونیشانەکەی سەرەک وەزیران بوو، بەڵام بۆ ئەوان پاشا بوو، فریادڕەس بوو. ئەو پەرجوی ئافراند. کاتێک سەردانی خێوەت و کۆڵێتەکانی دەکرد کە بە شێوەیەکی کاتی بۆی گواسترابوونەوە، ئەو سەردانی نەخۆشەکانی دەکردن بەو هیوایەی چاک ببنەوە.

تەنانەت بۆ کەسێکی وەک بنگۆریۆنیش کە سەر بە ئۆرسۆدۆکسەکان نەبوو، ئەو کەشوهەوایەی گەڕانەوەی کۆچبەران لە رازدارێتی بایبل دەچوو. ئەوەی لێرەدا رویدا لەوە زیاتر بوو کە تەنها دەرفەتی حەوانەوە و خانوبەرە بێ بۆ ئەو بێ پەنایانە، بەڵکو چەوساوەکان دەرفەتێکیان پێبدرێ تا وڵاتە نوێکە بە دەستپێکەکان پڕبکرێتەوە و بە بازوی گەنجەکانیشیان ئێشک لەسەر سنورەکانیان بگیرێ.

بۆ بنگۆریۆن ئەمەیان خاڵی وەرچەرخان بوو، ساتێکی مێژویین بوو، هەروەک لە دیرۆکی هەر رەگەزێکدا بەلای زۆری جارێک یان دوو جاران ئەو پێشهاتە سەرهەڵدەدا. لێرەوە خۆڕێکخستنەوەی هەمو گەلی جو دەستپێکرد.

لە کاتێکدا هاوکارەکانی لە حکومەتدا بەپرسی بێژماری ناڕۆشن سەریان دەیەشاند، ئاخۆ کێ سەرپەرشتی باجەکان بکا، یان چۆنیەتی دانانی بەرزایی باڵەخانەکان دەستنیشانبکرێ، پێویستە لە چ کاژێرێکدا قاوەخانەکان دابخرێن، لەو کاتەدا بنگۆریۆن هەوڵیدەدا گەلەکەی بهێنێتە سەر هۆشی ئایندە مەزنەکەی، هەوڵوتەقەللای بۆ ئەوەبوو گۆڕانە خێراکانی سەردەمەکەی بە ئاراستەیەکی گونجاودا ببا، ئەو هەوڵی دەدا زۆرترین، ئەفسانەترین، پەرجوترین پێشهاتی سەردەمی بهێنێتە گۆ.

پێویست بوو نوسراوەکان واژۆ بکا، لە بۆنەکاندا ئامادەبێ، رێگای وێنەگران بدا وێنەی بکێشن، راوێژ لەگەڵ وەزیرەکانی دیکەدا بکا، سەرۆکایەتی دانیشتنی کابینەکەی بکا، وەلێ پێش هەمویان دەیویست بۆ جیهانی رونبکاتەوە کە سەرهێڵەکانی دەوڵەتێکی نوێ شتێکی حاشاهەڵنەگرە. پێویست بەیەکێک بوو کە هێڵەکان لێکبداتەوە

و كە ئیسرائیل وێستگەیەکی ئەزموونداری دەبێ کە تیایدا دەرەنجامە زانستییەکانی بە کردەوە سەلمێنراون کە ئەزمونەکەیان سەرکەوتووبووە.

ئێستا ئەوەندە زۆر جولەکەی رەشپێست هاتون کە مەترسی ئەوە هەیە بەهۆی رەنگی پێستەکەیانەوە جیاوازبکرێنەوە. ئەو هەمو زمان و زاراوانە کێشەیان خوڵقاند. لەژیانی نەریتیانەی کۆچبەراندا گۆرانکاری شۆڕشگێرانە پەیدا بوون. مرۆ دەبوایە دژی جیاوازی چینایەتی بەئاگابایە. دەبووایە لەنێو کۆچبەراندا بانگەشەی کاری کشتیاری کرابا، تاکو نەبادا هەمویان لە دەوری تەلئەبیب کۆببانەوە و دوکانۆکەیەکیان دانابایە.

هەروەها لە ساڵی ١٩٤٩شدا بنگۆریۆن تەواوی دوان و وتارەکانی لەسەر کارتەکان دەنوسی کە بۆ ئەو مەبەستە بەکاریدەهێنان، تیایاندا پێشچاوڕونی پێدەدان بە جۆشی دەرخستن کە زۆر پێویست بوو تا خەونەکانی بە ڕاست وەربگەڕێن.

«گەر کۆچبەری تازەهاتو لەخۆیەوە حەزی لەوە نەبوو لە وڵاتدا جێگیر ببێ، ئەوا دەبێ بە خۆشەویستی و هاورێیایەتی پاڵی پێوە بنێین بمێنێتەوە...»

«ئێمە دەبێ هەمو ناوچەیەکی وێرانەی وڵاتەکەمان بە دارودرەخت دابچێنین بەم شێوەیە لە قوڵایی خاکی بابوباپیرمانەوە بێپێتی بێفەڕی ریشەکێش بکەین. خاکەکەمان سەرلەنوێ دەبێ ببوژێتەوە.»

گەر هاتو لەناکاو بەتاوی باران خێوەتاکانیان ژێرئاو بکەوێ، یان خواردنیان خراپ بێ، ئەوا باسکی هێزو بازو هیوای لێهەڵدەکا و پێ لەسەر خانوبەرەی باشتریان بۆ دادەگرێ تا بۆیان دروستدەکرێ. هێشتاش هەر رێبەرایەتیان دەکا تاڕاستەڕێ بگرنەبەر.

ئەو بەردەوام لە ڕیگەی راپۆرتەکانی بەردەستی لەسەر ئەو ئاستەی پێیگەیشتوون لەوەتەی هاتوون دنەیان دەدا و لەسەر بەردەوامبوون بەگەڕیان دەخا. لە هەفتەیەکدا دەبوایە بیستوپێنج هەزار خانو دابین بکرێ. لە گرد و زورگەکانیشادا مرۆ دەبووایە یەک ملیارد دارودرەخت بڕوێنن. هێزێکی پۆلیسی دووهەزار کەسی پێکهات کە سەرجەمیان جولەکە بوون. لە وڵاتەکەیاندا تەنها جولەکە دەیتوانی جولەکە بگرێ و بیخاتە بنچاوان. دەزگای کارگێڕی نزیکەی بە تەواوی لە رەگەزی گەندەڵیی سەردەمی مانداتدا پاککرابووەوە. بەهای پارەکەیان جێگیر ببوو. لە ئیسرائیلدا دامەزراوێکی گەشتی ئاسمانی دامەزرا. باش بوو دامەزراوەکەش تەنها یەک فڕۆکەیان هەبوو، بەڵام بە ئارامگرتن شتی دیکەی بەدوادادێ، شەمەندەفەرەکانیان کەوتبوونەگەڕ. کەشتیگەلیکی بازرگانیش رێکخرابوو. ئیسرائیل دەژیا. ئیدی ئیسرائیل ببووە نەتەوەیەک.

کاتێک لە ١٩٤٩دا ئیسرائیلییەکان بە نەقەبدا بڵاوبوونەوە، شا عەبدوڵا تەنگەتاو بوو؛ رێکەوتنامەی کاتی خۆی بەبیر بەریتانیای گەورە هێنایەوە، بەریتانیاش هێزەکانی ناردنە ئەکەبە Akaba. ئەکەبەش ئەو بەندەرەی ئوردن بوو دەکەوتە لاباڵی باکوری دەریای سور، کە تەنها بە دۆڵێک( Wadi وادي) لە بەندەری ئیلاتی ئیسرائیلی جیادەکرایەوە.

تاکە رێگای گەیشتنە ئیلات ریچکەیەک بوو بە زەحمەت بەنێو بیاباندا دەڕۆیشت

و نزیک بوو لە تخوبی ئیسرائیل و ئوردن. بۆ ئەوەی دەستیان بە ڕێگایەکەی دیکەدا ڕابگا پێشئەوەی ئوردونیەکان ڕێگەیان پێبگرن، بنگۆریۆن ڕێگەناسانی ناردنە گردە چۆڵ و وێرانەکانی دیوەکەی دیکەی نەقەب، لەو شوێنەی کە بیابان هاوسنوری وڵاتی میسرە. بە زەحمەت بەناو ئەو بەردەڵانەی دۆڵەکە و ئەو ڕێیەی کەسی پێدا نەڕۆیشتووە ڕەتبوون. دوا جار ڕاپۆرتێکیان دایە بنگۆریۆن تیایدا هاتبوو:

«زەحمەتە، بەڵام دەکرێ.»

ئەوەش بۆ بنگۆریۆن بەس بوو. ئیدی ئاللۆنی ڕاسپارد کە فەرماندەی هێزەکانی باشور بوو بۆ ئەوەی دوو تیپ بنێرێتە ئیلات، یەکێکیان بە ڕێگای ڕۆژهەڵات و ئەوی دیکەشیان بە ڕۆژئاواوە. دەبوایە مشوری ئەوەیان خواردبا کە ختوکەی عەرەبەکان نەدەن. هەر دوو تیپەکە ئەوپەڕی توانایان بەکارهینا کە ئاخۆ کامەیان پێشتر دەگاتە سەر دەریای سور. یەکێکیان چەند کاژێرێک پێش ئەوی دیکەیان گەیشتێ، بەڵام فەرماندەکەی بڕیاریدا چاوەڕێی دوهەمەکەیان بکا، تاکو بەیەکەوە بروسکە بۆ سەرەک وەزیران لێبدەن:

«سڵاومان لە ئیلاتەوە.»

لە پەرۆشیدا سەرەک وەزیران بە فڕۆکەیەک خۆی گەیاندە سۆدۆم Sodom لەوێشەوە بە ڕێگایەکی ناخۆشدا بەناو بیاباندا تاگەیشتە دوا دەروازەی وڵاتەکەی لە ڕۆژهەڵات نەوەستا.

هەفتەیەک دواتر، ئیسرائیل بووە پەنجاو نۆهەمین ئەندامی ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان. ڕاستی واقیع هەنوکە نزیک بۆتەوە.

سێ ڕۆژ دواتر ئاهەنگی یەکەمین ساڵڕۆژی سەربەخۆیی گێڕدرا. بنگۆریۆن لە دوانەکەیدا لە هێڵە سەرەکیەکانی دەرنەچوو، هەرچەندە هەمو هۆیەکی لەبەردەستدا بوو کە شانازی پێوەبکا. بە خێرایی دەستکەوتێکی بە بیرهێنانەوە (دووسەد هەزار کۆچبەر گەڕاونەتەوە)، بەڵام بابەتی سەرەکی دوانەکەی سادەییانە بوو.

لە حوزەیراندا ناونیشانێکی نوێی بەخشیە یادین ئەویش ڕاوێژکاری سەربازییانەی سەرەک وەزیران بوو.

لە خۆڕێکخستنەوەی سوپادا زۆر گرفت هاتنە پێشەوە. هەنوکە پلەی سەربازییانە، یەکبەرگیی، خەڵات و میدالیای ڕێزلێنان. یەکدوو نمونە نیشانی بنگۆریۆن دران. کاتێک سەرنجی دایە کە ناوی تۆڵەسێنەرە مێژوویەکانی وەک بار کۆچبا Bar Kochba، شاوڵ Saul و سیمۆن Simonی لەسەر بوو، ئەنجا گوتی:

«من ئامادە نیم میدالیای ڕێزلینانی شۆرەسوارانی سەربازی کە ناوی ئەو جوانەی لەسەرە لە نەبەردییەکاندا دۆڕاون، ببەخشمەوە. سەربازەکانم نابێ ئەو میدالیانە بە بەرۆکیانەوە بدەن کە ئەو کەسانە بهێننەوە یاد کە لە شەڕگە و نەبەردییەکاندا تێشکاون. ئێمە دەبێ یادەوەرییەکان بە زیندویی ڕابگرین، ئەو سەردەمانەیان بە بیر بێنینەوە کە بردومانەتەوە، نەوەک دۆڕابین.»

هەرچەندە بنگۆریۆن سەرقاڵ بوو بەڵام بەلای کەمیەوە ڕۆژێک لە مانگدا سەردانی دامەزراوە سەربازییەکانی دەکرد، بنکە سەرسنورییەکان و مەڵبەندی مەشقپێدانەکانی

بەسەردەکردەوە. هەروەها لەگەڵ فڕۆکەی تۆرپیدۆ جەنگاوەرییەکانیشدا دەفڕی. یەکێک لە تاقمی فڕۆکەوانەکان گوتی:

«ئەوە زۆر خۆش بوو سەرەک وەزیران کە کتێبی ئەفلاتونی لەدەستدا لە سێبەری یەکێک لە فڕۆکە شکێنەکاندا ببینی دابنیشێ. بە ڕاستی پێکهاتەیەکی پەڕجوانە دەسازێنی.»

تەمەنی ئەو گەیشتبووە نزیکەی شەست و سێ ساڵ، بەڵام هێشتا تین وزەی تەواوی وای تێدا بوو کە یاریدەرانی بە زەحمەت پێیڕا دەگەیشتن. ئەو بەردەوام هەوڵیدەدا بە بەرزترین گرددا هەڵدبگەڕی، هەمو هێڵی بەرگری ببینێ، هەمو پارچەیەکی چەکی بۆمباهاوێژ ببینێ، بەلای هەمو فڕۆکەکاندا بچێ، بەسەر هەمو تانکەکاندا باز بدا، سەربازانی هەمو بەشە جیاجیاکان بپشکنێ.

لەشکر بەردەوام جێنیشانەی ئەو بوو. ئەوەی دەدی کە ڕێکخراوەی داکۆکی لە سنورەکان دەکا، بەڵام لە پێشەوەی هەموانیش هۆکارێکی هەرە بایەخداری یەکێتیە بیخاتە باوەشی گەل تا زیاتر بە بیری نوێ پەرەی پێبدرێ.

جولەکەکانی کە لە یەمەن، ماراکۆ، عێراق و ئاوڕوپا تازە هاتبوونە ریزی سوپای ئیسرائیلی؛ سوپا فێرە زمانی عیبرییانەی کردبوون، فێری کردبوون کە چۆن بە چەقۆ و چەنگاڵ نان بخۆن ، چۆن بچنە نێو جێگایان، چۆن ددانەکانیان بشۆن. فێری مێژوی جولەکەیان کردن، فێری جوگرافیای رۆژهەڵاتی ناوین، دامەزراوەکانی حکومەت، پاکوخاوێنی و بەکارهێنانی سابون و ئەلفوبێیان کردن. ئەوەی زۆریش گرنگ بوو ئەوانەی لە هەمو گۆشەیەکی دنیاوە هاتبوون، ئەوانەی رەنگی پێستەکانیان لەنێوان تۆخی و کاڵیدا بوو، کە سەر بە شارستانیە جۆربەجۆرەکان بوون، چۆن بە هاوڕێیایەتی لەگەڵ یەکدا هەڵبکەن. لەشکر ئەو ئەرکەی بەو پەڕی لێوەشاوەیی بینی لەوەی کە بنگۆریۆن بە قوڵی بۆی دەهەژا. کاتێک ئەو وشەکانی تسڤا هاگانا دیزرائیل Tsva Haganah Deysrael (سوپای پارێزەری ئیسرائیل)ی گۆدەکرد، ئەوا وەک درود لەسەر لێوەکانی دەردەچوو.

ئەو سوپای بەوە هەڵدەسەنگاند ئاخۆ تا چەند توانیویەتی دانیشتوانی لە یەمەنەوە راهاتوو لەگەڵ خۆدا بسازێنێ. گەر هاتباو لەگەڵ دەستەیەک لە ئەفسەران دوابا، بەردەوام لێیدەپرسین:

«کێ لە ئێوە لە یەمەنەوەڕا هاتووە؟»

ئەو لە یەکەیەکەی دەپرسین، زانیاریی ئەوەی لێوەردەگرتن ئاخۆ لە کەیەوە چوونەتە راژەی سەربازییەوە، چ پلەیەکیان هەیە، بارەکەیان پێچۆنە. ئیدی هێشتا هەر دەیگوتەوە:

«ئێمە سوپایەکی باشمان نابێ تا ئەوکاتەی یەمەنییەک نەبێتە ژەنەڕاڵ.» (بەرزترین پلەی سەربازییانەی یەمەنییەک تا ئەوکات ماجۆر بوو.)

لە سەروبەری کۆتایهاتنی ساڵی ١٩٤٩دا دەبووایە بنگۆریۆن و دەوڵەتی ئیسرائیل بڕیار دەربارەی چارەنوسی ئۆرشەلیمەوە بدەن.

دوای چەند مانگێکی ئابڵۆقەی سەربازییانە شارە نوێکە نمونەی نەداری بوو. لە

هەمو شەقامێکیدا خەڵکی لێکوژرابوو، نزیکەی هەمو خێزانێکی شارەکە شیندار بوو.
لەو کاتەی لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئامریکدا لە بارەی ئایندەی ئۆرشەلیمەوە باسوخواس دەکرا، بنگۆریۆن و وەزیرەکانی هەوڵیاندەدا ژیانێکی نوێ بەبەر ئەوبەشەی شارەکەدا بکەن، کە کەوتبووە بندەستی جوەکان. دەست بە خانوبەرەی گەڕەکی نوێ کران. دە هەزار کۆچبەر ڕەوانەی ئەوێ کران. کارگە پیشەسازییە بچوکەکان کە ئامادەبوون لەوێ جێگیر ببن، لەلایەن حکومەتەوە کۆمەک کران. لە بریتی تەلئەبیب ئۆرشەلیم بۆ کۆنگرە سازدان بەکار هێنرا.
ئوستڕالیا لە بارەگای نەتەوە یەکگرتووەکان لە لییک سوکسێسدا پڕۆژە بڕیارێکی پێشکەشکردبوو کە سەرجەم ئۆرشەلیم بکەوێتە بندەستی نەتەوە یەکگرتووەکان.
پێش ئەوەی دەنگیشی لەسەربدرێ، بنگۆریۆن بە لێبڕاوانە ڕایگەیاند:
«جوەکان تەواو ئامادەن ژیانیان لەسەر ئۆرشەلیم دابنێن هەروەک چۆن ئینگلیزەکان لەسەر لەندەن، ڕوسەکان لەسەر مۆسکۆ و ئامریکاییەکانیش لەسەر واشنتن دایدەنێن.»
چوار ڕۆژان دواتر کۆمەڵەی گشتی نەتەوە یەکگرتووەکان سەرەڕای ناڕەزایێتی بەریتانیای گەورە، کەنەدا و وڵاتە یەکگرتووەکانی ئامریکا بڕیارەکەی پەسندکرد.
بنگۆریۆن دوو دڵ نەبوو. بانگەشەی بۆ ئەوەکرد کە شارە نوێیەکە ی ئۆرشەلیم لەمەولاوە پایەتەختی ئیسرائیل دەبێ.
هەندێکیان بەریانپێگرت، چونکە ئەو ڕێکخراوەی کە چاکەی ناساندنی ئیسرائیلی بەنێوچاوانەوەیە، بەو بڕیارە ڕەزامەند نیە. ئەوانی دیکە پێیان وابوو کە شارە نوێکە کە سەرجەمی جولەکەن بەکردەوەش هیچ شوێنێکی پیرۆزی کریستیانەکان موحەمەدییەکان (ئیسلامەکان)ی تێدا نەبوو، کە سەد هەزار جولەکەی لێدەژین، نابێ هەروا بۆ بەختی خۆی بەجێبهێڵدرێ. مرۆ نابێ هەستوسۆزی ئایینەیەکانی واتای ئۆرشەلیم بۆ جولەکەکان بەهەند هەڵنەگرێ.
ئەوەش شارە کۆنەکەی داود بوو. هەر لە تاراوگەییەوە جولەکەکان نوێژیان بۆ گەڕانەوە دەکرد.
ئامریکا کە دژی بە نێونەتەوییکردن بوو، تێبینییەکی بەهێزی دایە ئیسڕائیل تێیدا لەوەی ئاگادارکردەوە کە «هەنگاوێکی دژوارانە»نەنێ.
بەڵام بنگۆریۆن وازی لە نەخشەکەی خۆی نەهێنا. لە ماوەی پایزی ئەوساڵدا بێئەوەی سەرنجی زۆر بۆ خۆی کێشبکا یەکدوو دامەزراوەی حکومەتی ناردنە ئۆرشەلیم. ئەوسا سواری ئۆتۆمبێلەکەی خۆی بوو لە تەلئەبیبەوە بەرەو شاری پیرۆز کەوتەڕێ، ماوەی نێوانیان ٧٢ کیلۆمەتر بوو، چونکە هەندێ لە دامەزراوەکانی دیکەی حکومەتیش لەوێ بوون. ئەوەی ئاشکرا کرد کە لە دواییدا کەنیستیش لە ئۆرشەلیم کۆدەبێتەوە. هەمو وەزارەتەکان دەبێ بۆ ئەوێ بگوازرێنەوە، تەنها وەزارەتی بەرگری نەبێ. وەزارەتەکە لە شوێنی خۆی لەبەر هۆی ستراتیژی لە تەلئەبیب دەمێنێتەوە. هەروەها وەزارەتی کاروباری دەرەوەش تا سێ چوار ساڵێک هەر لە تەلئەبیبدا دەمێنێتەوە تاکو دیپلۆماتە بیانییەکان توشی هەڵوێسی نەخوازراو

نەکەن؛ بۆ هەندێکیان زەحمەت بوو دوای دەرچوونی بڕیاری نەتەوە یەکگرتوەکان بۆ ئۆرشەلیم بگوازنەوە.

ئەوە دوو ساڵ بوو بنگۆریۆن ئۆرشەلیمی بەجێهێشتبوو تا سەرقاڵی جەنگەکەی بێ؛ ئەوکات کلیلی ئەو باڵەخانەیەی کە ئاژانسی جوەکانی تێدابوو لە گیرفاندا نابوو، گوتی:

«ئەمەیان هەڵدەگرم. من بیرم بۆ ئەوە دەچێ کە بۆی دەگەڕێینەوە. هەنوکە ئەو ساتە هاتەوە کە کلیلەکە بەکاربهێنمەوە.»

# بەشی
# (١٩)

لەسەردەمی مانداتەوە ئاژانسی جولەکان لە سەر ڕێگای جۆرجی پێنجەمدا، خانوێکی گەورەیان بەبەردی سروشتیەوە دروستکردبوو؛ هەمو دامودەزگاکانی جوەکانی بۆ گوازرابووەوە. دوای ١٩٤٥دا لە دیوی پشتەوەیدا باڵەخانەیەکی سێ نهۆمییان دروستکرد، ڕوەکەی دەکەوتە سەرشەقام کە لە هەردوولا دارودرەخت بوو، بەرێکەوتیش هەمان ناوی شەقامەکەی تەلئەبیبی هەڵگرتبوو کە بنگۆریۆنی لێدەژیا ئەویش ناوی کێرن کایەمەت Keren Kayemet بوو.

ئیدی بنگۆریۆن لە ١٩٥٠دا جارێکی دیکە گەڕایەوە خانوەکە، بەڵام ئەمجارەیان وەک سەرەک وەزیران بەخۆی و سکرتێرەکەی، یاریدەدەرە سەربازییەکەری، کارمەندانی نوسینگەکەی، تایپیستەکە تاکو ئەو دوانانەی لەسەر کارتەکانی دەنوسین تایپیان بکا، بەمشێوەیە بەخۆی و تەواوی ستافەکەی هاتە ئەوێ. نوسینگەی تایبەتی بنگۆریۆن لە نهۆمی دوهەم بوو کە هۆڵێکی نۆ بە دوانزە مەتر بوو. سەر هەر چوار دیوارەکانی نەخشەڕێژ کرابوو. لەپشت مێزی نوسینگەکەی نەخشەیەکی گەورەی دومەتر چوارگۆشەی هەڵواسرابوو کە وڵاتە عەرەبییەکانی بە ڕەنگی سور ئاماژەکرابوون، باقی دیکەی جیهان ڕەنگەکەی زەرد بوو، ئیسرائیلیش خەتێکی شینی تۆخ بوو. ئیسرائیل لەسەر نەخشەکەدا ئەوەندە بچووک بوو مرۆ بەئاستەم دەیدۆزیەوە. لێرەوە لەنوسینگەکە سەرۆک و میوانەکانی بەردەوام بارودۆخی جیۆسیاسیەکەیان بەبیردەهاتەوە.

«بنگۆریۆن دەربارەی پرسەکە گوتی: «ئاوا ڕۆژ لەسەر ڕۆژ دەبینم کە ئێمەچەند بچوکین.»

لە دیواری بەرامبەریشیەوە نەخشەی ئۆرشەلیم هەڵواسرابوو، کە نزیکەی هەمو باڵەخانەیەکی ئەوێ نەخشەیەکی وای هەبوو. لە یەکێک لەلا دیوارەکانی دیکەدا نەخشەیەکی گەورەی ئیسرائیل هەڵواسرابوو لە تەنیشتیشەوە نەقەب بوو. لە دیواری چوارەمیشدا نەخشەیەکی وڵاتانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست دانرابوو.

تاکە پۆرترێتی هەڵواسراو لە ژورەکەدا تاساڵی ١٩٥٨ وێنەیەکی بێرل کاتزێنسلۆن بوو کە لە چوارچێوەیەکی چەرمیندا دانرابوو. وێنەکە لەلای چەپی نوسینگەکە بوو. سەرنوسەرە کۆچکردووەکە هەندێک لە ئاینشتاین و برێکیش لە شوایتزەر Schweitzer دەچوو.

جگە لەوانە لەسەر نوسینگەکەی ڕۆژمێرێکی لێبوو کە حیسابی ڕۆژە کریستیانی و جولەکەکانی دەکرد، هەواگۆڕکێیەکی ڕەش، مەرەکەبدانێکی مەڕمەڕ و دوو قەڵەمی پاندان (بنگۆریۆن حەزی لە قەڵەمی وشک(جاف) نەبوو)، بایبلێک، پێڕستی ناو و شوێنان تا بتوانێ بەئاسانی لەبایبلدا بگەڕێ، چوار ئامێری تەلەفون، سێی ڕەنگ ڕەش و یەکی سپی. ئامێرە سپیەکەیان بۆ پەیوەندیکردن بوو بە سکرتێرەکەی بۆ باری پەلە و پێویست.

ڕوی مێزی نوسینەکەی بە پارچەیەکی تەختی شوشە داپۆشراوە، لەژێریەوە پارچە کاخەز هەبوو کە نوسینەکەی لە دوو ئایەتی بایبل پێکهاتووە. لەماوەی پشوەکانیش یەکیانی بەوی دیکە دەگۆڕی.

لە نوسینگەکەیدا شەش کورسی چەرمین هەبوون. بەشێکی زەمینەکە بە مافورێکی ڕۆژهەڵاتییانە داپۆشراوە. لە دیوەکەی دیکەی ژورەکە لەسەر مێزۆکەیەک پەیکەرێک کە لە ئیسرائیل دروستکراوە، دانراوە، لەگەڵ دوو کورسی و قەنەفەیەکی لەدەروەیە دانراوە.

بێجگە لە نەخشەی وڵاتان و چوار دۆلابی پڕ کتێب ژورەکە دەکرا ژوری بەڕێوبەرێکی بانک یان سەرپەرشتکاری قوتابخانەیەکی گیمناسیۆم بووبایە.

بەهۆی نەخشەکانەوە دەتزانی کەتۆ لە ئیسرائیلدای. کتێبەکانیش ئاماژەیەکی باش بوون بۆ هەمو ئەوانەی بنگۆریۆنیان دەناسی، دەیانزانی کە ژورەکە هی ئەوە. لەیەکێک لە ڕەفەکانی دۆلابی کتێبگرەکە ئەو کتێبانە دانرابوون کە خۆی نوسیبوونی. ئەوانی دیکەش بەرهەمی نیو دەرزەن زمان بوون دەربارەی فەلەسەفەوە نوسرابوون. یەکدوو هەنگاو بەولاوە کەبۆ ژوری کۆبوونەوەی کابینەی حکومەت دەچوو، هۆڵێکی شانزە کورسیی بوو، کە بە چەرمێکی بۆر بەرگکرابوون بەدەوری مێزێکی گەورەی ڕەشدا. لەسەر دیوارەکانیشدا نەخشە هەولواسرابوون لەگەڵ پۆرترێتێکی تیۆدۆر هێرزل دانەیەکی لەبەرگیراوەی جاڕنامەی سەربەخۆیی.

کاتێک بەیەکجاری شاری پیرۆز وەک پایەتەخت دەستنیشانکرا، ئیدی ڕێگای تەلئەبیب بۆ ئۆرشەلیم پڕ ئاپۆرەترین ڕێگای ڕۆژهەڵاتی ناوین بوو. زۆر لە فەرمانبەرەکان ماڵێکیان لەسەر زێ بوو کە بە ماڵی دوایین ڕۆژانی هەفتە دەیانژمارد.

ئەوەش گەشتێکی خۆش نەبوو. چونکە لەدوری یەک کیلۆمەتر مرۆ توشی سنوری ئوردن دەهات. بۆ ئەوەی بەیادی ئەو قوربانیە زۆرەی گەلی ئیسرائیل لەپێناو پاراستنی ڕێچکەی ئۆرشەلیمیان دابوو، هەندێ ئۆتۆمبێلی پەکەوتە و کونکراو بە گوللە لەمبەر و ئەوبەری جادە دانرابوون، کە بەهۆیە بەردەوام لەهەوڵی شکاندنی ئابلۆقی لەشکرە عەرەبیەکاندا بوون. ئەو ماشێنانە بە بۆیە ڕەنگکران هێمایەکی بیۆێنەی یادەوەریەکانی شەڕیان نیشاندەدا. کە مرۆ لە ئۆرشەلیم نزیک دەبێتەوە، ڕێگاکە پێچاوپێچ بەناو گرد و زورگەکانی جودیادا نمایشی خۆی دەکرد.

بنگۆریۆن کاتەکەی خۆی دابەشی سەر هەردوو شارەکان کرد. لە پێنجشەممە، هەینی و شەممماندا لە تەلئەبیب دەبوو، لەو شوێنەی لە ماڵەکەی لە کێرم کیامەت بوو بەرەو وەزارەتی بەرگری دەچوو. لە ئێوارەی شەممەدا کاتی خۆرئاوابوون

یان بەیانیە زوەکەی یەکشەمەدا  لەگەڵ هاوسەرەکەی و یاریدەدەرە سەربازییەکەی دەهاتە ئۆرشەلیم. کابینەی حکومەتەکەی لە ڕۆژانی یەکشەمەدا کاژێر ١٠ی سەر لەبەیانی کۆدەبووەوە؛ دانیشتنەکەیان ئاساییانە هەمو ڕۆژەکەی دەخایاند. ڕۆژانی دووشـەمـە، سێشەمە و چوارشەممان ئاسایی لە نوسینگەکەی خۆی دەبـوو لەو باڵەخانەیەی کەوتبوە سەر جاددەی شا جۆرجی پێنجەم. لە ئێوارەی پێنجشەممەوە دەگەڕایەوە تەلئەبیب.

لە سەرەتاوە بنگۆریۆن لە ئۆرشەلیم لە میوانخانەیەک دەمایەوە، بەڵام دواتر حکومەت خانوێکی  لەوێ بۆ کرێ. هەنوکە ئەو لە گەڕەکی ڕێهاڤیا Rehavia، شەقامی بن مەیمون Ben Maimon ژمارە ٤٤دا دەژی. خاوەنی پێشوتری خانوەکە لە تەقینەوەکەی  میوانخانەی شا دادودا گیانی لەدەستدا.

ئا بەم شێوەیە پاولای تەمەن پەنجا و هەشت ساڵان دەبووایە مشوری دوو خانوان بخوا. بەڵام هێشتاش  هیچ خزمەتکاری بۆ هیچ کام لە خانوەکان بەکرێ نەگرت.

خانوەکەی سەر شەقامی بن مەیمون لە دوو نهۆنم و  باخچەیەکی گەورە پێکهاتبوو. بنگۆریۆن کتێبەکانی لە نهۆمی دووەمدا دانان، ئەو کتێبانەی لە خانوەکەی تەلئەبیبدا جێگەیان نەدەبووەوە، بەڵام کتێبخانە تایبەتییەکەی هێشتا هەر لە تەلئەبێب هێشتەوە، هەر لەبەر ئەوەش بوو زیاتر لەوێ هەستی بە ئارامی ماڵ دەکرد. لە  خانوەکەی ئۆرشەلیمیدا تابلۆیەکی گەورەی باخێکی زەیتون هەڵواسرابوو کە لە لایەن نێردەی پێشوی ڕۆمانیاوە  کێشرابوو.

لەڕاستیدا وەزارەتی کاروباری دەرەوەی ئامریکا لە نێردەکەی خۆی ماکدۆنالد قەدەخە کردبوو  کە لە ئۆرشەلیمدا بەدوای بنگۆریۆندا بگەڕێ. گەر هاتباو پێویستی بەڕاوێژ لەگەڵ سەرەک وەزیرانی ئیسرائیلدا هەبووایە، ئەوا پێویست بوولە تەلئەبیبدا بیبینێ، لەو شوێنەی کە سەرەک وەزیران ڕێک وەک وەزیری کاروباری بەرگری کاریدەکرد.

لە ڕۆژێکی گەرمی شێداردا، ماکدۆلاند و ژنەکەی دەیانەویست لە گردەکانی جودییا بەدوای هەوایەکی فێنککەرەوەدا بگەڕێن. دواتر بڕیارڕیاندا بەڕێگای ئۆرشەلیمدا بگەڕێنەوە و لەسەر ڕێگای خۆشیاندا سەرێک لە ماڵە نوێکەی پاولا بدەن. ماکدۆنالد هاوسەرەکەی دڵنیاکردەوە کەئەم سەردانەیان هیچ سەرپێچییەک نیە لە ڕێنماییەکانی وەزارەتـی کاروباری دەرەوەیـان. ئەوکات هەواڵێک لەسەر ڕوپـەڕی ڕۆژنامەکان هەبوو گوایە بنگۆریۆن بۆ ئامادەبوون لە کۆنفڕانسێکی سەربازیی، چووەتە ئێلات؛ کەواتە سەردانەکەیان سەردانێکی کەسیی تایبەتیانە دەبێ، ئەوان دەچن سەری ماڵە نوێیکەیان دەدەن و هیچ پەیوەندی بە کاری دیپلۆماتیانەوە نابێ.

لەو کاتەی ئەوان لە ماڵە نوێیکەی پاولا لەئۆرشەلیمدا چایان دەخواردەوە، بینیان کابرایەک بە کراسێکی نیوقۆڵ و قاپقاپە لەپێ بەژور کەوت.

ماکدۆناڵد بە شڵەژاویەوە بانگیکرد: «ئاخر تۆ لە ئێلاتی!»

بنگۆریۆن بە پێکەنینەوە بەرسڤی دایەوە: «بەڵام بەیانی.»

ئەوکات شەڕی کۆریا تازە حەوت ڕۆژ بوو دەستیپێکردبوو، هەردوو لایەنیش

دەیانەویست گفتوگۆی لەبارەیەوە بکەن. لەوکاتەیدا خانمەکانیان لە باخچەکەدا بوون، ئەوان چوونە ژوری میوانان گفتوگۆیەکی گرنگ و چڕوپڕی یەک کاژێریان لەو بارەیەوە کرد.

لەوکاتەی نێردەی ئامریکا گەڕایەوە تەلئەبیب، بروسکەیێکی بۆ وەزارەتی کاروباری دەرەوەی خۆیان لێدا و پوختەیەکی دیدارەکەی لەگەڵ بنگۆریۆندا باسکردبوو. ڕۆژێک پاشتر وەزارەتی کاروباری دەرەوەی ئیسرائیل لەریگەی نێردەکەیان لە واشنتۆنەوە لە پێشهاتەکە ئاگادار کرایەوە. کە سەرەک وەزیرانیش ماکدۆنالدی دیتەوە بەوەی سەرزەنشتکرد کە قسە تایبەتییەکانی گەیاندوون.

بنگۆریۆن بە پێکەنینەوە زیاتری لەسەر رۆیشت: «بێجگە لەوەش خودی حکومەتەکەی تۆ دەڵێ بەهیچ شێوەیەک نایانەوێ لەگەڵ مندا لە ئۆرشەلیم باسوخواس بکەن!»

لە میانی ساڵی ۱۹۵۰دا دەبووایە بنگۆریۆن بڕیاری سیاسیانەی گرنگ بدا.

ئاوارەکان بەئاستیکی خێرا دەگەڕانەوە، تێکڕای لێشاوی هاتنەویان ئەمجارەیان لەهەر خولەکێکدا دوو تا سێ کەس دەبوون. لەماوەی ئەو دوو ساڵەی دوای جاڕدانی سەربەخۆیی نزیکەی چوارسەد هەزار کۆچبەر گەڕابوونەوە. بۆ هەر تاکێکی گەڕاوە خەرجی هاتنەوەکەی، دابینکردنی نیشتاک، خۆراک و پۆشاک و مەشقپێدانی دووهەزار و پێنجسەد دۆلار لەسەر حکومەت دەکەوت.

ئیسرائیل لەمێژ بوو بە ملیۆنان دۆلاری خەرجکردبوون، پارەکەشی لە بانکی هاوردە و هەناردنەوە قەرز کردبوو، پاشانانیش بەملیۆنانی دیکەی خەرجکردبوو کەلەڕێی باروبوکۆکراوەی سیای CIA پێگەیشتبوو.

بەهەزاران کۆچبەر لە رەشماڵگەکان دەژیان. گەر هاتباو بباریبا، ئاویان لێدەچووە ژور. زۆریان ئۆقرەیان لەبەر هەڵگیرابوو، تاکتاکەیان داوایان دەکرد بگەڕێنەوە ئەو شوێنەی کە لێیهاتبوون. رەوشی ئابوری وڵات لەو کاتەدا زۆر زەبون بوو. هەرچەندە خەڵک نەیدەزانی، بەڵام ئەوکات تەنها بایی سێ رۆژ گەنم لەسایلۆ و ئەمبارەکانی ئیسرائیلدا بۆ یەک ملیۆن ککەس هەبوو. گەر هاتباو کەشتیەکی گەنم هەڵگر لە ڕێگادا دواکەوتبا، ئەوا دەبووە مایەی نانەوەی کارەساتێکی نیشتمانییانە.

بنگۆریۆن لەهەمو لایەکەوە رەخنەی لێگیرا، نەخاسمە لەلایەن پسپۆڕە داراییەکاندا. بە مەزندەی ئەوان دەبووایە کێرڤی ئاستی گەڕانەوەی ئاوارەکان دابەزێنرابایە. هیچ جولەکە لە ئۆردوگا ئاوارەییەکانی ئاوڕوپا نەمابوون. کۆچبەرەکان لە باکوری ئافریکاوە دەهاتن. بەڵام هەلومەرجی ئەوێ زۆرخراپ نەبوو. گەر هاتباو مانگێک تەنانەت ساڵیکیش کۆچبەرەکانی ماراکۆ، تونس وجەزائیر لەگیتۆکانی خۆیاندا مابانەوە هیچ نەدەبوو. ئەوان لەمێژە بەچەندان سەدەیە وەک هاوڵاتی پلە سێ دەژیان. ئایا بارودخۆخی سەقامگیری و پاشەڕۆژی دەوڵەتە تازە ساواکە بەهۆی هاتنی بێسنوری کۆچبەران ناکەوێتە بەر هەڕەشەوە؟

بنگۆریۆن گوێی لە هەمو بەڵگەوبەندەکان دەگرت، ئەوسا بڕیاری دەدا. گەر بێت و وڵاتەکەی بەرەو نەمان شۆڕکاتەوە ئەوا هەرگیز مێژو لێیخۆشنابێ. بەڵام ئەو

ڕێگای هیچ سنووردارکرنێکی گەڕانەوەی ئاوارەکانی نەدەدا و ئامادە بوو پێشەوایەتی گەلەکەی بۆ ئەوە بکا کە دوای سێ یان چوار ساڵی دیکە لە ئیسرائیلدا دوو ملیۆن کەس بژین.

ئەو باش دەیزانی وڵاتێکی دوو ملیۆن کەسی دوو ئەوەندە دەرفەتی ژیان و مانەوەی لە دەوڵەتێکی یەک ملیۆن دانیشتوان زیاترە. هەروەها دەشیزانی دەبێ بە زویی نشینگە لە نەقەبدا دروستبکرێن، دەنا بیابانیش لەدەست ئیسرائیل دەردەچێ. ئەو دەیزانی کەدەبێ خەڵک لە دوروبەری ئۆرشەلیمدا جێنشین بکرێن.

بە ئەرخاینبوونەوە هەستی ئەفسوناى هەبوو بەوەی گەر هاتو لەتای تەرازوودا دابنرێن ئەوا گەڕاندنەوەی ئۆرشەلیم لەخودی دەوڵەتەکە گرنگترە. ئەدی کەواتە لەبەرامبەردا چ دەبێ گەر کەمێک لەبن باری برسێتیدا بناڵێنن؟

پیاوە بەرچاو ناودارە جولەکەکانی نیشتەجێی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئامریکا بانگی ئیسرائیل کران و بنگۆریۆن دەقاودەق ئەوەی پێگوتن کە بۆچی بەدوایدا ناردوون: ئێمە لە ماوەی ئەو دوو ساڵەی بەسەریەکەوەی داهاتوودا  پێویستیمان بە یەک ملیارو نیو دۆلارە دەبێ. دەوڵەتی ئیسرائیل دەرەقەتی بڕی سێیەکی پارەکە دێ.»

سەرکردە ئەمریکاییەکان گەڕانەوە ماڵی خۆیان؛ هەفتەیک دواتر کۆنفرانسێکیان لە واشنتۆندا  ڕێکخست و نەخشەی ئەوەیان دانا کە چۆن یەک ملیار دۆلار کۆبکەنەوە، بەگشتی بڕیار لەسەر پلانەکە درا.

لە ڕۆژێکی گەرمی ١٩٥٠دا بنگۆریۆن کۆبوونەوەیەکی بە ستافی ژەنەڕاڵەکان و چەند گەورە ئەفسەرێکی لە تەل هاشۆمەر Tel HaSomer کە مەڵبەندێکی سەربازیی نزیک تەلئەبیب بوو، کرد. لەوێدا دوانێکی بە ناونیشانی «بانگردن و ئەرکەکان» دا.

ئەوەش بەڕاستی خۆی لەخۆیدا پرسێک بوو ئایا هەرگیز ڕویداوە کە سوپاسالارێک لە ژیانی ئێستاماندا و لە سەدەکانی بەرێشدا ئاوا بەو شێوەیە ڕوی دەمی بکاتە ئەفسەرەکانی و لەگەڵیاندا بدوێ. دواندانەکەی سێ کاژێری بێ هیچ پچڕانێک خایاند. لە دوو کاژێری یەکەمدا بەئاستەم باسی سوپای بۆکردن. باسی سەرەکی بنگۆریۆن کاروباری سەربازییانە نەبوو. ئەو سەرەتا وەک ڕوحانییەک بە دەقێکی بایبل لە کتێبی دیۆتۆرۆنۆمیۆم Deuteronomiumەوە دەستیپێکرد:

«لەبەر ئەوە نەبوو کە ئێوە لە گەلانی دیکە زۆرتربوون، بۆیە زمانی عیبریی دایە ئێوە و ئێوەم لێهەڵبژاردن؛ خواوەند زمانی دایە بچوکترین گەلیش، بەڵام لەبەرئەوەی خواوەند ئێوەی خۆشدەویست...»

بنگۆریۆن ئەو تێکەڵە نائاساییەی وڵاتانی سەبارەت بە پرسی ئۆرشەلیمدا بەبیرهێنانەوە کەدژی ئیسرائیل وەستاوەنەتەوە: وڵاتە عەرەبییەکان، ئامریکای باشور، فەڕەنسا (کەپێشتر بەردەام پشتی ئیسرائیلی دەگرت)، بلۆکی کۆمۆنیزم و ئەو وڵاتانەی کە زۆرینەی دانیشتوانەکانیان  کاسۆلیکین.

چەند ڕستەیەکی دیکەی گوت، ئەنجا گەڕایەوە سەر بایبلی دێرین؛ جەنگاوەرەکان دەرسێکیان لە مێژوی کلتورە کۆنەکان وەرگرت، بەوەی کە بایبل سەردەستەیان بووە کە لێکۆڵینەوەیان دەربارەی  ئەستێرەناسی، زانستی داودەرمان، بیناسازی کردوە و

لەوەدا پێشینە داهێنەر بوون. پاشان باسی شارستانێتی  قیبتی (میسری) بۆکردن؛ ئەوەی بۆ رونکردنەوە باب و باپیرە دێرینەکانی دوژمنەکانیان کە خۆشیان زۆر لەمێژ نیە دژتان وەستانەوە(رەنگبێ لەداهاتوشدا دژیان بوەستنەوە) بنەمای ئەرکی زانستەکانی  بیرکاری، تەکنیک، کیمیا و وەستای بیناسازی کارامەیان  دارشت.

کاتێکیش یەکێک لە ئەفسەرەکان بۆ چاوتروکانێک ببۆژابا، ئەوا یەکسەر رادەچڵەکی و سوپاسالارەکەشی باسی شۆڕشی روسی و فەڕەنسای بۆ دەکردن. بار کۆچباBar Kochba (سیمۆن بار کۆچبا سەرکردەیەکی بەرگریکاری جولەکە بوو، سەرکردایەتی راپەڕینی بارکۆچبای لەدژی ئیمپراتۆریەتی رۆمانەکان لەساڵەکانی نێوان ١٣٢ تا ١٣٦ی زاینی کرد. لەلایەن هەندێ لەجولەکەکانەوە لە سەردەمی راپەڕنەکەدا بە فریادرەس ناوی دەهات-وەرگێڕ) بەلشەفیکەکان بەیەک هەناسە ناویان دەهات.

پاشان باسی سەربردەیەکی خۆشی خۆی لەسەردانەکی ساڵی ١٩٢٣دا بۆ روسیا کرد، ئەوکات  بەنوێنەرایەتی هیستادروت چووبووە نمایشگایەکی کەرتی کشتوکاڵی. گروپێکی جوە کۆمۆنیستەکان (کە زیاتر رکیان لە زایۆنیزم و زمانی عیبری دەبووە لەخۆشەویستیەکەیان بۆ کۆمۆنیزم)  هەوڵیاندا وا لە دەسەڵاتدارانی روسیا بکەن کەرێگەی چونەناوەیان پێنەدەن.

لە باسی کتێبی گێنیسیوس Genesusدا هاتەوە سەر ساڵی ١٩٥٠. لە ئاینشتاینەوە چووە سەر یونس Jona. لە موحەمەدەوە بۆ سەر ئەفلاتون، لە لینینەوە بۆ سەر خمێلنیتسکی Khmelnitski  لەویشەوە بۆ سەر هیتلەر.

هەندێ لە ئەفسەران ئەو هەستەیان لا پەیدا بوو کە لەنوسینگەی زانایەک دانیشتوون کە زۆر بە تیژی بیردەکاتەوە.

گریمانە ئەبستراکت و کۆنکرێتەکانی بەیەکەوە  کورتدەکردنەوە دەیخستنە قاڵبێکی گشتی.

«هەروەک چۆن ئێمە گۆشتی ئەرجەنتینی و گەنمی روسی دەخۆین، چۆن تراکتۆر و ئامێرەکانی ئامریکایی بەکاردەهێنین، پۆڵای بەلژیکی دەتاوێنینەوە، وەک چۆن بەنزینی ماکسیکی بەکاردەهێنین و قوماشی بەریتانی دەپۆشین و خانوەکانیشمان لەداری کەنەدی دروستدەکەین، ئاواهاش دەبێ ئێمە کتێبەکانی ئەو هەمو نەتەوانە بخوێنینەوە بەدوای هۆشمەندییدا بگەڕێین و بیدۆزینەوە.»

بنگۆریۆن دەیویست ئەو ئەفسەرە گەنجانە کە زۆری خۆشدەویستن بیانجۆشێنێ. خوازیار بوو دنەی پەرۆشیان بۆ مێژو وەک خۆی دەیزانی، بدا. دەیەویست لە نیگا پێشبینییە سروشەکەیدا پشکدار بن.

ئەفسەرەکان بە سەرنجراکێشراوی گۆیان بۆقولاغ کردبوو.

«لەنێو نەتەوەیەکی بچوکی وەک ئێمەدا بەردەوام گروپی لێهەڵدەکەوێ کە هەستیار بن بەرامبەر هێزی راکێشانی زلهێزەکان کە دەتوانن لە بواری سیاسیی، ئابوریی و سەربازییانەدا  دەستیان باڵابێ، بۆیە کارانگازییان بەسەر جیهاندا هەیە. ئەوان لەو رەهەندەدا هەستی کێشبوونیان بە هیوای سودمەند بوونە، هەرچەندە پێویستە ئێمە نابێ ئەو هۆکارە بەراییانە بەهەند هەڵنەگرین، هەروەها نمایشە مەزنەکان هێز و

دەوڵەمەندی ئەو زلهێزانەش نابێ فەرامۆشبکەین.
ئەو لاوازی و بەخۆداشکانەوە و دەنگی خۆبەکەمزانین لەمێژوی نوێی ئێمەدا بە مایۆفس mayofes ناویهاتووە. جوە مایۆفسەکان مرۆڤ لەناو ئەوانەدا دەیاندۆزیتەوە کە ڕێزی تەوای خۆیان ناگرن یان متمانەیان بە ئایندەی نەتەوەکەیان لەدەستداوە. لە ژینگە راسترەوەکاندا بە ئەنجومەنی جولەکان ناودەبرێن کە لە لایەن ملیۆنلێرە ئامریکاییەکان رابەرایەتی دەکرێن، لەنێو باڵە چەپرەوە شۆڕشگێڕەکانیشدا بە یەڤیکتزیا Yevektzia ناودەبرێن(باڵی جولەکەی پارتی بەلشەڤیک) و لەلایەن نوسەرانەوە پێکهێنراوە و بەردەوام قسەکانی بەرپرسە باڵاکانیان کاوێژ دەکەن.»
ئەو ئاماژەی بەو زیندوێتیە کرد کە رەگەزی جولەکەی لەماوەی ئەو هەمو سەدانەدا پاراستووە، ئاماژەی بە لێکۆڵینەوەی زانایان، فەیلەسوفان کرد کە لە ریزەکانی ئەوان پەیدابوونە.
«هەروەک ئەوە وایە کە گەلەکەمان ڤیتامینیکی بەهاداری هەبووبێ، کە مانەوی پاراستووە و هێشتاش هێزێکی لەشکاننەهاتوی داوەتێ کە بەرامبەر نەیاران و هێزی دەرەکی خۆی رابگرێ کە هەرەشەن لەسەر نەتەوایەتی و مۆراڵی ژیانەکەی...»
ئەو هەڵسەنگاندنەی بەگوێی گوێگرانیدا دا:
«لە سەردەمی ئێستاماندا کارێکی ئاسانە کە خۆمان لەدەست ئاوارەییە فیزیکەیەکەدا رزگار بکەین. مرۆ دەتوانێ لە ئیسرائیل بسەنگرێتەوە. وەلێ ئەوە زۆر ئەستەمترە کە مرۆ خۆی لەدەست گیان و رەوشتی ئاوارەییدا رابپسکێنێ. ئەوەش مرۆ بەوەندە لەدەستی دەرناچێ کە لە وڵاتێک بۆ یەکیدیکە کۆچ بکا. ئەو کارە دەبێ لە ناخەوە سەرهەڵبدا، داخوازی تەکانێکی گیانی، روناکبیریی و ڕێڕەوشتی لێدەکا، هەمو کەسێکیش ئەوەی لەباردا نییە.»
لەدوای نیوەڕۆکەدا بەدرەنگەوە بنگۆریۆن روانینی خۆی لەبارەی لەشکرە نوێکەوە رونکردەوە: دەبێ سوپاکەمان لەبەرامبەر هێزە چەکدارەکانی وڵاتانی دیکەدا شتێکی دیکە بێ.
«سوپاکەمان نابێ هەر چەکێکی جەنگاوەرانە بێ. ئەو دەبێ فێرگەیەک بێ کە زانیاریی بداو نەریت بسازێنێ؛ دەبێ لەڕاژەی نشینگەدروستکردن و بنیاتنانەوەی وڵاتەکەماندا بێ...
«ئەو دەستەگەریی یە مرۆییەی لەهەمو لایەکی وڵاتە بیانییەکانەوە هاتۆتە نێومان، دەبێ پاکبکرێتەوە، جڵەوبکرێ و لەنێو بۆتەی هاوڕێتی و دیسپلینی سەربازیانەدا بتوێتەوە. دەبێ جیاوازیە نێوخۆییەکان لەبەیندا نەمێنن و یەکەیەکی وڵاتپارێزی نوێ بێتە کایەوە...
«هەنوکە کاتەکەی هاتووە.»
بنگۆریۆن تادەهات بەشێوەیەک گەشەی دەسەند کە ببێتە سەرکردەیەکی رۆحیی گەلەکەی. دکتۆر وایزمەن بە میوانە جۆربەجۆرەکانی گوتبوو کەوا سەرەک وەزیران «بەشێوازێکی بایەخداری پەڕجوانە»رابەرایەتی دەکا.
زانکۆی عیبریی خەڵاتێکی هەزار و پێنجسەد دۆلاری بەناوی «ئەو کەسەی

لەماوەی دوو ساڵی رابردوودا باشترین خزمەتی ئیسڕائیلی کردووە»پێبەخشی.

بنگۆریۆن چەکی پارەکەی گەڕاندەوە بۆ زانکۆکە و لەسەری نوسی کە بڕە پارەکە بدرێتە ئەو خوێندکارەی باشترین پەخشانی لەسەر کاریگەری ئەفلاتون لەسەر فەلسەفە و وێژەی جولەکەدا نوسیوە.

رۆحە پەرەسەندووەکەی بنگۆریۆن تادەهات زیاتر بڕی دەکرد، بەڵام بۆ رۆژنامەنوسان هەمیشە تاقیگە و هەندێک جاریش قوربانی بووە.

زۆر جاران ئەو دوانی وای دەدان کەخۆی بۆئامادە نەکردبوون، هەروەها کاتێک بە نوسراویش شتێکی خوێندبایەوە، دەقەکەی دوای خوێندنەوەیەکی دەکەوتە بەردەست. کاتێک لێیان دەپرسی کە بیچمە ناودارەکانی ئامریکا هەندێ جاران دوانزە کاژێر لە پێشدا پوختەیەکی ئەوەی بەنیازن بیڵێن دەیدەنە رۆژنامەوانان، ئەو تەنها ئەوەندەی گوت: «ئەز نازانم بۆچی.»

چەند ساڵێک لەسەریەک لەگەڵ رۆژنامەیەکی ئیسڕائیل بەباشی نەدەهاتەوە، چونکە ئەوان بەبۆچوونی بنگۆریۆن زۆر هەستیار و زانیاری کەمیشیان دەدایە خوێنەرەکانیان.

هەرچەندە ئەو نزیکەی نیو سەدەیە بۆ رۆژنامەکان دەنوسێ، بۆ ئەو تەکنیکی رۆژنامەگەری هیچی نەدەگەیاند.

جارێکیان لۆمەی هەواڵنێریکی لەسەر هەڵەیەکی بچوکدا کرد.

«داوای لێبوردن دەکەم، بەڵام من بەپەلە بووم.»

«بۆچی زیاتر لەبەر نوسینەکەت دانەنیشتی و پرسەکەت تەواو لێکبدابایەوە؟»

«بەڵام ئەوکات نوسینەکە رۆشنایی چاپی نەدەبینی.»

«چا چ دەبو؟ ئەو ڕۆژ نا رۆژی دواتر چاپدەکرا.»

بنگۆریۆن سەری لە شێوازی رۆژنامەگەری ئامریکایی دەرنەدەچوو. کاتێک گوێیلێبوو کە راپۆرتنوسەکانی گۆڤارەکانی ئامریکایی لەیەک رۆژدا چل هەزار وشەی دەربارەی ئەو و ئیسڕائیل بۆ ئامریکا دەنوسن و دەنێرن، لەو کاتەشدا هەر وشەیەک دوانزە دۆلاری تێدەچوو، بەسەرسوڕماوییەوە چاوی لەیەکدەدان کاتێکیش زیاتر بۆیان باسکرد کە هەواڵنێرێکی هەمان گۆڤار لەیەکجاردا دووهەزار وشەی لەسەر ئیسڕائیل بۆ گۆڤارەکەی ناردووە کە بەتەنها دوو دێڕیان لێبەکارهێناوە، ئەوسا گوتی:

«تۆ بڵێی ئەوان هەواڵنوسەکەیان لەسەرکار لانەدابێ؟»

لەساڵەکانی دواییدا بەرامبەر رۆژنامەنوسە بیانیەکان نەرمتر دەجولایەوە. رێگەی بەسەدان دیداری رۆژنامە، رادیۆو تەلەفزیۆندا دا و چیدیکە ئەو سەرنجەی نەوروژاند کە ئەو هەمو ئەو پەخشنامانەی لەسەری دەردەچن بە بێبەها دەزانی. لەبەرامبەر هەواڵنێرانی ئیسڕائیلییدا بەردەوام هەر هەندێک رەق بوو؛ ئەو بەدەگمەن بواری دیدار لەگەڵ سازدانی دەدان. بۆ ئەوەی بیرۆکەکانی سەرەک وەزیران لای خۆیان پەخش بکەن، دەبوایە هەندی لە رۆژنامەکانی ئیسڕائیل مافی لەبەر گرتنەوەو لەچاپدانەوەی دیدارەکان لە رۆژنامە ئینگلیزییەکان یان ئامریکاییەکان بکڕنەوە.

لەبەرامبەر داوای دیدارێکی راپۆرتنوسێکی ئۆرشەلیمدا، ئەو وشانەی وەڵام دابوونەوە: ئەز هیچ دیدارێک لەگەڵ رۆژنامەنوساندا ساز نادەم :

١- چونکە من خۆشم رۆژنامەنوسم و بەشێوازی خۆم بیروڕاکانم دەگەینمە کۆمەڵانی خەڵک.

٢- هۆیەکەی یەکەم دەربەستی وەڵامەکەیە.»

جارێکیان رۆژنامەیەکی ئیسرائیلیی وتارێکی بڵاوکردبووەوە کە ئەندامێکی کابینەی حکومەتی بەوە تۆمەتبارکردبوو گوایە باڵەخانەکەی خۆی بە قازانجی حکومەت کرپیوە. بنگۆریۆن ئەوەی بە «هەڵەیەکی قەشەنگ» ناوزەدکرد و رۆژنامەکەی بە تۆمەتبارکرد کە «قوڕبارانکردنی کەسانێکە کە بە ئەرکێکی راشاکاوانە و کراوە رادەبن.»

کاتێک هەواڵنێریک لە ئیسرائیل پرسیارێک لە بنگۆریۆن بکا، وەڵامەکەی بەو شێوە دەبێ : «منیش بەخۆم بۆ رۆژنامە دەنوسم.، دواتر ئەوەشی دەخاتە سەر: «بەڵام من بۆ هۆکاری پارەپەیداکردن نانوسم، بەڵکو بۆ ئەوە تا ئەرخاین بم بەوەی بە هەڵە قسەکانم وەرنەگیراون.»

لەراستیدا ئەو وای دەکرد، چونکە لە جەرگ و هەناویەوە نوسەر بوو. ئەو دەیتوانی کاری سەرۆکایەتی خۆیشی ئاستەنگ بکا. گەر ساڵێک بۆ دواوە بگەڕێینەوە، ئەو دوانێکی بیست خولەکی نوسیبوو، کە دەبووایە لە بۆنەی ئاهەنگێکی وەرزشی نیشتمانییانە بیخوێندبایەوە. کارمەندە رۆژنامەونیەکەی نوسینەکەی وەریگێرایە سەر زمانی ئینگلیزی سەرو دانەی دایە هەواڵنێران. بەڵام گەمەکە زیاتری خایاند لەوەی مرۆ لێیچاوەڕوان دەکرد. تاریک داهات تا سەرەک وەزیران چووە سەر سەکۆو دوان بدا، لەبەر ئەوەی کاتەکە دواکەوت وازی لەدوانەکە هێنا هەربەوەندە کۆتایی پێهێنا: «ئەز ئاواتی باشترتان بۆ دەخوازم و هیوام وایە چەند گەنجێکتان رەوانەی ئیسرائیل بکەن.»

هەمان شتیش سەبارەت بە خۆئامادەکردنێکی لە بیئر سەبعە رویدا. پێش ئەوەی دەست بەدوان بکا تاوەبارانێک داهات، بۆیە بەوەندەی لێبڕیەوە: هیوام وایە کە ئەو هێڵی شەمەندەفەرە بگاتە ئیلاتیش.»

دواتر لەسەر سەکۆ هاتە خوارەوە دانیشت.

رەفتاری تەواو پێچەوانەشی لە کۆنفرانسێکی ناوەکی نواند. ئەو کات بە سەرۆکی کۆنفرانسەکەی گوت: «من تەنها بەخێرهاتنامەیەکی کورت دەخوێنمەوە.»

بەڵام کاتێ دەستی بەدوانکرد، مژارەکەی لێخۆشهات ، بۆیە باشترین دوانی لەو ساڵەدا دا.

لەماوەی ساڵی ١٩٥٠دا بنگۆریۆن لەگەڵ کەسانی جۆراوجۆر نەخشەی وەرگێڕانی نوسین و بەرهەمە کلاسیکییەکانی بۆسەر زمانی عیبری تاوتوێکرد؛ مەبەستیشی هەر وەرگێڕانی شەکسپیر و ئەفلاتون نەبوو، نەوەک هەر ئەو شاکارە کلاسیکییانەی کەمرۆ بە بەرهەمی کلاسیکیی ئینگلیزی، فەڕانسی، ئاڵمانی و روسیایان دەزانێ، بەڵکو گرنگترین ئەو کتێبانەی لە رۆژهەڵات و رۆژئاوادا چاپکراون. ئەوکات پارەیان بایی راییکردنی ئەو کارە لوکسەییە نەبوو، وەلێ ئەو خەونە تادەهات لای ئەو بایەخدارتر

دەبوو.
لە ئیسرائیلدا بە تاسەوە هانی کتێب چاپکردن دەدرا، رەنگبێ چاکەی بەشێکی بۆ نمونە پێشەنگی بنگۆریۆن بگەڕێتەوە. لە شەقامێکی تەلئەبیبدا مرۆ سەد و دوانزە دکانی کتێبفرۆۆشی دەژمارد، ژمارەیان لەچاو رێژەی چایەخانەکان و شوێنی ئارایشگاکان زۆرتر بوو.
لەو سەردەمەدا لە تەلئەبیبدا پەیمانگایەکی نوێ  بۆ هونەر و زانست دامەزرا، مرۆ لەوەی دەپرسی ئاخۆ ناوی چی لێبندرێ. یەکێکیان  ناوی : «ئەکادێمیا بۆ هونەر و زانستەکان»ی پێشنیازکرد.
بنگۆریۆن لە پەرچەکرداردا گوتی: «من حەزم لە وشەی ئەکادێمیا نییە.
یاریدەرەیێکی لێیپرسی: «بۆچی نا؟» خۆ هەمو جیهان وشەی ئەکادێمیا بەکاردەهێنی.»
سەرەک وەزیران تەڕدەستانە کەوتە پەلاماردان: «ئا بەڕاست؟ خۆ لەهەمو ئاسیادا تاکە ئەکادیمیایەکی لێ نیە.»
لە ئۆکتۆبەردا کابینەکەی کەوتە تەنگژەوە؛ بنگۆریۆن دەستی لەکار کێشایەوە، بەڵام لەسەر داوای سەرۆک وایزمەندا کابینەیەکی نوێی پێکهێنایەوە. دوو هەفتە پاشتە بارودۆخەکە ئاسایی بووەوە ئەوسا خۆی و پاولا بۆ یەکەمجار لەماوەیەکی دورودرێژدا، رەنبگێ بۆیەکمجاریان بێ لەژیانیاندا گەشتێکی پشودان بکەن. ئەوان بەرەو وڵاتی گریک (یۆنان) چوون.
دوای گەشتەفڕینێکی کورت گەیشتنە ئەو شارە دێرینەی کە بنگۆریۆن لەڕێگەی کتێبەکانەوە باشی دەناسی. سەرێکی ناوچە ئارکیۆلۆژییەکانی دان و بەسەر ئاکرۆپۆلیس Acropolisیشدا هەڵگەڕا، ویستی لەگەڵ گریکە هاوچەرخەکان بە زمانی بابوباپیرانیان بدوێ. بەڵام نە لێخوڕی تاکسیی و نە خاوەنی میوانخانەکە، تەنانەت مامۆستاکانیش لێیتێنەدەگەیشتن. لەدواییدا هەڵسەنگاندنێکی دایە گریکەکان بەوەی شوێنپێی جوەکان بگرن و زمانە کلاسیکییەکەیان ببوژێننەوە.
ئێلیاهۆ ئێلات Eliahu Elath کە ئەوکات ببووە نوێنەری ئیسرائیل لە بەریتانیای گەورەدا، لە شەوێکی دیسێمبەردا پێش نیوەی شەو لە فڕۆکەخانەی لەندەندا لە پێشوازی نێردەیەکی هیستادروت دابوو کەلە تەلئەبیبەوەڕا هاتبوون. کاتێک سەرنشینەکان فڕۆکەکەیان جێهێڵا، لەنێویاندا سەرسام بوون بەدەرکەوتنی سەرە سپیەکەی سەرۆک وەزیران. ئەوەش بێگومان بەگوێرەی رینمایی پرۆتۆکۆلییەکان نەبوو. لەندەنیش شارێک بوو کە پرسی پرۆتۆکۆلیی زۆر بەهەند هەڵدەگرت.
سەرەک وەزیران بە پێکەنینەوە رایگەیاند کە بەنەناسراوی هاتووە. ئەو وەک هاوڵاتیەکی ئاسایی ئیسرائیل گەشتەکەی کردووە.
ئێهود ئەڤریل Ehud Avriel کۆنە نوێنەری ئیسرائیل لەپراگیشی لەگەڵدا بو. بەیەکەوە چوونە ماڵە دۆستێکیان لە گۆلدەرس گرین Golders Green.
رۆژنامەوانیی لەندەن هەلە هەستیارەکەیان قۆستەوە. تۆ بڵێی چ تەنگژەیەک لە ئیسرائیل رویدابێ وای لەسەرۆک وەزیران کردبێ بەو شێوەیە بێتە لەندەن؟ ئایا

بنگۆریۆن دەیەویست کێ ببینێ؟ لەکوێ دەمێنێتەوە؟ بۆچی بە نهێنیی هاتووە؟

هەواڵنێریکی هەفتەنامەی New Statesman and Nation رازەکەی هەڵێنا.

هیچ قەیرانێک لەئاراد نییە..

بنگۆریۆن خۆی نەشاردۆتەوە.

سەرەک وەزیرانی ئیسرائیل لە ئۆکسفۆردە. ئەو بە فڕۆکە لە ئاسیناوە هاتووە بۆ ئەوەی چوار رۆژان بە لێگەڕان بەدوای کتێبفرۆشە هەرە بەناوبانگەکەی جیهان بلاکوێل Blackwellدا بگەڕێ. بیستویەتی کەوا نایابترین کۆبەندی کتێبانی لەسەر لێکدەرەوەکانی ئەفلاتون تێدایە.

هەمو کەس بڕوایان نەهات ! سەرەک وەزیارنیش شتێکی ئاوای نەکرد. بەڵام هەفتەنامەی لەندەنی کۆتایی وتارەکەی بەو برگەیەدا هێنا: لەو سەدە دڕندانەیەماندا بیرۆکەیەکی زۆر خۆشە کە ئەوکەسەی سەردانێکی ژورەکانی پشتەوەی دکانی بلاکوۆلی کرد و پیاوۆکەیەکی ریش سپی بەدی کرد کەلە بەر دۆلابی کتێبفرۆشەکدا دانیشتبوو، سەرەک وەزیرانی لەسەر هێڵدا گرت کە ددانی بە ئەندێشە شاردراوەکانی خۆیدا نا.»

# بەشی
## (٢٠)

بنگۆریۆن ساڵی ١٩٥١ (کە هی لەیادکردن نەبوو) دەستپێکێکی ئاساییانەی هەبوو. یەکەمین سەردانی فەرمیی بۆ ئۆردوگایەکی کۆچبەران بوو لە دەوروبەری شارەبەندەری ناتانیا Natanya، لەوێ بووە سادیک Sadek (عەراب: ئەوکەسەیە دەبێتە مامانی کۆرپەلەیەک بەوەی لەگەڵ دایک و بابی هاوپشکی بەرپرسیارێتی پەروەردەی ئایینییەکەی بێ–وەرگێڕ)ی کۆرپەیەکی تازە لەدایکبوو ناوی داود ئیسحاق David Yitzhakیان لێنا.

ئـەوەش چـواردەهـەمـین منداڵی کۆچبەرە عیراقییەکان بـوون، دوای ئەوەی گەڕابوونەوە ئیسرائیل، بڕیاریاندا منداڵەکانیان بەناوی سەرەک وەزیرانەوە ناوبنێن.

وێنەی بۆنەی مامانێتیەکە لەزۆر رۆژنامەدا بڵاوکرایەوە، ئیدی وەک دیاردەیەکی لێهات بـەوەی کۆرپە تـازە لەدایکبووەکان بەناوی سـەرەک وەزیـرانـەوە بنێن، تا سکرتاریەتەکەی بۆ کۆمەڵانی خەڵکی رونکردەوە چیدیکە بنگۆریۆن ناتوانێ ببێتە ساندێک.

لە فێبرایەردا قەیرانیکی دیکە سەریهەڵدا. تەوافوقێک لەگەڵ پارتە ئەرسەدۆکسیەکان گرێدرا بەوەی ژنانی گەنج لەسەر بنەمای ویژدانیی و دیینی لە خزمەتی سەربازییدا ئازاد بکرێن. رێژەی ٣٠٪ کچە داواکراوەکان بۆ سوپا، سودیان لە رێسایەکە وەرگرت و نەچوونە راژەی سەربازیی. ئەوەش بنگۆریۆنی خستە سەر باریکی گوماناوی و خوازیار بوو قانونێکی دیکە دەربچێ، تاکو ئەو کچانەی لە سوپا دەردەچن کارێکی دیکە بکەن.

گەورەترین گرفتیش لەبنسەری پرسی پەروەردە و فێرکردنەوە سەریهەڵدا. پارتە ئەرسەدۆکسییەکان دەیانەویست خوێندنی دیینی تەوزیمی بێ.

لەبەرامبەریاندا بنگۆریۆن رایگەیاند:» ئێمە بواری هیچ گروپێک نادەیەن کایەی پەروەردە و فێرکردن بۆ خۆی پاوان بکا؛ ئەو مافە بەتەنها هی دەوڵەتە.» ئەوسا داوای متمانەپێدانەوەی پەرلەمانی کرد. کاتێک رێژەی زۆرینەی بەدەست نەهێنا، دەستی لەکار کێشایەوە و داوای هەڵبژاردنێکی نوێی نیشتمانییانەی کرد. سەرەک وایزمەن داوای لێکرد جارێ بۆ راپەڕاندنی کارەکان بمێنێتەوە. هەڵبژاردنەکان کەوتنە هاوین. ئەو بۆ کردەی هەڵبژاردن ئامادە بوو. دواتر لەگەڵ پاولا، ئارگۆڤ، تێد لوری Ted Lurie سەرنوسەری رۆژنامەی پۆستی ئۆرشەلیم و رۆژنامەنوسێکی دیکە

گەشتێکی ئامریکایان کرد.
زۆر جاری دیکە بنگۆریۆن سەردانی ئامریکای کردبوو، بەڵام لەجارەکانی پێشویدا بە ئاستەم چوونەکەی مایەی سەرنجدان و تێبینیکردن بوون. هەنوکە دوای ئەوەی بەڕاستی بووەتە بیچمیکی جیهانیی، هاتنەکەی واتایەکی دیکەی دەبەخشی. نزیکەی هەمو جوەکانی ئامریکا ئەویان دەناسی، هەروەها زۆر غەیرە جوش دەیانناسی. لە کەسایەتی ئەودا خەباتی چەند سەدهەزار جولەکەیەک لەهەمبەر چل ملیۆن عەڕەب بەرجەستە دەکرا. ئەو داود بوو، نزیکەی هەمو ئامریکاییەکانیش زۆرانبازییەکەی داود لەگەڵ گۆلیات( شەمشون، زەبەللاح)یان بیستبوو.
بە فڕۆکەیەکی سپی شینباوی Constellation کە یەکەمین فڕۆکەی داەزگای گواستنەوەی ئاسمانی ئەلئال El Al بوو، فڕی. فڕۆکەکە سەرەتا لە واشنتن نیشتەوە، لەوێ بنگۆریۆن لەلایەن سەرۆک ترومان پێشوازیلێکرا. ئەوسا بەرەو نیویۆرک رۆیشت.
لەوێ جۆشوخرۆشی جەماوەرە بەشێوەیەک بوو مرۆڤی دەخستە سەر کەڵکەڵەی بەخێرهێنانەوەی لیندەبێرگ Linddbergh یان گریتئد ئێدێرل Gerteude Ederl دوای ئەوەی بەمەلە لە نۆکەندەکە پەڕینەوە.
کەم بێگانە و- تائێستا هیچ جولەکەیەکیش- بەو شێوە گەرمەیە پێشوازی لێنەکراون.
گرۆڤەر والەن Grover Whalen بەخێرهاتنێکی گەرمی لێکردن. سی وشەش پۆلیس بە سواری ماتۆڕەوە لە پێشەوەی کەژاوەی کاروانەکەیان دەڕۆیشتن ئەوسا بیست ئۆتۆمبێلی پر کەسایەتی پایەبەز و هەزار سەربازی ئامریکایی و کۆڕالێکی موزیکی شەست کەسی، دەستەیەکی دەریاوانی ئیسڕائیلیی، بەکورتی هەزاران پۆلیس چاودێرییان دەکرد.
بەگوێرەی مەزندەی پۆلیس یەک ملیۆن و نیو خەڵکی نیویۆرکی بۆ دارڕژابوونە سەر جادە و دروشمیان بۆ دەکیشا و هەوڵیان دەدا لێی نزیک ببنەوە و پرچە سپیەکەی ببینن.
کاتێک شەو ژمارەی حەشامەتەکە لە رۆژنامەکانەوە زانرا، یەکێ لە ئەندامی دەستەی یاوەرانی گوتی : «ئاخر ئاپۆرەی ئەو خەڵکە بەقەد ژمارەی هەمو دانیشتوانی ئیسڕائیل دەبێ.»
لە بارەگای شارەوانی نیویۆرک، لەو شوێنەی لەگەڵ پاولادا گرێبەستی هاوسەرێتییان مۆرکردبوو، پێنج هەزار کەس لەسەر کورسییەکان دانیشتبوون و نۆهەد و پێنج هەزاری دیکەشبە بەپێوە وەستابون، گوێبیستی سەرۆکی شاروەانی بوون کە بنگۆریۆنی بەخێردەهێنا:
«ئەو پیاوەی کە ئێستا پەسنی دەدەین دڵی هەمو ئازادیخوازانی لە سەرتاسەری دنیادا داگیرکردووە. ئەو لە بڕیارەکەی بۆ بەرجەستەکردنی خەونی دوو هەزار ساڵ کۆنی گەلی جولەکە هەرگیز کۆڵی نەدا و چۆکی نەلەرزین...»
سەرۆکی شارەوانی ئەو رۆژەی ناونا «رۆژی بنگۆریۆن «و دووبارە دەستی

سەرەک وەزیرانی گوشی. دەبوایە بنگۆریۆن بۆ هەفتەیەک ئەوەی فەرامۆشکردبا کە قینی لە دەستگوشین و تەوقەکردنە.
هەرچەندە لەوە رانەهاتبو کە بەشانوباڵیدا هەڵبگوترێ، بەڵام لە رۆژی ٨ی ئایاری ١٩٥١دا کاتێک بەناو شەقامەکانیدا تێدەپەڕی دەستی هەر لەدەرەوەبوون بۆ سڵاوکردن، هەڵبەت چێژێکی زۆری لێوەرگرت.
کاتێک سەردانی بارەگای نەتەوە یەکگرتووەکانی کرد، گڵۆپی یەکێک لە کامیرای وێنەگرەکان لەکاتی کۆنفرانسە رۆژنامەوانیەکەدا تەقی، بەشێوەیەک کە وردە شوشەکانی گڵۆپەکە بەبناگوێی ئەودا تێپەڕین؛ بە خەندەوە گوتی: «مەترسن ئەوە نابێتە بەربەست، ئەز لەچەندان جەنگدا بەشدار بوومە.»
بنگۆریۆن، پاولا و ئارگۆڤ لە سویتێکی میوانخانەی والدۆرف ئاستۆریا Waldorf-Astoriahotel مانەوە. ژەنەڕال ماک ئارسەر Douglas MacArtherیش کە تازە لەلایەن سەرەک ترومانەوە لە کۆریاوە بانگکرابووەوە، لەهەمان میوانخانە بوو. لەرۆژی دوهەمدا بنگۆریۆن و یاوەرانی رویانکردە بەشی رۆژئاوا تاکو مۆمێک لەسەر گۆڕی کۆلۆنێل داود مارکۆس David Marcus دابگیرسێنن. لەسەر بەردەکێلی گۆڕەکەی نوسرابوو : «ئەو خەباتکارەی لەپێناو هەمو مرۆڤایەتیدا تێکۆشا.»
ئەو شەوە بیست هەزار کەس لە گۆڕەپانی مادیسۆن Madisonدا گردببوونەوە و هێشتا حەفت هەزاری دیکەش لە شەقامەکان بوون، هەمویان گەواهیدەرییبوون بەسەر هەڵمەتی بنگۆریۆن بۆ «کڕینی پشک (سەنەد) بۆ ئیسرائیل».
هەمان ئێوارە لەسەر سەکۆی دواندا، گەنجێکی چاویلکە قاوەیی کە زۆر لێزانانە لە نەتەوە یەکگرتوەکاندا داکۆکی لە ئیسرائیل دەکرد، بەدەرکەوت. بنگۆریۆن پیاوەکەی کردبووە نوێنەری ئیسرائیل لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئامریکادا. ئەو تازە تەمەنی گەیشتبووە سی و شەش ساڵ، لاوەکە لەڕاییکردنی ئەرکەکەی لە واشنتندا بڕوا و متمانەی تەواوی بە سەرەک وەزیران هەبوو، هەنوکەش هەموی بەڕەوا و راست بۆ دەرچوو. ئەو کەسێکی گەشەکردوو روناکبیر و قسەزانێکی کارامە بوو، ئەو کەسەی قسەکانی بۆ دوژمنانی بکوژ بوون ئەوانەی خزمایەتی گیانیشییان لەگەڵدا هەبوون وەک پڕوشکی گەمە ئاگرینە وابوون.
پیاوەکە ئابا ئیبان Abba Eban بوو، لەسەر سەکۆیەکە بەچەپڵەرێزانەوە بە ئامادەبوونی گوت: «کارەکانی خۆیان ئەو رۆژەی ئێستای ئافەریدەکرد.»
لەدرێژەی وتەکەیدا گوتی: «لە ١٩٤٣دا بنگۆریۆن رایگەیاند کە ئیسرائیل دەبێتە دەوڵەتێکی سەربەخۆی جولەکە. دەوڵەتە زلهێزەکان و رای گشتی ئەوکات هەر ئەوەندە پەرۆشی دەوڵەتی جولەکە بون بەقەد چوونە سەرمانگ (مەبەست لێرەدا هیچ پەرۆشیان نەبوو، چونکە چوونە سەر مانگ سی ساڵی دیکەی خایاند-وەرگێڕ).»
«لە زستانی ١٩٤٧دا بنگۆریۆن رایگەیاند کە جوەکانی وڵاتی پیرۆز ئامادەن بەرگری لەخۆیان دژی لەشکری هەمو وڵاتە دراوسێکان بکەن و بەرپەچیان بدەنەوە. مرۆڤ ئەوکات لەچاوی شارەزاییە سەربازییەکان گومانی لە خۆڕاگرتنەکەیان هەبوو کە نەخشەی بەرگریکردنەکەیان هیچ دەرفەتێکی سەرکەوتنی هەبێ».

«لە سێپتامبەری ١٩٥٠دا بنگۆریۆن رایگەیاند بۆ ئەوەی ئیسرائیل پەرەبسێنێ و گەشەبکا لەماوەی سێ ساڵی داهاتوودا پێویستی بە یەک ملیار دۆلارە، دەبێ لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئامریکاشەوە کۆ بکرێتەوە. ئابوریناسەکان پێشنیازەکەیان بەرێزەوە بەڵام بەخەندەیەکی گوماناوی یەوە سەیردەکرد.»

«بەڵام دەوڵەتی جولەکە دامەزرا، لەشکرەکانی دوژمن تێکشکان، ملیار دۆلارەکەش کۆکرایەوە.»

کاتێکیش میوانی شەرەف هەڵسایەوە بۆ گردبووەکان بدوێ، بە پەسندان و جۆشوخرۆشەوە دروشمیاین بۆ کێشا. بەگوێرەی ئەوانەی سالانێکە دەیناسن، ئەوە یەکەمین جاری بوو کە خرۆشان بەسەریدا خەریکە زاڵبێ. چەند جارێک خوزی خۆی قوتدایەوە و سەدایەکی بیئۆقرەیی بەدەنگیەوە دیاربوو. پاشان بەدەرکەوت کە چەند پشک لەو چل و هەشت ولایەتانەی ئامریکادا فرۆشراون. سەرجەمیان سی و پێنج ملیۆن دۆلار کۆکرایەوە. هەواڵنێران بەهەمو شیوەیەک بە شانوباڵی بنگۆریۆنیان هەڵدا و کۆمەڵێ وتاری پەسنداری گەرمی لەبارەوە نوسران.

رۆژی چوارەم کە پشکنەرێکی پۆلیس و دوو پۆلیسی بە جلی مەدەنی لەدواوە دەرۆیشتن، سەری کتێبفرۆشەکانی نیویۆرکی دا. بەهەمویەوە ٣٠ کتێب کە بابەتی سەرەکییان فەلسەفەی چینی بوو، کڕین.

لە کۆلانی پێنجەمی برێنتانۆ Brentanoدا لەلایەن ژنێکی گەنج کە چوار ساڵ پێشتریش یارمەتی دابوو، بەخێرهاتنی لێکرا.

«باروخا هابا barucha habba» (بەسەرکەوتویی بەخێر بێی).

لەوێش دانەیەکی کتێبی فەلسەفەی ژیان «The Philosophy of Life» لە نوسینی شین لیس فو Chen Lis Fu بوو، کڕی، لەو کاتەدا بەڕێوبەری شوێنەکە دانەیەکی دانسقەی بایبل کە بە عیبری، لاتینی و گریکی لە ١٥٥٣دا چاپکرابوو، بەدیاری دایە بنگۆریۆن.

بۆ پاولاش دەرفەتی سەردانی خوشکەکەی لە بروکلیندا رەخسا. کوڕێکی خوشکەکەی ویل ماسلاو Will maslow کەبۆ کۆنگرەی جوەکانی ئامریکا کاردەکا، خۆی و ژنەکەی و کیژە شەش ساڵیەکەی لەلایەن پاولاوە بانگهێشتکرانە میوانخانەی والدۆرف تا بنگۆریۆنیان پێبناسێنی. لەو شەوەدا ماسلۆو گوێیلێبوو کە کچەکەی بە برادەرێکی خۆی دەگوت: «بەڵی بەیانی من ودایکم دەچینە میوانخانەی والدۆرف-ئاستۆریا و قسەلەگەڵ سەرەک وەزیرانی ئیسرائیل کەدەبێتە خاڵی من دەکەین، ئەویش کارێکی وادەکا کە بتوانین ژەنەراڵ ماک ئارسەر ببینین!»

یەکشەممەکەش بنگۆریۆن بە ئۆتۆمۆبیل چووە پرینسێتۆن Princeton، نیو جێرسی New Jersey تاکو سەردانی بەناوبانگترین جولەکەی سەردنیا پرۆفیسۆر ئەلبێرت ئاینشتاین Albert Einstein بکا.

رۆژەکەی رۆژێکی خۆش بوو، لەدەرەوە لەناو باخەکەیان لەتەنیشت یەکدیدا دانیشتبوون. بنگۆریۆن ئەو پیاوەی هەرگیز حەز و باکی بە جلوبەرگ نەبووە، ئەوکات زۆر بەرێکوپێکی قاتێکی تۆخی دوورێزە قۆپچەیی لەسەر کراسێکی سپی لەبەرکرد،

بۆینباخێکی پەشسمینی وێنەداری بەست و میدالیەکێشی لەبەرۆکی دا کەدەدرایە ئەو ئەفسەرانەی خوێندەکەیان تەواو دەکرد.

ئاینشتاین پانتۆڵێکی لۆکە وفانیلەیەکی خوری لەسەر کراسێکی سپی لەبەردابوو کە قۆپچەی سەرەوی کردبووەوە.

لەبەردەم کامێرای وێنەگراندا تێپەڕین و تەوقەیان لەگەڵ یەکدا کرد. ئاینشتاین زۆری نەبردبوو ئاهەنگی سالڕۆژی حەفتاو دوو ساڵەی گێڕابوو  بنگۆریۆنیش بە شەش ساڵان لەو کەم تەمەنتر بوو.

لەبیچمی دەرەوەیاندا لەیەکدەچوون. هەردوکیان قژێکی سپی بژیان هەبوو کە تاسەر گوێیان هاتبوو. گەر هاتباو پێکەنیبان —لەو ماوە کورتەشیاندا زۆر پێکەنین- هەردوکیان هەمان کوریشکی گۆشەی لاچاویان هەبوو.

کاتێکیش وێنەگران بەجێیان هێشتن، بەیەکەوە دانیشتن و قسەیانکردن. بێجگە لە کتێبەکەی خۆی کە کەس بەرچاوی نەکەوت، بنگۆریۆن لەبارەی وتووێژەکەی لەگەڵ گەورەترین بیرکارییناسی سەردەمی نویَ نە نوسی و نە دوانیشی دا. بەڵی دواتر هەندێک لە وتووێژەکانی بۆ برادەرێکی باسکردبوو.

بنگۆریۆن بە برادەرەکەی گوتبوو : «تێدەگەی کە ئاینشتاین نە تاقیگەی پێویستە، نە ئامێر نە کەلوپەل نەهیچ شتێک! ئەو بەتەنها لەژورەکەی دادەنیشی قەڵەمێکی پاندان و دەستە کاخەز و مێشکی خۆی و بەس، ئیدی بیردەکاتەوە.»

بنگۆریۆن لای خۆی دانابوو پرسی رازی توانا تەرکیزببونەکەی لێبکا و لەگەڵیدا راستییە هەمیشەییەکان باس بکا. لەدواییشدا لە ئێوارە هەمانرۆژدا کە پرینسێتۆنی جێهێلا، لەو بڕوایەدا بوو کە خاوەنی زیرەکترین مێشکی هەمو مرۆڤەکانی سەردەمی ئێستامانە.

لە نیویۆرکەوە درێژەی بەگەشتەکەی دا.

لە فلادلڤیادا کاتژمێری ئازادیان نیشاندا، لەوێدا بەبیری هێنانەوە کە دەقێکی بایبلی لە کتێبی  لێڤیتیکوس Leviticusدا هاتووە کە پەیڤەکانی خوان بۆ موسا: تۆ دەبیَ ئازادی لەوڵاتدا بۆ هەمو دانیشتوان رابگەیەنی.»

لە بالتیمۆردا کلیلی شارەکەیان پێشکەش کرد.

لە واشنتندا ئاهەنگێکیان بۆ سازدا کە هەزار کاربەدەستی پایەبەرز و دیپلۆمات تەوقەیان لەگەڵدا کرد. لە وێنەیەکدا لەگەڵ ئاشێسۆن Achesonweی وەزیردا کە دوو جاران لەخۆی باڵابەرزتر بوو بنگۆریۆن بە بەرینی پێدەکەنیَ، یەکێک لە دۆستە ئامریکاییەکانی  گوتی:

«تۆ لەوێنەکەدا وادیاری وەک ئەوەی ئاشیسۆن  لۆنگ ئایسلاند Long Island و بەشێکی تەکساس  و کەشتیگەلی ئامریکایی پێبەخشیبی.»

ماندوترین رۆژی لە ئامریکادا رۆژەکەی بۆستۆن بوو: لەویَ چوار دوانی گرنگی لەماوەی یەکدوو کاژێردا دان. لەگەڵ ئەوەشدا هێشتا کاتی ئەوەی فەراهەمکرد بەناو کتێبفرۆشەکانیشدا بگەڕیَ.

لەبەرئەوەی دەیزانی بەشێکی زۆری دانیشتوانی بۆستۆن بەرەچەڵەک ئێرلەندیین،

بۆیە بە سەرۆکی شارەوانیەکەیانی گوت کە جولەکە و ئێرلەندییەکان زۆر خاڵی لەیەکچوویان هەن؛ هەردوولایان لەرابردوودا بۆ ئازادی تێکۆشاون.

سەرۆکی شارەوانیش لەوەڵامنامەکەیدا یادی حایم سۆلۆمۆن Chaim Solomon ی کردەوە، ئەو بازرگانە جولەکەیەی لەساتەوەختێکی تەنگەتاودا کۆمەکی شۆرشگێڕە ئامریکاییەکانی کرد بەوەی باربویەکی دووسەد هەزار دۆلاریان بکا.

لە کۆبوونەوەکەی بۆستنیشدا بنگۆریۆن کەزۆری لە دیرۆکی ئامریک دەزانی، بەناخیادا شۆڕبووە و هەندێک هێڵی تەریببی کێشان:»

«ئێوە لەبۆستن Tea Partyتایان هەبوو، ئێمەش کتێبی سپی.

ئێوە مینوتەمین Minutemen (میلیشیای چەکداری)یتان هەبوو، ئێمەش هاگانا.

ئێوە بۆ سەربەخۆیی خۆتان تێکۆشان، هەروەها ئێمەش.

ئێوە دەبووایە دژی یەک پاشا بجەنگن، ئێمە دژی چوار.

ئێوە دەبووایە دژی یەک سوپا رابوەستن، ئێمە دژی شەش.

بەڵام ئێمەش هەروەک ئێوە بردمانەوە.»

لە بەرامبەر خوێندکارانی زانکۆی براندایس Brandeisیشدا گوتی:

«وەرنە ئیسرائیل و یارمەتی بناتنانی شارستانیەتێکی نوێ بدەن. ئێمەش ئەوەتان دەخەینە بەردەست کە پێش دووسەد ساڵ لەو وڵاتە پێشکەشتانکرا. هیچ شتیک لەو دڵگیرتر نیە کە کارێکی داهێنەرانە ئەنجامبدەی. ئێمە لەو باوەڕەداین بۆ جیهانی بسەلمێنین کە دەتوانرێ بی روتاندنەوە بێ رکوکینە بژین.»

لە دیترۆ Detroitیشدا پێشبینیکرد ئیلاتی شارەکەی بایبلی سەر دەریای سور ببێتە دیترۆیتی ئیسرائیل.

لە کێلڤەلاند Kelvelandدا قسەی بۆ بیست هەزار کەس کرد.

لە شیکاگۆشدا بە تەقاندنی بیست و یەک تۆپ پێشوازیلێکرا، ئەوەش ریزگرتنێک بوو تەنها لە سەرەک دەوڵەتە گەورەکان دەنرا.

لە توسلا Tuslaدا دەبووایە ئەو فرۆکەیەی بۆ گەشتەکەی بەکرێ گرتوە، بۆ بەنزین تێکردن بنیشتبایەوە. کاژێر دوو نیوی شەو بوو بارانیش دەباری. لەوکات تەنها سێ سەد خێزانی جولەکە لە توسلادا دەژیان. لەگەڵ ئەوەشدا کۆمەڵێکی زۆری خەڵک هاتبوونە فرۆکەخانە بۆ بەخێرهێنانی.

لە لۆس ئەنگلزیشدا لەلایەن بەڕێوبەرەکانی کۆمپانیای فیلمەکان بانگهێشتی شێوخواردن کرا. لە هۆلیود بۆل Hollywood Bowlدا بیست هەزار کەس خڕببووەوە کاتێک ئێدوارد رۆبنسنEdward G. Robinson جاڕنامەی سەربەخۆیی ئیسڕائیل خوێندەوە سامۆئیل گۆلدیۆن Samuel Goldionیـش میوانی شەڕەفیان بوو. کاتێکیش بنگۆریۆن گوتی کەوا کەشوهەوا و جوانی سروشتی کالیفۆرنیا و ئیسڕائیل لەیەکدەچن و ئیسرائیلیش چیدیکە لێناگەڕی بیابانی هەروا بێ ئاوەدانیی و دەستکاری بهێڵێتەوە، بەتایبەتیش کاتێک مرۆ بە فرۆکە لەئاسمانەوە تەماشای ژێر خۆی دەکا دڵگیرە، ئیدی جەماوەرەکە پێکەنی.

ئەو لەو گەڕانەگەشتەیدا کە دوو هەفتەی خایاند نزیکەی ٣٠ هەزار کیلۆمەتری

بڕی و شەست دوانی گرنگی لە دە شاردا دان، گوێی لە دروشمە پڕخرۆشەکانی نزیکەی سێ ملیۆن کەس گرت، وەک میوانێکی شەرەفیش بیست و هەفت ژەمی فەرمی خواردن. هەرچەندە باوەڕیشنەدەکرا بەڵام هێشتا کاتی ئەوەی دەدۆزیەوە سەربکاتەوە سەر پیشە کۆنەکەی و زنجیرە وتارێک بۆ ڕۆژنامەکانی هیرست Hearst بنوسێ.

بە کەمتر لەمانگێک دوای گەیشتنە ئامریکا، گەڕایەوە؛ لەنێو چاوانی ئەوەوە هەنوکە بایی پەنجاو پێنج ملیۆن دۆلار  پشکی ئیسڕائیلیی فرۆشران.

کاتێکیش فڕۆکە سپیە شینباوەکە گەیشتەوە کەنارەکانی ڕۆژهەڵاتی دەریای سپی ناوەڕاست، شەش فڕۆکەی جەنگاوەری ڕاوەدونەری ئیسڕائیلی گەیشتنە دەوروپشتی فڕۆکەکەی بنگۆریۆن. لە فڕۆکەخانەشدا پاسەوانی شـەرەف، پەرەشوتوانەکان، زەریاوانەکان، ژنە سەربازەکان، تـەواوی ئەندامانی کابینەکەی، ئەندامانی ستافی ژەنەڕاڵەکان، نێردەیەکی گەورەی کەنیست، نێردەی ئامریکا و بە هەزاران هاوڵاتی لەپێشوازیدا وەستابوون.

پاولا لێگەڕا هەواڵسازان دیداری لەگەڵدا سازبدەن. ئەوان دەیانەویست بزانن ئاخۆ ئەو وڵاتەی کە بەچەندان ساڵ لێیژیاوە پێی چۆن بووە، کەتبووە بەردڵی. ئایا دۆستە کۆنەکانی بەسەر کردبوونەوە؟

«بەڵی کاتێ من لێی دەژیام لە روناکبیرە ئایدیالیستەکان تەژی بوو. ئێستا ئەوانە هەمویان  ژنیان هێناوەوو مێردیان کردووە، ئەوان سەرقاڵی کاروباری خۆیانن لەبەر پیشەکەیان تەنها بیر لە پەیداکردنی پارەو پول دەکەنەوە. ئەوان هیچ بیرۆکەیەکیان نیە کە ئێمە چۆن بە سادەییانە دەژین. بەڵام ژیان لێرە کەمتر دەستکاری کراوە و ئەوەش گرنگە.

«بەڵام ئای ئەوان چەند دەستکراوەن! زۆریان  دوو بەڵکو سێ پشکیان دەکڕین. لە هەر شوێنێک بۆی بچووبام  باوەشە گوڵیان پێشکەش دەکرین. هەڵبەت منیش ڕاستەوخۆ بۆ نەخۆشخانەکانم دەناردن.

«پیاوەکەم خەریک بوو لەخۆشیانا بفڕێ کاتێ دیاریەکیان پیشکەشکرد؛ ئەویش تۆپێکی گەورەی گۆی زەوی خولخۆر بوو کە لەناوەوەڕا دەدرەوشایەوە.

لێیانپرسی ئایا کاتی بازاڕکردنی هەبوو.

پاولا پێکەنی. دەیەویست جارێک خۆی لەو هەمو بۆنە فەرمیانە بدزێتەوە «هەندێ کەلوپەلی ناوماڵ» لە سوپەرمارکێتە گەورەکان  بکڕێ، بەڵام کات هەرگیز بواری پێنەدا.

لەکاتی لەوێنەبوونی بنگۆریۆن باترلی کروم Bartly Crum، ئەوکەسەی ئەزمونی خۆی وەک ئەندامێکی کۆمسیۆنی ئانگلۆ ئامریکایی لەفەلەستین لەکتێبێکدا بەناوی Behind the Silken Curtain خستبووە ڕوو، سەردانی ئیسڕائیلی کرد.  کاتێک ئەو لەپاریس بوو، زەنگی بۆ برادەرەکەی خۆی جۆ داڤیدسۆم Jo Davodsom کە پەیکەرتاشێکی بەناوبانگ بوو، لێدا و داوایلێکرد  ئاخۆ خۆی و هاوسەرەکەی فلۆرەنس لەگەڵیدا دەچنە ئیسڕائیل. ئەوانیشی هاوگەشتەکەیان پەسەندکرد. بەڵام هەنوکە دوای

یەكدوو ڕۆژ دەبێ ئیسرائیل بەجێبێڵن.
کروم بە بنگۆریۆنی گوت کە داڤیدسۆن زۆر حەز بەناسینی دەکا. «ئەو گوتی کەوا پەرۆشی دروستکردنی پەیکەرێکی ئەوە.»
بنگۆریۆن رازی بوو کە کروم داڤیدسۆن هەمان شەو لەگەڵ خۆییدا بیهێنێ و بیبینێ.
کاتێکیش بۆ یەکەمین جار یەکدیان دی، هەردولایان ماندوو ببوون. داڤیدسۆن هەمو رۆژەکە ئیشی لە کەللەسەری پەیکەری مۆشێ شاریت کردبوو، کاتێک کەبەلایانادا تێپەڕی سکرتێرەکەی بە عیبری لەگەڵیدا ئاخاوت پاشان هەندێ وشەی بە روسی لەگەڵ ژنەکەی گۆڕییەوە و لەگەڵ پەیکەرتاشەکەش بەئینگیلیزی قسەیدەکرد. ئێوارە درەنگەکەی داڤیدسۆن بە ماندویی و شەکەتی گەڕابووەوە میوانخانەکەی؛ زۆری نەبردبوو هێرشێکی دڵ لێیدابوو بۆیە نەدەبوا زۆر خۆی سەرقاڵ بکا. بەڵام کە کروم بانگهێشتنەکەی پێگەیشت بەپێخۆشییەوە گوتی: ئای چەند خۆشە!
بنگۆریۆن داڤیدسۆنی لە کتێبخانەکەی کەلە نهۆمی دوهەم بو دیت. پێیگوت:
«بیستوومە کەتۆ بێ ڤیزا هاتویتە ئێرە.»
داڤیدسۆن ددانیپێدانا.
«لەو بڕوایەدام خێرا بتوانم بتگرم.»
بەیەکەوە قسەیان لەئەگەری نیوە پەیکەرەکەی کرد. کاتەکەش شەوی یەکشەممە بوو. لە دوشەممەدا داڤیدسۆن وادەیەکی لەگەڵ سەرۆکی شارەوانی حەیفا ئابا خوسی Abba Khousy سازدا و دەبووایە هەمان شەویش بگەڕابایەوە پاریس. بنگۆریۆن هەمو یەکشەممەکە لە کاژێر نۆی بەیانییەوە سەرقاڵ بوو.
سەرەک وەزیران لەدواییدا گوتی: «من بەیانیەکەی زو لەبەردەمت ئامادە دەبم.»
داڤیدسۆن بەرسڤی دایەوە: «زۆر بەجێیە.»
بەڵام لەپڕێکەوە سەرەک وەزیرانە تەمەن شەست و چوار ساڵە کە بە پەیکەرتاشە تەمەن شەست و هەشت ساڵەکەی گوت: «ئەرێ بۆچی لەم شەوەوە دەست پێنەکەین؟»
کروم و فلۆرەنس داڤیدسۆن بەپەلە دەرچوون بەڵکو قوڕ و کەرەستەی پێویست وەربگرن. هەنوکە چوار کاژێری بەدوادا دێ کە داڤیدسۆن بە هێزوگوڕی لاوێیک خەریکی قوڕ شێلانەکەی دەبێ، لەو کاتەشدا بنگۆریۆن و فلۆرەنس داڤیدسۆن سەرگەرمی قسانن.
لەنیوەشەودا پەیکەرتاشەکە دەستی لەکارەکەی هەڵگرت؛ قوڕەکەی بە پەڕۆیەکی تەڕ داپۆسێ و گەڕایەوە میوانخانەکەی. رۆژی پاشتر کاژێر حەفت و نیوی سەرلەبەیانی هەر چواریان لەسەر کارەکانی خۆیان ئامادە بوون. بنگۆریۆن لە کاتی ئاساییانەی خۆی کەمتر نەنوستبوو، بەڵام هەرسێ کەسەکانی دیکە هێشتا بەتەواوی بێدار نەبووبوونەوە.
داڤیدسۆن وتەکانی هاوکارە پەیکەرتاشەییەکی چەندبارە دەکردنەوە: «ئەز دەبێ ئەو نیوە پەیکەرە پێش مردنم تەواو بکەم.»

ئەوەش سەرنجێکی پێغەمبەرانە بوو. نیوە پەیکەرەکەی بنگۆریۆن دوا پەیکەر بوو کە پەیکەرتاشی ناوداری ئامریکایی دروستیکرد.

کاتێکیش بنگۆریۆن بەجێیهێشتن، چاوێکی برِیە کەڵلەی پەیکەرەکە و پرسی:

«ئەرێ تەواو بوو؟»

پەیکەرتاشەکە بەرسڤی دایەوە: «هێشتا بەتەواوی نا.»

«دە باشە، کەواتە من ئێوارە درەنگ کاژێر شەش و نیو کەمێکی دیکە لەبەردەمتدا دەمێنمەوە.»

هەمان شەو بۆ کاژێر نۆ نیوە پەیکەرەکە تەواو بوو.

رۆژی پاشتر، دوای نیوەڕۆکەی شەپۆلێکی لەناکاوی باوبۆران کە ساڵانێک بوو ئیسرائیل شتی وای بەخۆیەوە نەبینیبوو، هەڵیکرد. باوبۆرانەکە دارودرەختی لەڕەگەوە هەڵقەناندن، ریگاکان گیران، خانوبەرەکان زیانیان پێگەیشت. لێشاوەکە زۆر هاروهاج و لەوپەڕی هێزیدابوو کە زەنگیان بۆ بنگۆریۆن لە ماڵەکەی کێرن کیامەتدا لێدا. ئەوەش جۆ دادیدسۆن بوو کە بۆ خواحافیزی هاتبوو. خۆی و هاوسەرەکەی بە هۆی باوبۆرانەکە گەڕانەوە حەیفا. بنگۆریۆن بە ئۆتۆمبێلەکەی لەسەر ئەوە بوو ئۆرشەلیم بەجێبێڵێ. لەو کاتەی هەردوو پیاوەکان لەگەڵ یەکدا دەدوان، هاوسەرەکانیان گازاندەیان بۆیەک دەردەبڕی چونکە «مێردیان بە دووپیاوی پڕ وزەی بزۆز» کردووە، کە رەشەبا، تەنانەت لاهاتنی دارودرەخت یان ئەوەی سروشت دەیهێنێتە سەر ریگایان، لە ئامانجەکانیان لانادا.

لە کاتی خواحافیزی و دوعاخوازییەکەدا داڤیدسۆن بەشێوازە تێبینیدارەکەی خۆی وەک کەسێک کە هەرگیز ئەوجۆرە پەسنە ریزگرتنەی بەکارنەهێابێ بە بنگۆریۆنی گوت: «ئەو رۆژانە بۆمن یادەوەرییەکەی گرانبەها بوون.»

ئەوەش پیاهەڵدانێکی گەورە بوو، چونکە داڤیدسۆن وەک پەیکەرتاشێک لەگەڵ زۆر لەمەزنە پیاوان هەڵسوکەوتی کردوە. ئەو کۆتەڵی بۆ کەڵلەسەری گاندی، ئاینشتاین، شاو Shaw، وایتمان Whitman، رۆزڤێلت، رۆکفێلەر، کلیمانسۆ و هێلین کێللەری دروست کردبوو. بەڵام ئەو نیوە پەیکەرەی بۆ بنگۆریۆنی داتاشی لە پەیڤەکان زیاتر سەرنجڕاکێش بوو. قوڕ بۆتە گەچ و گەچیش بۆتە برۆنز، هەنوکە کێ بە نیوە پەیکەر سەرسامە، لەو پەیکەرەدا داڤیدسۆن پەنجە هەستیارەکانی بەکارهێناون، وزوە توانا و بزۆزی و لێبراوانەی بنگۆریۆنی تێدا بەرجەستە کردووە.

تاکە شت کە پەیکەرەکە نەیبێ بارگە کارەباییەکەی قژە سپییەکەی بوو کە رێکو قیت وەستاوە.

مایەی خۆشی بوو کە بنگۆریۆن لە گەشتە ئامریکاییەکەی گەڕایەوە. کاتی بۆ پشودان نەبوو، چونکە هەڵمەتی هەڵبژاردن لەدەرگا بوو.

پارتەکەی ئەو، ماپای سێ ساڵ بوو لەسەریەک گەورەترین پارتی دەسەڵاتدار بوو بەڵام هەنوکە لەهەمو لایەکەوە هێرشی دەکرایە سەر. تۆمەتی هەمو کەموکوڕیەکانی نێو خەڵکی خرایە ئەستۆی ماپای: کورتهێنانی خۆراک، بازاڕی رەش، کورتهێنانی سەرمایەی بیانی بۆ وەبەرهێنان، پاشەکشەکردنی بارودۆخی کرێکاران. لەسەرێکی

دیکەشەوە ئەو لۆمەیە لە ماپای کرا گوایە لەهەمبەر سەرمایەی ئامریکاییدا خزمەتکار بووە و قازانجی بەڵێندەرە تایبەتییەکانی پێ لە بەرژەوەندی کرێکاران گرنگتر بووە. بەگوێرەی نوارینی هەندێکیان ماپای بۆ سەر پرسی دیین هەڕەشەبوو، بەگوێرەی هەندێکی دیکەشیان زۆر بۆ تیۆکراتەکان (ئۆلدارەکان) چەماوەتەوە. تۆمەتی ئەوەشیان خستە پاڵ کە زۆر داڕساوەتە عەڕەبەکان و ورووژاندونیەتی، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا وەک پێویست لەبەرامبەریاندا رانەوەستاوە.

بنگۆریۆن ئەو دەوڵەتمەدارە، ئێستا بۆتە سیاسەتوانێک و وتاری سەرنجگیر لەو کۆبوونەوە بۆ ئەوی دیکەدەدا. بەو قسەیەی زۆر پێکەنین کاتی پەلاماری ئەو سیاسیەتوانانەی دان کە زیاتر گفت دەدەن لەوەی بەجێیبگەیەنن، کاتێ گوتی: «بەڵام من لەنەخشەمدا نیە بەڵێنی ئەوە بدەم کە بۆ هەر ژنێکی ئیسڕائیلیی مێردێک و فستانێکی نوێی بۆ دابین بکەم!»

لە هەفتەی یەکەمی ئاگستۆسدا هەڵبژاردنەکان کران. سەد هەزار کۆچبەر بۆ یەکەمین جاریان بوو لەژیانیاندا دەنگ بدەن. ماپای یەک کورسی لە چل و شەش کورسییەکانی کەنیست لەدەستدا. پارتە ئەرسەدۆکسییەکانیش هەمان زیانیان لێکەوت. هەروەها زیانەکە لە ماپامیش کەوت. زایۆنیزمە گشتییەکان کە بنگۆریۆن بەوەی تۆمەتباردەکردن کە زۆر پێ لەسەر دەستپێشخەری تایبەتییانە دادەگرێ، بەخۆیان و بیست کورسییانەوە بوونە دووهەمین گەورەترین پارت.

بنگۆریۆن بووەوە سەرەک وەزیرانی هاوپەیمانێتییەکی پیاوگەلێک کە هەر هیچ نەبێ لەیەک پنتدا بەتەواوی یەکانگیر بوون ئەویش: هیچ ئیسڕائیلیەک ناتوانی باشتر لەو پیاوە ریش سپییە بەویقارە رابەرایەتیان بکا؛ ئەوەش بیروڕایەک بوو رێژەیەکی زۆر لە دانیشتوان بڕوایان پێیهەبوو.

پشکهەبوونی بنگۆریۆن لە ساڵنامەی ١٩٥١ی ئیسڕائیل بەناوی «هاواری گیان» بوو. دوا دێڕی بەم شێوە بوو:

«بۆکوێ بە لەکوێوەهاتوی گرێدراوە. بەڵێی سروشت هەگیز ناگۆڕدرێتە سەر نەخێر. مێژو هیچ نادۆڕێنێ. رابردومان لە پشتمانەوە نیە بەڵکو بەزیندویی لەپێشماندا دەڕوا. ئێمە وەک ئەو دەستنوسە وێنانەکراوە نین یان ئەو سەنگە قوڕە مردووە نیین کە لەگەڵ خۆماندا بەرەو ئایندەی ببەین، ئێمە بەدەستی بەتاڵەوە رێناکەین. ئێمە لەگەڵ خۆماندا پاشماوەی خەڵاتی یەکێ لە گەورەترین شارستانێتی دێرینی سەدە کۆنەکانمان هەڵگرتووە.»

# بەشی
## (٢١)

دوشەممە، ٧ی فێبرایری ١٩٥٢ لە ئۆرشەلیم ڕۆژێکی ساردی ناخۆشی بوو، زۆربەی ئیسرائیلییەکان نەخاسمە خودی سەرەک وەزیران خواخوایان بوو ئەو رۆژە زو لەبیربکەن. لەبەرئەوەی هێشتا باڵاخانەی پەرلەمان بینانەکرابوو، بۆیە کەنیست لە تەلارێکی بازرگانی سێ نهۆمی کە دەکەوتە سەر شەقامی شاجۆرجی پێنجەم کە لەناو جەرگەی ناوچەیەکی بازرگانیدابوو، کۆببوەوە. لەو دووشەممە تەڕوتوشەدا پۆلیس ڕێگاوبانی باڵەخانەکە بە تێلدڕ و بلۆکە چیمەنتۆ گرتبوو. ڕێگای هاتوچۆ دەبووایە پێچی کردبایەوە؛ شەش سەد پۆلیسش بەیەکبەرگیی، بە شەپقەیان و زرێپۆش و تۆپزی لاستیک و نارنجۆکی فرمێسکرژێن بەو ناوەدا دەسوڕانەوە.

دوای نیوەڕۆکەی، کەنیست پرسێکی گرنگی تاوتوێ دەکرد. مژارەکەی دەبووە مایەی ئاژاوەنانەوە: ئەویش: سەرلەنوێ دەستپێکردنەوەی قەرەبووی ئاڵمان بوو بۆیان.

بۆ بنگۆریۆن ساتەبڕیارێکی پڕکێشەبوو. سەرەتا دەبوایە لەخۆی بپرسیبایە ئاخۆ چۆن قەرەبووی زیانلێکەوتنی گەلێک بپەژرێنێ، کە زۆرنابێ خراپترین کارەساتی راوەدونانیان لەمێژودا بەسەردا هاتووە.

دوای ئەوەی گەیشتە بڕیارەکە، کە فڕی بەسەر کاروباری رەوشتیانەوە نەبوو، دەبووایە ئەوانیدیکەش بهێنیتە ڕایێ. ئەو بەهۆشیارییەوە دەیزانی کە لەڕوی سیاسیەوە وەک ئەوە وایە یاری بە دینامیت بکا، چونکە پیاوەکانی خۆی دەناسین کە هێشتا کەمیان ئامادەن گوێ لە بەڵگەوبەندی هۆشمەندییانە بگرن. برینەکانی هیتلەریان هێشتا سارێژنەببوونەوە. هەر قسەکردنێک لەپرسی قەرەبوکردنەوە، برینەکان دەکولێنێتەوە و ژان و ئازار لەگەڵ خۆیدا دێنێ. هیچ پرسگەلێکی دیکە بەقەد ئەوە لەبار نەبوو کە دوژمنەکانی بخاتە یەک بەرەی بەرامبەرەوە. ئەو دەیزانی رەنگبێ کاری توندوتیژیشی لێبکەوێتەوە. بۆیە کۆسپ و تەگەرەی خستنە بەردەم رێگاکانی گەیشتن بە شوێنی کۆبوونەوەی کەنیست.

دانیشتنەکەی پەرلەمان بەهێورەیی دەستپێکرد. لە کاژێر ٤,٣٠ خولەکدا سەرەک وەزیران راگەیاندنەکەی خۆی خوێندەوە. ئەوەی باسکرد کە ئیسرائیل دە مانگ پێشتر دانوستانەکانی لەگەڵ ئاڵمانەکان دەستپێکردووە. راوێژکاری ئاڵمانیای ڕۆژئاوا نوسراوێکی نوسیوە، تیایدا هاتووە کە ئامادەیە پرسی قەرەبوونەوەکە تاوتوێبکا.

«رێگا مەدەن بکوژەکانی خەڵکەکانمان ببنە میراتگرییان!»
دوای ئەوەی سەرەک وەزیران لە دوانەکەی بووەوە و دانیشت، ئیدی بەڵگەوبەندی نەیارانی بەڕودا تەقینەوە. ئەندامێکی پارتی زایۆنزمیی گشتیی رایگەیاند کە کوڕێژگەکەی لێپرسیوە:
باوکە باوکە، ئەرێ چەند بڕە پارە لەبری باپیرە و داپیرەدا وەردەگرین؟»
قسەکەرێکی دیکەی ماپامیش گوتی:
«ئەوە لیستێکی دەسەڵاتدارانی رۆژئاوایە تاکو ئاڵمانی رۆژئاوا وەک بەردەبازێک بۆ هێرشکردنە سەر یەکێتی شۆرەوی بەکاربهێنن.»
لەو ساتەدا ئەندامێکی هێروت Herut بە هاوارکردنەوە لێوەژورکەوت: «ئەرێ خۆ گاز بوو دژی جولەکان بەکارهێنرا! گاز !»
شەقامێک لەولاوەتر مناحیم بێگن لەسەر بەلەکۆنەی یەکێک لەخانوەکاندا دیماگۆگێترین دوانی لەژیانیدا بۆ ئاپۆرەی کۆمەڵە خەڵکانێک کە زۆرینەیان گەنجەکان بوون، دا.
لەنیوەی دوانەکەیدا بە ئاماژەیەکی دراماتیکیانە کاخەزێکی لەبەرکە دەرهێنا و هاواریکرد:
«من نامەوێ توڕەییتان زیاتر بجۆشێنم، بەڵام ئەو هەواڵە منی گەیاندە ئەو بارە. پۆلیس ئەو جۆرە نارنجۆکانەی هەڵگرتووە کەبە گازی ئاڵمانی پڕکراونەتەوە. هەمان گاز کە باوک و دایکی ئێوەیان پێخنکاند...
«ئێمە ئامادەین هەمو شتێکی لەپێناودا بکەین، شەهیدبون، ئۆردوگای زۆرەملێ، زیندانی ژێر زەمینی، تاکو رێ لە دانوستاندن لەگەڵ ئاڵماندا بگرین.» بیگن بڕیاریدا دوانەکەی بە هەڕەشەیەک بۆ سەر بنگۆریۆن بنێرێ کە هەر چەند سەد مەترێک لەولاوە لەسەر مێزی حکومەت دانیشتبوو گوێی لە وتارەکانی ئۆپۆزسیۆن دەگرت:
«کاتێک جەنابتان تۆپت بەرەو ئێمە گرتیبەردەدا، ئەوکات فەرمانم دا : «نەخێر». بەڵام ئەمڕۆ فەرمان بە «بەڵی» دەدەم. ئەوەش شەڕی مان و نەمانە.»
بە دڵنیاییەوە نیوەی گوێگرەکانی بەرەو کەنیست کشان. زۆریان کۆڵەپشتیان پڕ بەرد کردبوو. بەبێ زەحمەتی توانیان هێڵی یەکەمی پۆلیس ببەزێنن. کاتێکیش لە کەنیست نزیکبوونەوە، ئەو پۆلیسانەی لەسەر بانەکانی دەوروبەر بوون، چەند بۆمبێکی فرمێسکڕژێنیان بەردانە ناو. وەلێ بایەکە بەئاراستەی پێچەوانەوە هەڵیکرد، بۆیە کاریگەری گازی فرمێسک رژێنەکە زیاتر لەسەر پۆلیسەکان بوو نەوەک ئاپۆرەی هەڵمەتبەر.
پۆلیسەکان بەرەودواوە کشانەوە و بەردەم باڵەخانەی کۆبوونەوەی کەنیستیان گرت. چەند تەقەیەک بەسەر سەری ئاپۆرەکەدا تەقێندرا. کاتێکیش ئۆتۆمبێلی نەخۆشخانە بە هێمای ئەستێرەی داودەوە لێیان نزیکبووەوە تا نەخۆشەکان هەڵبگرێ، پەلاماری ئۆتۆمبێلەکانیان دان. خەڵک رێگەیان لە پزیشکەکان گرت تا بەسەر بریندارەکاندا رانەگەن.
لە پەلاماری یەکەمدا سیانزە پۆلیس بریندار بوون، جێگری بەرپرسی پۆلیسەکان

و یاریدەدەرەکەی لەنێو بریندارەکاندا بوون.
پاش کاژێرێکی شەڕە شەقام، ئۆتۆمبێلیکیان وەرگێڕا. کاتێکیش تانکی بەنزینەکە کون بوو لێیڕژا، یەکێک بۆمبیکی بچوکی بۆهەڵدا و گڕی گرت. لەگەڵیدا پەلاماری ئۆتۆمبێلەکانی دیکەشیان دا.
ئەندام پەرلەمانێکی کۆمۆنیست لە هۆڵەکە بازیدا و هاواریکرد: «ئێمە لێرە دانیشتوین و قسە دەکەین، کەچی لەدەرەوە خەڵک بەربوونەتە گیانی یەکدی و یەکدییان تەواوکرد. دەگوێ بگرن دەی!»
لەو ساتەدا بەرد گیرانە پەنجەرەی کەنیست. بەردێک بە سەری پەرلەمانتارێک کەوت و زامداریکرد. ئەوانی دیکەش وردە شوشەیان بەسەردا بارین. جارێکی دیکە بەرد گیرانە هۆڵەکە، ئەوسا لەڕێی پەنجەرەی شکاوەکەدا دوکەڵی گازی فرمێسکڕژێن هاتە ژورەوە. وەزیر و پەرلەمانتارەکان دەستیان بەکۆخە کۆخ و سڕینەوەی فرمێسکی چاوانیان کرد.
پاولاش هەرچەندە لەلایەن مێردەکەی ئاگادار کرابووەوە کە رەنگبێ شەڕ و هەرای لێبکەوێتەوە، بەڵام وەک جاری جاران بەخۆی ترمزە چایەکەوە لەوێ بوو. لەو تەنگەتاویەدا بنگۆریۆن ئاسا دەیەوست بەهێوەرەیی بمێنێتەوە. پاولا یارمەتی پزیشکەکەی دا کە خۆی گەیاندبووە هۆڵەکە بۆ تیمارکردنی بریندارەکان.
جارێکی دیکە بەرد گیرانە هۆڵی کۆبوونەوەکە. دەنگەدەنگی هەراو بەزمەکە گەیشتە ناو هۆڵەکە: تەقەی دەمانچە، دەنگی شوشەشکاندن، تەقینەوەی بچوک، فیکەی ئۆتۆمبێلە فریادڕەسەکان و ئاگرکوژێنەرەوەکان، هاتوهاواری ئاپۆرەی تورە. دوای کپبوونەووی گازی فرمێسکڕژێن، بۆنێکی هەناسەتەنگکردن لە تایەی سوتاوەوە دەهات.
بارودۆخەکەی کنێست لە ئابلۆقەدانی قەڵایەک دەچوو.
کاتێک خانمێکی ئەندام پەڕلەمانی سەر بە پارتی زایۆنیزمی گشتی بێهۆش کەوت، بنگۆریۆن بنباڵی گرت ویارمەتیدا لە هۆڵەکەی هێنایە دەرەوە، بە تورەییەوە گوتی:
«ئەو هەمو بەحیساب تورەییە چۆن رێکخراوە.»
ئیدی مناحیم بیگین خۆی کشاندە نێو پەڕلەمان و چووە سەر سەکۆ و لیستێک ناوی رابیی، زانا، شاعیر و سەرکردەکانی بواری وێژە و ئایینی لەدوای یەک ریزکرد، گوایە هەموویان دژی دانوستاندن لەگەڵ دەوڵەتی ئاڵماندا.
بنگۆریۆن کە گەڕابووەوە سەر جێگای خۆی، ئاماژەی بەپەنجەرە شکاوەکان دا و گوتی:
«ئەو کەسانەی ناوتهێنان، فڕییان بەسەر ئەو گێرەشێوێنیەی تۆوە نیە.»
بیگین بەسەریدا قیژاند و پێیگوت: «خۆت گێرەشێوێنی.»
لەنێو هۆڵەکەدا سوکایەتی زۆر بەیەکدیکرا. بێگین بە سەرەک وەزیرانی گوت «بکوژ»، یەکێکی دیکەش بێگینی بە «شێت» لەقەڵەمدا، بەڵام ئەوانە قسەبەیەکدی بڕینی نێو هۆڵەکە بوون.
سەرۆکی پەڕلەمان داوای لە بیگین کرد وشەکانی خۆی بکێشیتەوە و پەژیوان

ببێتەوە. ئەویش داوای لێبوردنەکەی رەتکردەوە. سەرۆکی دانیشتنەکە داوای لێکرد سەر سەکۆ جێبیلێ، دیسان رەتی کردەوە وگوتی:
«گەر من نەتوانم قسەبکەم، رێگەنادەم هیچ کەسێکتان قسەبکا.»
سەرۆک چەکوشەکەی بە مێزدا دا و دانیشتنەکەی تا کاژێر سێ هەڵپەسارد.
کاتێک سەرلەنوێ کەنیست دانیشتنەکەی کردەوە، سەرکردەی هێروت کەدوای شکستەکەی هەڵبژاردن جارێکی دیکە مقۆمقۆی لەسەربوو، داوای لێبوردنی لە سەرەک وەزیران کرد کە بەشێوەیەکی ناشایستە و ناپەرلەمانییانە قسەی بەسەرەک وەزیران گوتبوو. ئەو رایگەیاند کە دواجارە لە کەنیستدا قسەبکا.
«گەر هاتو هەوڵبدرێ لەگەڵ ئاڵمانەکان دانوستان بکرێ، ئەوا پارتەکەی من رودەکاتە کردەی ژێرزەمینی. شتگەلێک هەن خۆشەویسترن لە ژیانمان، شتگەلێک بەدتر لە مردن.. هێشتا بۆرێپێگرتن شەڕی کەم کراوە. ئەز دەزانم کە پەلکێشی ئۆروگا زۆرەملێکانم دەکەن، بەڵام ئەوکات خۆ بەیەکەوە دەمرین.»
بە ئێوارەیەکی درەنگەوە ئارامی گەڕایەوە شەقامەکان. حەفتا شەڕکەری گێرەشێوێن گیران. زیاتر لە سەد پۆلیس و هاوڵاتی بریندار بوون، هەندێکیان برینەکەیان سەخت بوو. مرۆ گومانی ئەوەی هەبوو کە خۆپیشاندەرانیش سەد برینداریان هەبووبێ، بەڵام لەسۆنگەی ترسی راوەدونان و گیران ئاودیوکرابوون، بۆیە خۆیان شاردەوە.
لە شەوەکەیدا جامی پەنجەرەکان چاککراونەوە بەشوشەئاسنینە گیران.
رۆژی پاشتر زۆرینەی شەقامەکانی ئۆرشەلیم بەربەستیان بۆدانرا. ناوبەناو دەنگی تەقەیەک دەهات. دەنگێکی گرژی و تورەیی باڵی بەسەر شاردا کێشابوو. هەمو وڵاتەکە بەترس و تۆقینەوە چاوەڕوانیدەکرد. گەر هاتبا و شەڕی براکوژی هەڵبگیرسابایە، ئەوا بێهودە هەمو شتێک لەدەست دەردەچوو. جارێکی دیکە پێویست بە دەنگێکی بەهێز و بڕوابەخۆبوون هەبوو، سەدای بووبایە.
لەو شەوەدا هەمو ئیسرائیل لە ڕادیۆدا گوێیان لەو دەنگە بوو.
«دەستەیەکی لاسار کە لە ئیرگون و کۆمۆنیستەکان پێکهاتبوون بەسەر کەنیستیان دادا...
«بەئەرکی خۆمی دەزانم کە نەتەوە لەو شێوە پیلانە ناپاکیی و تاوانبارییە دژوارە ئاگادار بکەمەوە و دەمەوێ دڵنیاتان بکەمەوە کە ئێمە هەمو رێکارێکی ئاسایشپارێزیمان گرتۆتە بەر تاکو ئارامی ئیسرائیل بپارێزین...
«من واتای راگەیاندنەکەی مناحیم بێگین بەکەم هەڵناگرم. ئەز دەزانم خۆی بۆ زۆرانبازییەکی ژیان و مردن تەرخانکردووە، منیش بەباشی هەروام؛ من دژی هەرکەسێکم کە هەڕەشەوگوڕەشە بکا. کارێکی گران نیە کە تاوانی کوشتنی ئەندامانی حکومەت ئەنجامبدرێ... ئەوەشم لا رون وئاشکرایە کە پلانەکانی بەڕێز بێگین بە پلەی یەکەم دژی کێیە...
«بەڵام ئەوەش نابێتە هۆی تۆقین، نابێتە هۆی ترس وبیم.. ئیسرائیل هەرگیز نابێتە سپانیا و سوریای دووەم.»
رۆژی دواتر لە شارەکەی بایبلدا باران دەباری، لەو کاتەشدا زالمان شازار

Zalman Shazar وەزیری پەروەردە داکۆکینامەکەی بۆ پەژراندنی دانوستاندەنەکانی قەرەبووکردنەوە دەخوێندەوە.

«دوو هەزار ساڵە ئاوارە و دەربەدەر دەکرێین، بەڵام هەرگیز نەمان توانیوە داوای قەرەبوکردنەوەی ئەو هەمو ژانانەمان بکەین.»

کاتێکیش ساتی دەنگدان هات، پارتەکەی بیگین ئەندامێکی خۆی کە هێرشی دڵ لێیدابوو بە چوارپایەی نەخۆشخانەوە هێنایانە ژوری کۆبوونەوە. بنگۆریۆنیش بانگی داود هاکۆهن David Hacohnی کردەوە کە بە بەئەرک بۆ کۆبوونەوەی نەتەوە یەکگرتووەکان لەپاریس بوو، فەرمانی بۆدرا بەفڕۆکەیەک بگەڕێتەوە ئۆرشەلیم تا دەنگەکەی بدا. هەرچەندە تونڕەوەکان بەلێشاو هاتبوون، بڕیارەکە بە ٦١ دەنگ بەرامبەر ٥٠ دەنگ بە بەرژەوەندی سەرەک وەزیران درا. بەهۆی بڕیارەکە بنەمای رێکەوتنێک دانرا، بە هۆیەوە ئیسرائیل بایی ٧١٥,٠٠٠,٠٠٠ ملیۆن دۆلاری لە ئاڵمانەوە بە کاڵای لێخوڕین، ماشێن و ماددەی خاو وەرگرت.

هەندێکیان هەرگیز لە بنگۆریۆن خۆشنەبوون، کاتێکیش کەلوپەلە قەرەبووەکان بە شەمەندەفەڕان لە ئاڵمانەوە گەیشتنە سەر خاکی ئیسرائیل، رەتیان کردەوە کە بەکاریبهێنن.

وەلێ بنگۆریۆن ئەو شتەی ئەنجامدا کە ویژدانی خۆی لەگەڵدابوو، ئەو داکۆکی لەپرسگەلێکی ناجەماوەریانە کرد، لە ئانوساتێکی تەنگەتاودا بۆ گەلەکەی سەلماند کە ئامادەیە سەرکردایەتییەکی دیموکراسیانە بکا.

لاوتنانت کۆلۆنێل Lieutenant Colonel(بەرامبەر پلەسەی سەربازی مقدم ە) نەحێمیا ئارگۆڤ یاریدەدەری سەربازیی سوپاسالار، لە کاتی ئاژاوەکەدا لە ئۆرشەلیم نەبوو. دوای ئەوەی لەو سەربازگەیەی مەشقەخولێکی دووبارە دەکردەوە، گوێی لە هەواڵەکان بوو، بە ناسیاوێکی گوت : «گەر ب.گ هیچی لێهاتبا، منیش خۆم دەکوشت.»

لە فێبرایردا بنگۆریۆن چاوی بەکەسێک کەوت، سی وسێ ساڵ بەرێ، بەسەرپێی دەیناسی. ئەو و سام هامبورگ Sam hamburg لە جەنگی یەکەمی جیهانییدا بەیەکەوە لەراژەی بەتالیۆنی جوەکاندا بوون. ئەوکات سام تازە تەمەنی گەیشتبووە حەڤدە ساڵان بوو، کەڵەگەتێکی ئایدیالیست بوو. دوای جەنگ لەفەلەستین دەڕوات و دەچێتە ئامریکا، لەوێ بەپارەی قەرز کۆرسی کشتوکاڵی لە زانکۆی کالیفۆرنیا تەواو دەکا. لەنێو جوتیارانی بیاباندا بووە بیچمێکی ئەفسانەیی، کە پێنج ملیۆن دۆلاری لە بەڵێنداریێتی و کشتگەکاندا بەگەڕخست، ئەوەندە گەورە بوو بەقەد دورگەی مانهاتن Manhattan دەبوو؛ وەک دەرچەیەکی ململانێ زەحمەتیەکەی لەگەڵ بیاباندا ، لەدوایدا سەرکەوت.

هەنوکە ئەو پیاوە کۆڵنەدەرە بە ڕوە گەش و چوارشانەییەکەی سەردانێکی وڵاتی پێشینانی بابوباپیرانی کردەوە.

بنگۆریۆن دەربارەی نمایش و چالاکیەکانی بیستبوو، دەیزانی کە بەروبوومی گەنمەکەی بەهۆی سن و کیسەڵە و ژەنگەوە لەدەستداوە، کانیاوەکانیشی وشک

هەڵگەڕاون، بەڵام ئەو ئاوی بەدرێژایی ٦٤ کیلۆمەتر بەخاکێکی گردۆڵکەییدا راکێشاوە، هەر جارێکیش کارەساتێکی سروشتی بەسەردا هاتبا زیاتر زەوی دەکرِی و نوچدانی نەبوو. ئیسرِائیل پێویستی بە جولەکەی لەو جۆرە هەبوو. سەرەک وەزیران داوای دیتنی کرد.

«ئەو شێوازەی لێرە کشتوکاڵی پێدەکرێ، سەرکەوتو نیە.»

«چۆن؟»

«لێرە رامانیان بۆ کارەکەیان نیە. خەڵک هەروەک ئاورِوپا لەسەر کێڵگەی بچوک و دارودرەختی کەم کاردەکا.»

«ئەدی باشە چیبکەین؟»

«جەنابی سەرەک وەزیران، دەزانم تۆ رامانت هەیە، بەڵام تۆ لە وڵاتی خۆت دەترسی. تۆ نازانی چیت هەیە. خاکی ئێرە نایابە. تۆ سەقایەکی چونیەکت هەیە. تۆ دەتوانی باشترین لۆکە ، شەکر، توتن، گەنم و سەوزەی زستانی بەرهەم بهێنی.»

بنگۆریۆن برۆ دڕەکانی هەڵاوێشتن.

«تۆ دەتوانی بەرهەمەکان بنێریتە دەرەوە. بازرگانی گەورەی پێوەبکەی. سەرمایەی دەرەکی بۆ کێشبکەی.»

«شارەزایەکانمان پێیان گوتوومە کەوا لێرە لۆکە ناچێندرێ، چونکە مێشولە هیچی ناهێڵێ.»

هامبۆرگ بە لەپە گەورەکانی ئاماژەیەکی کرد.

«هیچ مێش و مەگەزێک نیە لەناونەبرێ، گەرهاتو کێڵگەکان بەروبەرێکی فراوان بوون، کەمیشی تێدەچێ.»

بەچەندان کاژێر قسەیەکان بەیەکەوەکرد. لەدواید بنگۆریۆن دەستێکی لەمێزەکەی بەردەمیدا وگوتی:

«دەکرێ هەفتەی داهاتو بەیەکەوە سەرێکی نەقەب بدەین و تەماشایەکی بکەین.»

هامبۆرگ بەرسڤی دایەوە: «نەخێر ناکرێ، ئێستا لە کالیفۆرنیا بەهارە. من دەبێ تۆ دابچێنم. بەڵام باوا رێکبکەوین گەر تۆ پێویستت بەمن هەبێ ، جارێکی دیکە بگەرِێمەوە.»

«کەی؟»

هامبۆرگ روپەرِەکانی ئاجیندای ناوگیرفانی کرد و گوتی:

«٦ی مارت کە دەکاتە پێنجشەممە، ئەز کاتژمێر هەشتی سەرلەبەیانی لای نوسینگەکەی تۆ دەبم.»

بنگۆریۆن بەبەرینی پێکەنی. ئەو کەسانەی خۆشدەویست کە بەدەقاودەقی دەیانزانی چیان دەوێت.

«دەکرێ لەوادەکە خاترجەم بم؟»

«بەڵی، بە ئەرخاینبونەوە.»

پێنجشەممەی ٦ی مارتی ١٩٥٢ کۆمەڵێکی نزیکەی پەنجا کەسی لەبەردەم وەزارەتی

بەرگری لەتەلئەبیب ئامادەبوون. ریزە ئۆتۆمبێلیکی زۆر وەستابوون، لە رۆخی شۆشتەکاندا رایانگرتبوو. بنگۆریۆن لەگەڵ یادین، بەرپرسی ستافەکەی، وەزیرێک کۆمەڵێک پسپۆڕی کشتوکاڵی و لێکۆڵەرەوە زانستییەکان، هەمویان چاوەڕێبوون.

ئەوان هەر تەماشای کاتژمێرەکەی دەستیان دەکرد. گرەو لەسەر هاتن و نەهاتنی ئەو پیاوە ئامریکاییە چوارشانە تێکسمڕاوە دەکرا.

بەدەقاودەقی لە کاژێر هەشتدا بەدەرکەوت. بەیەکەوە بەرەو بیابانی نەقەب ئۆتۆمبێلەکانیان لێخوڕین، هەمو رۆژەکەیان لە بیاباندا بەسەربرد و چەند جێبێکی سەربازییش پاسەوانیان دەکردن. هەر شوێنێکی بۆی دەچوون وشکوبرینگ و بێبەرهەم بوو. لەکۆتاییدا لە بیئر سەبعە راوەستان.

سەرەک وەزیران پرسی: «بەڵێ هامبورگ، چۆنی لێتێدەگەی؟»

«تەماشاکە گەورەم- خۆ پێتناخۆش نیە گەر من بەگەورەم ناوت بهێنم؟- من هەمو ژیانم بە گژ بیاباندا چوومەتەوە، شەڕم لەگەڵ سروشتدا کردووە تا لەروی داراییەوە سەربەست بم و ئازادانە بژیم. من هەرگیز حەزم بەچارەی گەورەم نەکردووە. بەڵام ئیرادەی تۆ وام لێدەکا بەگەورەم ناوتنهێنم. تۆ من دەبەیتەوە سەر کەڵکەڵەی هۆنراوەیەک کە جارێکیان خوێندومەتەوە. هۆزانەکە بەناوی «پێغەمبەرەکە»یە.» بەڵام با لەوە بگەڕێین و بێینەوە سەر بیابان-»

بنگۆریۆن پێکەنی.

«بەڵێ، بیبانەکە.»

«دوا دەڤەر کە بینیمان... هەرکاتێ ئاوی گەیشتێ، ئەوا بۆ رواندنی لۆکەو شەکر دەستدەدا، بەچەشنێک لە جیهاندا بێوێنە بێ.»

لەسەر راوێژی سام هامبورگ لە بیابانی نەقەبدا لۆکەیان چاند. لە مێژوی گشتیاری ئیسرائیلییدا ئەو ملیۆنلێرە کالیفۆرنابیە بە تاسەو دڵە بەخشندەییەوە رۆڵێکی گرنگی وازیکرد. بێئومێدی و نوشستییەکان بەردەوام هەر هەبوون. بەڵام خۆ دەستپێکەکە رۆنرا.

پێش ئەوەی ئەوجار ئیسرائیل بەجێبهێڵێ، داوای لە بنگۆریۆن کرد پارچەیەکەی چۆڵی بیاببنی لەشوینێکدا بدەنێ کە بەقسەی شارەزایان زۆر بێنرخ بێ وهیچی لێنەڕوێ، خوازیار بوو کێڵگەیەکی نمونەیی لەسەر بنیاتبنێ.

زەویەکی شەش سەد ئیکەر Acre( فەددان؛ پێوەرێکە بۆ پێوانەی روبەر. هەر ئییکەرێک ٤٠٤٦مەتر دوجایە-وەرگێڕ)یان لە بێت شینڤالای Beit Sheanvallei لە گالیلیا کە شەست مەتر لەئاستی روبوری ئوردن بەرزتر بوو، پێدا. خاکەکە زەرد، لمێکی وشکوبرینگ تەنانەت درکودالیشی لێ نەدەڕوا.

یەکێک لە پسپۆڕەکان لێیپرسی: «ئەرێ باشە چۆن ئاوی بۆ دەهێنی؟»

وەڵامی دایەوە: «من زۆرم حەز لە روبارە. خودا و من بەیەکەوە مشوری دەخۆین.»

لە بەهاردا مارێنزی بەریتانی چەند سەردانێکی دۆستانەی بۆ وڵاتەکانی رۆژهەڵاتی ناوین کرد. حکومەتی ئیسرائیل ئاگادارکرایەوە کە سەرەک وەزیران رۆژێک لە کاتێکی

دیارکراودا ئەدمیرالی کەشتیگەلی بەریتانیی دەریای ناوەڕاست لۆرد لویس ماونتباتن Lord Louis Mountbatten جێگری پێشوی شاژن و حاکمی هیندستان، ئەندامی ئەنجومەنی نهێنی، هەڵگری خاچی مەزن، ئەستێرە سورەی ئاسایشی هیندستان، شۆڕەسواری کاوسباند Kouseband و هەڵگری خەڵاتی بێژماری ناوەوە دەرەوە سەردان دەکا.

سەردانەکە بۆنەیەکی هەستیار بوو. پەیوەندی نێوان ئینگلستان و ئیسرائیل هێشتا هەر گرژ بوو. تۆ بڵێی شوێنی یەکدی دیتنەکە کوێ بێ؟ بنگۆریۆن پێیباش بوو لە ئۆرشەلیمدا بێ، بەڵام وەزیری کاروباری دەرەوە هێشتا بارەگاکەی هەر لە تەلئەبیب بوو، کەسیش چاوەڕێی نەدەکرد ئەدمیراڵی بەریتانیی پرۆتۆکۆل بشکێنێ و بەرەو ئۆرشەلیم بێ.

هەواڵناردنەوەی ئەدمیڕال بەوەی لاری لەسەر ئۆرشەلیم وەک شوێنگەی دیدارەکە نیە، مایەی سەرسوڕمان بوو.

ڕۆژی دیدارەکە سەرەک وەزیران بەبێ بۆینباخ  هاتە وەزارەت. سکرتێرەکەی پێیگوت:

«ئایا بەڕاستی تۆ بەباشی نابینی کە ئەدمیڕالی بەریتانی سەردانت بکا، بۆیناباخ ببەستی؟»

سەرەک وەزیران هەندێک بیریلێکردەوە: «بەڵێ، لەڕاستیدا دەبێ بیبەستم.»

کەس لەوەزارەت بۆینباخێکی زیادیان پێنەبوو، بۆیە تەتەرێک بەپەلە ڕەوانەی ماڵی بنگۆریۆن کرا تا بۆینباخەکەی بهێنێ.

ڕێک لەوکاتەی هۆڕن و فیکەی کەژاوەی ئۆتۆمبێلەکانی ئەدمیرال لەجادەکەدا دەنگی دەهات، تەتەرەکە بە بۆینباخەکەوە گەڕایەوە. بنگۆریۆن هێشتا هەر خەریکی بەستنی بۆینباخەکە بوو، میوانەکە هاتەژور.

تەنانەت سەرەک وەزیرانیش کەمێک بە ماونتاباتن سەرسام بوو کە بەژورکەوت. ئەو کابرایەکی بەژن یەک مەتر و هەشتا سانتیمەتر درێژ بوو، قۆز هەروەک ئەستێرەکانی سینەما، یەکبەرگییەکی سپی ئاودامان زێڕی لەبەردابوو، زنجیرەی قۆپچەکانی زێڕ بوو، چواردە مەدالیا و هێڵی لەشانی چەپەوە بوون لەخواروشیان میدالیایەکی گەورەی کاوسنباند و دوو تەختەی دیکە. ئەو شمشێری دوڵەتیشی بەلانێکەوە وەکردبوو.

هیچ پاساوێک لەگوڕێدانەبوو ئەو جوتە حەز بەچارەی یەکدی بکەن، بەڵام لە نیگای یەکەمیانەوە بەباشی لەگەڵ یەکدا هەڵیانکرد.

هەرزو بنگۆریۆن روی قسەکانی بەرە و بابەتی کەسیی گۆڕی و سەبارەت بەساڵەکانی ماونباتن لەهیندستانەوە پرسیاری لێکرد.

چارەگێک بوو هێشتا ئەدمیرال هەر دەربارەی ئەزمونەکانی خۆی قسەی دەکرد، هەستیارێتی و زۆرزانی نمایشدەکرد. ئەوان دەربارەی پەنابەرانی هیندستان و پەنابەرانی ئیسرائیل، سەبارەت  بە کۆچی نهێنی و  بابەتگەلی دیکە  بە دۆستایەتی دوان. کاتێک ویستی بڕوا ماونباتن گوتی:

«من بیستومە گوایە ئێوە لەکاتی خۆی لەڕاژەی سەربازیی بەریتانیادا بوونە.

ئەوکات گەیشتبوویە چ پلەیەک؟»

سەرەک وەزیرانی کورتیلە چاوێکی دایە میوانە درێژەکە و گوتی:

«ئەز عەریف بووم، بەڵام پلەکەیان داگرتم.»

میوانەکە پێکەنی، دەستێکی خستە سەرشانی بنگۆریۆن و گوتی: «پێم سەیر نیە!»

هەفتەیەک دواتر پاکێتێک بە زۆر مۆرو پولی فەرمییەوە بەپۆست گەیشت. ئەویش بریتیبوو لە کتێبێکی ماوننباتن بۆ بنگۆریۆنی «برادەرە باشەکەی»، بەیادەوەری ئەو سەردانە ریزلێگیراوەی ناردبوو.

لەکۆتایی ساڵی ١٩٥١دا جۆ داڤیدسۆن یاداشەتەکانی خۆی بەناوی لەنێوان دانیشتنەکان 'Between Sittings' بەچاپگەیاند. پێش ئەوەی کتێبەکەی بچێتە چاپخانە چەند روپەرێکی سەبارەت بەسەردانەکەی بۆ ئیسرائیل، دوا قۆناخی سەرسامبوونی بە وڵاتێکی پڕ لە ژیان لێزیادکرد. دانەیەکی بە دیاری بۆ بنگۆریۆن نارد. هەفتەیەک دوای ئەوە بە هێرشی دڵ کۆچی دوایی کرد.

چەند مانگێک دوای ئەوە بێوەژنەکەی سەردانی ئیسرائیلی کرد بۆ راپەڕاندنی هەندێ کاروبار. لە تەلئەبیبدا ناسیاوێکی بانگهێشتی شانۆ کرد. بەشێوەیەکی ریزپەڕی دەگمەن سەرەک وەزیران ئەو شەوە پشوی وەرگرت. لەنزیک فلۆرەنس داڤیدسۆنەوە دانیشت و قسەی لەبارەی مێردەکەیەوە دەکرد. پێیڕاگەیاند کە کتێبی مێردە کۆچکردووەکەی پێگەیشتووە بە تاسەوە خوێندویەتیەوە.

ئەو پشتی بە کورسیەکەدا بووە و هەر قسەی دەکردن، کاتێکیش پەردە هەڵدرایەوە و ئەکتەرەکان دەمەتەقیی شانۆیی خۆیان نمایش دەکرد. هۆڵەکە زۆر کڕومات بوو، مرۆ تەنها گوێی لەدەنگی ئەکتەرەکە و بنگۆریۆن دەبوو. بنگۆریۆن پەسنی کتێبی پەیکەرتاشە ناودارەکەی دەدا. فلۆرەنس داڤیدسۆن نەیدەزانی چی بکا، تۆبڵێی تا چەندی دیکە بنگۆریۆن هەورا قسان بکا، تۆبڵێ کارێکی شیاو بێ قسەکانی پێببڕێ.

لەدواییدا بنگۆریۆن ناچار بوو ئاوڕ بداتەوە کە شتێکی نائاسایی لەگۆڕێدایە، ئەویش بینی کەوا هەمو جەماوەرەکە بێ هەستوقوست دانیشتووە، گوێ لە پێشهاتەکانی سەر شانۆ دەگرن.

لەو سەردەمدا ئێفرایم ئێڤرون Ephraim Evrum کە دواتر بووە نوێنەری هیستادروت لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئامریکا، سکرتێری بنگۆریۆن بوو. پێش ئەوەی بگاتە ئەو پایە بەهۆی شارێتەوە بردرایە لای بنگۆریۆن بەڵکو ببێتە ئەڵقەی پەیوەندی نێوان وەزارەتی کاروباری دەرەوە و سکرتارییەتی سەرەک وەزیران. ئەو هێشتا گەنج بوو، درێژیەکەشی هەر بەقەد سەرۆکەکەی بوو، پێشتر ئەفسەرێک بوو لای دەزگای هەواڵگریی هاگانا. بۆ کارە نوێکەی زۆر گونجاو بوو، تەنها خاڵی نەرێنییەک کە هەیبووبێ: خێزانداری بوو، دوو منداڵی بچوکیشی هەبوون.

بەهێزترین چیرۆک کەلەسەر سەرۆکەکەی بگێڕێتەوە ئەو کاتە بوو کە ئۆرشەلیمەوە بنگۆریۆن زەنگی بۆلێدا تا یاوەری بێ بۆ تیبریاس لەسەر گۆلی گالیلیا. سەرەک وەزیران دەبوایە کتێبێکی لەسەر فەلسەفەی گریکی پێبووایە. ئیپی(کەبەردەوام بە

ئیڤرومی دەگوت) دەبوایە بگەڕێتەوە تەلئەبیب، لەو سێ ژورە پڕکتێبەکەی ماڵی بنگۆریۆن لە نهۆمی دوهەمدا لە کێرم کیامەتە لە سەر رەفەی سێهەم، لەسەروی دەستەڕاستی کە دەرۆیشتیتە ژورەکە پێنجەم کتێب بەلای چەپەوە هەڵدەگری و بۆ سەرۆکەکەی دەهێنێ. هەندێکیشی باسی ناوەڕۆکە گریکیەکەی کتێبەکە بۆکردبوو.

کاتێکیش ئێرۆن رۆژی دواتر دەگاتە تیبریاسی سەر گۆلی گالیلیا کۆمەڵێک بروسکە و نوسراوی وەزارەتی کاروباری دەرەوە دەداتە سەرەک وەزیران»

«ئەدی کتێبەکە؟»

«بەڵێ، ئەویشم هێناوە.»

کاتێک بنگۆریۆن چاوی لەناونیشانی سەربەرگی کتێبەکە کرد، سورهەڵگەڕا.

«ئـەوەی هێناوتە شەشەمین کتێبە لە دەستە چەپەوە، خۆ من پێم گوتبووی پێنجەمین کتێب، دەبووایە تۆ پێنجەمین کتێبت بۆ هێنابام. «ئیڤرۆن ویستی پێیبڵێ کە شەشەمین کتێب باشتر لەگەڵ ئەو ناوەڕۆکەی پێیگوتبوو دەهاتەوە لە کتێبی پێنجەمی سەر رەفە تایبەتییەکە.

هەر زو بنگۆریۆن بەسەر بێئومێدیەکەیدا زاڵ بوو، بەڵام هێشتا چەند مانگ دواتر پەلارێکی لە ئیڤرۆن گرت بەوەی کە نەیزانیوە کامەیان کتێبی پێنجەمە یان شەشەم.

سەربردەیەکی دیکەش دەربارەی یادەوەری بنگۆریۆن هەبوو. لە فڕۆکەخانە نیشتمانییەکەی واشنتن بنگۆریۆن کە سواری فڕۆکەیەک دەبوو بچێتە نیویۆرک، سکرتێری ئەندام کۆنگرێسێکی ئامریکایی رایسپارد:

«جەنابی بنگۆریۆن، دەبووایە منیش سەرنشینی هەمان فڕۆکە بووبام، بەڵام بەداخەوە جێ نەماوە بۆیە بەفڕۆکەی دواتر دێم. برادەرێکم لە فڕۆکەخانەی نیویۆرک دێتە دوام. من هەنوکە دەستم پێیڕاناگا. گەرهاتو لەوێ دیتت چاوەڕوانم دەکا، توخوا بۆی رونبکەرووە کە بۆچی من دواکەوتم؟»

بنگۆریۆن ئامادەبو پەیامەکەی بگەیەنێ، ئیدی خانمە سکرتێری ئەندام کۆنگرێسەکە وێنای تەواوی برادەرەکەی خۆی بۆکرد.

ساڵانێک پاش ئەوە سیللەر Cellerی ئەندامی کۆنگرێس سەردانێکی ئیسرائیلی کرد. خانمە سکرتێرەکەشی لەگەڵدابوو. کاتێک گەیشتنە ژورەکەی بنگۆریۆن، پێش ئەوەی هیچ وشەیەکیان لەگەڵدا بگۆڕێتەوە، بە خانمە سکرتێرەکەی گوت: «لەنێوان دو کەوانۆکەدا. من برادەرەکەی تۆم لە نیویۆرکدا نەدۆزیەوە.»

رۆژێکیان بنگۆریۆن بانگی ئیڤرۆمی کرد و پاکەتە پۆستێکی کەلە ئەرژەنتینەوە بۆهاتبوو، نیشاندا. پۆستەکە پێکهاتبوو لە بەرهەمێکی چواربەرگی سپانیزمانی نوسینی پرۆفیسۆر لیۆن دوڤۆن Leon Dujovne لەسەر ژیان، بەرهەم و کاریگەری سپینۆزا Spinoza (١٦٣٢–١٦٧٧ فەیلەسوفێکی هۆڵەندی رەچەڵەک جو–وەرگێڕ)، لەبۆینس ئایرسەوە نێردرابوو.

«ئیپی من دەمەوێ ئەو کتێبانە بخوێنمەوە. ئەرێ کەسێک دەناسی زمانی ئیسپانیم فێربکا؟»

ئیڤرۆن یەکسەر بیری لە ئیسحاق ناڤۆن Yitzhak Navon کردەوە. ناوبراو

جێگەی ئیڤرۆنی لە سکرتارییەتی شارێتی وەزیری کاروباری دەرەوەدا گرتبووە و لە گەڵ نێردەکانی بۆ ئوروگوای و ئارجەنتین کاری کردبوو. بنگۆریۆن ناڤۆنی دەناسی. ساڵانێک لەمەوبەر کاتێ ناڤۆم بەرپرسی هەواڵگری بەشی عەرەبی گاهانا بوو، یەکدیان دیتبوو. لەو ئەرکەیدا ساڵیک بەر لەجاڕدانی سەربەخۆییدا بیرۆکەیەکی داهێنابو، کە دواتر بە «فیڵەکەی عەرەبان» ناوی دەرکردبوو گوایە پێویستی بە چوار هەزار دۆلارە. تەنها یەک ئەفسەری هاگاناش دەیزانی ئاخۆ چۆن دەستی بەو برە زۆرەیە رابگا.

ئەفسەرەکە پێیگوت: «دەبرۆ لەگەڵ بنگۆریۆندا قسەبکە. بەڵکو ئەو جۆرە بیرۆکە شێتانەیە هەستی ئەو رابکێشێ.»

ناڤۆن بەشەرمەوە لەسەرۆکی ئاژانسی جولەکان چووە پێش. بنگۆریۆن گوێیلێگرت پاشان لێیپرسی: «ئایا دوو هەزارت دەوێ؟»

ناڤۆن بە تاسەوە گوتی بەڵێ، دەردەست پارەکەی پێدرا و ئیدی ناوی «فیڵەکە»ی بەسەردا برا.

پەیوەندی لەیەکتێگەیشتنی نێوان هەردو پیاوەکە هەر لەسەرەتاوە باش بەڕێوەچوو. ناڤۆن تەنها سابرایەک نەبوو، بەڵکو ماڵباتەکەی سێسەد ساڵ بوو لە ئۆرشەلیم دەژیان. هەنوکەش دەبووایە زمانی سپانی فێری بنگۆریۆنی کردبا.

«پێویست ناکا بە سپانی قسە بکەم» رونکردنەوەی بنگۆریۆن بوو بە مامۆستاکەی گوت: «بەڵکو تەنها خوێندنەوەم فێر بکە.»

ناڤۆن بۆیدەرکەوت هەرچەندە بنگۆریۆن بەسەر چەند زمانێکدا زاڵە، کەچی لەڕاستیدا هیچ بەهرەیەکی تایبەتی بە ئاراستەی زمانفێربوون نەبوو، بۆیە زەحمەتییەکی زۆری کێشا تا دەنگە نامۆکانی پێ گۆبکا. بنگۆریۆن زمانی گریکی، تورکی و زمانەکانی دیکەی کە دەزانین لەڕێی زۆر خوێندنەوە فێر ببوو قسەی پێبکا.

دوو تا سێ جاران لەهەفتەدا ناڤۆن بەشەو دەچووە ماڵی بنگۆریۆن لە کێرن کیامەت، ئەوسا بەیەکەوە کاژێرێک خەریکی زمان فێربوون دەبوون. مامۆستاکە گوتی کەوا شاگردەکەی واتای وشەکانی لێکدەدایەوە و کاتێکیش لەبەریدەکردن بە مامۆستاکەی دەگوت واتای وشە فەلسەفییەکانی بۆ لێکبداتەوە.

رۆژێکیان بنگۆریۆن بانگی ئیڤرۆنی کردو پێیگوت: «من ئەو دوای نیوەڕۆیە لەنێوان دوو کۆبوونەوەدا دە خولەک کاتم هەیە. بانگی ئیسحاق بکە بێت دەرسی ئسپانیەکەم پێ بڵێ.،

ئەو جارەیان کورترین ماوەبوو، درێژەکەشیان پێنج کاژێری خایاند.

دوای مانگێک بنگۆریۆن خۆی سەرودەرێکی لێدەرکرد: هەمو شەوێک لەگەڵ رێزمان و فەرهەنگی زماندا خەریک بوو. ئەوەی تێینەگەیشتبا لەپارچە کاخەزێکی تۆماردەکرد. کاتێ دەبوونە کۆمەڵە کاخەزێک بانگی ناڤۆنی دەکرد تا یارمەتی بدا.

بنگۆریۆن حەزی لە سەرچاوەی وشەکان بوو ئاخۆ لەکوێیوەڕا هاتوون. رەگوڕیشەی زۆر واژەی ئیسپانی بۆ زمانی عەرەبی دەگەڕانەوە، ئەوەش بۆ ئەو دۆزینەوەیەکی سەرنجڕاکێش بوو. لەکاتی وانەکاندا زۆرجاران لەگەڵ ناڤۆندا دەربارەی رەفتاری

جوەکانی لە چاوی سپینۆزاوە دەکرد. زۆر جار پرسی زمانیان لەبیر دەچوو بازیان دەدایە سەر فەلسەفە.
لەو رۆژگـارەدا لە سکرتارییەتەکیدا تەنگژەیەک بەرپابوو. خانمەکەی ئیڤرۆن هۆشداریینامەیەکی دابووە مێردەکەی بەوەی: «ئەریٚ تۆ منت هێناوە یان سکرتاریەت. دەبێ یەکێکیان هەڵبژێری.»
ئەڤرۆن چوو لای بەرپرسەکەی و باسەکەی لەگەڵدا هێنایەگۆڕێ. ئاڤۆن خوازیار بوو هەروەک نەحمیّیا ئارگۆڤی بۆسەرۆکەکەی دڵسۆز بێ، وەلیٚ ژنەکەی هەڵوێستەکەی خۆی راگەیاندووە.
بنگۆریۆن بە پێکەنینەوە پێیگوت: «بە ژنەکەت بڵێ سەردانێکم بکا.»
خانمی ئیڤرۆن هات، بەڵام پیش ئەوەی بنگۆریۆن ببینێ دەیزانی چی دەوێ. دوای گفتوگۆیەکی کورت پێدەچوو سەرەک وەزیران نەیبردبێتیەوە. دەستێکی لەسەرشانی خانمەکە داناو پێیگوت: «باشە، من مێردەکەت دەدەمەوە.»
لە دوا مانگەکانی ١٩٥٢دا ئیڤرۆن گواسترایەوە واشنتۆن، ناڤۆم جێگەی گرتەوە و دەبووایە شارێتی وەزیری کاروباری دەرەوەش بەدوای سکرتێرێکی نوێدا بگەڕێ.
کاتێک ئیڤروم خواحافیزیکرد، بنگۆریۆن کتێبیکی بە یادگاری ساڵانێکی دورودرێژی بەیەکەوە کارکردنیان، پێشکەشکرد. کاتێکیش پێشکەشنامەکەی خۆی خویندەوە، گوتی: «من تەنها «بۆ ئیپی»م نوسیوە، چونکە بەڕاستی نازانم پاشناوەکەت چیە.»
لە پایزدا بنگۆریۆن و پاولا بە کورتە گەشتیک چونە تیبێریاسی سەر گۆلی گالیلیا و ناڤۆنیشیان یاوەر بوو. سەرەک وەزیران بە سکرتێرە نوێیەکەی گوتبوو ئاخۆ چ کتێبێکی پێباشترە بیخوێنیتەوە، چونکە هەنوکە زمانەکە دەزانێ. ناڤۆنیش شاکارەکەی سێرڤانتس Cervants «دۆنکیشۆت»ی پێباش بوو. بنگۆریۆنی چاپێکی دە بەرگی کڕی و بۆگەشتەکە لەگەڵ خۆیدا برد.
بەرگی یەکەمی لەماوەیەکی پێوەریدا خوێندەوە و دایەوە دەستی سکرتێرەکەی. لە پەڕاوێزی کتێبەکەدا بەقەڵەمدار چەندان پرسی دەربارەی رێزمان، رستەسازی واتای وشەکان نوسیبوون.
«لەوکاتەی من خەریکی خوێندنەوەی بەرگی دوهەم دەبم، وەڵامەکانی بەرگی یەکەمم بۆ بنوسەوە.»
هەمو بەیانییەک کاژێرێک لەگەڵ پاولا و ناڤۆن لەکاتی بەرچاییخواردندا دەربارەی ئەوەی بە شەو خویندبوویەوە، دەدوا. پاولا کەیفی بەهەندێ نوکتەی سێرڤانتسی نوسەری دۆنکیشۆت نەدەهات.
کاتێکیش ناڤۆن وەڵامـی هەمو پرسەکانی دەدایــەوە بـەرگی پەیوەندیداری دەخوێندەوە.
بنگۆریۆن کەیفی زۆر بەو خوێندەوەیە دەهات کە دۆنکیشۆت لەبەردەم ئاگردانی شواندا دادەنیشت لەبەرخۆیدا قسەی دەکرد، بەو شێوەش دەستی پێدەکرد:
«ئەرێ ئەو خەڵکەی ئەوکات چەند بەختیار بوون کە کۆنەکان بەسەردەمی زێڕین ناویان دەبرد، ئەوەش لەبەر ئەوە نەبوو کەزێڕ لە سەردەمی ئێستاماندا ئەو بەهایەی

هەیە، کاتی خۆی بێبەها بوو، بەڵکو لەبەر ئەوەی ئەو کەسانەی بەرێ واتای وشەکانی من من و تۆتۆ(منمنۆکێ)یان نەدەزانی.»

هەنوکە ناڤۆن سکرتێریەتی، لە میانەی کۆنفرانسەکاندا زۆر بانگی دەکرد و دەربارەی وێژەی سپانیزمانی و تەنانەت دەربارەی زمانەکانی دیکەو کێشەگەلی فەلسەفەشەوە دەدوان.

سکرتێرە نوێکە هەرزو بۆیدەرکەوت کەدەتوانی سەرۆکەکەی لەباسێکی فەلسەفیدا لابدا کاتێ بروسکەیەکی بۆ بخوێنێتەوە، بەڵام دژوار بوو دەمەتەقێیەکی فەلسەفییانە بۆ پرسیاری بروسکەیەک ببڕی.

سەرەک وەزیران لەگەڵ ناڤۆمدا نەخشەیەکی وای دانا کەبەهەمان شێوازی فێربوونی زمانی ئسپانی خەریکی فێربونی زمانی ئیتالیایش بێ، بۆ ئەوەی دانتێ و ماکیاڤیللی پێبخوێنێتەوە، بەڵام پێشهاتە سیاسیەکان بواریان پێنەدا.

ناڤۆن کاریگەریەکی باشی بەسەر بنگۆریۆندا هەبوو. هەروەک ئارگۆڤ بۆ ماوەیەکی کورت ژنی هێنابوو بەڵام جیاببووەوە. لەبەرئەوەی خاوخێزانی نەبوو بۆیە دەیتوانی خۆی بۆ راژەی بنگۆریۆن تەرخان بکا. بە پێچەوانەی ئارگۆڤیشەوە دەیتوانی رەخنە لە گەورەکەی بگرێ. ئەو جۆرەها شیوازی هەستیارانەی هەبوون کەوا لەبنگۆریۆن بکا لەبارێکی دیاریکراودا هەست بەهەڵەی خۆی بکا.

لە میانەی هاویندا ئارسەر لوری Arthur Lourie کە هەنوکە نوێنەری ئیسرائیلە لە کەنەدا، بەڵام ئەوکات کونسولی گشتی بوو لەنیویۆرک، بۆ پشودان گەڕابووەوە ئیسرائیل. دوا شەوەکەی سەرێکی سەرەک وەزیرانی بۆ خواحافیزیکردن دا. لەوکاتەدا بنگۆریۆن بەنیازی شێوخواردن بوو ئەویشی بانگهێشتکرد و چوونە سەر مێزی ئاشپەزخانەکە. لەکاتی ژەمخواردنەکەدا بنگۆریۆن چەند لاپەڕەیەکی لە کتێبە سپانیەکە دەربارەی سپینۆزا بۆ میوانەکەی وەردەگێڕایە سەر زمانی عیبری. ئەو بەئاستەم ئاگای لەخواردنەکەی بوو، بواری میوانەکەشی نەدا چەند سەرهێڵێکی سیاسیانەی دەربارەی نۆژەنکردنەوەی کاروبارەکانی ئامریکا لەگەڵدا باس بکا. لەکۆتایی ژەمەکەدا هاوسەرەکەی پێیگوت: لەبیرت نەچێ ئەمشەو نۆرەی قاپشوشتنە.»

بنگۆریۆن بەخەندەوە ئاوڕێکی لە خێزانەکەی دایەوە.

«هەمووی دەزانم.»

یەک دوو خولەک پاشان سەرەک وەزیران سەقاڵی قاپشوشتن بوو. لێنەگەڕا لوریس یارمەتی بدا. لەکاتی قاپشوشتنەکەدا گازاندەی لەدەفرێکیان هەبوو کە ئاوەکە ئەوەندە گەرم نییە پاکی بکاتەوە. کاتێکیش تەواو بوو، گەڕایەوە کتێبخانەکەی. پاولا قاپەکانی پشکنی و شوشتنەکەی بەدڵ نەبوو. خەریک بوو بانگی بکاتەوە و پێیبڵێ دەبووایە زۆر شتی دیکە بکا، بەڵام لوریس لێنەگەڕا و پێیگوت وازیلێبێنە. کونسولی گشتی بەناچاری بەبێ دەستنیشانکردنی سەرهێڵە سەرەکییەکان گەڕایەوە نیویۆرک.

لەدوا مانگەکانی ساڵدا درزێک کەوتە نێوان سەرەک وەزیران و یادین. ئارکیۆلۆژەکە هەنوکە سەرۆکی دەستەی فەرماندەیی هێزەکان بوو، رێنمایی بۆ هات کە سوپا رێکبخاتەوە. کێشەکە لەسەر راددەی زۆری بودجەی سوپا بوو. لەو دەمدا سەرەک

وەزیران هاتبووە سەر بیروڕایەک کەجارێ پێناچێ شەڕ لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا بەرپا ببێ، بۆیە پێویستە بەرێژەیەکی دیار بودجەی سوپا کەمبکرێتەوە.

یادین گوتی: «ئەز دەزانم کە ئیسرائیل بە بارێکی قورسی داراییدا تێدەپەڕێ، بەڵام من هێشتا یەک ساڵی دیکە  هەمان بودجەی ئەمساڵم گەرەکە، گەر ئەوەش مەیسەر نەبێ کەواتە پێویستە بەدوای یەکێکی دیکە جگە لەمن بگەڕێی.»

هەردوکیان لەسەر هەڵوێستەکەیان سوربوون، ئیدی یادین دەستی لەکارکێشایەوە. لەبۆنەی بەرێکردن و جێگرتنەویدا بنگۆریۆن بە وشەی هەستبزوێن پەسنیدا، کەچۆن هەمیشە نیوانیان لەگەڵ یادیندا باش بووە. کاتێ لەقسەکانی بووەوە فرمێسکی لە چاوان قەتیس مابوون. دیاریەکی دایە سەرۆکی پێشووی ستافی هێزەکان ئەویش یەکێ لەخۆشەویسترین کتێبەکانی بە ناوی «archailogia Bios» بو کەلەلایەن فلاڤیوس یوسفوسس Flavius Josephus نوسرابوو لەگەڵ هیواخاستنێکی لەدڵەوە.

لەهەمان سەردەمدا د. حایم وایزمەن کۆچی دواییکرد. بە هێواشی گیانی لەجەستە دەرچوو. وایزمەن ساڵانێکی دورودرێژ بوو نەخۆش کەوتبوو، بەڵام مەرگەکەی هەمو ئیسرائیل و سەرجەم جوەکانی دنیای هەژاند. بەسەردانەواندنێکی زۆرەوە بنگۆریۆن بەدوای دارەبازەکەیدا دەڕۆیشت.

کاتێکیش پرس هاتە سەر ئەو کەسەی جێگای بگرێتەوە، بنگۆریۆن وایدەبینی داوا لە ئاینشتاین بکرێ پایەی سەرۆکایەتی ئیسرائیل وەربگرێ.

بە برادەرێکی خۆی لەحکومەتدا گوت: «ئەو داوایەکە ناپەژرێنێ، بەڵام پێویستە پێشنیازەکە بۆ زیرەکترین جولەکەی دنیا بکەین.»

کاتێکیش ئاینشتاین پێشنیازەکەی پەسندنەکرد، بنگۆریۆن ئیسحاق بن‌زێڤی وەک بەربژار دەستنیشانکرد، ئەو پیاوەی کە نزیکەی چل و پێنج ساڵە برادەرن. بن‌زێڤی بە دەنگدانی سێهەمەوە پەسەندکرا و بووە سەرۆکی ئیسرائیل.

لە کتێبی ساڵنامەی ١٩٥٢دا سەرەک وەزیرانی ئیسرائیل وتارێکی لەسەر کۆپلەدەقێکی  بایبلدا نوسی: «ئەگەر  سروش بوەستێ، گەل بەرەو دڕندایەتی دەڕوا.»

سەبارەت تواناکانی بنگۆریۆن وەک سەرکردەیەکی پێغەمبەرئاسا، یەکێ لە هاوکارەکانی گوتی:

«گەورەترین بەهرەی ئەو، ئەوەیە کە دەتوانێ بە پەرۆشی و تاسەی خۆیەوە بچێتە گیانی ئەوانی دیکە.  گەر هاتو بۆ یەکەمجار شتێکی گوت، ڕەنگبێ بگوترێ شتێکی دێوانەییە؛ بۆنمونە بیرۆکەکەی بۆ بەپایەتەختکردنی ئۆرشەلیم، یان پەرەپێدانی ئیلات وەک بەندەرەشارێک. بەڵام  دوای یەک دوو هەفتە یان یەک دوو مانگ ئیدی مایەی شێتایەتی نیە گەر خەڵک بڵێن: ئا، بەڵی ئەرێ بەڕاست بۆ نا؟»

مەبەست لەو پەیڤانە ئەوەیە کە بگوترێ ئەو پێغەمبەرە و نیگایەکی سروشییانەی هەیە.»

# بەشی
# (٢٢)

ساڵی ١٩٥٣ بە نوکتەیەک دەستیپێکرد.

چەند مانگێک پێشتر بنگۆریۆن و وەزارەتــی کـاروبـاری دەرەوە بروسکە و بروسکەکاری نهێنییان لەگەڵ کرملیندا دەربـارەی رێگەدانی روسیا بە کۆچکردنی جوەکان بۆ ئیسرائیل دەگۆڕیەوە. لە یاداشتێکدا ئیسرائیل خستبوویەڕو کە ئامادەنیە بۆ دژایەتی یەکێتی شۆرەوی بچێتە نێو هیچ پەیمانێکەوە چونکە لەبەرامبەردا ئەوانیش رێگا بە کۆچی بێسنوری جولەکەکان دەدەن. بەڵام مۆسکۆ پێشنیازەکەی پشتگوێ خست.

کاتێکیش پاکتاوی کۆمۆنیستانە لە چیکۆسلۆڤاکیا دەستیپێکرد، ئیسرائیل بەوپەڕی پەرۆشیەوەیە بەدوایدادەچوو، چونکە هەستی دژەسامیزمیش لەسەنگی محەک دابوو، هەروەها ئیسرائیلییەکیش (ئەندامێکی ماپام) لەوکات کە لە چیکۆسلۆڤاکیا بوو، یەکێک بوو لەوانەی سکاڵای لەسەر بوو. ئەوەش لەڕاستیدا واتای بەکردەوە هیوابڕانی تەواو بوو بە هاوکاری مۆسکۆ و پایەتەختەکانی دیکە وڵاتانی کۆمۆنیزم بوو.

بنگۆریۆن لەوە دوودڵ بوو کە هاوپەیمانێتییەک لەگەڵ کۆنەپارێزەکانی پارتی زایۆنیزمی گشتی پێکبهێنێ، چونکە دەترسا ئەندامە چەپەکانی پارتەکەی خۆی بەرە ماپام بڕۆن، بەڵام کاتێک یانزە ئەندامی بەرچاو لە پراگ تۆمەتبارکران و لەدوا مانگەکانی ١٩٥٢شدا بڕیاری مردنیان بەسەردا درا، ئیدی بنگۆریۆن راوێژی لەگەڵ پارتی زایۆنیزمی گشتیدا کرد. ئەوانیش رایانگەیان ئامادەن هاوپەیمانێتی لەگەڵدا بە مەرجگەلێک ببەستن، کە حکومەت کەمتر خۆی لەکاروباری بازاڕ هەڵبقورتێنێ، دەستپیشخەریە تایبەتییەکان هانبدرێن، هەلومەرجی سەرنجراکێش بۆ سەرمایەی تایبەتی دەرەوە فەراهەم بکرێ کە بۆ رەوشی وەبەرهێنانیان بە پێویست دەزانی.

ئەوەبوو لە رۆژنامەی ماپای(پارتی سەرەک وەزیران) وتارێک بڵاوبووە، بەتوندی هێرشی کردەسەر ماپام (پارتی کۆمۆنیستی نزیک لە یەکێتی شۆرەوی)، چونکە پارتی ناوبراو دەیەویست لە هەردوو بەری جۆگەکە بلەوەڕێ: حیسابیان لەسەر جیهانی کۆمۆنیزمی دەکرد، بەڵام پشکی خۆشی لە وڵاتە سەرمایەدارەکان لەسەر حیسابی کیبۆتەکان دەویست. وتارێکی بەهێزی راشکاوانە بوو. شێوازی نوسینەکەی بۆ نوسەرێکی ناسراو نەدەچوو کەلە بواری سیاسیی و ویژەدا بزوێنەربێ. وتارەکە بەناوی سابا شێل یاریڤ Saba Shel yariv (باپیرەی یاریڤ) واژۆکرابوو. دیاربوو

ناوێکی خوازراو بوو.
ئەودەم زۆرکەس دەیپرسی ئاخۆ ئەو نوسەرە نوێیە کێیە کە گەیاندویەتیە مریشکە ڕەشەو هیچی تێدانەهێشتۆتەوە، وتاری دوهەمیشی بەدواداهات، تیایدا باسی پاکتاویەکەی پڕاگی کردبوو، ئیدی ماپامی لەوە ئاگادار کردەوە کەدەبێ لەنێوان کۆمۆنیزم و زایۆنیزم یەکێکیان هەڵبژێرێ.
لە سێهەمین وتاردا وێنای یەکێتی شۆرەوی وەک «ماڵی کۆیلەکان» و ستالینیشی(کەتا ئەو کاتە ژیاندا مابوو) وەک بەدترین بکوژ لەمێژودا لەقەڵەمدابوو. لە وتاری چوارەمیشدا پەردەی لەسەر کێشە و دەمەقاڵێە نێوخۆکانی ماپام هەڵدایەوە.
جەماوەری خوێنەر ئەوکاتە مەتەڵەکەیان هەڵێنا کەیەکێکیان بیریخستنەوە گێولای کیژەکەی بنگۆریۆن کوڕێکی هەیە بەناوی یاریڤ.
پێدەچوو سەرەک وەزیران ئەو چارەسەریەی بۆ ئەوە هەڵبژاردبێ کە بتوانێ ڕاشکاوانەتر بنوسێ، بێئەوەی پێگەی خۆی وەک سەرەک حکومەتێک لەنێو پێشهاتە پەرەسەندووەکانی نێودەوڵەتیدا بخاتە ژێر پرس و مەترسییەوە. بەفەرمیش هەرگیز دانی بەوەدا نەنا کە خۆی نوسەرەکەیە، بەڵام چەند مانگ دواتر لە کەنیستدا گوتی:
«هەنوکە دەمەوێ کۆپلەیەک لەو وتارەی کەبەناوی سابا شێل یاریڤ بڵاوکراوەتەوە، بهێنمەوە.»
ئیدی ئامادەبووانی هۆڵەکە لە قاقای پێکەنینیان دا.
«ڕەنگبێ ببێتە مایەی سەرسامیتان گەر بڵێم، لەگەڵ نزیکەی هەمو رای نوسەری وتارەکەدا کۆکم.»
لەرۆژی دوشەممەی ٩ی فێبرایری کاژێر ١٠:١٠ی شەودا، سێ رۆژ دوای بڵاوبوونەوەی وتاری ناوبراو کە هێرشکرابووە سەر یەکێتی شۆرەوی، نارنجۆکێک فڕێدرایە نێو ئەو خانوەی نێردەی روسی تێدابوو. بەهۆیەوە دەبووایە هاوسەری نوێنەرەکە، ژنی فەرمانبەرێک و شوفێرەکە بگوازرابانەوە نەخۆشخانە.
سەرلەبەیانی سێشەممە بنگۆریۆن کەزۆر لە دەرچە سیاسییەکانی روداوەکە دەترسا، لە کنێستدا رونکردنەوەیەکیدا، بەو پەیڤانەی خوارەوە دەستپێکرد:
«ئەز لەناخەوە بەو کردە شەرمەزارییەی کە دوێنێ شەو قەوماوە نیگەرانم.»
بنگۆریۆن ئەو وشەیەی بەکارهێنا کەلەبۆنەیەکی دیکەدا مناحیم بێگینی پێتوڕەکرد:
«ئەو ئاژاوەیە، کە ئەو تاوانبارە ترسنۆکە پێیهەڵساوە، بەپلەی یەکەم دوژمنایەتی ئیسرائیلی پێکردووە؛ ئەوسا رقوکینەیان بە لایەنی دەرەکی دەربڕیوە. گەر ئامانجیان لەکەردەکەدا ئەوە بووبێ داکۆکی لەشەرەفی ئیسرائیل بکەن، ئەوا پێویستە پێیان بڵێم بەو کردەوەیان شەرەفی ئیسرائیلیان شکاندووە.»
ئەو چوارشەممەیە هەوادارە کۆمۆنیستییەکان خۆپیشاندانێکیان بەدەستپێشخەری یەکێتی دۆستانی یەکێتی شۆرەوی لە ئیسرائیلدا سازدا. بیست ژن و پیاوی تێدا بریندار بوون.
لە پێنجشەممەشدا یەکێتی شۆرەوی پەیوەندییە دیپلۆماتیکیەکانی لەگەڵ ئیسرائیلدا

پچڕاند. گۆلدا مێرسۆن(مایەر) کە ماوەیەک نوێنەر بوو لە مۆسکۆ رایگەیاند: «ئەوە بۆ ئیسرائیل، بۆ گەلی جولەکە و بۆ تەواوی جوەکانی یەکێتی شۆرەوی رۆژێکی رەشە.»

رهێبیکا سیف Rebecca Sief سەرۆکی یەکێتی ژنانی زایۆنیزمی نێودەوڵەتیی کەدایکی مارکوس سییف بوو، بنگۆریۆن و هاوسەرەکەی لە پشوی رۆژانی هەفتەدا بانگهێشتی ناوچەی تەلمۆدی باکوری تەلئەبیبی کرد. بنگۆریۆنیش داوای لە خانمێکی ئینگلیز «خانم ب» کرد بەڵکوو لەگەشتەکەدا یاوەریان بێ.

لەکاتی چونە ئەوێدا و لەناو ئۆتۆمبێلدا خانم ب پرسی:

«ئەرێ جەنابی بنگۆریۆن بۆچی ویستت منتان هاوگەشت بم.»

سەرەک وەزیران پێکەنی.

«ئەز دەزانم کە ئێوە خانمێکی لێبڕاوانەن، حیساب لەسەر ئەوە دەکەم کە تۆ خانمی خانەخوێ، پاولا و ژنانی دیکە هەمو شەممەو یەکشسەمە بەتەواوی سەرقاڵ بکەی.»

خانم ب ئەوەی لەتوانایدا بوو و ئەرکەکەی بەباشی راییکرد. بێجگە لەکاتی ژەمەکان کەس سەرەک وەزیرانی نەدی. لە شەوی شەممەدا ژورەکەی جێهێڵاو لە باخەکەدا لەگەڵ خانم ب یدا پیاسەەی دەکرد. دوو پۆلیش دووربەدوری ئەوان شوینپێیان هەڵگرت. (تەل مۆمن دەکەوتە سەر تەسکترین بەشی ئیسرائیل، لەوێ زێ لەلای چەپەوە هەر هەشت کیلۆمەتر دوربوو، لە رۆژهەڵاتیشەوە تەنها سێ کیلۆمەتر لە سنوری ئوردنەوە دوربوو.)

خانم ب چاوەڕوانیدەکرد تا بنگۆریۆن دەست بەقسان بکا. ئەویش بەبێ دەنگی لەگەڵ خانمەکە دەڕۆیشت. لەهەمو پیاسەکەدا کەسیان قولماتی لەزار نەهاتەدەرەوە.

بەیانی پاشتر سەرەک وەزیران رۆژنامەکانی دەخوێندنەوە و ئەنجا دیسان گەڕایەوە ژورەکەی خۆی، هەمو رۆژەکە هەر بەتەنها مایەوە.

کاتێکیش بۆ شەوەکەی گەڕانەوە تەلئەبیب، بنگۆریۆن بە خانمە ئینگلیزەکەی گوت:

«هەنوکە پیت دەڵێم بۆچی پێویستیم بەو بێدەنگییە ئارامە هەبوو. من دەبووایە بڕیارێکی چارەنوسساز بدەم. کێشەی توبیانسکی Tubianskyم لەبەردەستدابوو. ئیدی من بڕیاری یەکلاکەرەوەم دا، کەواتە دەتوانین قسان بکەین.»

نزیکەی هەمو کەسێک لە ئیسرائیل بە کێشەی توبیانسکی دەزانی. مایەر توبیانسکی ئەفسەرێکی گەنجی هاگانا، لەسەردەمی شەڕی رزگاریخوازییدا بە تۆمەتی ناپاکیی تاوانبارکرابوو. لەبەردەم ئەنجومەنی جەنگدا ئامادەبوو بڕیاری مەرگی بەسەردا درا و جێبەجێشکرا.

ساڵانێک تێپەڕین، بێوەژنەکەی بەدوای سۆراخی راستی روداوەکەدا گەڕاو تیشکی نوێی خستەسەر. بەپلەی یەکەمیش دنەدانی بەدواداچوونەکەی بەهۆی کوڕەکەیەوە بوو، کە هەستی بەبەدبەختی خۆی دەکرد. زۆر جاران لەماڵ دەیگوت کەوا لەلایەن قوتابیەکانی قوتابخانەوە تیروتوانجی تێدەگرن بەوەی کوڕی باوکێکی تاوانبارە.

کەمێک بەرلەوەی بنگۆریۆن بچێتە تێلمۆند بۆ پشوی دوایی ڕۆژەکانی هەفتە، بێوەژنەکە لێکۆڵینەوەکەی تەواوکردبوو فایلەکەی دابووە سەرەک وەزیران، تیایدا لەسەر بێتاوانی مێردەکەی مکوڕبوو. وەک سەرەک وەزیران و سوپاسالاری لەشکر دەبووایە بنگۆریۆن بگاتە ئەو دەرەنجامەی کە هاوڕای ئەرخاینبوونەکەی بێوەژنەکە بوو.

کاتێکیش کە بنگۆریۆن ناوی کێشەکەی برد، پاولا لێیپرسی: پاشان، تۆ لەبارەیەوە چی دەڵێی.»

مرۆ دەیتوانی وەڵامەکەی لەدەموچاوە خاوبووەکەی بنگۆریۆندا بخوێنێتەوە.

«ئەز هاتومەتە سەر ئەو بڕوایە کە بێتاوان بووە.»

ڕۆژی پاشتر نامەیەکی بۆ خانم توبیانسکی نوسی، نامەکە شیاوی ئەوەبوو هەر ئابراهام لینکۆلن Abraham Linkoln (١٨٠٩-١٨٦٥ شانزەهەمین سەرۆکی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئامریکا، یەکەمین سەرۆک بو لەماوەیەی دەسەڵاتەکەیدا بکوژرێ. لینکۆلن بەدژایەتیکردنی شەڕی ناوخۆ و کۆیلەکردن بەناوبانگ بوو-وەرگێڕ) بینوسیبایە.

«لەتوانامدا نیە نیگەرانی خۆم بە وشە دەرببڕم... ئەو دادوەرانەی لەکاتی لەسێدارەدانیدا ئامادەببوون، ڕایانگەیاند کەوا ئازایانە مردووە، ڕەتی کردۆتەوە دەستەکانی ببەستنەوە و پارچە پەڕۆیەکی ڕەشی لە چاوان ببەستن، تەنها ئەوەی داواکردووە کە منداڵەکەی باش پەروەردە بکرێ... دەبێ لە قوتابخانەی کوڕەکەتدا نمایشێکی تایبەت سازبدرێ، تیایدا ئاشکرا بکرێ کە لەشکر چ هەڵەیەکی تراژیدی کردووە. ئەوسا برادەر و هاوپۆلەکانی دەزانن کەوا باوکی وەک دەرچەیەکی کوشندەی سەرلێشێوانی دادگاوە ژیانی لەدەستداوە ، ئیدی با کوڕەکەت شانازی بەباوکە قوربانیەکەیەوە بکا...»

لە حوزەیراندا سام هامبورگ گەڕایەوە ئیسرائیل. چوار هێکتار کێڵگە کشتیارییە نمونەییەکەی بە لۆکە داچاندبوو، هاتبوو سەرێکیان بدا. ڕۆژێکیان خۆی بەژورەکەی بنگۆریۆندا کرد دەستە چیلە بڕکە لۆکەیەکیشی لەگەڵ خۆی هێنابوو. سڵاوێکی لە سەرەک وەزیران کرد و ئەو بڕکە گیایەش کە لۆکەکەی گرتبوو نیشانیدا وگوتی:

«تەماشاکە گەورەم! ئێمە بوینە یەکێ لە گرنگترین وڵاتە بەرهەمهێنەرانی لۆکە. سەیری ئەو دەستەبڕکەیە(دەستە چیلەیە) بکە! من هەرگیز لۆکەی وا هارم لە حوزەیراندا نەدیوە، هەرچەندە زیاتر لە ٣٠ ساڵە لۆکە دەڕوێنم.»

سەرەک وەزیران دەستەچیلە لۆکەکەی لێوەرگرت، بە پەنجەکانی لۆکەکەی گوشی و پێکەنی.

«ئیسرائیل سوپاست دەکا.»

هامبورگ یاری بەشەپقەکەیەوە کرد.

«شایانی نیە، من سوپاسی ئێوە دەکەم. من هەرگیز نەمدەزانی کەوا لۆکە وام دەخرۆشێنی. بەڵام ئەو کێڵگە بچوکە هەستێکی وای پێبەخشیم کاری باشتر بکەم کە بەشێک بێ لەو شتە گشتییەی لەوەی تائێستا پێشکەشم کردووە.»

لە ڕۆژێکی هاویندا، کە بیابانی نەقەب مرۆڤی دەهێنایە سەر کەڵکەڵەی قاڵبی توانەوو و لمیش لەبەر گەرما تاوی دەسەند؛ بنگۆریۆن لەگەڵ هێزێکی سەربازییانەدا گەشتێکیان بەرەو ئیلات کرد. نزیکەی هەشتا کیلۆمەتر لە خوارووی بیئر سەبعەدا کاروانەکەیان لە ئاڤدات Avdat وەستاند. ئاڤدات ئەو شوێنە بووکە نەخشەکان وەک قوچەکێکی سەراوبن نیشانیان دەدا. ئەوەش واتای ئەوەی دەگەیاند کەلە چاخەکانی زۆر کۆندا نشینگەی لێبووە.

لە گردە بەرزە سەدو پەنجا مەترییەکەدا شوێنەواری بێزەنتییەکان، ئەو دەفرە قوڕاویانەی کە بۆ ئاو کۆکردنەوە بەکاردەهێنان، دۆزیەوە؛ دیاربوو نیشانەی کلتوری گەلێکی دێرین بوو.

بنگۆریۆن ئەو شتەی ئەوەندە پێخۆش بوو بۆیە بەسەر گردەکە کەوت. ئەو زیاتر پێیلێنا و بە خێرایی سەردەکەوت هەندێ جار ئەوانی دیکە بە ئاستەم پێیڕادەگەیشتن. تەنانەت بۆ گەنجەکانیش گەشتێکی بازو ماندوکەر بوو، بەڵام سوپاسالارە پیرەکەیان ئەوەندە بەتاسەبوو کە نە تاوی گەرما، نە شەکەتبوون، نە تینوێتی، نە ئەو لمەی بەبا لەچاوانی دەدا، نە تیشکی سوتێنەری ڕۆژ کەلە تۆقی سەری دەدا و نەهیچ شتێک لە بوێرییان بۆ بەسەر گرد هەڵگەڕاندا کەمنەدەکردەوە.

لەنزیک ئاڤاداتەوە سەربازەکان یەک دوو کوڕە گەنجیان دیتن کەسەر بە کیبۆتنشینێکی ئەو ناوە بوون بەناوی سدێ بۆکر Sde Boker (کێڵگەی شوان). بەدوای جێگایەکی لەبار بۆ لەوەڕاندنی پەزەکەیان دەگەڕان.

سدی بۆکر تەنها سەد مەترێک لەڕێگا سەرەکییەکە دور بوو، بنگۆریۆن لەگەڵ یاوەرەکانی لەگەڕانەوەدا سەردانێکی کردن.

نشینگەکە ساڵی پێشو لەلایەن دەستەیەکی پێکهاتو لە دوانزە کچ و کوڕی گەنج دامەزرابوو. هەمویان لەکاتی شەڕدا لەنەقەب سەربازییان کردبوو، بۆیە زانیاری ئارکیۆلۆژی تەواویان لەسەر ناوچەکە هەبوو کە لە سەدەکانی ڕابردوشدا جێنشینگە بووە. ئەوان پارەیان بەقەرد لەئاژانسی جولەکان وەرگرتبو؛ دەبووایە دوای بیست ساڵ قەرزەکەیان دابایەوە؛ هەنوکەش دەستبەکارن تا وای نیشان بدەن ژیان لە بیاباندا بەردەماوە. سەرەک وەزیران پرسی جۆربەجۆری سەبارەت ئەزمونەکەیان لێکردن.

جارێ سدی بۆکر یەکدوو خانوی دارین و درەختێکی هەژارانەشی لێبوو کە بە تێلدڕ شورەیان بۆ کردبوو.

ژیان لەوێ بەراییانە بوو؛ زۆر جاران ناخۆش و هەندێ جاریش دژوار بوو. گەر لە بیاباندا بایە بەهێزەکەی لە سەر لمەکە هەڵکردبا، هەندێ جار دەبووایە دەست بدەیە بەرچاوت تا پێشچاوی خۆت ببینی. عەڕەبەکان بەو بایی باشورەیان دەگوت خەمسین(بەعبریش شاراڤSharav ). بایەکە زۆر گەرم بوو، پێستی دەموچاوی دەسوتاندەوە. بیابانشینەکان دەڵێن بایەکە وا لەپیادە دەکا هۆشی لەدەست بدا. لمە بەباهەڵکردووەکە دەچووە نێوچاو، کونە لوت و گوێ، گزۆز و ماشینی ئۆتۆمبیلەکان، بەشوێنی نادیارەوە دەهاتە نێومالان، قوڕگ و گیانی هەمو زیندەوەرێکی بیابانشینی

دەگرت.
ڕەوەندە عەڕەبەکان و میسریەکان کە سنورەکەیان زور دور نەبوون، نیشانەی مەترسی بوون. یەکێ لەو دوو کچانەی لەدامەزراندنی کیبۆتەکەدا هاوکاریان کردبوو، ڕۆژێکیان بووە شوانی ڕانە مەڕێک. کاتێکیش نەگەڕایەوە، بەدوای سۆراخیاندا چوون. شوێنەواری مەڕەکان دیار نەمابوو، بەڵام لاشەی کچەکەیان دۆزیەوە.
کۆبرای میسرییش کە ژارەکەی مەڵبەندی دەمارەکانی پەکدەخست، قوربانیەکەی لەجوڵە دەخست و لەماوەی بیست خولەکدا دەیکوشت، دژوار بوو. دەستپێکەکانی سدێ‌بۆکر هەمو مانگێک جوتێکیان لێدەگرتن. کیبۆتنشینەکان چاڵیکی قوڵیان لێدابوو، گەیشبوونە ئاو، بەڵام سوێر بوو بەکەڵکی بەکارهێنان نەدەهات. ماوەی حەفت مانگی ڕەبەق وشکوبرینگ بوو تیشکی ڕۆژ وا لمی گەرم کردبوو وەک ئاسنیی داغی لێدەکرد. لەماوەی پێنج مانگەکەی دیکەدا سێ جاران لافاوێکی واهات کە ئاو بەسەر گردەکاندا لێشاوی بەستبوو وەک ئەوەی لمەکە بووبێتە شوشەچیمەنتۆ. ئاوەکە لەدۆڵەکەدا گردبووەوە. هەروەک جوەکان لەمێژ بوو فێرببوون، گەنجەکانیشیان بەربەست و گۆلیان دروستکرد تا باراناوی لێکۆبکەنەوە، گەر هاتو پێویستیان پێبوو بۆ ئاودانی کێڵگەکانیان بەکاربهێنن.
ئاو بۆ مرۆ و مەڕوماڵات بە تانکەر دەهات. ئاخر هێشتا بۆڕی ئاو بۆ نشینگەکە ڕانەکێشرا بوو.
پلەی گەرما بەتیژی دەگۆڕا، لەهەندێک کاتی ساڵدا ئاو تا کاژێر هەشتی بەیانیش دەیبەست.
کاتێ بنگۆریۆن گەڕایەوە نوسینگەکەی خۆی، بانگی ستافەکەی کرد و باسوخواسی ئەوەی لە گەشتەکەیدا دیتبوو بۆ گێڕانەوە. دەربارەی ئاکنجیانی نشینگەکە گوتی: «من ئێرەیی بەو لاوانە دەبەم. ئای کە چ ژیانێکی نایابە.»
لە ڕۆژەکانی بەدوایداهاتن ناوبەناو هەندێ سەرنجی دەردەبڕین وەک : «هیچ مرۆڤێک بێ خەوش نیە.»
ئەوە شتێک بوو دەیویست زیاتر لەبارەیەوە بلێ. بەڵام ئێستا ئەوەندەی لێزیادکرد: «لەسەر هیچ کەسێکمان پێویست نیە کە زۆر لەجێگەی خۆیدا بمێنێتەوە، هەرلەبەر ئەوەی بیسەلمێنێ کە ئێمە زۆرمان پێویست پێیەتی.»
دواتر جارێکی دیکە گوتیەوە: «پیاوە بەتەمەنەکان پێویستە دەرفەت بدەنە لاوەکان.»
لەدواییدا لەپاولای پرسی: « ئەرێ چۆن دەبینی کە من و تۆ بچین لە بیاباندا بژین؟»
ڕۆژێکیان لەسەر کارتێکی ٧,٥ بە ١٢,٥ سەنتیمەتر نامەیەکی بۆ ماپای نووسی و دایە تایپیستەکە تا کۆپی بکا.
هێشتا کارمەندەکانی باوەڕیان نەدەکرد.
بنگۆریۆن لە کۆبوونەوەی بەڕێوبەرە سەرەکییەکانی ماپای ئامادەبوو، کاتێ نامەکەی خوێندرایەوە.

«ئەز چیدی ناتوانم بەردەوام بم... من هیچی دیکە بەرگەی ئەو پێشهاتە گرژانەی دادێ وەک سەرۆکی حکومەت ناگرم...شەش ساڵە لەژێر گوشارێکی گەورەدا کاردەکەم... ئەوەش ماندوبوونێکی ئاساییانە نیە...»
بنگۆریۆن پێیڕاگەیاندن کە بڕیاریداوە دەست لەکاری سەرەک وەزیریی و وەزیری بەرگیدا بکێشێتەوە، بەڵام حەزدەکا کورسییەکەی پەرلەمانی بمێنی و دەچێتە سدی بۆکر دەژی.
لە ساتەکانی یەکەمەوە بەرپرسە باڵاکانی پارتەکەی وەک ئەوەی توشی کارەساتێکی گەورە ببن هێدمەگرتنی. پاشان یەک بەیەکیان قسەیانکرد و داوایان لە بنگۆریۆن کرد بە بڕیارەکەی خۆیدا بچێتەوە.
بنگۆریۆن بە بێدەنگیەکی خۆبچوککردنەوانە گوێیلێگرتن.
خانمێکی دەستەی بەڕێوەبەر کە لە جەنگدا دوو کوڕی لەدەستدابوون، قسەکانی رێک ئاراستەی ئەوکردن و پێگوت: «گەر من هەردوو کوڕەکانم پێشکەشی نەتەوە کردبێ، چۆن دەتوانی تۆ دەستبەرداریان بی.»
کۆبوونەوەکە بێئەوەی سەرەک وەزیران یەک وشەی زیاتر بخاتە سەر نامەکەی یان لەبڕیارەکە پاشگەز ببێتەوە، دواخرا.
کاتێکیش هەواڵەکە بڵاوبووەوە، دەستکلەکارکێشانەوەکەی بنگۆریۆن شەو و ڕۆژ لە ئیسرائیلدا لەپێشترین بابەتی قسەلەسەرکردن بوو.
لە حەیفادا کۆمەڵە سۆشیالیستێکی لایەنگری پارتەکەی رایانگەیاند، گەرهاتو لە پایەکەیدا نەمێنیتەوە، ئەوا ماندەگرن. تەلەفونی پاولا هەرگیز لەزەنگداندا نەدەکەوت؛ دەبووایە بۆ زەنگلێدەران چەندبارەی بکاتەوە کە ناتوانێ لەو بارەیەوە لەگەڵ پیاوەکەی قسان بکا. نامەکان لەناوەوە و بروسکەکان لەدەرەوە بەلێشاو دەهاتن.
پاولا وەک هاوسەرێکی بەخشندە کاردانەوەی بوو، بڕیارەکەی مێردی پەژراند. هەنوکە ئەو لەسەروی شەست ساڵیە و مێردەکەش شەست و حەفت ساڵ. دەیزانی کە ژیانی کیبوتنشین زۆر زەحمەتە. رەنگبێ ژیانی بیابان لەسەروی هێزوتوانای ئەوانەوە بێ. بەڵام بنگۆریۆن بڕیاری خۆی داوە و پێویستە کەلوپەلی ناوماڵ تێکبنی.
تەنانەت ئەوانەی باشیشیان دەناسی لەگەڵ بەڵگەوبەندی رۆیشتنەکەی هاوڕانەبوون. یەکێ لە کارمەندەکانی گوتی ئەو دەیەوێ لەوە بکۆڵێتەوە ئاخۆ گیانیش وەک جەستە پیر دەبێ، یان ئەگەری ئەوە هەیە بە خۆدەربازکردن لە ئاستەنگی رۆژانە لەتەمەنێکی شەست و حەفت ساڵیدا بەدوای بواری نوێ و گیانێکی سەرچڵیانەی نوێدا بگەڕێ.
زیاترین وەڵامە نەریتییەکە بەلای ئەودا دەچوو کە ئەو لە خەمەکانی حکومەت تێربووە، دەیەوێ ژیانێکی ئارام و هێورەییانە وەک روناکبیرێکی بێهەڵپە بەسەرببا.
خەڵکی دیکەش هەبوو پێیانوابوو بنگۆریۆن دەیەوێ جارێ لاپەڕگە ببێ و بەتەنیا بژی تا تەواو تەرکیزبکاتە سەر رێگە چارەسەریەکانی کێشە سەختەکانی ئیسرائیل.
بەگوێرەی رامانی کەسانی دیکە؛ گەنجەکانی ئیسرائیل بێئومێدیان کردووە. خولیای کۆنە دەستپێکیکەی جارانی سەرهەڵداوەتەوە. بەڵێ ئیسرائیل سنوری هەبوون، بەڵام دانیشتوانی سەر سنوری نەبوون. سەردەمەکە سەردەمی بنێشت، سوراوی لێو،

گۆڤارە گاڵتەجارِییەکان، فیلم و خێرهێنەکانی دیکەی شارستانێتین، بۆیە خەڵکی گەنج زیاتر بەپیریانەوە دەچێ لەوەی ژیانێکی نوێ لە بیابانی کۆن کە دوو هەزار ساڵ دەبێ مردووە، بژیێننەوە. ئەوەندەش کۆچبەر لە تەلئەبیبدا کۆبوونەتەوە کاتی خۆیان لە چایەخانەکاندا بەسەردەبەن، دوکانۆکە دەکەنەوە، نایەنەوێ لەگەڵ خاکدا (کشتیاری) ئیشبکەن.

باشترین رونکردنەوە ئەوەبوو کە بنگۆریۆن خوازیاربوو نمونەسەرمەشق بێ، چونکە ووشەکانی چیدیکە دادی نەدەدان.

یەک دوو تەوسلێدەریش گوتیان کەوا نمایشکردنی شانۆگەرییێکە؛ ئەوانی دیکەش پێیان وابوو دەیەوێ هەندێ رەگەزی نەتوانراو لەنێو حکومەتدا بسەلمێنی. هەندێکیشیان بەنیشانەی بەرگریان لەقەڵەم دەدا چونکە دەبووایە لەسەر حیسابی باربووە داراییەکەی ئامریکاوە دەستبەرداری کۆمەڵێک بنەمای سۆشیالیستی بێ.

زۆرینەی کیبۆتەکان پەیوەندییان بە گروپێکی ئایینی یان سیاسییەوە هەبوو، بەڵام سدیبۆکر ئەوەشی نەبوو. ئەوەش واتای ئەوەی دەگەیاند سەرچڵیەکەی بنگۆریۆن لە هەڵسەنگاندنی سیاسییەوە بەدووربوو.

لەماوەی پێنج ساڵی بوونی ئیسرائیلدا هیچ هەواڵێک وەک دەستلەکارکێشانەوەکە وروژێنەر نەبوو، ئاخر خۆ پێشهاتەکەش هەمو رۆژ روینەدەدا کە سەرەک وەزیرانێکی خۆشەویست بگەڕێتەوە کۆڵێتێک و لەبیاباندا بژی.

لە پایەتەختە جۆربەجۆرەکاندا وتاری لێتێگەیشتن و هەستپێکردن بڵاوبونەوە، ئەوانەش هی کەسانێک بوو کەنانیان لەسەر نوسین بوو. ئەوان تێگەدەگەیشتن کەبۆچی ئەو بڕیارەکەی داوە. ئیدی لەو چوار ئامێر تەلەفونانە بەردەوام زەنگیان لێدەدا، ئەو هەمو میوانە، ئەو هەمو دیدارانە، ئەو هەمو بارگرانییەی کارگێڕیدا رزگاری بوو. ئەوەی لەگەڵ ئاشی ئەو هەمو رێکخستنانەدا بڕوا بێگومان هەندێ شێتیش دەبێ؛ هەمو ئەو بیچمە ناودارانە و میوانە پایەبەرزانە لە ماوەیەکی دوردا توشی دەمارگرژی دێن. ئەوەش دەرەهاوێشتەی پیشەکەیتیان.

لە وتارێکدا پەسنی بنگۆریۆن کرا، چونکە بوێری تێدابوو، لەجەنجاڵی، سەرقاڵی و هاتن وچوونی بەردەوامی نێوان ئۆرشەلیم و تەلئەبیب رزگاری بوو.

بێئەوەی ناوی کەس ببەن مەبەستیان سەرۆک دەوڵەتانی دیکە بوو کەلە پیشەی دەسەڵاتدارێتیان توشی دەیان گێچەڵی دەمارگیری بوونە، کە کارێکی باش دەکەن بگەڕێنەوە بیابان و دەرفەتی خەڵکی لەشساخ و گەنج بدەن. بۆ ئەو جۆرە کەسانە بنگۆریۆن نمونەیەکی باشی نیشاندا، بەڵام پێدەچی کەسانێکی کەم هەبن چاویلێبکەن.

لەسەر خوانی نیوەڕۆدا کە حکومەت لەسەر شەرەفی خواحافیزیکردن لە بنگۆریۆن رێکیخستبوو، بنگۆریۆن لەودیوی مێزەکەوە بۆ پاولا چەمایەوە، کەپێناچووو زۆر کەیفساز بێ و بەدەنگە نەرمەکەی کۆپلە دەقێکی لە کتێبی یەرمیاس Jermiasی بایبلدا خوێندەوە:

«من بەرِێزەوە لەبەرامبەر لاوێتیت، خۆشەویستی سەردەمی بوکێنیت، ئەو کاتەی

بەدوای مندا هاتیە بیابانێکی بەیار، کڕنوش دەبەم.»
لە ٥ی دیسێمبەردا بنگۆریۆن سی و شەش ساڵ بوو ژنی هێنابوو. پاولا ئاهەنگی ساڵڕۆژەکەی بەوە گێڕا کەلەگەڵ هەواڵنێرانی ئۆرشەلیم دەربارەی رابردوو داهاتو قسەبکا.
«بنگۆریۆن ئەو سی وشەش ساڵە هاوسەرێکی ئازا بوو، پیاوێکی خۆشەویستی مشورخۆر..» ئەو لەو ساڵە دورودرێژانەدا یارمەتی داوە لەقاپشوشتن و بەڵێنیشی پێداوە لە سدیبۆکردا رایەخەکانیشی لەگەڵ هەڵبکوتێ و داوەشێنی، بەڵام هەڵبەت پاولا لێینەدەگەڕا.
«ئەو دەبێ بە بەرهەم بێ. پشکێکی زۆری کاتەکەی بەنوسین بەسەردەبا.»
لە بەیانییەکەی ٧ی دیسێمبەردا بنگۆریۆن نامەی دەستلەکارکێشانەوەکەی خۆی پێشکەشی سەرۆک بنزیڤی کرد:
«هیچ کەسێک لەهەڵە و خەوش بەدور نیە، بیگومان ئەزیشی لێبەدەر نیم... ئیسرائیل بەبێ سەرکردە نامێنێتەوە. بەخت وچارەی هەر نەتەوەیەک پابەند نیە بەو پرسەی ئاخۆ کێ سەرۆک وەزیرانە یان نا... سەۆک وەزیران دێن و دەڕۆن، بەڵام حکومەت بە قانونەوە پابەندەوە پشتی لێکردۆتەوە...هیوادارم رۆیشتنم هیچ قەیرانیکی بەدوادا نەیەت. موشێ شارێت دۆستم جارێ بەشێوەیەکی کاتی ئەرکی سەرۆک وەزیرایەتیی لە ئەستۆدەگرێ... من تەواو لەو باوەڕەدام کە بەبێ دۆشدامان و وەخرانەوە حکومەتێکی نوێ بە پشتگیری کنێست دادەمەزرێ.»
هەمان شەو سەرەک وەزیرانی دەستلەکارکێشاوە لە رادیۆدا دوانی بۆ نەتەوەکەی دا. دوانەکەی خواخافیزکردنێکی سۆزبزوێنانە نەبوو، بەڵام دەنگی یەک دوو جاران لەرزی و زۆر لە گوێگرانیش پێیوە هەژان.
«من لە ئەرکەکەی خۆمدا هەوڵمداوە بەپێی توانام کارەکان راییبکەم، بەوپەڕی بەخشندەیی و خزمەتکارییانە لەڕاژەی وڵات و گەلەکەمدا بم. گەلۆ هەڵبەت من ئەوە ناڵیم کە هیچ هەڵە و کێماسیم نەبووە و نیە. بەهەمو راشکاویەی و کراوەییەکەوە ئەو وشانەی هۆزانڤانی رۆڤی کەلە کۆپلەی یەکەمی هۆنراوەی ١٤١ بایبلدا هاتوە وەک هی من بن دەڵێمەوە:
«خوایە، دڵی من ئاو ناخواتەوە
چاوەکانم شاناز نین
من بەناو شتە مەزنەکان رێناکەم
چ جای ئەو شتانەی کە بۆمن مایەی پەرجوێتین.»
بڕیاریدا دوانەکەی بە کۆپلە دەقێکی پێغەمبەر هاباکوک Habakuk کەڕەنگبێ باشترین رونکردنەوی خواحافیزیکردن بێ، کۆتاپێبێنێ:
«دادپەروەر لەنێو بڕوای خۆیدا دەژی. ئەو کەسە نیە کە قسە و نمایش بۆ خەڵک بکا، ئەو کەسە پیرۆزئاسایە نیە کە خەڵکی دیکەی بەگوێرەی قانون بەدوادا بکەون، ئەو بەدوای هەڵەی کەسە نزیکەکانی ناگەڕێ، بەڵکو بڕوای خۆی لە ژیانی رۆژانەدا بەرجەستەدەکا و پێوەی دەژی.»

له یەکشەممەی ١٣ی دیسامبەردا پاولا و مێردەکەی لە کاتی ئاساییانەی خۆیان زوتر لەخەو هەڵسان. دەبوایە کەلوپەلەکانیان تێکبنێن. پێش ئەوەی لەبەرچایی ببنەوە میوانیان هاتن، بەتایبەتیش لە کارمەندانی حکومەت و دۆستە دێرینەکانیان بوون، کە هیوای گەشتێکی خۆشیان بۆخواستن.

کەلوپەلی ماڵەکەیان لە ئۆتۆمبێلێکی وەزارەتی بەرگری بارکرا. جێبی پڕ لەسەرباز لەگەشتەکەیاندا تا دوا مەنزڵگایان یاوەرییان بوون.

کاتێکیش بۆدواجار بەماڵەکەیاندا گەڕان، بنگۆریۆن بە پاولای گوت:

«ئەریَ ئەو دەستەبڕکە لۆکەیەی سام هامبورگت تێکناوە.»

پاولا لەهێنانی دڵنیا کردەوە.

بە پێچەوانەی خوەکەی سەرەک وەزیرانی پێشو، دەستی هەمو پاسەوانانی ماڵەکەی لە شەقامی کێرم کیامەت ژمارە ١٤دا گوشی. خێزانەکەی سەرو وێنەیەکی مێردەکەی بە واژۆکەوە پێبەخشین.

کاتیکیش سواری ئۆتۆمبێلەکان بوون، بنگۆریۆن ئاوڕێکی لە ئاپۆرەی خەڵکەکە کە بۆ خواحافیزیلێکردن هاتبوون، دایەوە. هەندێکیان بەدەسرۆک(دەستەسڕ) فرمێسکی چاوەکانیان وشک دەکردنەوە. دەستێکی بۆ ڕاوەشاندن و هاواریکرد:

«مەگرییێن و فرمێسک مەڕێژن، باشتر وایە دوام بکەون.»

# بەشی
## (٢٣)

بەگوێرەی پێوەرە روپێوییەکانی ئامریکایی، نەقەب گەورە نیە. لە تەکساسدا چوار پارێزگا هەن، هەر پارچەیەکیان لە بیابانی ئیسرائیل بەرینترە. هەڵبەت سدیبۆکر بۆ پاولا بنگۆریۆن کە هەمو ژیانی لەشارە گەورەکاندا بەسەربردووە، شوێنێکی لاپەڕگەبوو؛ هەر چوارلای هەر گرد و زورگی لماوی بوون، هیچ دوکانێکی داودەرمانیشی لێنەبوو کە روی تێبکا. دەبووایە پاولا منداڵەکانی، نەوەکانی، دراوسێکان، دۆست و ناسیاوەکان و خودی خۆشیی شارستانێتیە نوێکە لەپاش خۆی بەجێبێڵێ بێتە بیابان. لە سدیبۆکردا تەنها چەند دانە ژنێک دەژیان کە هەرە بەتەمەنەکەیان ژنێک بوو هێشتا تەمەنی نەگەیشتبووە سی ساڵی، بەدەر لەوان دوو دەەرزەن پیاوی گەنج و بنگۆریۆن هەبوون. بەڵام پێدەچێ بنگۆریۆن زیاتر بە کتێب و رۆژنامەوانان خەریک بێ. کەواتە لەوێدا هیچ کەس نامێنێتەوە کە لەگەڵیدا بکەوێتە قسەوباس. دڵە بەخشندەییەکەی وایلێکرد بەبێ قرە بۆ هەمو شوێنێک بچێ.

زۆری نەبرد تۆزو غوباری سەر ڕێگا بۆ دانیشتوانی سدی بۆکر نیشانەی هاتنی کاروانێک بوو. پاولا یەکەمین کەس بوو لە ئۆتۆمبێلەکە دابەزی. هەردو دەستی پڕبوون لە دەسکە گوڵ کەلە بیئر سەبعە پێشکەشیان کردبوون.

«گەر لێرە کەسێک نەخۆش کەوت، ئەوا لەتەنیشتیان دادەنیین. بەڵام دەبێ هەر زوو بخرێنە ناو ئاو تا وشک هەڵنەگەڕێن.»

ئیدی لێرە قسە لەسەر بەخێرهێنانێکی فەرمییانە نەبوو. هەمویان لەداگرتنی بارەکەدا یارمەتیان دا. لەسەر فەرمانی سەرەک وەزیرانی پێشو هەمو پۆلیسە سەربازییەکانی لەگەڵیان هاتبوو سەر و وێنەیان لەتەک بنگۆریۆندا گرت.

هەواڵنێرەکان ویستیان پرسیاری لێبکەن.

«ئاخۆ لێرە چ کارێک وەردەگری؟»

بەکورتی وەڵامی دانەوە: «جاری هیچی بیرۆکەیەکم نیە. خۆتان دەزانن کە ئێرە کیبۆتە. سکرتارییەت کارەکان دابەش دەکا. هەرچی بۆیان دانام، دەیکەم.»

لەوەڵامی پرسێکی دیکەدا، تەنها کورتە وەڵامێکی دانەوە: «گەر من لێرە یەک دوو ساڵان بژیم، ئەوسا دەتوانم رونی بکەمەوە کەچیم کردووە و ئایندەکەشی چۆن دەبێ.»

بە ئێوارە درەنگەوە هەواڵنێران، وێنەگرە رۆژنامەوانییەکان، دۆست و برادەر و

یارمەتیدەران، هەمویان ڕۆیشتنەوە.
پاولا تەنورەیەکی لۆکەی سادەیی لەبەرکرد. لەبەرئەوەی بۆ بنگۆریۆن ڕۆژێکی مێژوویین بوو، قاتێکی تۆخ و بۆینباخی بەستبوو، ئیدی دایکەند و شۆرتێکی خاکی و کراسیکی کردەبەر.
بە پێکەنینەوە بە ژنەکەی گوت: «بەخێر بێن بۆ سدیبۆکر.»
هاوسەرەکەشی لەناخیەوە وەڵامی دایەوە: «هیوادارم لێرە شادمان بی.»
لەو کاتەی بنگۆریۆن خەریکی دانانی کتێبەکانی بوو، پاولاش ماڵی پاک دەکردەوە.
یەکەمین میوانیان منداڵێکی تەمەن چوار ساڵ و نیو بەناوی چەمی کۆهن Chemi Cohen کە کەمتەمەنترین کۆلۆنیست بوو، هات لەبەردەرکە وەستاو بە زمانی عیبرییانە پرسی:
«تۆ کێی؟»
سەرەک وەزیرانی پێشو بە خەندەوە وەڵامی دایەوە:
«من نوێترین دەستپێکم Chalutz.
بنگۆریۆن و هاوسەرەکەی کەسی نۆزدەهەم و بیستەمین بوون کە هاتنەڕیزی کیبۆتەکە. کاتێک پاولا بۆ یەکەمینجار ماڵەکەی کە تەنها خۆی و مێردەکەی لێدەژیان دیت، بە غوربەتێکەوە گوتی:
«ئەو خاونوە لە بەنگەلۆی دورگەی کۆنی Coney Island دەچێ. کاتی خۆی لە نیویۆرک لەگەڵ چەند برادەر هاوینێک بەکرێمان گرتبوو.»
ئەو کۆڵێتە ڕەنگ زەردەیان ١٣,٥ بە ٥,٤ مەتر بوو لە سێ ژور پێکهاتبوو؛ بۆ هەریەکەیان ژورێکی نوستن و ژورێکیش بۆ کتێبخانە و شوێنی ئیشتێداکردن بوو. کەلوپەلەکانی لەسوئێدەوەڕا هاتبوون. لەولاشەوە ستونێکی رادیۆ هەبوو کە چەند ئامێرێکی پێوانی لێقایمکرابوون. لەسەر بانی خانوەکەی بنگۆریۆندا ئامێرێکی لێبوو کەزۆرجاران نیشانی میوانەکانی دەدا و دەیگوت: «ئەمەیان هەرزانترین ئاوگەرمکەرەوەیە لە جیهاندا.»
ئەوەش پەیوەندی بە تیشکدانەوە هەبوو. هەمو تیشکەکانی ئاسمانی سەر بانەکەی بۆخۆی کێشدەکرد و ئاراستەی خاڵێکی ئاسنینی بچوکی دەکرد کە تانکی ئاوی ماڵەکەیان بوو، ئیدی هەمان پلەی گەرمای وەک زۆرینەی میوانخانەکان دەپاراست.
لە سدیبۆکردا دەبووایە کاژێر ٥,٤٥ خولەکدا لەخەو رابووبان. کاری یەکەمی بنگۆریۆن تۆمارکردنی پێوانەی پێوەرەکان بوو.
لە کاژێر هەشت تا نۆ کاتی نانخواردنی بەیانی بوو. فراوینی نیوەڕۆش لە دوانزەونیو تا یەک بوو، شێوی ئێوارانیش لە کاژێر حەوتی ئێوارەوە دەستیپێدەکرد. کاریشیان لە شەش تا هەشت، لە هەشت و نیو تا دوانزە و نیو، لەیەکیشەوە تا کاژێر چوار بوو.
شەوان کیبوتنشینەکان خەریکی خوێندن و خۆپەروەردەکردن بوون؛ ئەنجا خەریکی سازدانی نەخشە و پلانیان بوون کە نەدەبوایە بەلاوەبنرێ.

ژەمەکان لە هۆڵێکی خوردنی هاوبەشدا ئامادەدەکران. هەندێ لە گەنجەکان شۆرتیان لەپێدابوو، ئەوانی دیکە پانتۆڵی خاکییانە. زۆرینەیان بە کراس بەو ناوەدا دەڕۆیشتن. کچەکانیش تەنورەی کورت یان درێژ و بلوزێک. تەنها نوێکان پێڵاویان لەپێدەکرد، چونکە هێشتا بەرپێیان لە لمە سوربووەوەکەی بیابان رانەهاتبوو.

کاری پاولا ئاشپەزخانە و ژوری منداڵان بوو. زانیاریی داودەرمانییەکەی لەوێ باش فریای کەوت، گەر هاتبا یەکێک لەرێگا بەروداوی ئۆتۆمۆبێل، یان بەشەڕ و دەمەقاڵێیەک برینداربووبا دەیانگەیاندە لای. (لەسەرەتادا هیچ پزیشکی لێنەبوو. دواتر یەکێکی بۆهات، ئەوانەی تازە دەردەچوون دەبووایە بۆ ساڵێک لە شوێنێکی دور مەشقیان بکردبایە. پاشان پزیشکێکی گەنج بەشێکی ژیانی بۆ ئەوان تەرخانکرد و هاتە سدیبۆکر.)

لەبیاباندا زۆرجاران ئاسکیان بەدیدەکرد، بەشەویش گوێیان لەدەنگی رێوی و کەمتیار دەبوو.

سدیبۆکر روبەرێکی دوانزە هکتاری بە خۆخ، ترێ و سەروزە داچاندرابوو، باقیەکەشی وەک پاوانی پەزەکانیان بەکاردەهێنا.

کیبۆتەکە سەد مەڕێک، دوو مانگا، یەک دەرزەن ئەسپی عەرەبی و یۆگسلافی و هەزار سەرمامری لێدەبوو. کیبوتنشینەکان خوری مەڕەکانیان بە خۆیان دەبڕیەوە، خوریەکەیان لە شە دەدا، بۆیەیان دەکرد و جلیان لێدروستدەکرد.

لە مانگدا یەکجار ئۆتۆمبێلێکی باری ئازوقە لە تەلئەبیبەوەڕا دەهات. سەبارەت بە رادیۆش ئێزگەی قاهیرە و تەلئەبی وەردەگرت.

ئاودانی کێڵگەکانیان دەبووایە لە دوای نیوەڕۆ پێش رۆژئاوابوون بووایە. بەرۆژ بایەکەی وا توند هەڵدەکرد رێڕەوی ئاوەدانەکەی دەگۆڕی.

تەنها شەش کاژێر لەرۆژدا کارەبایان هەبوو. دەبووایە دەست بەئاوەوە بگرن.

کیبوتەکە دیاریەکان دایە پاولا کە زۆری کەیف پێهات: بەفرگرەیەک کە بە نەوت کاریدەکرد.

هەمو رۆژ و شەو دەبوایە کیبوتنشینێک لەگەڵ مەترالیۆزەکەیان ئێشکگر ببا. دوو لە سەرنشینانی کیبوتەکە کوژرابوون؛ کچە شوانێک و کوڕە گەنجێکی دیکە.

بنگۆریۆن تا نانی نیوەڕۆ بەگوێرەی خشتەی کاری گشتی دەڕۆیشت، دوای نیوەرۆیانیش دەینوسی. دوای ژەمی رۆژئاواش، کاژێرێک پێش نوستنی دەینوسی یان دەیخوێندەوە.

یەکەمین کاریان کە دایە بنگۆریۆن ئیشی کێڵگە بوو، دواتر کرایە شوانی مەڕان.

پاولا دەبووایە لەپاڵ کارە گشتیەکانی کیبوتەکە،ماڵی خۆیشی پاکبکردبایەوە: جێیوبالینگانی هەڵدەگرت، گەسکی دەدا، و شتەکانیشی لە شوێنە گشتیەکەدا دەشوشت.

ئەوانەی سەری سدیبۆکریان دا، تێبینی ئەوەیان کرد شتێک لە رەفتاری بنگۆریۆن بەرامبەر هاوسەرەکەی گۆڕاوە. یەکێک لەکۆنە دۆستەکانی گوتی:

«پێش سەرچڵیەکەی بیابانی، بنگۆریۆن هەمو شتێکی بەگوێی پاولا دەکرد. پێی

ئاسایی بوو هەمیشە پاولا شتەکانی بۆ ئامادەکردبان. بەڵام لە سدیبۆکردا کە بەردەوام بەیەکەوەن، ئەوسا تێگەیشت کە پاولا چ زەحمەتیەکی بۆ ئەوبینیوە چی بۆکردووە. بنگۆریۆن دڵگەرمتر و مشورخۆتر بوو لەجاران..»

لە روانگەی دیکەشەوە بنگۆریۆن لەبیابان گۆڕابوو. ئەو دۆستانەتر و مەحشەرخۆشتر لەگەڵ ژینگەکەی دەهاتەوە. هەمیشە بیرۆکەکان بۆ ئەو لە مرۆڤەکان گرنگتر بوون، وەلێ لەو کۆمەڵگە زۆر بچوکەی نێوەڕاستی بیاباندا کە لەوەتەی سەردەمی سەرەتای گەنجێتی لە دەستپێکەکانی گالیلیا بەقەد ئێرە لەگەڵ کەمترین ژمارەی مرۆڤدا هەڵسوکەوتی نەکردووە، کەچی هەنوکە زۆر کەیفسازە و بەگەرمی لەگەڵ دەروروبەرەکەی هەڵدەکا.

لە یانایریدا کۆلۆنیستێکی نوێ پەیدا بوو. روس ئالێکسندرۆڤسی Ruth Alexandrovsi gailadi کیژێکی تەمەن بیست و چوار ساڵانی پرچڕەشی چاو زەقی سابرایی بوو. کچەکە و بنگۆریۆن زۆر بەیەکەوە کاریان دەکرد و بوونە برادەر. کچەکە هەمو ئەو خەسڵەتانەی هەبوون کە بنگۆریۆن بۆ گەنجەکانی بەهەند دەزانین. کیژێکی بەهێز، سەرنجڕاکێش، رۆشنبیرو چاوکراوە بوو.

هەرگیز لەخۆیەوە نەدەدوا. زۆر جاران لەگەڵ بنگۆریۆندا بەبێدەنگی ئیشیان دەکرد، هەردوکیان بەکاژێر لەکاتی کارکردندا لە کێشەکان بەبێدەنگی قوڵدەبوونەوە. بەڵام دوایی لەپڕێکەوە بنگۆریۆن رویتێدەکرد تا لێیبپرسێ:

«ئەرێ تۆ بڵێی چی بەسەر ئەو هەمو لاوانەی ئیسرائیلدا هاتبێ؟ بۆچی بەهەزارانیان وەک تۆ روناکەنە بیابان؟»

چەند جارێک ویستی بۆ پیرەمێردەکەی رونبکاتەوە. جارێکیان گوتی: «جەنگ سەردەمێکی خۆش نەبوو. پاشان ئێمە شتێکمان لەدەستدا. ناشزانم بە دەقاودەقی چی بوو. رەنگبێ ئێمە دژوارێتیمان لەدەستدابێ. رەنگبێ تەمبەڵ بووبین. رەنگبێ حەزمان لە لوکسەیی بێ. لەوانەشە زۆر بیر لە شتی لاوەکی بکەینەوە.»

لەماوەی گفتوگۆکانیاندا بنگۆریۆن کە نزیکەی ساڵێک دەبوو لەکێڵگەکانی ئۆهیۆ Ohio و گۆرجیا Georgiaدا مابووەوە و باوکی دەناسی چونکە لە تەوژمی دوهەمی کۆچبەرانی سەرلەزو لە کیشنیف Kishinvەوەڕا هاتبووە فەلەستین.

پاولا و روس زۆر جاران بە ئینگلیزی لەگەڵ یەکدی دەدوان، ئەو بە شێوەزاری بروکلینانە، روسیش بە تێکەڵاوییەکی شێوەزارە سترانبێژیانەی گورجی و رەوانیە ئۆهیۆکەی.

هاتنی بنگۆریۆن بووە مایەی سەرئێشی جۆربەجۆر بۆ کیبوتەکە. گەر کەشوهەوا خۆش بووبا، ئەوا زۆر میوانیان دەهاتن؛ لە رۆژێکیاندا زۆرکەس هەر بۆخۆشی لە گەشتیاران، کارمەندانی حکومەت، پایەبەرزە بیانیەکان، هەواڵنیران و وێنەگران و خەڵکانی دیکەش سەردانیان دەکردن. مرۆڤ دەبووایە ژەمەخواردنێک بداتە هەموان، هەندێ جاریش دەبوایە لای خۆیان جێیان بۆکردبانەوە.

ئەرێ چۆن کیبوتنشینەکان ئەندامە نوێکانیان بانگکردبان؟ ئەوان هەمیشە بە پێشناوی یەکەم و بەتۆ یەکدیان بانگدەکرد، بەڵام ئەدی هەنوکە؟

بۆیان ئەستەم نەبوو بە خانمەکەی بنگۆریۆن بڵێن پاولا، بەڵام پێیان شیاو نەبوو کۆنە سەرەک وەزیرانی پێشو لە بنگۆریۆن بترازێ بەناوێکی دیکەی بانگ بکەن.

لە دوا هەفتەی فێبرایەردا بنگۆریۆن ئامادەبوو پێشوازی لە رۆژنامەوانان بکا. هەواڵنێران تێبینی ئەوەیان کرد کەهەندێ رەشتاڵە بووە و تەندروستیشی وەک کوتک باشە. خانوەکەیان زۆر بچوک بوو، جێی هەمو میوانانی نەدەبوەوە بۆیە بانگهێشتی نێوحەوشەی ماڵی کردن و لەسەر زەوی جێگای بۆ راخستن.

«خاکێکی نایابەو شورەیی نیە گەر لەسەری دابنیشی.»

ئەو نەچووە سەر باسی پێشهاتە نوێکانی حکومەت و رەتیکردەوە وەڵامی ئەو جۆرە پرسانەیان بداتەوە، بەدەر لەوە زۆر دۆستانەتر و هاوکارانەتر بوو لەجاران. ئەو خۆی هەندێ جاران خۆشی دەدایە دیدار و چاوپێکەوتنەکان.

«من ئێستا ئەندامی کابینەی حکومەت نیم. تەنها ئەندامێکی ئاساییانەی کەنیستم کە کاری ئاسان دەکا.»

لێیانپرسی ئاخۆ چ ئیشێکی وەرگرتوە:

«جارێ چاوم لە بزنەکانی نێو کۆزەکەیە کە تازە زاون و کاریلەیان پەیدابووە.»

نەیدەویست دەربارەی ئایندەی خۆی بدوێ، بەڵام دەربارەی پاشەرۆژی نەقەب گوتی: دەکرێ ئەو دەڤەرە ببێتە پڕ دانیشتوانترین ناوچەی ئیسرائیل. تاکە کێشە تەنها ئاوە.»

بەگەرمیەوە ئاورێکی لە دانیشتوانی سدیبۆکر دایەوە کە لەدەورەی دانیشتبوون، ئەنجا گوتی: «ئەو کۆمەڵە خەڵکەی نەقەب هەندێک دێوانەن، بەڵام من ئەو دێوانانەم خۆش دەوێن.»

لە مارتدا بنگۆریۆن وتارێکی بەناونیشانی «بۆچی خۆم کێشایە نێوبیابان» بۆ New York Timesدا نوسی: «ئەگەر هێز بۆخۆی ئامانج نەبێ بەڵکو تەنها داردەستێکی راژەی نەتەوە بێ، کەواتە هەقە هەمو دەوڵەتمەدارێک بە هەستێکی بەرپرسیارانەوە لەمیانەی تێپەڕینی رۆژگاردا لەخۆی بپرسێ: ئەرێ ئەزیش نەبوومەتە قوربانی دەستی خو؟ تۆبڵێی توانام هەروەک جاران بە بەهێزی مابێتەوە؟ ئایا بەتەواوی هۆشمەوە ئاگام لە هاوڵاتییەکەی ئاسایی - کەهەموشتێک لەپێناوی ئەودایە- گەلەکەمدا هەیە؟

«ئەو سەرۆک دەوڵەتەی خۆی بەهۆکارێکی بڕیاردەر بەسەر چارەوبەختی وڵاتەکەی بزانێ ئەوا زیانبەخش و کوشندەیە. ئەو گرژیە بەردەوامەش کە لەسەریەتی و داگیریکردووە یان هەڕەشەیە بەسەریەوە لەمپەرێکە بۆ نوارینێکی تازەی کاروبارەکان، ئەوا دەبێتە مایەی لاوازکردنی هەر بڕیاردانێکی پێویست، ئیدی سەرپێیانە لێیدەڕوانێ بێئەوەی بەدوای رەگوریشەیدا بچێ و لەبڕیاردانادا پرسەکە جدییانە هەڵبسەنگێنێ... گەر ئەوە رویدا واباشترە خۆی بکێشێتەوە...»

بەشی دوهەمی وتارەکەی تەرخانبوو بۆ ئارەزوە خۆشەویستە دوهەمەکەی: کار لەگەڵ خاکداکردن و خوێندنەوە.

«بە گوێرەی هەڵسەنگاندنی من ، ژینگەی سروشتی بەبایەخترین دەروربەرە بۆ مرۆڤ. بەپێی ئەوەی مرۆڤ چەند خۆی لە دەستکارییەکانی شارستانیتی

نوێ دەکێشێتەوە...ڕوبەڕوی سروشتێکی درو دەستلێنەدراو (وەک چۆن یەدزان ئافەریدەیکردووە)دا دەبێتەوە، لەوەشیاندا بیابان نمونەیەکی سەرمەشقە، ئەوا هەست بەوە دەکا باشتر لە رازی ژیان و ئەرکی خۆی لەسەر لەزەویدا بگا.»

بەڕیکەوت بوو گوتی کەوا تەوڕات (قانونی جولەکان) لە بیاباندا رادەستی موسای گەورەترین مامۆستای ئیسرائیل کە گەلەکەی پەلکێشی چۆلستان کرد، کرا.

بڕیاریدا ئەو راگەیاندنەی هەنگاونانەکەی رونبکاتەوە: لەدواییدا شوێنێک بۆ سەرەک وەزیران پەیدابوو، بەڵام شوێنی سەدان، هەزاران بگرە ملیۆنانیش ئەوانەی دەیانەوێ بیابان ببوژێننەوە، هەیە. چارەنوسی دەوڵەت زیاتر بە کۆمەڵ بەستراوەتەوە لەوەی بەتاک. لەرۆژگارێکی وەک ئێستاماندا تاک هەستێکی وای لا گەلاڵە بووە کەتەنها ئەو کارانە بکا کە بەجەماوەر دەکرێن و پێویستە بکرێن.»

لە ئایاردا ئەو وەرزە دەستیپێکرد کەدەبووایە خوری مەڕەکانیان ببڕدرێتەوە. لەروی فیزیکیەوە جەستەی بنگۆریۆن بێخەوش بوو. ئەو و روس بەیەکەوە ئیشیاندەکرد. پێدەچوو بەبێ کێشە کاوڕێکی پەنجا کیلۆیی هەڵبگرێ و لەسەر تەختە داینێ تا سابرا لاوەکە بە کەلەخ خورییەکەی ببڕێتەوە. بەڵام بنگۆریۆن ئەوەی فەرامۆشکردبوو کە تەمەنی شەست و حەفت ساڵانە و لەمێژیشە دەردە پشتئێشەی هەیە. لەدواییدا دەبووایە لەسەر جێگەدا بکەوێ چونکە لە سدیبۆکر هیچ پزیشکی لێنەبوو، پاشان گەیەنرایە نەخۆشخانەی تەلئەبیب. سێ هەفتەی خایاند تا گەڕایەوە دۆخی جارانی و سەرلەنوێ دەست بە ژیانی دەستپێکیی خۆی بکاتەوە.

لەو کاتەی خوری مەڕەکانیان دەبڕیەوە، روس نهێنیەکی خۆی هێنایە سەرزمان. ئەو لە حوزەیراندا شو بە کوڕەلاوێکی درێژی نشینەگەی زێیڤ ستاینهاردت Zeev Steinhardt دەکا. دەیەویست بنگۆرین لە کەسە یەکەمەکان بێ کە بەهەواڵەکە بزانێ. روس گوتی : «هیچ لەوە خۆشتر نیەکەلە بیاباندا دڵداری بکەی.»

لە و ماوەدا هەستی پاولا بە ژان و ئازارێکی زۆر کرد؛ دەبوایە بۆ چارەسەری بگەیەنرابایە نەخۆشخانەی هاداساhadassa لە ئۆرشەلیم.

کاتێکیش خۆی و مێردەکەی گەڕانەوە سدیبۆکر، دەستە مێوانێکی نوێیان هاتن. سام هامبورگ هاتو دیاریەکی نائاساییەنەی لەگەڵ خۆیدا هێنابوو: فەردە لۆکەیەک، یەکەمین بەرهەمی لۆکەی ئیسڕائیل. کاتێک فەردە لۆکەکەی نیشانی بنگۆریدا ، پاولا لەو ساتەدا هاتەژور:

«ئەرێ ئێوە و ناوی خوا، پێم ناڵێن ئەمە چیە؟»

پێش ئەوەی هامبورگ بۆی رونبکاتەوە، مێردەکەی گوتی:

«ئەمەیان گرنگترین شتە کە لەو ساتەدا ئیسڕائیل پێویستە هەیبێ.»

بە تروسکایی چاوێکی خەونبینینەوە بنگۆریۆن نیگایەکی بڕیە سەر بەرهەمەکە وخاکەکەی کە بەگوێرەی پسپۆڕان بێبایەخ بوو کرد. هەنوکە هامبورگ زۆر باشی دەناسی، دەیزانی بیر لەچیدەکاتەوە.

ریزگرتنی ئیش، شانازیکردن بە ئیشی قوڕس بۆ بەدەستهێنانی بەرهەم، تێگەیشتن لە بایەخی کێڵگەکانی لۆکە، خاکێکی پڕ دارتوو، پرتەقاڵ و کێڵگەی سەرتاپا داچیندراو

بە چەوەندەری شەکر. ئەو شتانە بوون کە بنگۆریۆن دەیویست گەلەکەی فێریان بێ.

هامبورگ یاوەری بنگۆریۆن بوو کە بەخۆی و ریشە سپیەکەوە چوە کۆزی بەرخەکانی و دەستی لێدەدان. دواتر هامبورگ بەدۆستەکانی گوت:

«کاتێ بنگۆریۆنم بە سەرقاڵیەوە دەدی، دەبووایە بیر لە گاندی و خەڕەکەکەی بکەمەوە. دەبوایە بیر لەپێغەمبەرەکانی بایبلیش بکەمەوە. لەکۆزە مەڕی سدیبۆکردا ئەز بەرزترین نمایشی گیانی مرۆڤایەتیم دی.»

ئی نو U Nu (١٩٠٧-١٩٩٥) یەکەمین سەرەک وەزیرانی بیرمای سەربەخۆ-وەرگێڕ) سەرەک وەزیرانی بیرما Birma، سەردانێکی بنگۆریۆنی کرد. وڵاتەکەی هەر وەک ئیسرائیل لەچنگی ئینگلیزەکان رزگاری ببوو. ئینگلیزەکان لە بیرمادا سێسەد ساڵ دەسەڵاتدار بوون و لە ئیسرائیلیش سی ساڵان. مانگێک بەرلەوەی نەتەوە یەکگرتووەکان نەخشەی دابەشکردن بپەژرێنن کە بەهۆیەوە ئیسرائیل سەربەخۆ ببێ، لە لەندەن رێکەوتنی سەربەخۆیی بیرما واژۆکرا. چوار مانگان بەر لە ئیسرائیل بیرما تەواوی مافەکانی دەوڵەتێکی سەربەخۆی وەرگرتەوە و بووە پەنجاو هەشتەمین ئەندامی نەتەوە یەکگرتووەکان و ئیسرائیلیش پەنجا و نۆهەمین ئەندام. دەسەڵاتەکانی سەرۆک لە بیرمادا دەقاودەق وەک ئیسرائیل سنورداربوون. لە هەردوو دەوڵەتەکەدا رابەڕایەتی بۆ سەرەک وەزیران دەگەڕایەوە. ئونو وەک بنگۆریۆن بۆماوەیەکی دورودرێژ سەرەک وەزیران بوو.

هەردووک پیاوەکان لەکاتی پیاسەیان بەناو گۆڕەپانی کیبوتەکەدا، ئەزمونەکانی خۆیان لەگەڵ یەکدا بەراورد دەکرد.

یەک دوو نەمامی ئیکالوپتیس چاندرابوون، بنگۆریۆن بە شانازیەوە نیشانی میوانەکەی دان»

ئونو بە خەندەوە گوتی:

«لە بیرمادا دارودرەختی زۆرمان هەیە. زۆر هەبوون خراپترە لەوەی کە کەمت هەبێ. گەر من لەجێگەی تۆدابم، جەنابی بنگۆریۆن ئەوا تا زوە نەمامەکە لە خاک دەردەکێشم.»

بنگۆریۆن بەربەستەکانیشی نیشاندان کەبۆ گرتنەوەی باراناو بنیاتیان نابوون.

ئونو سەرێکی بۆهەژاند.

«لەوڵاتی من ناخۆشیمان لەگەڵ ئاودا هەیە. لەوێ دژی دەوستینەوە. کەچی لێرە دەبێ شەڕی لەسەربکەن.»

ئەوان گەڕانەوە خانوە رەنگ زەردەکە و بەقوڵی لەگژ باسوخواسیان ڕاچوون.

بنگۆریۆن بەو میوانە دڵخۆش بوو، دەرفەتێک بوو لەگەڵیدا باسی ئۆل و فەلسەفە لەگەڵ کەسێکد بکا کە لە وڵاتێکی سەر بە ئایینی بوداوە هاتووە. بنگۆریۆن خوازیاربوو بیردۆزەکەی بۆ شیبکاتەوە بەوەی ئیسرائل، هیندستان و وڵاتی گریک(یۆنانستان) سێ ناوەندی کلتوری گەورەی دێرینەن کە بەهایەکی ئەبەدییان بەخشیوەتە مرۆڤایەتی.

بە میوانەکەی گوت: «من هەمیشە بودام بەیەکێ لە دە بیچمە مێژوییەکاندا

داناوە.»
بەیەکەوە دەربارەی خاڵە یەکانگیرییەکانی بودایی و دە ڕێنماییە ڕێرەوشتەکانی موسا دوان.
دەربـارەی شارستانێتی کۆن و نوێ دوان. سەبارەت بەئەرکی لێکۆڵینەوەی زانستییانە بنگۆریۆن گوتی: لەمێژە زانست بەدوای رازی سروشتدا وێڵە، ئەو ناتوانێ مرۆڤ فێری ئەوە بکا کامە ڕێگا هەڵبژێرن.»
ئونوی سەرەک وەزیران مکوڕ بوو لەسەر ئەوەی بنگۆریۆن نیکایاس Nikayas (کۆکراوەی نوسراوەکانی شانزەفێرگەکانی کۆنی بودایزم-وەرگێڕ) بخوێنێتەوە.
هەروەها سەبارەت باوەڕی ئو نو بە دۆنـاودۆن(Reincarnation) کە لێبڕاوانە باوەڕی وابوو مرۆ لەژیاندا زیاتر پەرەدەستێنێ سەرەتا بەپلەی پیرۆز و لەدواییشدا دەبێتە بودا هەبوو، دوان.
بەو سەردانە بنگۆریۆن دنـەدرا لێکۆڵینەوەی زیاتر لەسەر دیین و فەلسەفەی رۆژهەڵاتیدا بکا، پەیوەندیەکی توندوتۆڵی ئابوری لەنێو ئەو دوو وڵاتە لەیەک دورەدا پەیدابوو. دواتر بنگۆریۆن بەخۆشیەوە یادی ئەو سەردانەی دەکردەوە. لە ساڵرۆژی هەشتەمی سەربەخۆیی بیرمادا ئەو بروسکەی خوارەوەی بۆ ئونو لێدا:
«ئـەو سـەردانـە لەبیرنەکراوەت کە ئـەو زێدەمافەی دایـە من باشتر بتناسم، بەردەوام لە یادەوەریمدا دەمێنێتەوە... من دەرسێکی تایبەتیانەی بودایزمت لێفێربووم، زۆر بەرزی هەڵدەسەنگێنم و خوێندنەوەی نیکایاسیش جۆشوخرۆشێکی ئازادانەی پێبەخشیم.»
لە سدیبۆکردا بنگۆریۆن بەسەدان هەزار وشەی نوسین. وتاری بۆ رۆژنامە جۆربەجۆرەکانی ئیسرائیل هەروەها بۆ وڵاتە یەکگرتووەکانی ئامریکا، کەنەدا، خواروی ئافریکا و وڵاتەکانی دیکەش دەنوسی. بەرچاوترین بەرهەمی کتێبێک بو بەناوی «The Rebrith and Destiny of Israel؛ کەبریتی بوو لەکۆکردنەوەی دوان و وتارە پەخشانەکانی نێوان ١٩٥١ و ١٩٥٢دا. کتێبێکی قەبارەی ٥٨٩ لاپەڕەی لێدەرچوو، لەهەمان ساڵیشدا لە وڵاتە یەکگرتووەکان و ئینگلستاندا چاپ و بڵاوبووەوە.
ئەو دەربارەی بابەتە جۆربەجۆرە گرنگەکانی دەنوسی. دەربارەی پاشەرۆژ گوتی: «ئێمە لە ئێوارەی رۆژگارێکداین کە سود لە وزەی رۆژ وەردەگرێ. لێرە لە نەقەبدا کۆگایەکەی بێسنورمان هەیە. ئێمە دەتوانین ئاوی دەریا بپاڵێوین و بەرەو نەقەبی پاڵبدەین، ئیدی ئەوێ بەچەشنێکی دیکە دەبینرێ لەوەی کە ئێستا هەیە.»
ئەو روی دەمی لە کەرتی پەروەردەی ئیسرائیل کرد و ئامۆژگاری ئەوەی کردن کە لەساڵێکدا رۆژێک بۆ سوپا تەرخان بکەن و لەگەڵیاندا بژین، رۆژێکیش بۆ گوندەکانی سەرسنور و رۆژێکیش بۆ کیبۆتەکانی نەقەب.
بۆ گۆڤارێکیش کە تایبەت بوو بە نوسینی کلاسیک پەخشانێکی دەربارەی ئەفلاتون نوسی.
لە وتارێکی دیکەیدا گـەڕایـەوە بن کەوڵی سۆشیالیستێکی هەڵمەتبەر: «کەم نین ئەوانەی ئەو بیرۆکەیان هەیە گوایە دەستپێشخەریە تایبەتییەکان (مەبەست لە

پولپەرستییە) هەمو گرفتێک چارەسەردەکا و دەیانەوێ ئایندە لە سەر بنەماکانی دەستپێشخەری تاکیانە بنیاتبنێن. بەڵام ئەو جۆرە کەسانە دەوڵەت و نەتەوە بەرەو هەڵدێر دەبەن. تەنها پولپەرستی مرۆ بەلای زۆریەوە دامەزراندنی قەرتاجەیەکی عیبریانەی لێدەکەوێتەوە و ئەویش وەک قەرتاجەی کەنعانییەکەیان زۆر خۆی ناگرێ.

«لەبەرئەوەی قەرتاجە لەسەر گوێ زەویش نەما، چونکە لەپشت هانیبالەوە تەنها شارێکی پڕ بازرگان و سەوداکارانی پول و پارە هەبوو کە دەستپێشخەرییە تایبەتیەکانی خۆیان وەک خودا تەماشادەکرد و بەرامبەرەکانیشیان گەلی جوتیار بوون کەبەتوندی بەخاکەوە بەسترابوونەوە.

«دەستپیشخەری تایبەتییانە نابێتە مایەی یەکگرتنەوەی کەسانی دیاسپۆرا، نابێتە مایەی بوژاندنەوەی بیابان، نابێتە مایەی ئافراندنی شارستانێتی عیبرییانە کە شیاوی گەلی کتێبەکە بێ و هەروەها هەرگیز ناشبێتە هۆی پێگەیاندنی جڤاکێکی نوێ.»

هەفتەیەکی دیکە بنگۆریۆن شلتری نواند و نوسی کەوا لەهەمو لایەکی ئیسرائیل هەرەوەزی، هاوکاری و کشتیاری تایبەت با پەیدابن، ئەوسا هەر کۆلۆنیستێک بەخۆی سەرپشک بێ ئاخۆ چ جۆرە سیستمە ئابورییەکی پێباشترە.

بنگۆریۆن دروشمی «دەی بەرەو ئیلات»ی بەخشیە گەنجان، بەڵام کاتێک تەماشای ئاسۆی بکردبایە هاتوچۆیەکی کەمی لەسەر ڕێگای بیئیر سەبعە بەلاپاڵی سدیبۆکر بەرو باشور دەدی. هیچ کۆڕەوێک لەشارە گەورەکانەوە نەهات، کۆمەڵە و دەستەی زۆری کۆمەلانی خەڵک شوێنپییان هەڵنەگرت، دانیشتوانی کیبوتەکان و سەرسنورەکان بەڕێژەیەکی بەرچاو زیادیان نەکرد، بای حەزی کشان بەرەو باشور هەڵینەکرد.

هەڵبەت بنگۆریۆنیش بەتەواوی شکستی نەهێنا. لە ١٩٥٤دا هەمو دانیشتوانی ئیسرائیلی لە بیابان ئاگادار کردەوە، لەو ئەگەرانەی لەوێ هەن، لە خاکەکەی کە ناوچەکە لە ئایندەدا چ رۆڵێک دەبینێ.

لە تەلئەبیبدا پێڵاودروستکەرێکی سادەی رەچەڵەک پۆلۆنی بەناوی باروخ تال Baruch Tal بیچمە هەرە لەپێشەکەی ماپای خۆشدەویست. پرسی: «ئەرێ دەکرێ ژمارەی پێوانی پێی بەڕێزیان بزانم چەندە؟»

کاتێک تال پرسەکەی کرد، رونیشکیردەوە:

«ئەز زۆر جار بیردەکەمەوە کە ئەو لە بیاباندا دەژی. دەڵێن لەو دەمەی ساڵەدا بیابان بەشەوان ساردە. من ئەو لەخۆمدا دەبینمەوە کە چ ئازارێک دەچێژێ. ئەو چیدی شەنگ و بڕستی لاویتی نەماوە. ئەو لەمن بە تەمەنترە. بەڵام ئەو لەوێ کێماسی لەزۆر شتدا هەیە، کەچی من لێرە وەک هەڤاڵێکی ئاسایی لەهەمو خۆشیەکی تەلئەبیب سودمەندم. خۆ دەبینی، لەبەرئەوە من جوتە پێڵاوێکی بۆ دروستدەکەم. ئیدی چیدی ویژدانم ئازارم نەدا.»

# بەشی
# (٢٤)

لە سەرەتای ساڵی ١٩٥٥دا وەزیری کار، گۆلدا میرسۆن(مایەر) سەردانێکی سدیبۆکری کرد تا لەگەڵ بنگۆریۆندا دەربارەی ئەو ئاستەنگانەی هاتونەتە رێی هاوکارەکانی بۆ پێکهێنانی کابینەی حکومەت بدوێ. بانگهێشتنامەیەکی سەرەک وەزیران شارێتیشی بۆ هێنابوو سەبارەت بەگەڕانەوەی بۆ ژیانی گشتی، تا سەرلەنوێ ببێتەوە وەزیری بەرگری، بەڵکو بێتەوە ناو حکومەت و هاوکاریان بکا تا لە قەیرانەکە دەردەچن، چونکە هەڵبژاردنەکان لە هاویندا ئەنجامدەدرێن.

سێ رۆژ دواتر شارێت رایگەیاند کە بنگۆریۆن داواکەی پەژراندووە. رۆژی پاشتر پیاوە سەر و ریش سپییەکە بیابانی بەجێهێشت، لە ئۆرشەلیم بەخۆی و جلی سەربازییانە سەری دەرهێنایەوە و جارێکی دیکە بۆ پایەی وەزیریەکەی سوێند درایەوە.

دەسەڵات بەجێهێشتنەکەی چاوەڕواننەکراو بوو بەتەواویش بڕایەوە. هاتنەوەکەشی بۆ ناوبازنەی ژیانی سیاسی پێواژۆیەکی پلەدارییانە بوو.

ئەوەندە هۆ هەبوون کە سدیبۆکر بەجێبێڵی هەروەک چۆن پێش چواردە مانگ هەمان هۆ بۆ بەجێهێڵانی ئۆرشەلیم و تەلئەبیب لەگۆڕێدابوون.

ژیانی بیابان بۆ جەستەی ئەو و خێزانەکەی قوڕس بوو. جارێکیان لەپڕ ژانێکی تیژ دایگرت و بەپەلە پاولای خێزانی بەرادیۆ داوای ئۆتۆمبێلی فریادڕەسی کرد، کاتێکیش ئەمبیولانسەکە گەیشت، ژانەکەی شکابوو، لەگەڵیان نەچوو. بەڵام زۆرجاران ژانی پشتێشەی هەبووو، پاولاش لەبەر دەردی باداریبدا دەیناڵاند؛ بۆیان ئەستەم بوو لەوێ بەردوام بن چونکە ئەوان نەیاندەویست لێیپاڵدەنەوە و بێئیش بوەستن.

لە سدیبۆکردا زۆر کاتی خوێندنەوەی بەدەستەوە نەبوو وەک ئەوەی چاوەڕوان دەکرا. سەرباری ئیشە فەرمییەکەی لە تەلئەبیب و ئۆرشەلیمدا کاتی زۆرتری بۆ خوێندنەوەی کتێبەکانی هەبوو. سەرەڕای ئەوەش مەبەستەکەی لەچوونە بیابان کەلە بنەڕەتدا هێمایەک بوو، پێکای. سەرنج و ئاگاهی زۆری بۆ لای نەقەب راکێشا، ئەو دەرفەتەی هەبوو بێتەوە سەرخۆی و ساڵێک بێ تەنگەتاوکردنی کاروبارەکانی حکومەت لەبیاباندا بەسەرببا.

هەڵبەت نەیدەویست پەیوەندییەکانی لەگەڵ سدیبۆکردا بپچڕێنێ. لەگەڵ دەستەی بەڕێوبەرایەتی ئەوێ وا رێککەوت کە کۆڵیتە رەنگزەردەکەی هەر بمێنێتەوە. زۆر

له کتێبەکانی لەوێ بەجێهێشتن و بەخۆی و پاولاش بەڵێنیان دا کە زۆر جاران بۆی بگەڕێنەوە.
بۆ بەرزراگرتنی ئەو چواردە مانگانەی لەوێ بەسەریبردن دوو وشتری پێشکەش بە جڤاکەکەی ئەوێی کردن تا بۆ شوانییێتی پەزەکانیان سودییان لێوەربگرن.
لە یەکێک لە دوانە یەکەمەکانی دوای گەڕانەوەیدا ئاشکرای کرد کەوا لە بیاباندا هیچ راستیەکی دیکەی نەدۆزیوەتەوە، بەڵام هەمو شتەکانی تیژتر دەبینین.
«لێمگەڕێن با پوختەیەکتان دەربارەی ئەوەی لەوێ بینیم، بۆتان باسبکەم: لە شارەکاندا خەڵکیکی زۆر بەچڕی لەتەک یەکدا دەژین؛ ناوچە سەرسنوریەکان وەک پێویست نشینگەنشین نەکراون.»
«لە شاردا زۆر هەوڵ بۆ خۆشگوزەرانی و دەوڵەمەندی دەدرێ؛ کێماسیان لە کاری بەرهەمدار و دەستپێشکەرییدا هەیە.
«شەڕو دەمەقاڵێ زۆر دەکرێ؛ هەستی بەرپرسیارێتی کەمە و گیانی هاوکاری و زبارەییش(هەرەوەزییانە) کەمتر.
«زۆر قسەی بێناوەڕۆک دەربارەی هاوڕێیایەتی و یەکێتی جولەکایەتی دەکرێ؛ یارمەتی پێویستی کۆچبەرە نوێکان نادرێ.،
«زۆر بازرگانی و خزمەتکاری گرێگرتەی ماڵان هەن؛ کەمتر کاری بەرهەمهێنن.
«داوای گەورە لەحکومەت و داوای بچوک لە خەڵک خۆی دەکرێ.
«زۆر پێ لەسەر زێدەمافدا دادەگیرێ، کەمتر مکوڕن لەسەر بەدیهێنانی بەڵێنەکان.»
هەنوکە دەوڵەتەکە تەمەنی بۆتە شەش ساڵان، سەرهێڵی نوێی بۆ گەلەکەی رونکردنەوە:
«پێوەرەکان دەبێ فێری ئەوەمان بکەن کە چۆن بەرپرسیارێتی هەڵبگرین. ئێمە دەبێ فێربین لێهاتوانە کاربکەین. دەبێ ئاستی پێوانەیی ژیانی خۆمان بەتەکانی پەرەسەندنەوە بەرەوپێشەوە بەرین زیاتر پاڵ بە کۆمەکی دەرەوە نەدەینەوە. ئێمە دەبێ بەبێ بەرامبەر گەنجەکانمان پەروەردە بکەین، نەوەک هەر بۆ قوتابخانە سەرەتاییەکان بەڵکو ناوەندی و بەرزتریش.
«ئێمە دەبێ مەڵبەندی لێکۆڵینەوەی زانستی دابمەزرێنین و باشترین زانایانی جولەکەی بۆ رابکێشین.
«ئێمە دەبێ ئاو بگەیەنینە بیابان. دەبێ سود لەهەمو دڵۆپە باراناوێک وەربگرین و کۆی بکەینەوە. دەبێ چۆلستانی بیابان بە بەهەشتی عەدەن بگۆڕین. دەبێ کۆڵیت و خانوە کۆنەکانمان بروخێنین، هەمو هاوڵاتییەک بە ئاستێکی شایستە موچە، نیشتاک و متمانەی ئابورییانەی تا لەژیاندا ماوە پێببەخشین.
«ئێمە دەبێ لێرەدا نمونەیەکی شەرمەشقی جیهان بین و راستیی گەلی بژاردە بەرجەستە بکەین، دەبێ خەونی پێغەمبەرە دێرینەکانمان بەدیبێنین..»
لەنێو میوانە زۆرەکانی ئەو هاوینەدا خانم فرانکلین دێلانۆ رۆزەڤێلت Franklin Delano Rooseveelt بوو. بنگۆریۆن لە خانوەکەی کێرن کیامەتدا پێشوازیلێکرد.

جدییانە لەسەر سیاسەتی جیهان و پرسگەلی ڕۆژهەڵاتی ناویندا دوان. لەگەڵ یەکدا باش هەڵیاندەکرد. خانم ڕۆزەڤێلت دواتر لە وتارەکانیدا بە «پیاوە نایابەکە کە من پێوەی کارانگاز بووم» ناوییرد و بنگۆریۆنیش بەشەوقەوە دەربارەی خانمەکە قسەیکردن.

بنگۆریۆن دەربارەی سدیبۆکر قسەی بۆکرد، کە چواردە مانگان لەوێی بەسەربردووە، ئەو ماوەیەشی بەختیارتین قۆناخی ژیانی بووە.

خانم ڕۆزەڤیلت تێبینی ئەوەی دا کە : «هاوسەرەکەم پێیوایە بەردە ڕوتەنەکانی هەندێ شوێنی ئیسرائیل هاندەری کشتیاریی نین.»

بنگۆریۆن بە خەندەوە وەڵامی دایەوە:

«ئەوە ڕاستە کە یەزدان هەمو بەردەکانی بە گڵ دانەپۆشیون، وەلێ هەر لەبەر ئەوە وایکردووە کە ئەوەندەی بەئێمە بەخشیوە بیخەینەگەڕ.»

خانم ڕۆزڤێلت ئەو سەرنجەی بە هێمای پیاوێک دانا کە زۆر لەبن ڕاژەی بیرۆکە نمونەییەکانی خۆیدابێ.

لە ماوەی هاوینەکەدا بنگۆریۆن، پاولا و ئارگۆڤ بە ئۆتۆمۆبیل یەک دوو ڕۆژ چونە سەر گۆلی تەبەریاس. کاتێکیش خەریک بوون بە بناری شاخی تابور ڕەت دەبوون، وەزیری بەرگری گوتی:

«نەحێمیا هەنوکە ئێمە ڕۆژێک دەمێنینەوە دەبێ مشوری پەیداکردنی ئەسپێکم بۆ بخۆی، تاکو بەسوارییەوە بچمە سەر چیاکە.»

پاولا دەردەست ناڕازی بوو.

لەوێ ڕێگایەیەکی باشی ئۆتۆمۆبیل هەبوو. لەوەش بترازێ تەمەنی ئەو هی ئەسپسواری نەبوو.

بنگۆریۆن لەوەڵامدا گوتی: «وانیە پاولا، من بەر لە چل ساڵ بەسەر ئەو شاخەدا بەسواری ئەسپ چوومەتە ئۆرشەلیم، دەزانی ئەو ماوەیە چەند دورە.»

پاولا خێرا بەرسڤی دایەوە: «بەڵێ، بەڵام چل ساڵ لەمەوبەر، ئەو کات تۆ هێشتا لاوێکی بیست و هەشت ساڵان بووی. ئەمەت لەبیرنەچێ هەنوکە بوویتە شەست و هەشت!»

مێردەکەی هۆشدارینامەکەی خێزانەکەی فەرامۆشکرد و فەرمانی بە ئارگۆڤدا دا کە ئەسپێکی بۆ پەیدا بکا.

پاولا بەسەرزەنشتکردنەوە: «خۆ ناوێری وابکەی!»

ئارگۆڤ بڕیاریدا ڕۆژێک لێی بێدەنگ بێ بەڵکو گەورەکەی لەبیری چوبێتەوە. بەڵام دوای دوو ڕۆژ بنگۆریۆن لێیپرسی: «ئەرێ مشوری ئەسپەکەت خوارد؟»

ئیدی ئارگۆڤ نەیدەتوانی لەبن باری ئەرکەکەدا دەربچێ، بەڵام بڕیاریدا نەرمترین ئەسپی ئیسرائیلی بۆ پەیدا بکا.

لەڕۆژی دیارکراودا بنگۆریۆن، پاولا و یاریدەدەرەکەیان بە سواری ئۆتۆمۆبیل چوونە دامێنی شاخەکە. لەوێ هەندێ پۆلیس چاوەڕێیان بوون کە ئارگۆڤ لەپێشدا قسەی لەگەڵدا کردبوون. پاولا هێشتا هەر هەوڵی دەدا مێردەکەی لە سەرچڵیەکەدا

پەژیوان بکاتەوە.
پۆلیسێک ریشمەی ئەسپێکی گرتبوو بۆلای ئەوانی راکێشا.
«نەخێر ئەمەیان نا، من سواری ئەو قاترە پیرە نابم.»
سەیرێکی ئەسپەکانی دیکەی کرد، ئەو ئەسپەی لێهەڵبژارد کە لەوانی دیکە هاروهاجتر دیاربوو.
بەئاسانی خۆی هەڵدایە سەر زینو لغاوی گرت و رکێفی لێدا و بۆ سەرشاخ لێیخوڕی. وەک ئارگۆڤیش باسیکرد: «پیرەمێرد کەوتە داوەکە. دەبوایە بەیارمەتی پۆلیس فێڵێکی لێبکەم و داوی بۆ دابنێمەوە. ئەو ئەسپەی لێیهەڵبژارد ئێمە دامانابوو، نەرمترین ئەسپ بوو. بەڵام بێئەوەی بنگۆریۆن هەست بە پیلانەکە بکا، ئەودەم ئەسپەکەمان هەندێ شەموس کردبوو تا بنگۆریۆن هەروا بزانێ ئەسپێکی بەهەڵمەتە و دەستنیشانی بکا، هەرواشیکرد.»
لە تەموزدا لەلایەن نۆزدە پارتەوە هەڵمەتی هەڵبژاردن بۆ سێهەمین وادەی کەنیستدا بەڕێوەچوو. پارتە نەیارەکان سەبارەت بە بەرزبوونەوەی نرخی رۆژانەی کەلوپەلە پێداویستییەکانی ژیان رەخنەیان لێگرت. سێ نارنجۆکیش فڕێدرانە بارەگای پارتی گشتی زایۆنیستی.
دەرەنجامی هەڵبژاردنەکە هەموانی سەرسامکرد. ماپای لە چل و پێنج کورسیەوە دابەزیە سەر چل، پارێزگارە زایۆنیزمە گشتییەکان لەو بیست کورسییەی هەیانبوو توانیان پارێزگاری تەنها لە سێزدە کورسی بکەن. هیروتی مناحێم بێگن نزیکەی دوو ئەوەندە زیادیکرد و لەدوای ماپای بووە بە پانزە کورسییەوە بووە گەورەترین پارتی وڵات. کۆمۆنیستەکانیش لەبراوەکان بوو شەش کورسیان بەدەستهێنا. سەرجەم نۆ پارتی بەرەو پێشەوە چوون.
سەرۆک بن‌زیڤی داوای لە دۆستە کۆنەکەی خۆی بنگۆریۆن کردەوە کە حکومەت پێکبهێنی، بەڵام بنگۆریۆن رایگەیاند کەوا پەلەی نیە. جارێ بەشێوەیەکی کاتی شارێتی سەرەک وەزیران کاروبارەکان رایدەکا.
لە پایزدا بنگۆریۆن بە هۆی نەخۆشیەکی نائاساییەوە لەجێگادا کەوت. ئەو بە گوێیەک گوێبیستی دەنگی نامۆ دەبوو، سەریدەسوڕا. ئەو بەندوباوەی گوایە توشی سوکە خەڵەفانێک هاتووە، ناڕاست بوو. لەڕاستیدا کەمێک توشی نەخۆشی مێنیری Meniere بووە کەدەرچەی هەوکردنی گوێی ناوەڕاستە، مرۆ هێشتا هۆیەکەی نازانێ چارەسەری پێویستیشی بۆنەدۆزراوەتەوە. بەشەو رۆژ لە میوانخانەیەکی ئۆرشەلیم لەناوجێگا کەوتبوو، زۆرجاران پێیوابوو وکە دیوارو بنمیچەکەی لەپێشچاواندا سوڕدەدا.
لەدوا هەفتەکانی سێپتێمبەردا لەپڕ زانرا کەوا چیکۆسلۆڤاکیا چەکی فرۆشتۆتە میسر. ئابا ئیبانی نێردەی ئیسرائیل بروسکەیەکی بۆ تەلئەبیب لێدا، تیایدا گوتبووی کە مانەوەی ئیسرائیل بە «ئاستێکی بەرز» لەمەترسیدایە. هەرزو کۆبوونەوە بەپەلەکانی کابینەی حکومەت دەستپێکرانەوە.
جارێکی دیکە بەرگریکردن لەوڵات خەمی سەرەکی حکومەت بوو؛ وەزیری بەگری

گرنگترین بیچمی کابینەکە بوو. ئەرکی چەککڕینی بۆ پەیدابوو.

«هەوڵەکانمان لەگەڵ ئامریکا، ئینگلستان، فەرەنسا و ئیتالیادا بێبەربوون. هەرچەندە زۆر لەو بڕوایەدان کە کات دژی ئێمە وەرگەڕاوە، لەگەڵ ئەوەشدا هێشتا هەر بێهیوا نەبووین.»

لە چوارشەممەیەکی ساردی نۆڤێمبەردا بنگۆریۆن یەکەمین دوانی لەکەنیست وەک سەرۆکی حکومەتی نوێ دا. هێشتا بەتەواوی لە دەردەکەی چاک نە بووبووەوە و ماندویی پێوەدیاربوو.

بۆ ئەوەی رای زۆرینەی پەرلەمان بۆخۆی کێشبکا دوو پۆستی وەزیریی دایە ماپامی چەپخواز، دووی دیکەشی دایە گروپی ئاخودت اڤۆدا Achdut Avoda کەلە ماپام جیاببوونەوە، دوو کورسی دیکەش بۆ گروپە ئۆلدارەکان و یەکێکیشیان بۆ توندڕەوەکان. ئەنجا هیچی تیا نەهێشتەوەو گوتی:

«ئەوە ئەرکی منە کە هەمو زلهێزەکانی دنیا- هەمویان بێریزپەڕ – بەڵام بەشێوەیەکی خاکیانە کەلەگەڵ نوێنەرایەتی نەتەوەیەکی بچوک دەگونجێ، بەڵام بەهەمو رەوشت و ورەیەک کەهێزی بڕواپێبەخشانە دەداتە ئەوانەی لەسەر مافن؛ لەوە بەئاگابێنمەوە گەلی ئیسرائیل وەک بەرخێکی قوربانی نەبردرێتە سەر تەختەی ملپەڕاندن.»

«ئامادەم لەگەڵ سەرەک وەزیرانی میسر و هەمو دەسەڵاتدارنی عەرەب بەپەلە راوێژ بکەم بێئەوەی هیچ پێشمەرجێکیشمان هەبێ، تا بەهەمومان بۆ رێکەوتنێکی ئاشتیانە تێبکۆشین.»

لەو شەوەدا بەفەرمانی بنگۆریۆن هەزار سەرباز بە ئۆتۆمبێلی بار دەرچوون تا ئەرکێکی سەربازییانەی گرنگ رابپەڕێنن.

شەست و چوار کیلۆمەتر لە باشوری بیئر سەبعە لەسەر سنوری نەقەب و سینادا، ئەلئەوجا ElAuja ناوچەیەکی چەکداماڵدراو بوو کەبەهۆی کۆمسیۆنی ئاگربری نەتەوە یەکگرتووەکان دانرابوو. چەندان هەفتە بوون بەبێ هودە کۆمسیاری رێکخراوی نەتەوە یەکگرتوەکان داوای لە میسر کردبوو چالاکی سەربازییانە لەوێ نەنوێنن. شەوەکە سەربازەکانی ئیسرائیل رویی خۆیان تەنییاوی کرد، چونکە مانگ روناک دەدرەوشایەوە، پەلاماری سەنگەرەکان و تۆپخانەی میسریان لەوێدا دا. دوای شەرێکی یەک کاژێری میسریەکان شکان و راونران. هێزەکە گەڕایەوە پێنج لاشەی کوژراوی خۆیان و چەند بریندارێکیان هێنایەوە لەگەڵ نزیکەی پەنجا دیل.

بۆ ئەوەی بسەلمێنن کە میسرییەکان لەو شوێنە بێچەکەدا چالاکی سەربازییانەیان ئەنجامداوە، چەند هاوەنی میسری، شەشتیر، دۆشکەی دژە ئاسمانی و گولەیان هێنان کە لە سوئێد، سپانیا و بەلژیک کڕدرابوون.

ساڵەکە بە کردەیەکی دیکەی سەربازییانەش لە دیوەکەی دیکەی وڵات کۆتاییهات.

گۆلی تیبیریاس لە رێکەوتنی ئاگبەستەکە بەتەواوی کەوتبوە دەست ئیسرائیلییەکان، بەڵام ساڵانێکی دورودرێژ بوو سورییەکان تەقەیان لەو ئیسرائیلییانە دەکرد کە لەسەر

گۆلەکە بەدیدەکران. زۆریان لێکوشتبنوون. پەلامەرەکەشیان لە شەوی ١١لەسەر ١٢ی دیسێمبەردا وەک دژەکاردانەوە دەستپێکرد. سەربازەکانی ئیسڕائیلیی بە بیست و نۆ دیلی سوریی، دوو تۆپ گەڕابوونەوە. پەنجا و پێنج سەربازییان لە سورییەکان کوشتبوون و خۆشیان شەش وقوربانیان دابوو.

پەلامارە کتوپریەکە بیرۆکەی بنگۆریۆن بوو، هەمو ئۆباڵی کردەوە سەربازییەکانی لەئەستۆی خۆی گرت. لەو ساتەدا ئەو نەوەک هەر سەرەک وەزیران و وەزیری بەرگری بوو بەڵکو هەگبەی وەزراەتی دەرەوەشی پێسپێردراوبوو چونکە شارێتی وەزیر بە گەشتێک لە هەندەران بوو.

ئەو یەک دوو پێشهاتانە لەدەرەوەی وڵاتدا بەقەد هەر حەفت ساڵ و نیوەکەی دامەزرانی ئیسڕائیل هەستیار و بە مقۆمقۆبوون. لەو بارەیەوە لە رێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان بڕیاڕ دەرچـوون، ئیسڕائیل کەوتە بەرگەڤی دژەرێکاری، داوای ئابڵوقەدانان بەسەر ئیسڕائیلدا کراو تەنانەت گوتراش کەوا دەبێ دەوڵەتی ئیسڕائیل لە نەتەوە یەکگرتووەکان دەربکرێ.

شارێت کە هەمیشە بەرامبەر رای گشتی جیهانیی هەستیار بوو، بەشڵەژاوی گەڕایەوە. بنگۆریۆن بێ دودڵی وەڵامی رەخنەکانی ناوخۆ و دەرەوەی دانەوە.

گەر کەس ئامادە نەبێ سنورەکانی ئیسڕائیل بپارێزی، گەر هیچ قانونێک لە گۆڕێدا نەبێ ئەو کەسانە سزابدا کە ماسیگرە ئیسڕائیلییەکان دەکوژن، کەواتە دەوڵەت ناچارە پەنابباتە بەر پەلامار و هەڵمەتەکانی ئەلئاوجا، گەر وانەبێ ئەوا دوژمنەکانی ئیسڕائیل لە هەرچوارلاوە هەروەک ساڵی ١٩٤٨ بەرەڕومان دەکشێن.

لە جیهانێک کە زەبـروزەنـگ هێشتا بــەردەوام رێـز بسەپێنی لـەوەی راوێژی هۆشمەندانە دەیکا، ئەوا کەس لە ئیسڕائیل چاوەڕوان ناکا لە پیادەکردنی سیاسەتێکی پاسیڤیستانە یەکەم بێ؛ لەسۆنگەی ئەوەش پێگەی ئیسرائیل کە پشتی زێیە، شڵۆقە.

# بەشی
# (٢٥)

بۆ ئەوانەی بەتاسەوە لە پێشهاتە سیاسییە جیهانییەکانیان دەڕوانــی، مانگە بەراییەکانی ١٩٥٦ ئاشکراودیار بوون کە ڕۆژهەڵاتی ناوین توشی هەڕەشەیەکی گەورەی تەنگژە دەبێتەوە. لەسەرەتادا بنگۆریۆنیش لای ڕۆشن نەبوو ئاخۆ ڕوداوەکان چۆن تەشەنەدەکەن. بەڵام ئەوەی لوتی بۆ ئەو کەشوهەوایە هەستیار بووایە، هۆشی بەوەدا دەهات کە تادێ گرژی، ئاڵۆزی و چالاکییە کورتهێنەکان لەبرەودان.

سەرچاوەی ئەو هەمو ئاستەنگیانە بەردەوام بەلێشاو ناردنی چەک لە لایەن وڵاتە کۆمۆنیستییەکان بۆ وڵاتی میسر بوو. چەکەکان لەڕێی ئاسمانەوە ئیسرائیلییان ڕەت دەدا و لە قاهیرە دادەبەزێنران. لەڕێگای بەندەری ئەلێکساندەریەشدا کەشتیەکان بە نزیک کەنارەکانی ئیسرائیلدا ڕەتدەبوون.

میسر لە ئینگلستان سێنترریۆن Centurionی (جۆرە تانکێکی قورسی بەریتانی دوایی جەنگی جیهانیی دوهەمە، لەباشترین تانکی بەریتانی بوو لەشەڕی کۆریاشدا کارامەیی خۆیسەلماند-وەرگێڕ)، ئارچەر Archer (چەکی دژە تانکی نوێ)، فڕۆکەی ڤامپایەر vampire و میتێیۆر Meteor ی ڕاوەدونان، بۆمبهاویژی قورس، فڕۆکەی تۆرپیدۆ و تەنانەت کەلوپەلی بۆ لیدروستکردنی فڕۆکەی کڕین.

هەروەها میسر لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئامریکاش دوو Fergat فەرقاتە(کەشتییەکی جەنگیە، درێژیەکەی لەنێوان ١٠٠-١٥٠ مەتر دەبێ و ١٥٠ تا٣٠٠ سەرباز دەگرێ و بۆ ئەرکی پاراستنی دەریا و شەڕی غەواسەکانی ژێر ئاو بەکاردەهات –وەرگێڕ)، شەش سەد ماشێن و ئۆتۆمبێلی سەربازیی و کەلوپەلی جەنگی زیاتریشی کڕی. ئیتالیاش ٣٠ فڕۆکەکەی ڕاوەدونەری بۆناردن.

وڵاتە عەرەبییەکانی دیکەش نزیکەی دوو ئەوەندە چەک و تفاقیان بەدەستهێنا.

بەڵام هەنوکە چیکۆسلۆڤاکیا دەیـان تانکی ستالینی قورس، فڕۆکەی تۆرپیدۆ، مینهەڵکەنە، دۆشـکـا(S.P)، فڕۆکـەی بۆبهاوێژ، ماشێنی گواستنەوە، دژەتانک، ئۆتۆمبێکی بارهەڵگری پێنج تۆن، ماشینی شوێنپێهەڵگر، ئامێرەکانی ڕادار، نوێترین مینی ئۆتۆماتیک، هەمو چەکێک بەدەر لە بۆمبی ئەتۆمی دایە جەمال عەبدولناسر.

لەو نێوەدا ئیسرائیل هیچی دەستنەکەوت، تەنانەت هیچ کەلوپەلێکی جەنگیش.

بنگۆریۆن کێشەکانی ئەودەمی بەو شێوەیەی خوارەوە وێناکرد:

«چەک ئەو شتە نیە مرۆ بچێتە لای بەرهەمهێن و بازرگان تا بەئارەزوی خۆی

لێیان بگرێ و بیانکڕێ. پارە و ڕەسید بەتەنها بۆ چەککڕین بەس نین. ئێمە لەزۆر دەرکەمان داوە، بەڵام لەسەرمان داخران. حکومەتی بەریتانیا کە تانکی قورسی بە دیکتاتۆر دەفرۆشێ، دەشزانێ کە دژی ئیسرائیل بەکاردەهێنرێ، بەتوندی ڕەتی کردەوە کە بەئێمەشی بفرۆشێ... وڵاتە یەکگرتووەکانی ئامریکا کە ئێمە هەر لەسەرەتای دامەزراندنی دەوڵەتەکەمانەوە قەزرباری سوپاسکردنین بۆ هەمو ئەو پشتگیرییە سیاسی و داراییانەی، بەقسە، هاوپەیمانەکانیان هان دەدەن کە چەکمان پێبفرۆشن بێئەوەوی خۆیان وابکەن؛ بەڵام بەقسە هاندانیان دەردی ئێمە تیمار ناکا.»

ژمارەی ڕوداوە سەرسنورییەکان تادەهات زیاتر دەبوون. هەمو دەوڵەتە عەرەبییە دراوسێکان بەشەو فیدائیان Fedayeen بە سنورەکان دەناردنە قوڵایی ئیسرائیل تا پیاو، ژن و منداڵانی جولەکە بە بۆمبەکانیان، نارنجۆکەکانیان و تفەنگەکانیان کەچوکرۆم بکەن.

ئێریک جۆنستۆن Eric Johnston ناوبژیکاری ئامریکایی نەخشەیەکی دابەشکردنی ئاوی ئوردنی دانا و واشنتۆنیش لەسەر ئەوە مکوڕ بوو کە هەردوو لا پێوە پانەبدبن و ریزی پێشنیازەکە بگرن، کەچی موفتی ئەوکاتی ئۆرشەلیم ڕایگەیاند:

«گەر هاتو پلانەکەی جۆنستۆن بە ڕێژەی ٩٩٪ ئاوی ئوردن بداتە عەرەبان، ئیسرائیلیش هەر کەمێکی بەرکەوێ، ئەوسا پێیان دەڵێم نەخێر.»

لە ینایەردا بنگۆریۆن کەوتە بە ڕەخنەی هەندێ گروپ سەبارەت بە دژەکردەوەکانی سوریا. بەگوێرەی گروپە ڕەخنەگرەکان بنگۆریۆن کردەوەکەی فراوان نەکرد و شەڕی پاریزگاری دژیان ڕانەگەیاند.

بنگۆریۆنیش داکۆکی لە هەڵوێستەکەی خۆی بەو وشانەی خوارەوە کرد:

«ئێمە بڕوامان بەوە هەیە کە پاراستنی ئاشتی پێشنۆرەیە لەوەی سەرکەوتنێکی سەربازییانە بەدەستبێنین. شەڕ تەنها ئەو کاتە ڕەوایە کە تەواو قسە لەسەر داکۆکی لەخۆکردن بێ. ئەوە مایەی پەژراندن نیە شەڕ بۆ سەقامگیر کردنی ئاشتی و کۆتاییهێنان بە ڕژێمێکی چەوت هەڵبگیرسێ.»

لەو ڕۆژگارەدا هەرچەندە ئەو جۆرە سیاسەتە زۆر بەرزیش بوبێ، بەڵام لە ئیسرائیلدا جەماوەری نەبوو. سەرکردەی پارتی زایۆنیزمی گشتی یەکێک بوو لەزۆر ئەوانەی بەئاشکرا دەهۆڵی شەڕهەڵگیرسانیان دەکوتا.

لە فێبرایردا ئێدوارد موراو Edward R.Murrow لەگەڵ ستافیکی قەبەی تەکنیکارانی تەلەفزیۆن لەگەڵ بنگۆریۆندا گەیشتنە سدیبۆکر تاکو چاوپێکەوتنێک بکەن، ئەوەش بەشێک بوو لەزنجیرە بەرنامەیەک لەسەر ئیسرائیل کەلە مارتدا لە تەلەفزیۆنی CBSی ئامریکایەوە پەخشدەکرا. بەشەکەی دیکەی بەرنامەکە لە میسر لەلایەن هاوارد سمیت Howard K.Smith تۆماردەکرا.

کاتێک میشێل ئارنۆن Michael Arnon سەرۆکی دیوانی سەرەک وەزیران پرسی ئاخۆ چ بابەتگەلێک لەگەڵ موراو دەهێنێتە زمان، بنگۆریۆن پێیگوت:» پرسەکانی ئەو سادەن، خەڵکی دیکەش دەکارێ بەرسڤیان بداتەوە. ئەرێ باشە بۆ خۆت وەڵامیان نادەیتەوە؟ لەبەرامبەریشدا پارەت دەدرێتێ.»

بەڵام لەدوایيدا هەر خۆی لەگەڵیاندا ڕۆیشت و وەڵامی دانەوە.
لە کاتی دیدارەکەدا هەردوکیان لە هەیوانەکە لەتەنیشت یەکدیدا دانیشتبوون. لەدەستپێکدا سەرەک وەزیران هەندێ ڕەق بوو، بەڵام لەگەڵ ڕەوتی دیدارەکە و درێژەکێشانی تۆنی دەنگی گەرمتر دەبوو، لە دوایيشدا دەستی دایە بەرخۆی و لە سەرکورسیەکە پاڵیدایەوە و تا وشەکانی بەهێزتر دەرببڕێ، ئەوەش بووە مایەی زەحمەتی بۆ تیمە تەکنیکییەکە.
هەرچەندە بنگۆریۆن چل وحەفت خولەک بێ خۆئامادەکردن قسەی بە زمانێک کرد کە هی خۆی نەبوو، زۆر جارانیش شاشیە رێزمانییەکانی ڕاستەدەکردنەوە یەک دوو هەڵەی تاک و کۆی لەروی زمانەوە هەر کردن.
جارێکیان لەپڕ پەندێکی عەرەبی بۆ نەهات، بەڵام بیریلێکردەوە واتاکەی بۆ خەڵکەکەی وەرگێڕا. کاتێکیش وشەی کیبوتیزمی بەکارهێنا، ئەوەی شیکردەوە کە چۆن بە زمانی عیبری داڕێژراوە.
مراو دەستی بە پرسەکانی کرد:
«تۆ لە ١٩٠٩ەوە گەیشتیە ئێرە-»
سەرەک وەزیران قسەی پێبڕی: «نەخێر ئەزلە ١٩٠٦ەوە هاتووم.»
دیدارێکی خۆش و دۆستانە و گەرم بوو. یەکجار نیگای بنگۆریۆن کەوتەسەر پاولا ئەوسا لە میکرۆفەنەکەدا گوتی: ئەوە بۆ یەکەمین جارە لەو دەڤەرەدا ژن لەگەڵ پیاودا یەکسان بێ، لە کێماسی و ئاسودەیی کارەکانیشدا هاوپشک بێ.»
موراو پرسی: «ئایا لەو هەمو ساڵانەتدا ساتێکت هاتوتە بەردەم تیایدا بڵێی بەسیەتی، ئیدی بوەستی؟»
بنگۆریۆن پرسەکەی بەتۆنێکی سەرسوڕهێنەر دوبارەکردەوە، وەک ئەوەی بەگومان بێ لە بیستنی. ئەوسا پێکەنی و گوتی:
«ئۆو، نەخێر. نەخێر. هەگیز. هەرگیز.»
دواترجارێکی دیکە پێکەنیەوە.
دەربارەی زایۆنیزمیش گوتی:
«زایۆنیزمی ڕاستەقینە واتای ئەوە دەدا کەمرۆ خۆی ژینگەی خۆی بەهۆی کەسایەتی، جەستەی و جۆشە گیانیەکەی ئافەریدەبکا. ئەوەش شتێک نیە بکرِدرێ، یان لەوەی کە لە مێژە هەیە دەستت بکەوێ. دەبێ مرۆڤ خۆی دروستیبکا.»
بەردەوامیش کە باس دەهاتە سەر بیابان، بەنەرمی دەدوا وەک ئەوەی رێزنامەی دەرببڕێ.
ئەو دەربارەی گەنجێکی سەردەمی خۆی، نوسەرێکی بەتوانا و سابراییەک قسەی بۆکرد. کاتێک بۆ یەکەمین جاری گەشتێکی بە ئاورِوپادا کرد، یاوەریبوو، بنگۆریۆن لەگەڕانەوەیدا پرسێکی لێکرد ئاخۆ بەچی سەرنجگیر بووە. لاوەکە بەرسڤی دایەوە:
«لە ئاورِوپادا هەمو شتێک کراوە. هەمو شتێک تەواو بووە. کاری دەستی زۆر کەمە و هەر لەبەین نەماوە. لە کەرتی کشتوکاڵیدا هەمو شتێک بەدەستهاتووە. لە

پیشەسازیشدا هەمو شتێک ئەنجامدراوە. هـەروەک لە وێژەشدا بەهەمان شێوە. شارستانییەتیش تەوو مشت بووە. ئەرێ خەڵک لەوێ چۆن دەتوانێ بژی؟»

بنگۆریۆن لەسەری ڕۆیشت:

«لێرە هەمو شتێک دەبێ لەسەرەتاوە دەستپێبکەینەوە. لێرە پێویستە بەخۆمان زەوی بکێڵین و بچێنین، چونکە پەروەردگاری مەزن تەنها بیابانی ئافراندووە و دەبێ ئێمە ئاوەدانی بکەینەوە .»

موراو پرسی: «من لەو بڕوایەدام تۆ لەدڵەوە کەسێکی دەستپێک بی، وانیە؟»

بنگۆریۆن دوودڵ بو.

«من ئەوە نازانم، بەڵام دڵم  بە بیابانەوە گیرساوە.»

یاریدەرێکی بنگۆریۆن لەگەڵ هاوکارێکی گرۆی لەسەر ئەوەکرد کە بنگۆریۆن زۆر نابا بەشێوەیەک لەشێوەکان ناوی بودا دێنێتە ناو ناوانەوە و باسی لێوەدەکا. لەسەروبەندی کۆتایی چاوپێکەوتنەکەدا لەوەڵامی پرسێک سەبارەت بە ڕەفتاری نێوان ئیسرائیل وئاسیا کە ڕۆژهەلاّت داکۆکیکاری گەورەی لەسەر ڕەوشت لێهەڵکەوتوون، گوتی: «بودا نمونەیەکە. دوو هەزار و پێنجسەد ساڵە ئەو لەدایک بووە. وتەکانی کاریگەری بەسەر ملیۆنان کەسدا هەبووە. من لێرەدا بیر لەڕۆژهەلاّتییەک دەکەمەوە کە دیتومە، ئەویش ئونوی سەرەک وەزیرانی بیرما بوو. من ئەو بە بیچمێکی پڕمتمانەی ڕۆژگاری ئێستاماندا دادەنێم. بەڕاستی شاگردێکی بودایە.»

پاشان موراو گوتی: «من بیستومە کە بەڕێزتان هەمو کات لەگەڵ سەرانی عەڕەب ئامادەی گفتوگۆکردنن.»

«بەڵی بەدڵنیاییەوە، هەر کاتێک ئەوان بیانەوێ.»

سەرەک وەزیران بەدەستی جێی پاڵدانەوەکەی خۆشدەکرد تا هەندێ وشە لەکاتی گۆکردندا باشتر بگیرسێنێ:

«وڵاتە عەڕەبییەکان پێویستیان نە بە شەڕ نەبە تانک تۆپ نیە، بەڵکو پێویستیان بە خوێندن، پاکوخاوێنی و پێشکەوتن هەیە. ئێمە لەمەیاندا دەتوانین یارمەتیان بدەین. ئەوان پێویستیان بە ئاشتی هەیە تا وڵاتەکەیان پێشبخەن، تا خەڵکی خۆیان  پەروەردە بکەن و نەخۆشی قەڵاچۆبکەن...

«هەرکاتێک ئەوان نوێنەری ڕاستەقینەی گەلیان هەبوو، ئەوانەی کە خۆشگوزەرانی کۆمەڵانی خەڵکیان لەپێشترین خاڵی مشور خواردنە، ئەوسا لێتێدەگەن کەوا باشترە ئاشتی لەگەڵ یەکدیدا بکەین... بەیەکەوە لەگەڵ ئیسرائیلدا کار بکەین... تا ئەو کاتەش دادێ پێویستە ئێمە خۆمان ئامادەبکەین وەک ئەوەی بەسەرمان دابدەن.»

مـوارو سوپاسی کرد و دەستە تەکنیکییەکەش خەریک بـوون ئامێرەکانیان هەڵبگرنەوە بەڵام بنگۆریۆنیش هێشتا سوپاسنامەکەی مابوو، بڵێ:

«بەڕاستی لە دلۆڤانیتان بوو کە هاتنە ئێرە. بەداخەوە ئێوە نەتانتوانی سێهەزار و سێسەد ساڵ بەر لەئێستا بێنە ئێرە، چونکە ئەوکات دەکرا موسا ببینن، لێرەوە زۆر دور نەبو کاتێ لەسەر کێوی سینا(تور) دە ڕێنماییەکەی لە پەروردگای مەزن وەرگرتن. ئای کەچ بەرنامەیەکی تەفزیۆنی دەبوو بۆ مرۆڤایەتی!»

کاتێک ئەوان خەریکی هەڵگرتن و تێکنانی ئامێرەکانیان بوون، موراو ویستی خواحافیزی لە سەرەک وەزیران بکا، کە یەکسەر دوای دیدارەکە گەڕایەوە خانوەکەی. موراو دوو جاران لەسەر یەک لەدەرکەی دا، کاتێ گوێی لەهیچ نەبوو، بە هێواشی پاڵێکی بەدەرکەوە ناو کردیەوە.

دواتر گوتی: «دەبوایە یەکسەر بانگی کامیرامانەکە بکەم. بەڵام ئەوکات تێگەیشتم کە رەنگبێ بینەرە ئامریکاییەکان واتێبگەن کەوا ئێمە نمایشێکی شانۆگەریمان سازداوە.»

موراو بینی کەوا سەرەک وەزیران کۆمەڵە کوپ و دەفرێکی زۆری لەبەردەمدایە و خەریکی شوشتنیانە.

مارت مانگێکی جەنجاڵ بوو.

دوای ئەوەی بنگۆریۆن لە کەنیستدا داکۆکی لەسیاسەتی دانەڕسانە سەر میسر کرد، مناحیم بێگن داوای متمانە لێسەندەوەی لە پەڕلەمان کرد کەتیایدا هێرشێکی کوشندەی کردە سەر بنگۆریۆن.

بنگۆریۆن لەوەڵامدا گوتی: «ئەز تەنها لەگەڵ یەک شتی قسەکەرەکە(مەبەستی بێگین بووە-وەرگێڕ) کۆکم، ئەویش ئەوەیە کە سەربازەکانمان دەبێ بجەنگن. بەڵام ئەو لە شەڕی پێشتریشدا نەجەنگا و لەو شەڕەشدا بەشداری ناکا.»

لەنێو ئەندامەکانی هیروتدا مقۆمقۆ پەیدابوو، بێگین بازیدایە سەرسەکۆ و هاواریکرد: «بەڵام تۆ ناپاکییت دەرهەق کێشەی ئیسرائیل کرد! هەی ناپاک ! ناپاک!»

بێنیامێن ئاردیتی Benjamin Arditi کەئەندامێکی هیروت بوو لەنێو مقۆمقۆی هۆڵەکەدا بەسەر سەرەک وەزیرانیدا قیڕاند:

«گێچەڵفرۆش!»

سەرۆکی پەڕلەمان گوشاری خرایەسەر قسەکەرەکە کە ناپەڕلەمانییانە جوڵاوەتەوە لە هۆڵەکەی دەربکا. بەڵام فێڵێکی تەکنیکانەی دۆزیەوە گوتی:

«من تێبینییەکەم گوێ لێنەبوو کەواتە لێتێنەگەیشتین. لەکۆتاییدا دەتوانم پرسی قورستر لەوەی تێبینیەکەی پێدرا بهێنمە سەرزمان.»

لەمارتدا زنجیرە بەرنامە تەلەفزیۆنییەکەی موراو پەخشکرا، لەرۆژەکانی بەدواشیدا هاتن کۆمەڵێ نامە بۆ نوسینگەی تەفزیۆنی CBS نێردران. زۆر نامەیان لەلایەن ئەو کەسانە نوسراوبوون کە زۆر بە سادەیی ئەو پیاوەی لە بن هەیوان و لە ناوجەرگەی بیابان بەجلێکی خاکییانە دانیشتبوو نەوەک چەشنی دیکتاتۆرەکەی میسر کە بە رازاوەترین یەکبەرگی سەربازیانە کارانگازببوون. ژنێک لە هینسدتیانەوە نوسی:

ئەو پیاوە سەر سپیە بیچمەکانی پەیمانی نوێ( ئینجیل» العهدالجدید)ی بەبیرهێنامەوە. من حەزم دەکرد دەستم بگاتە سەری و پرچەسپیەکەی تا بەبا سپیایەتیەکەی شەوق بداتەوە.»

لەمارتدا هەمو ئەندامێکی هێزە چەکدارەکان لە ئیسرائیل رۆژێکیان بۆ یارمەتیدانی نشینگەکانی سەرسنور تەرخانکرد. بۆئەوەی نمونەیەکەی باش نمایش بکەن، بنگۆریۆن لە ئۆرشەلیمەوە خۆی لە بەرەبەیانی کە کزرەبایەکی ساردی لە بیابانەوە هەڵیکرد خۆی

گەیاندە میڤاتهیم Mivathimی لای غەززە، تا لە دانانی تێلدڕی شورەی نشینگەکەدا کۆمەکیان بکا. کاتێکیش نەحێمیا دەستکێشی بۆ بردن ئیشی پێبکا، لێیوەرنەگرتن و گوتی:

«مرۆڤ بۆ ئەوە دوو دەستی هەن تا ئیشیان پێوەبکا.»

ڕۆژێک پاشتر لە گۆڕەپانی وەزارەتی بەرگریدا چاوی بە گروپێکی چل ڕۆژنامەوانی ئامریکایی کەوت، کە گەشتێکیان بەناو دەوڵەتە عەرەبییەکاندا کردبوو. بەو پەیڤانەی خوارەوەی بەخێرهێنان:

«ئەزیش ڕۆژنامەنوس بووم.»

ئەوان لیستێکی پرسیان لەپێش دانا. یەکێک لەو شتانەی پێیانڕاگەیاند و ویستیان لەو بارەوەیە رونکردنەوە بدا، ئەو نەخشەیە بوو کە عەرەبەکان باسیان لێوەدەکرد، گوایە نەخشەکە ئەوەندە گەورەیە تاکو بیسەلمێنن ئیسڕائیل هەر لە روباری فراتەوە تا روباری نایل دەگرێتەوە و دەبێ دواتریش داگیری بکا. ئەو نەخشەیە گوایە لە باڵەخانەی کەنیست و زۆر دامودەزگای گشتی دیکەش هەڵواسرابێ.

بنگۆریۆن سەرێکی راوەشاند و گوتی:

«حەللەق مەللەقێکی هەژێنەرە. ئێوە دەتوانن هەمو لایەکی ئیسڕائیل بگەڕێن. من داوا لە دۆستەکانی خۆمان دەکەم بتانبەنە هەر شوێنێک کە پێتان خۆش بێ، بۆ ئەوەی خۆتان لە راستی  نەبوونی نەخشەیەکی وا دڵنیابن. ئێوە پێویست ناکا بە قسەی من باوەڕ بکەن. دەتوانن بچنە هەمو شوێنێک. ئەو خەڵکەی وا دەڵێ نەزانن، تێناگەن کەوا ئێمە کاتێ لە کۆیلایەتی میسرییەکاندا رزگاریمان بوو، راسپێردراین کە هەرگیز بۆ ئەو وڵاتە نەگەڕێینەوە، ئێ خۆ نیلیش روبارێکە بەناو میسردا دەڕوا. ئێمە ئێرەمان پێخۆشترە. قسەی ئەوان بێ واتا و بێ بنەمایە.»

کاتێ ئەو بڕگەیەی خوارەوەی لێزیادکرد چاوەکانی بزۆزانە دەبریسکانەوە:

«بێگومان هەندێ بەڵێن لە بایبلدا هاتووە، بەڵام ئەوە لەلایەن پەروەدگاری مەزنەوە دراون؛ گەر ئێوە دەتوانن بیگەنێ بڕۆن لە یەزدان خۆی بپرسن.»

پاشان بە پێکەنینەوە ئەو سەربردەیەی بۆگێرانەوە.

«جارێکیان چاوم بەکابرایەک کەوت کە لە ئامریکاوەڕا هاتبوو. سەرۆک ڕۆزڤێلت رەوانەی لای منی کردبوو. ئەو ژەنەڕاڵێک بوو. ڕۆژێکیان کە لە باسوخواسەکانمان بووینەوە، هەندێ دەربارەی مێژو قسەمانکردن. من گوتم، دیرۆکەکەی ئەوان بۆ سێ سەد ساڵ دەگەڕێتەوە ئەوەی ئێمەش بۆ سێ هەزار ساڵ. ئەنجا ئەو گوتی:

«چی؟ خۆمن ئایرلەندیم. مێژوەکەی منیش بۆ هەشت هەزار ساڵ دەگەڕێتەوە.»

بەڕێکەوت هەر لە مارتدا بنگۆریۆن بۆ یەکەمین جار ئاهەنگێکی فەرمییانەی سازدا و بانگهێشتکراوەکان بریتیبوون لە کۆمەڵێک دیپلۆمات، ئەندامانی کابینەکەی، ئەندامانی کەنیست و هەندێ بیچمی ناوداری دیکە. ئاهەنگەکە لەسەر شەرەفی رینانای کچی بوو کە شوی بە ئەندازیارێکی لاو کردبوو.

ڕۆژێک دواتر پاولا چووە زانکۆی عیبریی تا دکتۆرانامەکەی کچەکەی وەربگرێتەوە، چونکە رێنانا بەگەشتی مانگی هەنگوینی بوکێنی دەرچووبوو، داوای لەدایکی کردبوو

لەبری ئەو بچێتە بۆنەکە و بڕوانامەکەی وەربگرێتەوە.

لە ئەپریلدا کوڕەلاوێک بەناوی ئیبراهیم عیزەت Ibrahim Izzat خۆی بە کونسولخانەی ئیسرائیل لە لەندەندا کرد. ئیبراهیم هەواڵنێری هەفتەنامەی روز ئەل یوسفی میسری بوو. داوای ڤیزای بۆ چوونە نێو ئیسرائیل کرد.

تا ئەوکات هیچ لەو جۆرە داوایانە نەکرابوون. کاتێک فەرمانبەری کونسولخانەکە لە هێدمەگرتن بەخۆهاتەوە، لە مەرامی سەردانەکەی پرسی. بە وەڵامێکی سادەی بروبیانوبڕ گوتی: «هەندێک زانیاریی لەسەر کۆمەڵە وتارێک کۆدەکەمەوە.»

لە لەندەنەوە پەیوەندی بە ئۆرشەلیمەوە کرا، لە دواییدا ڤیزایان دایە ئیبراهیم عیززەت بەڵام بەمەرجێک: بۆئەوەی ئاسایشی خۆی باشتر بپارێزرێ پێیان باشبوو خۆی وەک بزنسمانیکی باشوری ئافریقایی نیشانبدا. ئیدی دەتوانێ بچێتە هەمو شوێنیک و چاوپێکەوتنی خۆی لەگەڵ کێ دەوێ، سازبدا، مرۆ بەهیوا بوو راستگۆییانە ئەوەی دەیبینێ بیخاتە سەرکاخەز.

رۆژنامەنوسە لاوەکە مەرجەکەی پەژراند، گەشتێکی بەناو ئیسرائیلدا کرد. لەلایەن زۆرینەی ئەندامانی کابینەکە پێشوازیلیکرا و بەخێرهێنرا، بەڵام سەرەک وەزیرانی نەدی. کاتێکیش گەڕایەوە پەیامێکی لە بنگۆریۆنەوە پێگەیشت:

«کاتێک گەڕایتەوە میسر و عەبدولناسرت دیت، پێی بڵێ کەوا من ئامادەم گەر بیەوێ و لەهەر کوێیەک بێ بەیەکەوە دابنیشین و کێشەکانمان باسبکەین: پرسگەلی ئاوارەکان، کێشەکانی سەرسنور، کاروباری سیاسیانە، کێشە ئابورییەکان یان سەربازییەکان باسبکەین. دانیشتنێک بەبێ ناوبژیکار، بێ کۆنفرانسی راگەیاندن و تەنانەت بێ دەرەنجامیش. پێیبڵێ کەوا من ئامادەم تەنانەت بۆ کۆبوونەوەکە بێمە قاهیرەش.»

ئەوە داوایە هی کەسێک بوو کە نەدەترسا، کەچی کاردانەوەی هەر نەبوو.

لە یەکەم وتاری ئیبراهیم عزەتدا کە بەقسەی خۆی «لە ئیسرائیلییە گەوجەکان زیرەکتر بووە»کاتێک خۆی بە بزنسمانیکی باشوری ئافریکیا داوەتە قەڵەم و چاوپێکەوتنی لەگەڵ هەمو ئەندامانی کابینەی حکومەت بە خودی بنگۆریۆنیشەوە سازداوە. هەرچەندە پێلێهەڵبڕینێکی بێتاوانانەی تێدابوو بەڵام یەکەمین وتاری بابەتیانە بوو. بەڵام ئەوانی دیکەی ناپاکانە دەرچوون.

لە حوزەیراندا بنگۆریۆن وتارەکەی بۆ ساڵنامەی ئیسرائیلی ١٩٥٦دا تەواوکرد و ناردیە چاپ. بەهۆی پێشهاتە پەرەسەندووەکان ناونیشانەکەی رامانێکی پێغەمبەرانەی هەبوو: «بەرەو باشور». ئەو بە کۆپلەدەقێکی ئێزخیل Ezechiel دەستپێکردبوو: دە ئەی مرۆڤایەتی روت بەرەو باشور وەرگێڕە، دەبا وشەکانت بەرەو بەشی باشور برۆن.»

ئەو نوسینە لەسەردەمێکدا نوسرابوو کە ڕوخاندنی ئیسرائیل بۆ زۆربەیان ئەگەرێک بوو تادەهات نزیک دەبووەوە. لەهەمو سنورەکان ئاستەنگ هەبوون. هیچ دەسەڵاتدارێکی دۆست نەبوو چەکی وا بداتە ئیسرائیل کە پێویستی پێبوو. زۆر لەو سەدان هەزار کۆچبەرەی هاتبوونە وڵات هێشتا هەر لە خێوەتەکان دەژیان.

چارەکی بەرهەمی لۆکە لەناو چووبو. سیاسەتی بەنێو دەوڵەتیی بەهۆی جیاوازی بیروڕاکانیانەوە تادەهات هەر ئاستەنگی بۆ بەردەم ئیسرائیل دادەنا.
وتارەکە لەلایەن پیاوێک نوسرابوو، کە زۆر نابا تەمەنی دەگاتە حەفتا ساڵ و تەندروستیشی لەنگ ببوو. نزیکەی هیچ ساتێک دەستی بەتاڵ نەبوو، چونکە سەرەک وەزیـران، وەزیری بەرگری و سەرۆکی هەشتا و دوو بەش وهۆبە بوو، هەردو وەزارەتیش لە دوو شوێنی لەیەکجیابوون، نزیکەی یەک کاژمێر لەیەک دور بوون.
بێگومان وتارەکەی بووە بەڵگەنامەیەکی لێفێربوون کە بەرزو پێغەمبەرئاسایانە بوو.
ئەو پێغەمبەرەکانی بەبیرهێنانەوە کە لەبەرامبەر ئەو بیرۆکەیەی گوایە نەقەب هەمیشە بەرز دەمێنێتەوە، چۆکیان دانـەدا. جێسیا Jesajaی بەبیر هێنانەوە کە پێشبینی ئەوی کردبوو رۆژێک دادێ بیابان بە گوڵ دەڕازێتەوە. سلیمان، یۆسفات Josafat و ئوزیا Uzziay، سێ پاشاکەی خانەوادەی داودی بەبیرهێنانەوە کە هەوڵیاندا ئێلات بکەنە شارەبەندەرێکی خۆشگوزەران.
«شا ئویا کیڵگەناسێکی پیتۆڵ بوو، ئەو کەسەی هەوڵوتەقەللای بۆ دەستگرتن بەسەر بیاباندا دا تا بەسەرکەوتویی شانشینی لێدابمەزرێنی. لەو سەردەمدا لەشکری جولەکان بەهێز بوو، ئەو پەرەی بە نشینگە و ئاودێری دا، کاروباری بەندەریانەی لە ئێلات بنیات نا لەکاتێکدا لە بواری سیاسی و ئابوریشدا پێشوەچوونی بەرچاوی بەخۆوەبینی، هەروەها لەکایەی گیان و ورە و رەوشتیشیەوە سەنگی بەهاداری بەجێهێشت.»
گەر بهاتبا بنگۆریۆن لە قەیرانی ١٩٥٦دا نەتەوە بچوکەکەی دەرباز کردبا، ئەوا هەمان وشەکانی سەرو دەبوونە نوسینی سەر بەردەکێلەکەی.
لە دروشیمی «بـەرەو باشور» دا هەوڵیدا پەرۆشی و تاسەی گەلەکەی بە چیرۆکی گەنجینە شاراوەکانی ژێر نەقەب راکێشێ. ئەو بەخۆی نوسی کە بەملیار تۆن لە مادده کانزایە جۆربەجۆرەکان لەژێر زەویدا هەن و لێکۆڵەرەوە زانستییەکانی ئیسرائیل رێگایەکی هەرزارنیان دۆزیوەتەوە تا ئەو یۆرانیۆمەی بۆ لیکۆڵینەوەکانیان چارەنوسسازە لەنێو فۆسفاتی بیاباندا دۆزیویانەتەوە، بەکاریبهێنن.
بەڵام هۆشداریشیدا:
«ئەگەر دەوڵەت کۆتایی بە بیابان نەهێنی، ئەگەری وا لە ئارادایە کە بیابان دوایی بە دەوڵەت بهێنێ.»
«بەرەو باشور» وتاریکی درێژ بوو، لەکتێب دەچوو، کتێبێک لە ریزی دەستنوسەکانی دەوڵەتی تازەی جوەکان بوو.
لە حوزەیراند کۆتایی بە هاوکاری نێوان دوو پیاو کە چەند دەیەیەکە بەیەکەوە کار بۆ هەمان ئامانجی سیاسی دەکەن، هات.
موشێ شارێت پیاوێکی درێژی بازوداری دەنگ نەرم، لەزۆر روەوە پێکهاتەیەکی یەکانگیرییان لەگەڵ بنگۆریۆن پێکدەهێنا. ئەو کەسێک نەبوو لەخۆیەوە فێربووبێ، بەڵکو لەچەندان زانکۆ دەرچووە و بەهرەیەکی سروشتیشی بۆ زمانفێربووبن هەبوو.

ئەو زانیارێکی گەورەبوو. بۆ ئەوانەی ناسیبێتیان پیاوێکی لەناخەوە دڵگیرو میهرەبان بوو. حەزی بە سەوداکردن لەگەڵ ژینگەی خۆیدا هەبوو، زۆرینەی خەڵکیش خۆشیان دەویشت. کاتێک لە نیویۆرک دەژیا، هەمو شەوەکەی لە گەڵ برادەرەکان بە گفتوگۆ و راوێژکردن بەسەردەبرد، حەزیشی لەسەر دانیشتنی سەر زەوی بوو(چوارمشقیانە-وەرگێڕ). ئەوسا نوکتەیان دەگێڕانەوە و گفتوگۆکانیان گەرم دەبوون. بەردەوام لەیادی بوو کە هاوسەری برادەرەکەی ناوی چیە و هەرگیزیش هەواڵپرسینی منداڵەکانی فەرامۆش نەدەکرد.

کاتێکیش بۆ ماوەی پێنج مانگان لە لاتورن لە زیندانی ئینگلیزەکاندا بوو، وانەی زمانی عەڕەبی، ئابوری و رێزمانی عیبریی بە وەرداش زیندانەکانی دەگوتەوە.

ساڵانێک بوو لەنێو بۆتەی کارمەندانی حکومەتدا ئەو نوکتەی دیپلۆماتە بێگانەکە دەگێڕدرایەوە، کەدوای مانگێک لە ئیسرائیل، رایگەیاند کەبەلای کەمی فێربووە گوایە وشەی پایەبەرز Excellentie بە عیبری شاما موشێ Shama Musheیە.

کاتێک لە دیپلۆماتەکەیان پرسی ئاخر چۆنت زانی کە پایەدار ئەو واتایە دەگەیەنی، وەڵامی دایەوە: «ئەوەم لەوکاتەدا تێبینیکرد کاتێ کە فەرمانبەرەکان لەگەڵ وەزیری کاروباری دەرەوە دەدوان، هەمیشە هەر بە دووو وشەی شاما موشێ دەستیانپێدکرد.»

شارێت خۆڕسکانە دیپلۆمات بوو، تیژبین وخێرا بین بوو، نایابانە مشتومڕی گفتوگۆکانی دەبردنەسەر و کۆمەڵێک بنەماشی هەبوون کە بەتوندی دەستی پێوەگرتبوون. هەندێ جاران نیگایەکی مرۆڤهەژێنانەی هەبوو، بەڵام لەبۆنەکانی دیکەدا پیاوێکی فەرمی خۆپارێز بوو. تەنانەت بەتاسەی زانینی وردەکارییەکانیش بوو. ئەو هەگیز بەگوێرەی شێوازەی پراگماتیانە کارناکا. نەیارەکانی ناویان لێنابوو «شارێتی بنەپیتۆڵ» و پێیانوابوو کە مامۆستایە.

لە کۆبوونەوەی حکومەتدا نیوەی ئەندامەکانی لایەنگری شارێت بوون نیوەکەی دیکەش بەلای بنگۆریۆندا شکانەوە.

دۆستەکانی سەرەک وەزیران پێیانوابوو کە ئەو زیاتر راستیەکان بەرچاودەخا و شارێتیش هەوڵدەدا بەڵگەوبەندی نەهێڵانیان بهێنێتەوە. لایەنگرانی شارێت گوتیان کەوا بنگۆریۆن زۆرجاران لە بڕیارە تەڕدەستییەکاندا راستییە بنەماییەکان بە هەندهەڵناگرێ.

لە ڕاستیدا بنگۆریۆن مەیلی لێبوو تەڕدەستانە و ئازادنە رەفتار بنوێنێ و هەمو کردەیەک، نەخشەیەک و پێشنیازێکی لەڕیی ئامانجپێکانەکەیەوە هەڵدەسەنگاند. شارێت هەمەلایەنە بۆ کاروبارەکانی دەڕوانی، ئەو خۆپارێزیانە کاردانەوەی هەبوو، هەمیشەش دەیپرسی ئاخۆ چۆن شتەکان پێکدێن.

ساڵانێکی دورودرێژ بوو شارێت وەک جڵەوگرێک کارەکانی رایی دەکرد و بنگۆریۆنیش کە هۆشی بەوەدەشکا کە راگرێکی پێویستە، لەهەمو کابینەکانیدا بەشداری پێدەکرد.

وەک وەزیری کاروباری دەرەوە ئەو پیاوە گەنجە بەردەوام بە پلەی یەکەم بیری

لەدەرهاوێشتەی هەر پلانێکی بنگۆریۆن پێش ئەوەی بیپەژرێنێ، دەکردەوە. زۆر جاران زۆرینەی کابینەکە لەگەڵیدا کۆک بوونە، بۆیە بنگۆریۆنیش وەک بڕواهێنەرێکی دێموکرات ناچار بووە دەستبەرداری پلانەکەی خۆی بێ. رەفتاری نێوانیان دوای رێکارەتوڵەییەکان دژی سوریا باش نەبوو، نەخاسمە کردەوەکە لەکاتێکدا بوو کە شارێت لە واشنتن بوو، چووبوو لەگەڵ دەللەس Dulles وەڵامێک سەبارەت بەداوای کڕینی فڕۆکە جەنگاوەرییەکان وەربگرێتەوە، کە میسر فڕۆکەی میگی روسی وەرگرتبوو.

کاتێک وەزیری کاروباری دەرەوە گەڕایەوە وڵات بە راشکاوی راگەیاند کە کردەوە تۆڵەسێنەکان چ دەرچەیەکی ناچارییانەیان لە واشتنندا پەیدا کردووە هەمو جیهانیش پێی نیگەران بووە.

کاتێکیش بنگۆریۆن لە کەنیستدا رایگەیاند کە کۆتایی بە هاوکاری نێوانی لەگەڵ شارێتی وەزیردا هات، پێی لەسەر ئەوەداگرت کە لەکاتی خۆیدا شارێت داوای نەکردبوو بێتە نێو کابینەکە، هەرچەندیشە بیروڕایان لەگەڵ جودابوو بەڵام چونکە ئەوان ئەویان هەبوو. لەدوا مانگەکاندا کە سەرلەنوێ ئاسایشی ئیسرائیل کەوتۆتە بەر گەف وهەڕەشە و سیاسەتی دەرەکی لە جاران گرنگتر بووە وئەویش تەواو لەو بڕوایەدا بوو کە کەدەبێ هارمۆنییەک لەنێوان وەزیری بەرگری و وەزیری کاروباری دەرەودا هەبێ.

شارێت لە رونکردنەوەکەی خۆیدا رایگەیاند دوای دوا هەڵبژاردنەکە داوای لە بنگۆریۆن کردبوو کە نەیەتە ریزی کابینەی حکومەتەوە، چونکە هۆی بنەماداری هەن کە گومانی لە سەرکەوتنی چیدیکە بەیەکەوە کارکردندا هەیە، بەڵام بنگۆریۆن پێشنیازەکەی بەهەند هەڵنەگرت. شارێت لەسەری رۆیشت و گوتی:

«لە هەفتەکانی دواییدا بۆم رونبووەوە دەست لەکارکێشانەوەم شتێکی حەتمیە. ئەو بارەش پابەند نیە بە پرسگەلە سیاسییە هەڵواسراوەکان یان بە رەوتی پێشهات و روداوەکان. ئەز یەکشەمەی رابردو گفتوگۆیەکی کراوەم لەگەڵ سەرەک وەزیراندا کرد و لەوێ گەیشتمە بڕوایەکی یەکلاکەرەوە ناکرێ من لە حکومەتێکدا بمێنمەوە کە ئەو سەرۆکی بێ.»

دوای دەستلەکارکێشانەوەی شارێت کاتێکی زۆری بۆ ماپای تەرخانکرد؛ سەرپەرشتی کاری پەروەردە و فێرکردنی گرتە ئەستۆ.

لەسەر خوانی نانی شێوانی ماپایدا، بنگۆریۆن لە دوانێکیدا کە پەسنی وەزیری پێشوی کاروباری دەرەوەی دا، گوتی: «شارێت و من چل و سێ ساڵی مێژوییمان بەیەکەوە کارکردووە.»

شارێت بەپێکەنینەوە: «لەڕاستیدا چل و چوار ساڵ و نیو.»

دوای دەست لەکارکێشانەوەی شارێت لاوتر، تازەتر و کەمتر خەمی لە شتەکان دەخوارد. ئەو هیچ بۆنەیەکی لەدەست نەدەدا کە پەسنی دەستکەوتە گەورەکانی بنگۆریۆن نەدا کە پشکێکی هەرە گرنگی لە پێگەیاندن و پێشخستنی ئیسرائیلدا هەبووە.

کاربەدەستێکی باڵای ماپای بیروڕای کۆمەڵەیەکی زۆری لە هاوپارتەکانی هێنایە سەرزمان و گوتی:

«ڕەفتارمان لە بەرامبەر بنگۆریۆندا تێکەڵەیەکی متمانە و ترس بوو: متمانەدان بەو بەهرە لەڕادەبەرانەی خۆی، ترسانیش لەوەی نەوەک لەدەستی بدەین. باوەڕمان بۆ موشێ بە شارێت هەیە و خۆشماندەوێ. بێ ئەو هەست بەخۆشی خۆمان ناکەین. بەردەوام متمانەمان بە بڕیارەکان، هەستی کارامەیی و گونجاندن هەبووە.»

لە دوا ڕۆژەکانی حوزەیرداندا دیسان؛ «پەرجویەکی ئیسرائیلیانە»پەیدا بوو. بنگۆریۆن لەبارەیەوە گوتی:

«شتێکی مەزن ڕویدا، جوانترین شتێک لەدوای شەڕی سەربەخۆیی هاتەئارا. بە شێوەیەکی سەربەستانە (بێپابەند بوون بەرێکەوتننامە) لە دواییدا ئێمە لەوەدا سەرکەوتین ئەوەی ئێمە بۆ خۆپاراستمان پێویستی بێ کڕیمان وبەدەستمانهێنان.»

ساڵێکی خایاند تا جەماوەری لێئاگادارکرایەوە. چەکفرۆشەکان ئەو جارەیان لە فەڕانسەوە پەیدابوون. دانوستانەکان بەکەمترین دارشتەی فەرمیانە سازدران. فەرمانی خەرجکردنی ملیۆنان دۆلار درا و دەستەیەکی بچوک کە بڕوایان بەیەک هەبوو پێیهەڵسا.

لەماوەی چوار مانگدا ئیسرائیل چل هەزا تۆن چەک و تفاقی جەنگی دەستکەوت. هەرچەندە چاوی هەمو جیهان بەسەر ڕۆژهەلاتی ناوینەوە بوو، بەڵام کردەی چەککڕینەکە بە نهێنی مایەوە. بارەکان هاتن، دابەزێنران، بێ ئەوەی گومانی هیچ کەسێکی بۆ بوروژێنرێ.

لەو نێوەدا دەستبەجێ ئیسرائیل بەرهەمی پیشەسازی جەنگی خۆی بەرێژەی پەنجا لەسەد بنیاتنا. ئیدی ژمارەیەکی یەکجار زۆر مین، نارنجۆکی دژەتانک، بازوکا و گوللە و تەقەمەنیان بەخۆیان دروستکرد.

لە تەموزدا قەیرانێکی کشتوکاڵیی سەریهەڵدا. هەنوکە بەشێکی گرنگی ئابوری ئیسرائیلی پشتی بە بەرهەمی لۆکە بەستبوو. بەڵام بەرهەمەکە بەرامبەر هەمو شێوە قەلاچۆکردنێکی مێشومەگەز خۆی نەدەگرت و خەریک بوو لەناو دەچوو. بەرهەمی لۆکەکە بە بەهای هەشت ملیۆن دۆلار لەسەر لێواری فەوتان بوو.

بنگۆریۆن بروسکەیەکی بۆ سام هامبورگ لێدا. سەر لەبەیانییەکەی بروسکەکەی بەدەستگەیشت. ئیدی هەمان ڕۆژ دوای نیوەڕۆ سواری فڕۆکەیەک بوو خۆی گەیاندە وڵاتی پیرۆز. کاتێک گەیشت بەبەهای دوو ملیۆن دۆلار بەرهەمەکە لەناوجووبوو، بەڵام ئەو سەرپەرشتی قەڵاچۆکردنێکی کرد و باقی بەرهەمەکەی لە فەوتان ڕزگارکرد.

لە تەموزدا ناسر نۆکەندی سوێسی گرت و خۆماڵیکرد.

لە ئابدا بنگۆریۆن لە کۆنگرەیەکی لاوانی هەژدە وڵات قسەیکردن. گوتی کەوا جوەکانی هەندەران سەرپشکن لەوەی چ جۆرە ژیانێک هەڵدەبژێرن؛ ژیانیکی لوکسەیی لەو وڵاتانەی تیایدا دەژین یان ژیانی بە ترس و دژوار لە ئیسرائیل، بەڵام ژیانێکی ئازادانە بێ ئەوەی هیچ کەسێک پەلار بگرێتە ڕاستیی جوبوونیان.

ئەو گوتی: «ئێمە شتمان هەیە پێشکەشی بکەین کە لە هیچ سوپەرمارکێتێکدا

ناکردرێ»
لە نیوەی ئۆکتۆبەردا گرژی و ئاڵۆزی گەیشتە تۆپکە. ناسر راشکاوانە رایگەیاند کەوا نەوەک هەر دژی ئیسرائیلە بەڵکو دژی «جولەکەی نێو دەوڵەتیی و سەرمایەشیانە.» ئەو پەیڤانە لای هەندێک گوتەکانی کابرا مردووەکەی ئاڵمانیان(مەبەست هیتلەرە-وەرگێڕ) بیردەخستەوە.
لە ١٥ی ئۆکتۆبەردا بنگۆریۆن بە ئارامی لەبەردەم کەنیستدا وتاری دەدا. دوانەکەی ١٥,٢٠٠ وشە بوو، بەڵام کەس لەبەری نەبۆڑا و خەوی لێنەکەوت. ئەو بەکراوەیی دەربارەی جەنگ دوا، دوانەکەی نەوەک هەر هی وەزیری بەرگری بەڵکو وەک فەیلەسوفێک و مرۆڤپەروەرێک بوو. بەسەرسوڕمانی ئەوانەی کە پێیان وابو بنگۆریۆن زۆر بەلای شیعردا ناچێ، لەو دوانەیدا شیعرێکی درێژی نوێی خوێندەوە. یەکێک لەدێڕەکانی شیعرەکە دەیگوت:
«ئەوەیە هێز کە هەبووە یان کە دەبێ»
لە ئاخروئۆخری دوانەکەی هاتە سەر باسکردنی هەلومەرجی هەنوکەیی.
«ئەو لاسەنگیە هێز زۆرەی ئەوان (عەرەبەکان) هەیانە، لەوانەیە لە کەللەیان بدا و هەستی بەراوردکارییان لەدەستبدا، چونکە بەردەوام بەخەڵکی خۆیان گوتووە کە شەڕیان لەگەڵ ئیسرائیلدا بە خاپورکردنیان کۆتایی پێدێ.»
ئەو روداوەکانی سەر سنوری بۆ پوختە کردنەوە: لێرە کەسێک کوژرا، لە ئازوز Azuz خانوێکی دوو نهۆمی تەقێندرایەوە، لەشوێنێکی دیکە لەهەمان رۆژدا پەلاماری ئۆتۆمبیلێکی پۆلیس درا، دوو هاوڵاتی کوژران، ئۆتۆمبێلیکی بارهەڵگری جولەکان بە بۆمب تەقێندرایەووە دوو سەرنشینی بوونە قوربانی، بۆمبێک لە کێڵگەیەکی ئۆرشەلیم داندرایەوە، نارنجۆکێک فڕێدرایە قوتانخانەیەکی منداڵان، چوار هاوڵاتی دیکە لە لایەکی دیکەی وڵاتەوە کوژران، شەش سەرباز کوژران، قۆشەنە سەربازێکی عەرەب تەقەیان لە دەستەیەکی ئارکیۆلۆژ کرد، ژنێکی لەیەمەن ڕاهاتوو لەکاتی رنینەوەی زەیتونەکانیدا لەسەر کێڵگە کوژرا.
رۆژی پێشتر دەستەیەکی فیدائیەکان کە لەلایەن فەرماندەیی میسرییەوە نێردرابوون، لەشوێنێک لە سدیبۆکر کیبۆتەکەی خۆی لە بیابان دەستیان بەسەرداگرت.
بەشێوەیەکی زیرەکانە مرۆڤایەتی بۆ شتێک ئامادەدەکرد، وەک ئەوەی دەیزانی چونکە هەر خۆی فەرمانی بۆ دەردەکرد، کە لەماوەیەکی کەمدا شتەکە دەقەومێ. کارەکە ئەوکات سەردەکەوێ کە هیچ شتێکی لێدزەنەکا. زۆرینەی سەرکردەکان لە هەلومەرجی وەک ئەودا هەرگیز هیچیان نەدەگوت. ئەو بۆ رۆژنامەکان دوا. هەواڵنێرە بیانیەکان؛ لە هۆڵەکە ئامادەبوون. دوای کاژێریکی دیکە پوختەیەکی دوانەکەی لە نیویۆرک و لەندەن بڵاو دەبنەوە و نیو کاژێریش دواتر لە قاهیرە، دیمەشق، بەغداو عەممان. بەڵام تەنانەت لەساتە تەنگەتاوەکانیشدا ئەو بە دیموکراتانە مایەوە، هەر بۆیە هەوڵیدا متمانەی ئەندامەکانی کەنیست بێ هیچ ناپاکییەک بەدەستبهێنێ.
«بەگوێرەی بڕوانامەی نەتەوە یەکگرتووەکان هەمو ئەندامێکی رێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان مافی داکۆکی لەخۆکردنی هەیە...

«ئەز ناتوانم پێشنیازی ئەوە بکەم کە هیچ وڵاتێک هەبێ لەجیهاند گەلەکەی بێبەرگری بۆ بکوژانی بەجێبێڵێ کە لەلایەن حکومەتە دراوسێکان دەستیان ئاوەڵاکراوە...
«ئێمە پیشنیازی کۆنفرانسی ئاشتیمان لەگەڵ سەرانی عەرەب کردووە، بەڵام دەنگەکەمان وەک هی ئەو کابرایەی لێهات کە لە بیابان هاواری دەکرد...»
ئەنجا لەسەر باسی هەنوکەیی یەکسەر بازیدایە سەر ئایندە.
«هەندێ وڵات بەئاسانی دۆست پەیدا دەکەن چونکە زلهێز و گەورەن، هەرێمی دەوڵەمەند و گەورەیان هەیەو دانیشتوانەکانیشیان بەدەیان یان بەسەدان ملیۆنن.
«هەندێک دەوڵـەت دۆستیان لەڕێی ئایین یـان زمانی هـاوبەش پەیدادەکەن. هەروەک هەندێ لەوڵاتە عەرەبییەکان، وڵاتانی ناوەڕاست و خوارووی ئامریکا یان وڵاتە ئەسکەندەناڤییەکان.
«هەندێک وڵاتێش هاوپەیمنێتیان لەسەر بنەمای دوژمنـی هـاوبەش و ترس ڕۆناوە.
«ئیسرائیل هێزێکی گەورە نیە، دەوڵەمەنێکی قەبەش نیە و روبەرێکی پانوپۆڕیشی نیە؛ ئیسرائیل زمانی خۆی هەیە، ئۆل و رەگەزەکەی لەگەڵ هیچ دەوڵەت و گەلێکدا هاوبەش نیە. ئەوەی پەیوەندی بەزمان و رەگەزەوە هەیە کەزیاتر لێمانەوە نزیک بن عەرەبەکانن، ئەویش بەهۆی دیرۆکیەوە کە من بۆی دەچم جارێ دژوارترین دوژمنەکانمانن.»
لێرەدا پیتۆلێتی ئەو پیاوەمان بۆدەردەکەوێ کە ئەو دوای نیوەڕۆیە کە تەنها چواردە رۆژی مابوو تا ئیسرائیل بوێرترین هەنگاوی سەرچڵییانە بنێ کە گروپێکی بچوک تا ئێستا نابێتی، بە ئارامی و لەسەرخۆ بە چەندان کاژمێر قسە لەسەر ئەو پرسە بکا، ئاخۆ چۆن گەل دۆستی پەیدا بکا.
بنگۆڕۆن بڕیاریدا:
«لەوانەیە لەدەروازەی پێش ئێوارەیەکی بڕیاڕ و روداوی هەرە گرنگ وەستابین. دەبا خۆمان ئامادە بکەین یەکگربین، ئەوسا گاشەبەردەکانی ئیسرائیل دەستبەردارمان نابن.»

# بەشی
# (٢٦)

لە پێنجشەمە ٢٥ی ئۆکتۆبەری ١٩٥٦دا، لەپڕ بەهەزاران کەس لە ئیسڕائیلدا سەروسۆراخیان نەما.

سکرتێری بەڕێوبەری بانک بۆ نانی نیوڕۆ ڕۆیشت و نەگەڕایەوە.

نوێنەرێک ساکالای لەوە هەبوو گوایە شوفێرەکەی بێئەوەی هیچی پێبڵێ، بەجێیهێشتوە.

بەو کەسانەش کە لەپێش دکانەکان ریزیان بەستبوو گوترا: «بەداخەوە، ئێمە لە دەستی کاردا کورتمان هێناوە.»

بیستوچوار کاژمێر پێشتر پەیماننامەیەکی سێقۆڵی سەربازییانە لەنێوان میسر، ئوردن و سوریادا مۆرکرا، بەهۆیەوە سوپای هەر سێ وڵات کەوتنە ژێر فەرماندەیی ناسر.

لێرەوە بارودۆخی تەنگەتاوی پەیدابوو، بنگۆریۆنی ناچارکرد یانزەهەمین بڕیاری گرنگی لەژیاندا بدا. بە قسەکانی خۆی دەبوایە ئەو یەکێکیان لەمانەی خوارەوەدا هەڵبژێرێ:

«تێکشکانێکی بەردەوام و بوونە بابەتی دوانی ماتەمینییانەی دۆست و برادەرانمان کە لەسەر گۆڕەکانمان دەگرین، یان شەڕکردن.»

لەماوەی ئەو پێنج ڕۆژەی بەدواداهاتن، سەرەتا متمانەی بە دوو یان سێ کەس پاشان کەسێکی دیکەیش کرد و پێیگوتن، بەڵام هێشتا پلانەکە لە مێژوی سەربازیدا هەرە نهێنیترین راز بوو ، بەشێکی سەرکەوتنەکەشی هەر بۆ نەدرکاندنی نهێنییەکە دەگەڕایەوە.

ئەو پێنج شەممەیە کە سوپا بەوپەڕی بێدەنگییەوە خۆی جۆش دەدا –فەرمانی زارەکی لە ئەفسەران بۆ پلەکانی خواروسەربازەکان دەردەچوون– نوێنەری ئیسڕائیل ئابا ئیبان بۆ نەتەوە یەکگرتووەکان لە نیویۆرکدا دەدوا:

«ئیسڕائیل دەست بەجەنگ ناکاتەوە. ئەو یەکەم کەس نابێ کە پەنا بۆ زەبروزەنگ ببا.»

ئابا ئیبانی نوێنەر لە بڕیارەپلانەکەی بنگۆریۆن ئاگادار نەکرابووەوە. هەر بۆیە لە دوانەکەیدا درێژەی پێدا و گوتی:

«شەڕ دوا ئامرازە کە بۆ خۆپاراستن دەستیبۆببەین. هەندێک جاران مرۆڤ

ناتوانێ خۆی لە داخوازیەکانی داکۆکی لەخۆکردن بدزێتەوە.»
لە رۆژی هەینیدا ئەو ئەفسەرانەی فەرماندەیی باشور کە دەبوایە چالاکییەکەیان ئەنجام بدابایە، لە پلانەکە ئاگادارکرانەوە. هەفتاودوو کاژێریان لەبەردەمدا بوو تا خۆیان بۆ ئامادەبکەن.
لە شەممەدا ئاهەنگۆکەیەک لە تەلئەبیب بۆ نەتەوە یەکگرتوەکان سازدرا. سەردەستەترین مژاریش بابەتی خۆجۆشدان بوو. زۆرینەی دیپلۆماتەکان پێدەچوو لەسەر ئەوە کۆک بن کە بارودۆخی ئوردن هۆکارەکەی بێ.
دەستبەجێش ئەوانەی (بۆ کردە سەربازییە نهێنییەکە) بانگکرابوون، گەیشتبوونە مەڵبەندەکانی بانگکردن و ئامادەی گواستنەوەبوون بۆ نەقەب.
ئەو شەممەیە سەرۆکی دەستەی هێزەکان مۆشێ دایان کە لای بنگۆریۆن زۆرخۆشەویست بوو، بەفەرمی پلانەکەی سەرکردەی گشتی هێزە چەکدارەکانی پەسندکرد و گەڕایەوەماڵەوە خۆی بەئارەزوە ئارکیۆلۆژیانەکەی خەریککرد. ئەو پارچە شکاوانەی گوڵدانە بێزەنتییەی لێکدەدانەوە کەخۆی بەهەڵکەندن دۆزیبوونیەوە.
هەمان شەممە سەرەک وەزیران هەستی بەنەساخی خۆیکرد. جەستەی گەرم داداهات، سەرئێشەیەکی توندی گرت، بەڵام هەمو رۆژەکەش هەر خۆی نەخست و کاریکرد. ئێوارەکەی بانگی ئەندامەکانی حکومەتی سەربە پارتەکەی ماپای کردە ماڵەوە، بەکورتی  بۆی رونکردنەوە کە بەتەمایە ئۆپەراسیۆنێکی سەربازیی گەورە رابگەیەنێ، کەئەم ئامانجانەی خوارەوە بپێکێ:
١. «تێکوپێکدانی بنکە دوژمنکارییەکانی میسر لە بیابانی سینا.»
٢. «دەرکردنی هێزە خۆسەپێنەکانی میسری لە دەڤەری غەززە.»
٣. «کردنەوەی کایەی هاتوچۆی ئازاد بۆ ئیسرائیل و کەشتیگەلی نێودەوڵەتیی لە شاڕێی ئیلاتدا.»
ئەوەشی پێگوتن ئۆپەراسیۆنەکە بە سێ مەرج گرێدراوە: مرۆ دەبێ کتوپڕیانە دەستبەکار بێ، خێرا بێ و تا بشکرێ قوربانی کەم بدرێ.
وەزیرەکانی پارتەکەی خۆی پلانەکەیان پەسندکرد. ئەوان یەکەمین کەس بوون کە پرسیان پێبکرێ و لەسەری رەزامەندبن.
ئەوسا بنگۆریۆن بە ئاسودەیەوە چووە سەرجێگای چونکە هەمو شتەکان بەگوێرەی پلانەکەی بەڕێوەدەچوو. وەلێ سەرنجیدا تایەکە هەمو جەستەی گرتێبەرداوە.
ئەمە وایلێکرد بۆ بەیانییەکەی بە زەحمەت لە خەوڕابێ ، بەڵام دەیەویست ئۆپەراسیۆنە مەزنەکە کەخۆی خستبوویە سەر هێڵ، هەربەخۆشی رابەرایەتی بکا. جڵەوی چارەسەری هەمو کێشە بڵاوکراوەییەکانیشی گرتە ئەستوی خۆی.
نوێنەرانی ئیسرائیل لە دەرەوەی وڵاتدا پێویست نەبوو پێشکات بە هەواڵی پلانەکە بزانن، هەرچەندە بۆ هەندێکیان بووە مایەی هەراسانبوون.
یەکشەممەکەی کۆبوونەوەی بەتەواوی ئەندامانی کابینەکەی کرد، تیایدا وەزیرەکانی غەیرە ماپاشی تێدا بەشداربوون. لەدەستپێکدا رەوشی هەنوکەیی و تەمای روداوی ئایندەی بۆ باسکردن. کۆسپی دوهەمیشی تەختکرد، هێشتا هیچ نەیارییەکی بۆ پەیدا

نەبوو. ئیدی دەبێ بەفەرمی ئاشکرای بکا کە ئیسرائیل لەباری خۆجۆشداندایە. لە راگەیاندنەکەیدا ئاشکرایکرد کۆمەڵێک سەربازی یەدەگ بانگکراونەتەوە، ئەوەش پەیوەندی بەو روداوە تازانەی دەوڵەتە عەرەبییەکانەوە هەبوو. مەبەست لە هەواڵەکە پەرۆدادان بوو بەسەر ئاگرەکەدا تادیار نەبێ و زیاتریش پێ لەسەر رەوشی ئوردندا گیرا.

لەماوەی کۆبوونەوەکەی لەگەڵ کابینەی حکومەتەکەیدا، بنگۆریۆن چەند بارە دەرمانی دەخـوارد، بەڵام سەرنجێکی وای نەوروژاند کەباکی پێی هەیە. رەنگی دەموچاوی نیشانەی ئەوەبوو کە هێشتا تایەکەی دانەبەزیوە. سکاڵای لەدەست ژانەسەر و شەکەتی هەبوو. دوای ئەوەی بڕیاری کابینەکەی گەیاندە سەرەک بن‌زیڤی، لەگەڵ پاولا و ئارگۆڤدا سواری ئۆتۆمۆبێل بوون بە رێگا پرتاسەکەدا بەرەو تەلئەبیب لێیانخوڕی.

کاتێکیش گەیشتنە ئەوێ پاولا گوشاری بۆهێنا راستەوخۆ بچێتە سەرجێگا و پاڵکەوێ، بەڵام هێشتا رۆژەکەی ئەو زۆری بە بەرەوەمابوو. دەبوایە پێشوازی لە نێردەی هەمو لایەنەکانی کەنیست لە کۆمۆنیستەکان بترازێ، بکا. لەسەر داوای ئەو نێردەی کۆمۆنیستەکان بانگنەکرابوون. ئەو راگەیاندنەی دابوویە دەستەی گشتی هێزەکان، کابینەکە و کەنیست» بەوانیشی گوت. بەختیاربوو بەوەی هیچ نەیاری بۆ پەیدانەبوون. ئیدی بەمە بەسەر کۆسپی سێهەمیشدا زاڵ بوو.

لەمیانەی دانیشتنی لەگەڵ نێردەکاندا، چوار پزیشکی تەلئەبیب هاتنە لای. وای بۆچوون کە بنگۆریۆن توشی ڤایرۆسێکی تەشەنەکردوو بووە. پلەی گەرمییەکەی ٣٩,٩ بوو. پێیان گوت دەبێ دەردەست بچێتە نێو جێگای پاڵکەوتن. پاولا پێیگوتن کەوا پێویستی بەهیچ پەرستارێک نیە؛ ئەوەی کاتی خۆی لە نیویۆرک فێریبووە لێرەدا بەکردەوە بەهانای دێ.

بنگۆریۆن شەوەکەی لەناو جێگادا مایەوە. پاڵی بە بالیفەکان دابووە، دوا فەرمان و رێنمایی و دەدانە ئەو کاربەدەست و ئەفسەرانەی کە یەک لەدوای یەک بە قاڵدرمەکان سەردەکەوتن و بەناو ژوری کتێبخانەکەی دەچوونە ژوری نوستنەکەی.

لە کاژێر ٨ی دوای نیوەڕۆ ئـەدوارد لاوسـۆن Edward Lawson نوێنەری ئامریکا بەخۆی و بروسکەیەکی سـەرەک ئایزنهاوەر کە ئاراستەی بنگۆریۆنی کردبوو، پەیدابوو. لە بروسکەکەدا داوای لە ئیسرائیل کردبوو لەهەر پێشهاتێکدا هەوڵی ددانبەخۆداگرتن بدا.

بنگۆریۆن یەکسەر بانگی یاکۆڤ هێرزۆگ Yaakov Herzogی کرد. یاکۆڤ کوڕی گەورە رابانی ئیسرائیل بوو، هەر بەخۆشی رابییەکی ئەرسەدۆکسی و زانایەکی ناسراو بوو. پێشتر ئەرکی ئەڵقەی پەیوەندی نێوان حکومەت و کۆمەڵگای کریستیانی پێسپێردرابوو. هەنوکەش لەوەزارەتی کاروباری دەرەوەدا وەک بەرپرسی بەشی ئامریکا کاردەکا. لە هەفتەکانی بەدوایدا هاتن یەکێک بوو لە کارمەندە هەرە بڕواپێکراوەکانی لای سەرەک وەزیران، دواتریش کردییە نوێنەر لە واشنتن.

بە یاکۆڤ هێرزۆگی گوت: «ئێمە دەبێ دەستبەجێ وەڵامی ئەو بروسکەیە بدەینەوە.

بەڵام بەهیچ شێوەیەک نابێ وەڵامەکەمان یەکلاکەرەوە بێ.»
لەوکاتەی رابییە لاوەکە گەڕایەوە تا وەڵامەدەقێک بنوسێتەوە، پزیشکەکان هاتنەوە و دیتیان پلەی گەرمی سەرەک وەزیران هەر بەرزدەبێتەوە.
سپێدەزوی دووشەممە کاژمێر ٥ی کازیوە کارمەندێکی باڵوێزخانەی ئامریکا لە بەردەم وەزارەتی بەرگری ئیسرائیل لە هاکیریا پەیدابوو؛ بێهودە بەدوای یەکێک دەگەڕا کە نامەی سەرەک ئایزنهاوەری لێوەربگرێ. لەدواییدا پاسەوانێک نامەکەی لێوەرگرت. بەرگی نامەکە ئەو ناوونیشانەی خوارەوەی لەسەربوو:
بۆ خودی سەرەک وەزیرانی ئیسرائیل، بەڕێز داود بنگۆریۆن.
هێرزۆگ لە کاژمێر ٧ هاتە وەزارەت، دەستبەجێ بەنامەکەوە بەرەو کێرن کیامەت ژمارە ١٧ لێیخوڕی.
بنگۆریۆن لەخەو هەڵسابوو. شەوێکی نائارمی بەسەربردبوو. پلەی گەرمیەکەی هێشتا هەر بەرزبوو. دوهەمین پەیامی ئایزنهاوەری خوێندەوە، دووبارە مشورخۆری ئامریکای دەربڕیبوو. لەسەر ئەوە رژدببوو کە «هیچ کردەوەیەکی زەبروزەنگ نەگرێتەبەر هەڕەشە لەئاشتی بکا». بنگۆریۆن راوێژی بە هێرزۆگ کرد ئاخۆ چۆن وەڵامی بدرێتەوە.
کاتێکیش هێرزۆگ رۆیشت بە ژنەکەی گوت: «ئای رەنگت چەند زەردە، دەڵێی نەساخی؟»
پاولا چەند رۆژێک بوو هەستی بەنەساخی خۆی دەکرد، بەڵام نەیوستووە ئاشکرای بکا.
ناڤۆن بە کۆمەڵە بروسکەیەک هاتەوە. سەرەک وەزیران بەخێرایی چاوێکی پێداخشاندن. دیاربوو هێشتا نهێنییەکە دزەی نەکردبوو. هەمو کەسێک دەیپرسی ئاخۆ ئەو خۆجۆشدان و تەیارکردنە چی بەدواوەبێ، بەڵام کەس نەیدەزانی باسوخواس چیە.
ئەو بەیانییە هێرزۆگ کاژێر یانزەونیو دەقەوەڵامێکی بۆ سەرۆکی ئامریکای نوسیبوو. بنگۆریۆن بە بایەخەوە خوێندییەوە، لێرەو لەوێ هەندێ دەستکاریکرد و پەسەندی کرد.
نەخۆشەکە باقی رۆژەکەی بە نیوە دانیشتن بەسەربرد. دەموچاوی لەتاو تا سورهەڵگەڕابوو. رێنماییە گشتییەکانی بە نوێنەرەکانی ئیسرائیل لەدەرەوەوە دەگوت، کە هەر کاتێک کردەوەکە دەستی پێکردبا بۆیان بەبروسکە دەنێردرا.
بەڵام ئەو نەخۆش بوو تابتوانێ لەسەریان بەردەوامبێ، بۆیە پاڵیدایەوە بەڵکو سەرخەوێکی بۆ بشکێنێ. زۆری نەبرد بەهۆی تەلەفونێکی پێویستی وەزارەتی کاروباری دەرەوە لەخەوەکەی بێدارکرایەوە.
هەمو رۆژەکەی ئۆتۆمۆبێل لەبەردەم خانوی سەرشەقامەکە راوەستابوون. ناڤۆن لەخوارەوە وەستابوو بەڵکو هەمو ئەوانەی دەیانەویست قسە لەگەڵ سەرەک وەزیراندا بکەن، رایانبگرێ. یەکێک لەو کەسە کەمانەی کەڕێگەی درا بچێتە سەرو نوێنەری فەڕەنسا بوو. بنگۆریۆن بەڕێزەوە بەخێریهێنا، بەڵام هیچیشی بۆنەدرکاند.

دانی دوای نیوەڕۆدا لە کتێبخانە و ژوری نوستنەکەی لە نهۆمی دووهەمدا زۆر ئەفسەر، راوێژکارە سیاسییەکان، یاریدەدەر و ئەندامانی کابینەی حکومەت پەیدا بوون.

دواتر یەکێک بارودۆخی بنگۆریۆنی بە «خوێنساردێکی پلەی گەرمی بەرز» وێناکرد.

هەرچەندە پزیشکەکان داودەرمانییان پێدا، بەڵام تایەکەی هەر دانەبەزی. دەموچاوی سورهەڵگەڕابوو، چاوەکانیشی باریک ببوونەوە.

لە سەروبەندی کاژێر چواری دوای نیوەڕۆدا تاماشایەکی کاتژمێرەکەی دەستی کرد و روی کردە ژەنەڕاڵ مۆشێ دایان.

«ئەرێ کاژێر چەند دەکەونە بازدان؟»

«حەڤدە و پانزە خولەک»

«بۆ وا زو؟»

«گەرهاتو دوای تاریکداهاتن بازبدەن، مەترسی گاشەبەردکانی سەر ڕێگایان لێدەکرێ.»

کاژێر پێنج و چارەک هەردووکیان تەماشای کاتژمێرەکانیان کردن و بەبێدەنگی نیگای دەموچاویان لەگەڵ یەکدا گۆڕینەوە.

ئەو پەنجا وپێنج خولەکەی دەبوایە بەسەرچووبا تا یەکەمین هەواڵی بەرەی شەڕیان بۆدەهات، دەتگوت سعاتگەلێکە و تەواو نابن.

کاژێر شەش و دە خولەک ناڤۆم یەکەمین بروسکەی بۆ هێنان. لەو کاتەدا پزیشکێک پلەی گەرمی بنگۆریۆنی دەپێوا، هێشتاش هەر لەبەرز بونەوەدا بوو.

لە بروسکەکەدا هاتبو: «بەلەمەکانمان پیاوەکانی لە شوێنی مەبەست دابەزاندووە و بەبێ هیچ زیانێکیش گەڕاونەتەوە.»

ئامانجەکە میتلاپاس Mitlapas بوو لە سینا کە پەنجا کیلۆمەترێک لە نۆکەندی سوئێسەوە دور نەبوو.

پیرەمێرد کە پاڵی بە بالیفەکانەوە دابووەوە هەناسەیەکی هەڵکێشا و گوتی: «ئەز لەخۆم دەپرسم تۆ بڵێی بەتالیۆنەکە چۆن ئەرکەکەی جێبەجێبکا.»

چارەگێکی دیکە ناڤۆم بروسکەی دوهەمی هێنا.

«دابەزاندنەکە سەرکەوتو بوو. هیچ هێزێکی دوژمن لەماوەی ئەو پەنجا کیلۆمەترەدا بەدینەکراوە. هیچ فڕۆکەیەکی جەنگاوەری میسری هەوڵینەداوە رێ لە ئۆپەراسیۆنەکەمان بگرێ.»

سەرەک وەزیران هەناسەیەکی ئۆخەی هەڵکێشا؛ دەستی بۆ کتێبێکی سەرمێزەکە بردو دەستی بەخوێندنەوەی کرد. ناونیشانی کتێبەکە «زیرەکیی لای مرۆڤی هەرە کۆن بوو.»

ئیدی لەو ساتەوە لێشاوی بروسکە هەواڵەکانی بەرەی شەڕ، راپۆرتەکان و بروسکەی دیپلۆماتییەکان بەدەرکەوتن.

کاژێر ٩ی شەو بنگۆریۆن رێگەیدا یەکەمین هەواڵی فەرمی لەسەر روداوەکە

بڵاوبکرێتەوە. «هێزە جەنگاوەرەکانی ئیسرائیل  هەنوکە لەنێوەڕاستی سینا دان و لەنیوەی رێگای نۆکەندی سوئێس دان.»
یەک دو رودوای ناخۆش و پڕ ژان قەومان. ئابا ئیبانی نوێنەر روبەرووی وەزارەتی کاروباری دەرەوەی ئامریکا بووە، لەوکاتەی واشنتن لەڕێی میسرەوە هەواڵی پێشهاتەکەی ناوچەی سینای بۆ هات.
شاریێتیش کە گەشتێکی ئاشتیخوازانەی بەنێو رۆژهەڵاتی دوردا دەکرد، لە میانی گەشتەکەیدا لای سەرەک وەزیران جەواهیر لال نەهرۆدا بو، کاتێک لە رۆژنامەکانیدا هەواڵی پێشهاتەکانی وڵاتەکەی خوێندەوە.
دوای ئەوەی هەواڵە فەرمیەکە پەخشکرا، ئیدی پێواژۆی خۆپارێزی تاریککردن گیرانەبەر. ئەو دوشەمەیە لەلایەن زۆرینەی ئیسرائیلیەکانەوە پەردەی ماڵەکانیان گیران و پەنجەرەکانیان داپۆشتن و تاریکیان کردن.
لە کاژێر نۆی شەوەوە هەواڵیک لە ئۆرشەلیمەوەڕا هات، کە لە سەنگەرەکانی قۆشەنی سوپای عەڕەبەکانەوە گەڕەکی موسرارا Musraraی ئۆرشەلیمیان داوەتە بەر رێژنەی گوللەکانیان. هیچ قوربانی لێنکەوتنەوە. دوای ئەو روداوە پێدەچوو بەرەی ئوردن بە ئارامی بمێنێتەوە.
لەبەر ترسی ئەوەی نەبادا هێزی ئاسمانی میسری بە فڕۆکە هێرش بکاتە سەر تەلئبیب، پاولا بنگۆریۆنی ناچار کرد بێتە نهۆمی خوارەوە، چونکە لەباری پێویست و ناکاودا بەئاسانی بەرەو ژێر زەمین دەبردرا.
دەزگای هەواڵگری ئیسرائیلی بۆیان ئاشکرابوو کە هێزە ئاسمانییەکەی میسر زیاتر لە سەد میگی پانزە Mig-١٥، پانزە فڕۆکەی بۆمباهاوێژی جۆری ئیلوژاین Iljoesijn کە هەر یەکەیان دوو تۆن بۆبمب هەڵدەگرێ، شەست فڕۆکەی جۆری ڤامپایەر Vampire و بیست مەترەلۆزیان هەیە. گەر هاتو ئەو هێزە یان بەشێکی گرنگی بە رێکی دژی تەلئەبیب بەکاربهێندرێ ئەوا هیچی لەبەر نامێنێتەوە و خاپوردەکرێ. لەگەڵ ئەوەشدا بنگۆریۆن بەنابەدڵی گوازتیەوە بۆ نهۆمەکەی خوارەوە.
بەیانیەکەی رۆژی سێشەمە زوو لەخەو هەڵسا، هەستیکرد کەمێک لەجاران باشترە. بەڵام دکتۆرەکان پێیان گوت دەبێ جارێ هەر لەنێو جێگادا بمێنێتەوە.
گرتنبەری پێشهاتەکە کارێکی دژوار بوو، بۆ هەمو لایەکیش ئاشکراودیار بوو. بنگۆریۆن لە هەواڵەکانی دەزگای هەواڵگریدا زانی کەوا بەشیکی زۆری چەکە تازەکەی میسر کە لە چیکۆسلۆڤاکیاوەڕا هاتبوو لە ناوچەی سینایان دانابوو. گەر هاتباو میسر نیوە خۆئامادەکردنێکی هەبوایە ئەوا هەر کردەوەیەکی ئیسرائیلیانەی دەکردە بەهانە و بەسەر ئیسرائیلی دادەدا. پێگەی سەرەکی فڕۆکە جەنگیەکانی میسر هەر چەند خولەکەفڕینێک لە ئیسرائیلەوە دوربوون. بێجگە لەوەش قاهیرە دەسەڵاتی فەرماندانە سوپاکانی سوریا و ئوردنی لەپاڵ سوپاکەی خۆی هەبوو.
بەڕاستی سەرچڵیەکی گەورە بوو بۆ سوپاسالارێک ئەو پلانە سەربازییە بگرێتەبەر، بۆیە مایەی سەرسوڕمان نەبوو سەربارى نەخۆشیەکەی سەرۆک وەزیرانی پیری تەمەن حەفتا ساڵییەکە ئەو هەمو هەواڵ و بروسکانەی بەرەکانی شەڕ بە

دەماررژیەکی وا بخوێنێتەوە هەروەک قوماربازێکی مۆنتیکارلۆ Monte carlo کە تەماشای خولخواردنی تۆپەکە بکا ئەنجا بڕیار بدا.

سێشەمە راپۆرتێکیان لەسەر پەلاماری فڕۆکەکانی میسری بۆ سەر هێزەکانی زەمینییەکانی ئیسرائیلییان دایەدەست بنگۆریۆن. ئەمەیان گۆڕانگاریەکی گرنگی خستە سەر نەخشەی پێویستەکە. پێشتر فەرمانی دابوو هێزی ئاسمانی ئیسرائیلی نابێ بەسەر نۆکەندی سوئێسەوە بفڕێ، ناشبێ پەلاماری هێزە زەمینیەکانی دوژمن بدا، هەروەها ناشبێ نە پەلاماری فڕۆکەکانی دوژمن بدات و نە هێرشیش بکاتە سەر شارەکانی دوژمن؛ چونکە دەترسا کلّپەی شەڕی ئاسمانی بتەنێتەوە پەرەبسەنێ و شەڕێکی سەرتاسەری لێبکەوێتەوە، ئەەش رەنگبێ سەربکێشێ بۆ بەرایی شەڕی جیهانیی سێهەم. دەیەویست کردەوکە تەنها لەسەر زەوی و لەناوچە دیارکراوەکەدا سنوردابێ. بەڵام هەنوکە فڕۆکەکانی دوژمن هێزە زەمینەکانیانی خستۆتە بەر رەحمەتی میترالۆزەکانیان، بۆیە فەرمانی بەهێزی ئاسمانیدا کە داکۆکی لە هێزە زەمینیەکانیان بکەن.

هەمو سێشەممەکە ماڵەکەی کە ژمارە ١٧ بوو، بووە بارەگای سەرەکی ئۆپەراسیۆنە سەربازییە بوێرەکە. گەورە ئەفسەران دەهاتن و دەچون. تەتەرەکان بە هەگبەی پڕ لە بروسکە و راپۆرت سەریان بەژوردا دەکرد. سوپاسالارەکە بە چەندان کاژێر لەگەڵ سەرۆکی دەستەی هێزەکان، فەماندەکانی هێزی ئاسمانی، مارینز، زرێپۆش و پەرەشوتوانەکان دەدوا. لەو رۆژەدا چوار جاران وەزیری کاروباری دەرەوەی دی. بروسکەکان لەو چل وڵاتەوە کە ئیسرائیل پەیوەندی دیپلۆماتییانەی لەگەڵدا هەبوون، دەهاتن.

ئەمەش هەروەک بارەگا سەرەکیەکانی دیکە بوو، بەڵام بەتەنها جیاوازییەکەوە، لێرەدا سوپاسالار راکشاوە و بالیفی لەپاڵپشتن و کۆمەڵە کتێبێکیش لە سەر مێزەکەی بەردەمدان، کتێبەکان دەربارەی کاروباری ستراتیژی نین بەڵکو دەربارەی فەلسەفەی گریکی و رۆژهەڵاتین.

رێڕۆیشتن بەنێو ژورە پڕ کتێبەکاندا ئەنجا گەیشتنە شوێنی پیرۆز، وای لەمرۆ دەکرد بیر لە مۆزەی بەریتانی بکاتەوە کە کۆتایی بە هۆڵێکی خوێندنەوە دێت و تیادا زانایەکی ریشپسی دانیشتووە لە دەستنوسێک دەکۆڵێتەوە.

بنگۆریۆن سەرنجی وای لای هەندێ ئەفسەران دروست دەکرد کە پەلەبکەن و بەجێیبێڵن، تاکو بگەڕێتەوە سەر جیهانی کتێب خوێندنەوەکەی خۆی. کاتێک دەهاتنە لای پرسەکانی لۆژیکیانە تاوتوێ دەکردن، بە ئارامی و خێرا. بەڵام هەر کاتێک هەڵدەستان و دەڕۆیشتن دەستی دەدایەوە ئەو کتێبەی کە لە کاتی گەیشتنیان دەیخوێندەوە. لەو سێشەممەدا هەواڵی دڵخۆشکەرانەوە لەهەمو بەرەکانەوە هاتن. بەڵام تەنها یەکێکیان هەواڵێکی زۆر بێزراو بوو.

کفر قاسم Kfar Kasim گوندێکی عەرەبان بوو، لە سنوری ئوردن نزیک بوو. کاتێک هەڵمەتی سینا دەستیپیکرد، لەهەمو لایەکی وڵاتەوە رێکاری ئاسایشپارێزی گیرانەبەر. فەرماندەی خۆجێی ئەوێ فەرمانی قەدەخەکردنی هاتوچۆی لەدوای کاژێر

پێنجەوە بۆ دانیشتوانی کفرقاسم راگەیاند.
کۆمەڵێک لە گوندنشینان کە بە رێکاری پرسی قەدەخەکردنی هاتوچۆکردنیان نەزانیبوو، چونکە لە کێڵگەکانی خۆیان کاریاندەکرد، دوای کاژێر پێنجی ئێوارە لەسەر ئیش هێورهێور گەڕانەوە، کەچی لەلایەن پۆلیسی ئیسرائیلیەوە درانە بەر دەستڕێژی گوللە. لەنێو قوربانییەکاندا ژن و منداڵیش هەبوون. هەموی بەسەر یەکەوە ٤٣ کەس کوژران. بنگۆریۆن زۆر تورە بوو. کۆمیتەیەکی لە هاوڵاتیان پێک هێنا تا دەستبەجێ لە روادوەکە بکۆڵنەوە.
شەوی سێشەممە لە رادیۆوە گوێبیلێبوو ئینگلستان هۆشداریناماوەیەکی داوەتە ئیسرائیل و میسر کە هێزەکانیان چیدیکە لە نۆکەندی سوئێس نزیک نەخەنەوە و دەبێ لەدوری ١٠ مایلدا بوەستن. ئیدی کۆبونەوەیەکی حکومەتی پێویست بوو. لە نیوەی شەویشدا بروسکەیەک لە باڵوێزخانەی لەندەنەوە وەرگیراوە کە هۆشداریناماکە بەنوسین وەرگیراوە. دواتر دەبوایە وەڵامێکی بدرابایەوە.
نەخۆشەکە شەوەکەی کەم خەوت.
کاتێکیش بۆ بەیانیەکەی بیدار بووەوە، یەکەمین هەواڵ گوێبیستی بوو کەشتییەکی جەنگی میسر ١٠ تا ١٥ کیلۆمەتر لەکەنارەوە دەیەوێ حەیفا بۆمباران بکا. لە ماوەی دە خولەک و یانزە چرکەدا کەشتیەکە سەد و شەست بۆمبی هاوهێشت و هەموشیان لە نزیک کەنار کەوتنە نێو زێ. هەمو دانی بەیانیەکەی راپۆرت دەهاتن. کەشتیەکە ناوی ئیبراهیم ئەلئەوال Ibrahim el Awal بوو کە بەشداری لەزۆر نەبەردیەکانی ئینگلیزیی لە جەنگی جیهانی دوهەمدا کردبوو. دواتر کەشتیەکە درایە حکومەتی چینی و ئەوانیش لەدواییدا فرۆشتیانەوە میسر. هەنوکە کەشتیە میسریەکە لەلایەن کەشتیەکی تێکدەرانەی ئیسرائیلی هاوچەشنی خۆی کەلە ئینگلیستناەوە کڕدراوە، راودەنرێ.
راپۆرتی دوەم هەواڵی ئەوەی تێدابوو کە هەردوو کەشتیەکە پێکراون. کەشتیە میسریەکە زۆرتر پێکراوە و فڕۆکەکانی ئیسرائیلی بەسەریدا دەخولێنەوە. ئیبراهیم ئەلئەوال ئاگری تێبەربوو. دواتر سەرنشینەکانی خۆیان بەدەستەوەدا و کەشتیەکەش بۆ کەناری حەیفا راکێشرا. مرۆ هەوڵی دا کەشتیەکە نقومبکا، بەڵام کەشتیوانە میسرەکان لەوەدا سەرنەکەوتن کلیلی گونجاوی ئەو ماشێنە ژەنگخواردووە بدۆزنەوە و نەشیان توانی بەدەستی روتەوە هیچی لێبکەن.
یادەوەری بنگۆریۆن بۆ زور دور گەڕایەوە، بۆ ئەو سەردەمە مێژوویینەی کە ئیسرائیل لەیەکەم نەبەردی دەریاییدا سەرکەوتنی بەدەستهێناوە.
هەواڵی گرنگ دواتر لەهەمان رۆژدا هات. ئینگلستان و فەرانسە بەیەکەوە هانی بنگۆریۆنیان دا، بەڵام کردەوەیەکی سنوردار لە میانەی روداوگەلێک کە واتایەکی جیهانیی ببەخشێ بەهۆی پەلاماری ئەو زلهێزانە بۆ سەر فڕۆکەخانەکانی میسری و بۆ سەر نۆکەندی سوئێس گۆڕا.
تێکومەکاندانی بەشێکی گەورەی هێزی ئاسمانی دوژمن لەسەر زەوی واتای کۆتاییهاتنی ترسی بۆمبارانکردنی شارەکانی ئیسرائیلی دەگەیاند، بەڵام خەریک بوو

دەستبەجێ ڕەخنەی دیپلۆماتیانە دەگیران.
زۆرینەی ئیسڕائیلییەکان بە سەرەک وەزیرانیشەوە شەوەکەی بەئاسودەیی سەریان کردە سەر سەرینەکانیان. بەشێکی گرنگی هێزی ئاسمانی میسر تێکشکینرا؛ هێزەکانی ئینگلیزی و فەڕەنسی گەیشتنە نۆکەندی سوئێس و کەشتیە جەنگیە تێکشکاوەکەی میسریش لە حەیفا بوو. هەرچەندە کەشتیەکە هەنێک کۆن بوو، زیانیشی پێکەوتبوو بەڵام دەستکەوتێکی جەنگی باش بوو.
پێنجشەمەکەی لێشاوی دیلە جەنگییە میسریەکان و کەلوپەلە دەستبەسەرداگیراوەکان هێنرانە ناوەوەی وڵات؛ کەلوپەلەکان بایی ئەوە دەبوون سوپایەکی بچوکی پێ پڕ چەکوتفاق بکەی، دیلەکانیش ئەوەندە دەبوون کێشە بۆ وڵاتەکەیان بنێنەوە.
لە هەینیدا غەززە خۆی بەدەستەوەدا، لە کاژێر ١٠,١٥دا ناقۆن هەواڵێکی بەتەلەفون پێگەیشت: «ئێستا هەمو نیمچە دورگەی سینامان لەبەردەستدایە.»
بەلەز خۆی گەیاندە بنگۆریۆن و هەواڵەکەی پێڕاگەیاند. بەڵام سەرەک وەزیران بە قوڵی بەگژ بیرۆکەکاندا چوبوو. مقۆمقۆ کەوتبووە نێو نەتەوە یەکگرتووەکان. بڕیارێک بەدەنگی ٦٤ بەرامبەر ٥ دەنگ دەرچوو. بڕیاریەکە داوای دەستبەجێ کشانەوەی هێزەکانی ئینگلیزی-فەڕەنسی- ئیسرائیلیی دەکرد. نزیکەی هەمو دنیا کردەوەکەی سینای سەرزەنشتکرد. روسیا و ئامریکا بەیەکەوە دەنگیان بۆ دامەزراندنی دەوڵەتێکی جولەکە دا. لەو رۆژوە هەرگیز بەیەکەوە دەنگیان بۆ پرسێکی دیکە نەداوە. کەچی هەنوکە یەکیانگرتۆتەوە و ئیسڕائیلیان سەرزەنشت کردووە.
دوشەمە راپۆرتێکیان لە فەرماندەکە پێگەیشت (ڕێک هەفتەیەک دوای ئەوەی پەرەشوتوانان لە میلتا پاس دابەزین) : بەتەواوی دەست بەسەر دورگەی تیران Tiranدا گیراوە، ئیدی بەگوێرەی ئەو هەڵمەتەکە کۆتاییپێهات.
سەرەنجام: زیانی ئیسڕائیلییەکان: ١٧٤ کوژراو، یەک کەسیش ونبوو.
زیانی میسرییەکان: ١٠٠٠ کوژراو، ٦٠٠٠ دیل ( لەنێویاندا ٢٠٢ ئەفسەر)، لەدەستدانی کەشتیەکی جەنگی، سەدان تانک، تۆپ و پارچە چەکی دیکە کەوتنە بەردەستی هێزەکانی ئیسڕائیل.
هەر جارێک کە بنگۆرین ژمارەکەی حیساب دەکرد، ئەوەی لێزیاددەکرد: «ئەو ئیسڕائیلیەی ون بووە خۆی بەدەستەوەنەداوە؛ ئەو بە پەرەشوت خۆی لە فڕۆکە بەرداوەتە خوارەوە، ئیدی لەسەر سەری دوژمن تەقەی لێکراوە.»
ئەوە بیرۆکەی بنگۆریۆن بوو کە ئەفسەرە دیلە میسرییەکان بە حەیفا و تەلئەبیبدا بگێڕن پێش ئەوەی رەوانەی وڵاتەکەیان بکرێنەوە، بۆئەوەی هەرهیچ نەبێ کە گەڕانەوە شتێکیان هەبێ بیگێڕنەوە.
دوای نیوەڕۆ نامەیەکی لە بولگانین Bulganinی سەرەک وەزیرانی روسیاوە پێگەیشت. نامەکە نادۆستانە بوو، هەڵمەتی سینای بە دوژمنکارییەکی «چەکدارانە» ناوهێنابوو، بە «سەرچڵییەکی بێهودە»ی لەقەڵەمدابوو. بەگوێرەی نامەکە ئیسڕائیل وەک ئامرازێکی زلهێزە ئیمپریالیسیستەکان رەفتاری نواندبوو. وەک هۆشدارینامەیەک روسیا باڵوێزی خۆی لە ئیسڕائیل کێشایەوە.

بنگۆریۆن ئەو هاتنە سەر خەتەی روسیای راستەوخۆ یان لەرێی خۆبەخشینەوە بەهەند هەڵنەگرت. پێیوابوو کە زیاتر کاردانەوەیەکی بانگاشەکردنە لەوەی لێسورانەوەیەکی دیپلۆماتییانە بێ.

سێشەممە دوای ئەوەی نۆ رۆژان لەنێو جێگادا کەوتبوو، هەڵسایەوە و جلەکانی لەبەرکردن و بەچەندان کاژێر لەسەر ئەو دوانەی کە بۆ کنێستی دەدا، کاریدەکرد.

لەو رۆژەدا ئیسرائیل بەتەنها وەک هەڵمەتبەرێک مابووە، ئەمەش دوای ئەوەی هەر یەک لە ئینگلستان فەرانسە و لەژێر گوشاری نەتەوە یەکگرتووەکاندا ئاگربەستیان راگەیاندبوو.

لەو بەڵگانەی ئەوێ رۆژێ ناڤۆم دایە دەستی بنگۆریۆن، راپۆرتی کۆمیتەی لێکۆڵینەوەی روداوەکەی کفرقاسم بوو. پێدەچوو گێرانەوەی چیرۆکەکە تەواو راست بووبێ.

لەوکاتەی شەپۆلی رەخنە هەر لە بۆستنەوە تا بۆمبای بەهۆی هەڵمەتی سیناوە لە ئیسرائیل دەگیرا، رەنگبایە کەسی دیکە بووایە هەواڵەکەی کفرقاسمی پەردەپۆش دەکرد، بەڵام بنگۆریۆن بەپێچەوانەوە رەفتارینواند. ئەو لەسەر راستیەکان رێکاری خۆی گرتنەبەر و هەمو رۆژنامەکانیشی پێناساند و بڵاویان کردەوە، ئەوەش لەرێی رونکردنەوەیەکی فەرمییانە کە هەمو راستیەکانی ژماردبوو، بێئەوەی هەلومەرجی سوککردنی باری تاوانەکەش ناوبهێنێ. لێرەدا پێویستی بە بوێری هەبوو ئەوەش دیسان سەلمێنەری کۆگیریە روناکبیرییەکەی بنگۆریۆن بوو.

«هیچ گەلێک لەجیهاندا نیە ئەوەندەی گەلی جولەکە ژیان بەرز رابگرێ و مەبەستیشمان ژیانی هەمو تاکێکی مرۆڤە بێجیاوازی توخم، رەگەز، ئۆل و نەتەوایەتیی.»

بە بەڵێنێکی مکومەوە بریاریدا جارێکی دیکە شتی وا» هەرگیز لە ئیسرائیلدا رونەداتەوە.»

ئەو ئەفسەرانەی لەروداوەکە بەرپرس بوون دەبوایە بچنە بەردەم داداگا و هەر خێزانێکیش کە کەسێکی لەدەست داوە بە بری ٢,٧٥٠ دۆلاری ئامریکایی قەرەبووی کۆستکەوتنەکەی دەکرایەوە. دوای دادگایەکی دورودرێژ فەرماندەی یەکە پەیوەندیدارەکە بە ١٧ ساڵ زیندانی و ئەوانی دیکەش بە ٧ ساڵ حوکمدران.

رۆژی پاشتر لەجاران زوتر لەخەو هەڵسا و بەرەو ئۆرشەلیم کەوتەرێ. دکتۆرەکانی پیشنیازیانکرد کە یەکێکیان یاوەری بێ و پێویستیشە بەدانیشتنەوە دوان بدا، هەروەها دەشبێ دوای گەیشتنە ئۆرشەلیم یەک کاژێر پشوبدا. تەنها لەسەر خاڵی سێهەم رەزامەند بوو. سێ چارەگ لەسەر سەکۆی دوان راوەستا. پاولا بەخۆی و ترمزی قاوەی خەست لە نزیکییەوە بوو بۆ باریک گەر پێویستی پێ بووایە.

لەچاوی زۆر لە ئیسرائیلیەکان کاتەکە هی ئاهەنگگێران بوو. سەرلەنوێ هێزە جەنگاوەرەکانیان کارێکی ئەستەمیان بەجێگەیاند. جوەکان سینایان گرت. غەززە لەبن دەستیاندایە و کەسیش ناتوانێ رێگای ئیلاتیان لێبگرێ. بەڵام بنگۆریۆن بە رێکی هۆشداریدا؛ هێشتا کات هی ئەوە نیە پێیهەڵپەرن.

«ئەو ئەگەرە هەیە کەلە ئایندەیەکی نزیکدا خەباتێکی سیاسیانەی سەخت بکەین و لەوانەشە ئاستەنگی زۆر گەورەمان بێتەپێش. ئێمە نابێ بێباکانە بەچەشنی دەسەڵاتدارە عەرەبەکان لەخۆبایی ببین. هەروەها ناشبێ ملکەچی هێزە زلەکانیش بین گەر هاتو خاوەن ماف بووین.»

بێگومان بیری لە نامەکەی بولگانین دەکردەوە کە لەنێو گیرفانیدا بوو ئاشکرای نەکردبوو.

پێنجشەممە هەرچەندە شەکەت وماندوش بوو، کارەکانی لە کاژێر ٧ی بەیانیەوە دەستپێکردنەوە. رۆژنامە و بروسکەکانی نێردە دیپلۆماتییەکانی ئیسرائیل نمایشی هێستریای نیودەوڵەتیان بۆهات، ئەو وێنەیە تەنها لەسەردەمی پێش شەڕی کۆریا لەئارادا هەبوو. کۆبوونەوەیەکی بەپەلەی حکومەت بۆ کاژێری ١٠ی سەر لەبەیانی داندرا. وەزیری کاروباری دەروە گۆلدا مایر، لەرێگادابوو بۆ نیویۆرک بچێ، بەڵام داواکرایەوە. لەبەر ئەوەی فرۆکەکەی دەبوایە لەڕێی پاریسەوە بگەڕابایەوە ئیسرائیل، بۆیە کۆبوونەوەکە تا کاژێر ١١ دواخرا.

کۆبونەوەی کابینەکە دوو کاژێری خایاند. بەگشتی باس لەوەکرا وەڵامێکی نەرێیانەی بولگانین بدرێتەوە. بنگۆریۆن گەڕایەوە ماڵ. ئەو خاوبووەوە چونکە بڕیاریدابوو پێی لەسەر هەربستێک کە گرتبوویان بچەقێنێ و وەزیرەکانیش هاودەنگی بوون.

لەسەر نانی نیوەڕۆ بوو کە نامەیەکی سەرەک ئایزنهاوەر گەیشت. نامەکە رۆژی پێشتر نوسرابوو، بەڵام لەبەر ئەوەی پەیوەندی نێوان واشنتن و باڵوێزخانەی ئامریکا لە تەلئەبیب بۆ ماوەیەک پچڕابوو، نامەکە کەمێک دواکەوتبوو.

نامەکە زیاتر کەسایەتییانە نوسرابوو، لەوەی یاداشتیکی دیپلۆماتییانە بێ، وەلێ تۆنەکەی توند و بێگرێوگۆڵ بوو. گەر بێت و ئیسرائیل هێزەکانی نەکێشێتەوە ئەوا هەوڵەکانی نەتەوە یەکگرتووەکان بۆ گێڕانەوەی ئاشتی لە رۆژهەڵاتی ناویندا تەواو کزدەبێ و ئیسرائیلیش لەبەر ئەوەی بنەماکانی رێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکانی جێبەجێنەکردووە، سەرزەنشت دەکرێ. تیایدا هەڕەشەی سزادانیش کرابوو.

نامەکە روکردنەوەیەکی زارەکیشی لەگەڵدا بوو، بەوەی هیچ زلهێزێکی دیکە پشتی ئیسرائیل ناگرێ گەر هاتو یەکێتی شۆرەوی «خۆبەخشانە» خۆی لە پرسەکە هەڵقورتاند.

ئەمە بارەکەی سەرلەبەر گۆڕی و بنگۆریۆنی ناچارکرد بەوەی رەنگبێ ئەستەمترین بڕیاری لەژیاندا پێبدا. دەمودەست دوای ئەوەی بۆ دووهەمین جار نامەکەی ئایزنهاوەری خوێندەوە، زانی کەوا زۆر لەگوینە دەبێ ددانیپێدابنێ.

زیاتر لە دە ساڵێک دەبێ کە بنگۆریۆن ئایزنهاوەری دیتبوو، ئەوکات سەرۆکی دەستەی هێزەکانی سوپای ئامریکا بوو. ئەوەش لەکاتی گەشتەکەی بنگۆریۆندا بوو بە ئۆرودگای پەنابەرانی جو لە ئاڵمان. بەڵام هەنوکە ئەو هەستەی هەیە کە بەخودی خۆی پەیوەندی لەگەڵ سەرۆکدا هەیە. ئەوکات رێزێکی زۆری بۆ ژەنەڕاڵ نواند، هەنوکەش هەست دەکا متمانەی پێبهێنێ. بەڵام پێویستی بە دلێریی زۆر هەیە تا کابینەکە سەرلەنوێ بانگبکاتەوە داوای «بەڵێ» یان بۆ بڕیارە نوێکەی لێبکا، ئەمەش بێگومان

دوای ئەوەی کاژێرێک دەبێ  هەمو هەوڵێکی دا تا «نەخێر» یان پێبسەلمێنی.
باشە دواتر چی لە سوپا بکا. ورەیان ئەوەندە بەرز بووە هەرگیزیش وا ناچار نەکراوە کە بکشێتەوە. پرسی کشانەوە پرسێکی قورسە بەدەستیبێنێ. ئەوکات بارێکی تاڵ باسەر ئەفسەرە و پیاوانی دیکەدا دەکشێ رەنگبێ لێیتێنەگەن، کە بەکردەوە شتێک بەدەستهاتووە هەرچەندە نرخەکەی ناوچەی سیناش بێ. بیرۆکەی ئەوەی زەبرێک لە سوپا بدرێ  قورسترین شت بوولای ئەو.
لەدواییدا جەماوەریش هەبوو. هەڵمەتی سینا جۆشوخرۆشی گەلی دوای هەشت ساڵ لە ترسوبیمدا بزواند. هیچ سڵەمینەوەیەک لەو ئەگەرە نەبوو کە فرۆکە بۆمبهاوێژەکانی روسی بە نیشانەی میسرییەوە بێن و خاکی ئیسرائیل بە بۆمب دابێژن. هەروەها لەبەرامبەر ئەگەری سزادانیش ترس و دڵەڕاوکێ لەگوڕێدا نەبوو. ئیسرائیل دەیتوانی لەکاتی ناچاری برسێتیدا پشتێنی سەر زگی توند بگوشێ. بنگۆریۆن دەیزانی کە جەماوەر دەتوانرێ بەئاسانی بۆ سیاسەتێکی سادەییانە بۆخۆی رابکێشێ لەوەی ئێستا تێیکەوتووە. ئەوان ئەو هەستەیان لا پەیدا دەبێ گوایە ناپاکییان دەرهەق کراوە.
بەختی لەوەدا هەبووکەلە «وتارە سەرکەوتووانەکەی» رۆژی پێشتر هیچ رونکردنەوەیەکی سەبارەت بە پاشەڕۆژی  ناوچەی سینا نەدابوو، بەڵام ئەو شێلگیرانە گوتبووی هێزی جەنگاوەری ئیسرائیل چۆک بۆ هیچ گوشارێک دانانوێنی با لەلایەن رێکخراویکی نێو دەوڵەتییانەشەوە بێ. بەڵام زۆر ئاستەم بوو  ئیسرائیل بێ کۆمەکی بەرفراوانی فەرمی و نافەرمیی لایەنی ئامریکایی کەوەک لەڕابردوودا وەریدەگرت، بژیێ. سەرباری ئەوەش مرۆ دەبێ متمانەی بەوە هەبێ ئایزنهاوەر ناپاکی دەرهەق دەوڵەتی جولەکە ناکا.
دووەمین دانیشتنی بەپەلەی حکومەت ئەنجامدرایەوە. دوای چەندان کاژێریی پڕ لە مشتومڕ هەمو وەزیرەکان پێشنیازی بنگۆریۆنینان بەدڵبوو بۆ ئەوەی سەرەک ئایزنهاوەر دڵنیا بکاتەوە کە ئیسرائیل ئامادەیە سینا بەجێبهێڵێ گەر رێورەسمێکی بەرچاوی هێزەکانی رێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان بەخۆیەوە ببینێ. کابینە دەنگی بۆ پێشنیازەکە دا و دەبوایە هەمان شەویش لە رادیۆدا بۆ گەل قسەبکا.
نوێنەرانی تەواوی لایەنە ئۆپۆزسیۆنەکان بەدەر لە کۆمینیستەکان لە کۆنفرانسەکەدا بانگکرابوون. کاژێر  نۆ و نیو بوو کاتێ کۆنفرانسەکەی جێهێشت. ژەمە خواردنێکی سوکی خوارد و چووە نوسینگەکەی تا دوانەکەی رادیۆی بنوسێ.
لەمیانەی نوسینەکە بەردەوام دەیانپچڕاند. وەزارەتی کاروباری دەرەوە هەمو دوای نیوەڕۆکە سەرقاڵی ئامادەکردنی وەڵامێکی ئایزنهاوەر بوون. شەش کاژێری خایاند تا لەوەڵامنامەکەدا بوونەوە. هەمو پەیڤ، هەمو پیت و هەمو وێرگولێک خاڵی باسکردنی نێوان ئۆرشەلیم، وواشنتن و نیویۆرک بوون. هێڵی تەلەفونەکانی نێوانیان بەردەوام لەکاردابوو.
لە میانەی شەوەکەدا یەکێک تێبینی ئەوەیدا کە نامەکەی سەرۆکی ئامریکا کاراکتەرێکی کەسایەتیانەی لەخۆگرتبوو بۆیە جارێکی دیکە پێویست بوو لە واشنتن

بپرسنەوە ئاخۆ دەکارن نامەکە بۆ جەماوەر ئاشکرا بکەن. قسەیەکی سەرپێیانە لەگەڵ باڵوێزخانەی واشنتۆندا کرا. بەهۆی جیاوازی کاتەوە لەوێ نیوەڕۆ بوو. هەر زوو مۆڵەتیان دا نامەکە بڵاوبکەوەنەوە.

چەندان کاژێر بنگۆریۆن لەپشت مێزی نوسینگەکەیدا لەسەر کارتە ناسراوەکانی دوانەکەی دەنوسیەوە. یاریدەدەرانی پەڕبەپەڕیان بۆ لای پیتچنەکە دەبرد. چ نامەکەی بولگانین و چ هی ئایزنهاوەر وەرگێڕدرابووە سەر زمانی عیبری، کەچی سەرەک وەزیران سەرلەبەری لەسەر کارتەکانی خۆی نوسینەوە، تا لەکاتی دوانەکەیدا بتوانی باشتر بیانخوێنیتەوە.

لە درێژەی شەوەکەدا پێویستی بە سکرتێریکی زیاتر هەبوو، بۆیە یەکێکیان لەسەرۆکایەتی حکومەتەوە بۆ بانگکرد. کاتێکیش خانمە سکرتێرەکە گەیشت، بنگۆریۆن لە ناوەکەی پرسی.

«ناوم شیفرا رابینهوڤیچ Shifra Rabinovitch ە.»

سەرەک وەزیران بە شێوەیەکەی نادۆستانە پرسی: «بۆچی تائێستا ناوێکی عیبرییانەت نیە؟»

کیژەکە سورهەڵگەڕا و گوتی: «بەهیوام لەرۆژێکدا بەهۆی مێردکردنم ناوەکەم بگۆڕم.»

بنگۆریۆن خەندەگرتی و گوتی: «کەواتە هیوای هاوسەرێکی باش و ناوێکی عیبرییانەی جوانت بۆدەخوازم.»

دوانەکە کەمێک پێش نیوەشەو لەسەر نەوارێک تۆمارکرا. پەخشکردنەکە لە کاژێر دوانزەو نیوی شەو پەخشدەکرا. لەرادیۆدا چەندان بانگەواز بڵاوکرانەوە کە پەخشانامەیەکی گرنگ لەرادیۆدا بڵاودەکرێتەوە، بەڵکو گوێگران لەدەستیان نەچێ.

بنگۆریۆن لە نوسینگەکەی خۆی مایەوە. ناڤۆن رادیۆیەکی بچوکی هەبوو. کورسیەکان لەشێوەی هەیڤەداس دانران. یەکێکیان قاوەیەکی تورکی سازکرد. گۆلدا مایەری وەزیری کاروباری دەرەوە، نامیر Namirی وەزیری کار و ئاران Aranی وەزیری پەروەردە لەتەک یاریدەدەرانی بنگۆریۆن لەوێ ئامادەبوون.

پێش پەخشکردنی دوانەکە بنگۆریۆن دەستیدایە یەکێک لە چوار تەلەفونەکە ژمارەیەکی لێدا و لە تەلەفونەکەدا گوتی : «پاولا بەڵێنم پێدابووی ئاگادارت بکەمەوە. پەخشەکە دوای پێنج خولەکی دیکە دەستپێدەکا.»

پەخشەکە نیو کاژێری برد. لەو کاتەی بنگۆریۆن لەسەر کورسیکە پاڵیدابووەوە گوێی لەدەنگی خۆی رادەگرت، پێدەچوو بارە گرژیەکەی خاو بووبێتەوە. جارێکی دیکە بووەوە ئەو پیاوەی کە ئەرکێکی بەرچاوی لە خەباتی نەوەکاندا رایدەکرد، پێدەچو بڕیارێک بدا، بڕیارێکی پڕواتا. ئیدی دەکرا بچێتەوە ماڵ هەروەک ئەو دکتۆرەی نەشتەرگەرییەکی گەورەی ئەنجامدابێ، کەمێک لە کتێبەکەی «زیرەکی لای مرۆڤە هەرە کۆنەکان» بخوێنێتەوە و چێژ لە بێدەنگی نیوەشەو وەربگرێ. لە رۆژی هەینیدا نوسراوێکی زۆر دۆستانەی لە ئایزنهاوەرەوە بۆهات کە سوپاسی بڕیارەکەی کردبوو.

یەکێک لە گەورەترین بێئومێدییەکانی ژیانی ئەوەبوو کە لەو ماوەیەدا بەهۆی نەخۆشی نەیتوانی بچێتە سینا و هێزەکانی لەکاتی کشانیاندا بپشکنێ. هەفتەیەک دوای ئەوەی لەسەر جێگاکەی رابو و کاتێکیش پزیشکەکان مۆڵەتیان پێدا، گەشتێکی دوو رۆژەی بە فڕۆکە بەسەر هەمو ناوچە داگیرکراوەکانیدا کرد. (هێشتا لەشکر دەستی بەکشانەوە نەکردبوو.)

رۆژی پاشتر لە کنیست روبەروی توندڕەوەکان بووەوە. ئەو کۆمۆنیستانەی سەرهێڵی سیاسیی مۆسکۆیان پەیڕەودەکرد، لەوە توڕە بوون کە ئەو فەرمانی پەلامارە هەڵمەتبەرەکانی داوە. هیروتیش توڕە ببوو چونکە بەڵێنی کشانەوەی لەشکری دابوو. بەڵام هەستوسۆزی هەردو گروپەکان لەبەر زۆرینەی دەنگی کەنیست بەلاوەنران. پێش ئەوەی دانیشتنەکە کۆتایی پێبی سەرەک وەزیران پێناسەیەکی نوێی بۆ چەمکی ئازایەتی داڕشت.

«ئازایەتی جۆرە زانیارییەکی تایبەتمەندە، زانینێکە بۆ مرۆڤی روندەکاتەوە کە چۆن بترسێ، بۆچی ئەو بترسی و چۆنیش لەو شتانە نەترسێ کە شایانی ترس نین.»

روێکی دیکەی ئازایەتی باسنەکرد، ئەو ئازایەتیەی کە بڕیارێکی ناخۆشەویستانە (ناجەماوەرییانەی) پێبدەی. ئەوەش جاری یەکەم نەبوو کە بنگۆریۆن بیسەلمێنێ ئەو جۆرە ئازایەتییەی هەیەو دوا جاریشی نابێ.

لە کۆتایی دیسێمبەردا یەکێک لە کۆچبەرە نوێکان لە بیئر سەبعەوە نوسی؛ ئەو تاکە جوت پێڵاوەکەی لە هەڵمەتی سینادا دڕاندوە و بەداخیشە دەرفەتی نەبوو یەکێ لەو هەزاران جوت پێڵاوانەی لە میسرییەکان بەجێمابوون، بۆخۆی گلبداتەوە.

بنگۆریۆن لە خەرجی گیرفانی خۆی جوتە پێڵاوێکی نوێی بۆ کابرا کڕی.

# بەشی
# (٢٧)

بەدرێژایی هەفتەیەکی رەبەقی ساڵی ١٩٥٧دا وێنەیەکی سەرەک وەزیرانی ئیسرائیل لە هەمو رۆژنامە و گۆڤارەکان هەر لەپاریسەوە تا بریسبێین Brisbane (شارێکە لە رۆژهەلاتی ئوسترالیاوە-وەرگێڕ) بلاوبووەوە و خوێنەرانی سەرقالکرد. لەراستیدا وێنەکەش لەسەر کەناری تەلئەبیب گیرابوو کە هی پیرەمێردێکی سەرسپی بوو لەسەر سەر وەستابوو.

هەندێک کەس وایان دەزانی نوکتەیەکە. بە گەورەکردنی وێنەکەش سیمایەکە بەتەواوی دەرنەدەکەوت تا بناسرێتەوە. لە وێنەکەدا کابرایەکی کورتەبالای بەرینی سەرسپی دیاربوو، لە ئەوەندە زیاتر لەوێنەکە هەڵنەدەکرا. سەرباری ئەوەش ئەوانەی لە نزیکەوە بنگۆریۆنیان دەناسی، وایان دەزانی هەرگیز مەیلی بەلای جومناستیکدا نەدەچوو، هەنوکەش تۆ بڵێی دوای حەفتا ساڵ و یەک دوو ساڵێکیشە باری لەشساخی لەنگە، کارێکی وای لەمست بێ.

بەلام لەگەڵ ئەوەشدا ئەوەی لە وێنەکەدا دیار بوو بنگۆریۆن بوو و چیرۆکێکی خۆشی هەبوو کە بەتەواوی رواینەگەیاند.

کەمێک دوای جەنگی رزگاریخوازانە وەزارەتی بەرگری بە دڵنیاییەوە کابرایەکی بەناوی موشێ فێلدێنکرایس Moshe Feldenkrs کردە بەپرسی بەشی ئەلەکترۆنی. ناوبراو بەگەنجی دە ساڵان لە فەلەستین ژیاوە و پاشان چۆتە فەرەنسا و ئیتالیا لەوێ زانستە سروشتییەکانی خوێندووە.

فێلدنکرایس پیاوێکی فرەلایەن بوو. ساڵانێکی دورودرێژ لەگەڵ مالباتی کوری Curie (ماریا کوری١٨٦٧-١٩٤٣ کیمیا و سروشناسێکی پۆلۆنی- فرانسی بوو. لە کایەکانی رادیۆم و توخمەکانی پۆلۆنیۆمدا پسپۆڕ بوو، دوو خەلاتی نۆبلیشی وەرگرتووە-وەرگێڕ) خەریکی لێکۆڵینەوە بوولەسەر توخمی رادیۆم. لەو سەردەمدا وانەی تایبەتیانەی لەسەردەستی ژیگۆرۆ کانۆ Jigoro Kanoی پسپۆڕ لە جۆدۆ Jodoدا وەرگرتووە. ئەو یەکەمین ئاورووپی بوو قایشی رەشی بەدەستهێناوە و لەفەرەنساشدا یانەیەکی یویو یوتسو jiu-jitsuی دامەزراندووە. کاتێکیش ئاڵمانەکان لەفەرانسە نزیک بوونەوە، ئەو بارگەوبنەی بەرەو ئینگلستان تێکنا. لەوێ لێکۆڵینەوەی زانستی ئەنجامدا کە پەیوەندییان بە سۆراخکردنی بەلەمە ژێر دەرییایەکان(غەواسە) وە هەبوو. کاتێکیش مرۆ لەئینگلستاندا هێرش و پەلاماری و داگیرکاری ئاڵمانەکانی

بەدور نەدەزانی و پاسەوانانی نێوخۆش لەداری دەست زیاتریان پێنەبوو، فێلدنکرایس نامیلکەیەکی بەناوی «شەڕکردن بێ چەک» نوسی، تیایدا ئەوەی نمایشکردبوو چۆن پاسەوانەکان بەدەستی روتەوە بتوانن پەلاماردەرانی پڕچەک چەکبکەن.

فێلدنکرایس وای وێنای جۆدۆ jodo دەکرد کە «هونەرێک وزەی جەستە و گیان بەشێوەیەکی بەرز و کاریگەر ئاراستەی بەدیهێنانی ئامانج دەکا» . ئەو بەقوڵی لەسەر شێوازی خۆڕکێفکردنی جەستەدا کۆڵیەوە، بەشێوەیەک بێئەوەی هیچی بەسەربێ ئەرکی مەزن ئەنجامبدا. یەکێک لە نۆ کتێبەکانی بەناوی «جەستە و رەفتاری پێگەیشتووانە»بوو تیایدا باسی ترس، توەڕەیی، سێکبازی، هێزی راکێشان و کاردانەوەکانی دەکرد. تیایدا باسی ئەوەی کردبوو کە پەیوەندی نێوان لاسەنگی بەهۆی لەدەستدانی هەست و رەفتار و گرژبونی ماسولکەکان، هەڵە تەکنیکییەکانی هەناسەخواردنەوە، ئەزمونە سەرنەکەوتووکانی سێکس، پەنجەی کووڕبووە و چەقوەستانی جەستەوە هەیە. چارەسەریش بەلای ئەوەوە شەقڵێکی نوێی جەستەیە.

لە ئینگلستاندا لەگەڵ کەسانێک کە کێشەی جەستەیی و سۆزدارییان هەبوو کاریدەکرد و بۆیدەرکەوت، دەتوانێ یارمەتیان بدا. بەڵام بەپێی پۆلینکردنە نەریتییەکان و دامەزراوە داودەرمانییە زانستیەکان، بیرۆکەکانی ئەو رەتدەکرانەوە.

لە ئیسرائیل ئەو وڵاتە تازەیەی کە هێشتا باوەڕیان بە «مەحاڵ» هەبوو، پزیشکەکان بەچاوێکی گوماناویەوە تەماشایاندەکرد، لێ نەیانگەیاندبووە رادەی دوژمنکاریی. هەرزوو ئەوەندە نەخۆش و دەردەداری بۆ هاتن، دەبوایە واز لە لێکۆڵینەوە ئەلەکترۆنیەکەی بهێنێ. پرۆفیسۆر ئارۆن کاتزیر Aron katzir لە پەیمانگای وایزمەندا فێلدنکرایسی بە بنگۆریۆن گەیاند.

فێلدنکرایس بە بنگۆریۆنی گوت: «مێشکی لێبڕاوانەی مرۆڤ وەک هەوا وایە لە رۆژێکی خۆشدا، کە بەکردەوە بەتاڵە. مێشکێکی ئاسایی دەتوانێ حەفتا زمان لەخۆبگرێ و مایسترۆیەکی بە ئەزمون لەتوانیدا هەیە دەیان ئۆپێراو سیمفۆنیا لە یادەوەری خۆیدا جێبکاتەوە. مایسترۆکە دەکارێ شەست و هەشت یان شەست ونۆ زمانی لە پاڵدا فێر ببێ و زمانزانیش دەتوانێ هەمان ژمارەی ئۆپێراو سیمفۆنیا لە مێشکی خۆیدا جێبکاتەوە.

ئەو کەسەی کە ئێمە بە پیتۆڵی دەزانین تەنها پێنج لەسەدی تواناکانی مێشکی بەکاردەهێنێ.»

سەبارەت بەو شێوازە شاشەش کە مرۆ جەستەی خۆی دەجوڵێنی، بە بنگۆریۆنی گوت: «ئێمە لە رۆیشتنماندا وەک کۆمەڵە بوکەشوشەیەک رێدەکەین لەوەی پاشای ئافەریدەکان بین.»

بنگۆریۆن کەم تاکورتێک دەربارەی تاقیکردنەوەکانی یۆگای خوێندبووەوە بۆیە لایەنە تیۆرییەکەی دەزانی؛ مرۆڤ بەهۆی جڵەوکردنی جەستەی خۆی دەتوانێ زیرەکایەتی و بازوبەندی تێدا دەربکەوێ. بەڵام هێشتا هەر لێی دڵنیا نەبوو.

بە میوانەکەی گوت: «من پێویستیم بە گەواهی هەیە.»

فێلدنکرایس لیستێکی نەخۆشەکان، کتێبەکانی خۆی، گەواهیە نوسراوەکانی کە

بۆیهاتبوون لەگەڵ نمونەی دەرسێکی بۆ نمایشکردن، خستەبەردەست. ئەنجا سەرەک وەزیران بڕیاریدا: «ئەز کتێبێکی تۆ دەخوێنمەوە.»
ڕۆژێک دواتر سەرلەنوێ بانگی فێلدنکرایسی کردەوە.
«ئایا تۆ چەند دەرست پێویستن؟»
فێکلدنکرایس گوتی: «ئاسایانە هەفتەی دەرسێک لەماوەی ساڵێکی ڕەبەقدا.»
«بەڵام من هەرگیز شاگردێکی تەمەن هەواز حەفتاساڵیم نەبووە. ڕەنگبێ تۆ زۆر لەوە پترت پێویست بێ تا لە مەشقە نوێیکانم ڕابێی.»
بنگۆریۆن ویستی نمونە دەرسێکی ببینێ ئەنجا لەسەری ڕێکبکەون بەڵکو ڕۆژانە دوای تەواوبوونی کارەکەی یەک کاژێر دەرسی پێبدا.
لەیەکەم مەشقیدا دەبووایە بنگۆریۆن بەچاو نوقاندنەوە لەسەر پشت پاڵ بکەوێ، قاچێکی بەرزبکاتەوە و بەهێواشی بیسوڕێنێتەوە، ئەوەش لەکاتێکدا کە بەتەواوی تەرکیز بکاتە سەر ئەوجوڵەیەی ئەنجامی دەدا.
کاتێک فێلدنکرایس لە شاگردە نوێکەی دەکۆڵیەوە، کەوتە بەردڵی. ئەم پیاوە بەو ژانەی پشتیشی هەندێ جوڵە بە متمانەیەکی سەماکارێکی کۆرسئاسا دەکا، ئەوەش نیشانەیەی بەرەوپێشوەچوونی دەگەیاند. دوای دوو دەرس سەرەک وەزیران لیێپرسی: «ڕەنگبێ ئەو مەشقانە زۆر شتی لەبنسەردا هەبێ. چەند مانگێکی دورودرێژە کە ئازاری جومگەی سمتم هەیە، هەمو شەوێک چارەگێک هەڵمدەسێنێتەوە و لێناگەرێ بخەوم. بەڵام ئەمشەو کاژێرێک لەسەر یەک بەئارامی نوستم.»
پاولا لەو نێوەدا نەکەوتبووە ژێر باندۆری مەشقەکان. لەسەرەتاوە مامۆستاکەی بەساختەکار دەبینی ناوی لێنابوو «کاک حەللەق مەللەق» (نوسەر لێرەدا دەستەواژەی ئەفسوناوی هۆکوس پۆکوس Hocus Pocus بەکارهێناوە کە هیچ واتایەکی نیە. منیش حەللەق مەللەقە کوردیەکەم بۆ ئەو شوێنە پڕ بەپێستی زانی-وەرگێڕ). بەپیاوەکەی گوت کەوا کاتی بەسودی مێردەکەی بە شتی «بێسود» بەفیڕۆ دەدا.
بەڵێ کاتێک بنگۆریۆن بەهۆی مەشقەکانیەوە هەندێ پێشوەچوونی لە خۆکۆنترۆڵکردن بە سەر جوڵەی جەستەیدا بەدەستهێنا، گەشتێکی پشکنینی سەربازییانەی بە ماتۆڕەبەلەمێک بە کەنداوی ئەکەبە(عقبة) Akabaی ئاوە ساردەکەدا کرد. لەوێشەوە گەڕایەوە ئۆرشەلیم کە دانیشتنێکی بەپەلەی کابینەی حکومەتەکەی هەبوو. شەوێکیشیان کە دافێلدنکرایس هاتەماڵیان پاولا بەساردیەوە بەخێرهاتنیکرد.
«شالۆم سڵاو، کاک حەللەق مەللەق. ئەمشەو ئەو تۆ نابینێ. پزیشکەکە پێیگوتووە کەوا سیەکانی هەوکردووە.»
بنگۆریۆن کە گوێی لێیان بوو، لەژورەکەی خۆیەوە بانگیکرد: «ئەگەر فێلدنکرایس بێ، لێیگەڕێ بابێتە ژور. دەمەوێ قسەی لەگەڵدا بکەم.»
مامۆستاکە بۆ ئەو شەوە کاری بە بەرنامە ئاساییەکەی پێشوی نەکرد، بەڵکو مەشقی چۆنیەتی هەناسەدان و خواردنەوەی بۆ دانا.
پاولا وەک پاسەوانێک لای مێردەکەی وەستا.
«تۆ ئەو شەو ناتوانی هیچی لێبکەی، ئەو نەخۆشە.»

«من لەوە ئەرخاینم گەر لێم بگەڕێی پلەی گەرمییەکەی دادەبەزێنم.»
پاولا پێکەنی و گوتی: «من پەرستار بوومە و باوەڕم پێی نیە.»
ئیدی هەردوکیان گرۆییان لەسەرکرد. پاولا پلەی گەرمیی نەخۆشەکەی گرت و فێلدنکرایسیش دەستی بە مەشقەکانی کرد.
دە خولەک دواتر پلەی گەرماکەی گرتەوە. هەنوکە یەک نمرەی تەواوی فەهرەنهایت دابەزیبوو. بەڵام نەخۆشەکە هەر بەوەندە مەشقە وازیهێنا.
«دەبڕۆن و جاریَ وازملێبێنن.»
هەفتەیەک پاشتر قیت بووەوە و مەشقە ئاساییەکانی خۆی دەستپێکردنەوە.
لە ماوەی سێ مانگە بەراییەکانی ساڵی ١٩٥٧دا، قەیران لەدوای قەیران سەریانهەڵدەدا. لە هەمولایەکەوە گوشار دەخرایە سەر ئیسرائیل تاکو لە کەرتی غەززە و کەنداوی عەقەبەدا بکشێتەوە. دانیشتنی بەپەلەی حکومەت سازدرا و نزیکەی هەمو بروسکەیەکیش ووشەی «زۆر پیویست»ی لەسەربوو، ئیدی هەمویان تەنگاو ببوون. کەچی بنگۆریۆن رێنمایی دەرکرد کە هیچ کەسێک نابێ لەکاتی مەشقە دەرسەکانی فیلدنکرایسدا تەنگەتاوی بکا و بیپچڕێنێ. جاریَکیان لەنیوەی کۆبونەوەیەکی گرنگدا سەیرێکی کاتژمێرەکەی دەستی کرد و هەستیکرد کاتی مەشقەکانی هاتووە گوتی: لێم مەگرن، ئێمە جاریَ دانیشتنەکە هەڵدەپەسێرین. بە دەقاودەقی دوای یەک کاژێر دەگەڕێمەوە لاتان.»
تەنها جارێکیان لە پەیڕەوی مەشقەکان لایدا، ئەویش کاتێ ئارگۆڤ هاتە لای و بروسکەیەکی دوانەخراوی سەرەک ئایزنهاوەری بۆ هێنا.
هەندێ جاران سەرەک وەزیران لەگەڵ مامۆستاکەی باسوخواسی دەروونناسی و رەوشتیان دەکرد. جارێکیان فێلدنکرایس گوتی:
«خەڵکی خۆگونجێنەر هەرگیز سەودایەک ناکا تا پێچەوانەشی نەهێنێتیە بەرچاوان. بڕیار ئەو کاتە گرنگ دەبێ کە لایەنی پەیوەندیدار ئەگەری پێچەوانەکەشی بەهەند هەڵبگرێ.»
ئەمەش بووە مایەی گفتوگۆیەکی دورودرێژی نێوانیان، چونکە بنگۆریۆن لەو رۆژگارەدا بڕیارێکی لەپێشبوو بیدا کە خۆی لێبەدوردەگرت: ئایا دەبووایە مل بۆ گوشاری نێو دەوڵەتی کەچ بکا و لە غەززە و عەقەبە بکشێتەوە، یان نا؟
هەرگیز فێلدنکرایس ئەو جۆرە مژارە تەواو چاوەڕواننەکراوانەی بە سەرەک وەزیران نەدەبڕین. شەوێکیان گوتی: تۆ لە بواری زانستی ئەلەکترۆنیدا پسپۆڕی، دەتوانی پێمبڵێی ئایا هەڵدەکەوێ ماشێنێکی ئەلەکترۆنی دروستبکرێ کە هەمو ئەرکەکانی مێشکی مرۆڤ لەخۆی بگرێ؟ یاخود ئەو بەهایەی تێدایە کە مرۆڤ هەرگیز بەرێچکەی ماشێنێکی وادا نەچێ.»
پاولا سکاڵای جۆراوجۆری لەسەر مەشقەکان هەبوون.
«من کەیفم بەو جۆرە خەڵکانە نایەت کە زۆر بایەخ بە جەستەی خۆیان دەدەن. تۆ هەستێکت داوەتە پیاوەکەم کە چەند گرنگە چۆن بەپێوە بوەستێ، چۆن بڕوا، چۆن دابنیشێ.»

بەڵام کاتێ زانی کە تەندروستی هاوسەرەکەی بەرەو پێشەوە دەڕوا، بەرەبەرەوە رای گۆڕا و وایلێهات خۆی نەخۆشی بۆ لای «کاک حەللەق مەللەق» دەناردن.

سەرۆک بنزیڤی جارێکیان بەرێکەوت لەکاتی مەشقەکانی بنگۆریۆندا بەسەریانداهات، دیتی لەتەنیشت پاولا پرۆفیسۆر کاتزیر و سکرتێرە تایبەتییەکەی راوەستابوون؛ بەوردی بۆی رونبووەوە کە سەردانە رازداریەکانی پسپۆڕی بواری زانستی ئەلەکترۆنی چی لەبن کڵاودا هەیە.

رەنگبایە ئەو نهێنییە هەرگیز دەرنەکەوتبایە، گەر هاتباو فێلدنکاریس سەردانی هەندەرانی نەکردبایە. کەمێک پێش ئەوەی ئیسرائیل بەجێبهێڵێ، بنگۆریۆنی فێرکرد چۆن بەبەخۆهاتنەوەوەی تەواوەوە ترسە غەریزەییەکەی جەستەی راوبنێ. یەکێک لەو مەشقانە لەسەر دەست وەستان بوو. سەرەک وەزیران مەشقەکەی لەسەر جێگادا پێدەکرا، بەڵام هێشتا لەخۆی ڕانەدەی لەسەر زەوی ناوماڵەکەی خۆی تاقیبکاتەوە.

کاتێکیش یەک دوو هەفتە دواتر روپەڕی رۆژنامەیەکی لەندەنی هەڵدایەوە، وێنەیەکی شاگردەکەی بینی کە زۆر بەورێکوپێکی مەشقی لەسەر دەستوەستانی کردبوو. زەنگێکی بۆ تەلئەبیب لێدا، پێیان راگەیاند کەوا بنگۆریۆن لە میوانخانەی شارۆن لە هێرزلیا یەک دوو رۆژی بەسەربردووە، ئیدی لەوێ لەسەر لمی کەنار بۆی رونبۆتەوە کەدەتوانی مەشقەکانی بکا.

«وامزانی لمی کەنارەکە وەک دۆشەکی سەر جێگا نەرمە و روبەرەکەشی لەبارە بۆ مەشقەکان. لەراستیشدا وادەرچوو. هیچ بیرۆکەیەکم بەخەیاڵ نەهات کە کەسیک دەمبینێ.»

وێنەگرەکە بە نەناسراوی مایە، چونکە وێنەکە کامێرایەکی تێلیلێنس (تێلیلێنس بۆ گەورەکردنی وێنە و نزیککردنەوەی پنتە نادیارەکان بەکاردێ-وەرگێڕ)ی بەکارهێنابوو. دوو وێنەی لەوانەی گرتبوونی، بە رۆژنامە و گۆڤارە بەربڵاوەکانی جیهانیی فرۆۆشتن، ئیدی ئەو وێنانە هەر لەوکاتەی بۆتە بیچمێکی ناودار زیاترین وێنەی شوراوەی بنگۆریۆن بوون. باشی و ناباشی وێنەی لەسەر دەستوەستانەکە لە بۆتەی ئاهەنگە فەرمیەکاندا باسکران، بەڵام زۆرینەی خەڵک لەمەبەستی مەشقەکان تێنەگەیشتن.

فێلدنکرایس رونیکردەوە «وەستان لەسەردەست لەخودی خۆیدا مەبەست نیە. لێکدانەوکە زۆرئاسانە، کە یەکێکە لەمەشقە بێژمارەکان بۆ خۆ جڵەوکردن (خۆکۆنترۆڵکردن). ئەوەش قۆناخێکی گەیشتنە بە قوڵبوونەوە لە بەخۆهاتنەوە. هەرکاتێک مرۆ ئامانجەکە بپێکێ، ئیدی پێویست ناکا مەشقەکان دوبارەبکاتەوە.»

دکتۆرێکی هیندی کە سەردانی ئیسرائیلی کردبوو، لێیان پرسێ ئاخۆ ئەو جۆرە مەشقانە چەند بۆ لەشساخی باشن.

لەوەڵامدا گوتی: «ئەوە نازانم ئاخۆ ئەو جۆرە مەشقانە تەندروستی مرۆ بەرەو پێشەوە ببەن؛ بەڵام ئەوەندە دەزانم مرۆ دەبێ وەک گوێز ساخبێ تا ئەو جۆرە مەشقانە بکا.»

هەر لە سەردەمی هەراشییەوە بنگۆریۆن ئەوە یەکەمین ساڵی بوو کە هیچ

دەردێکی توش نەبوو؛ تەندروستیەکی باش تەنها دوو ددانی پشتەوەی دەرهێنان و ساچمەیەکیشی لە جەستەدا مابۆوە، دەرهێنا.

ئەو جلی پشتپاریزی فرێدان، پێویستی بە پشتمل لەناو ئۆتۆمۆبێل و دەرەوەییدا نەما، کێشی کەم بووەوە و دەیتوانی هەر کاتێک بخوازێ وەک کوڕێکی چواردەساڵی لەسەر زەوی بە ئاسانی چوارمشقیانە دابنیشێ. جارێکیان کە لەسەر یەک پێ وەستا، قەیتانی پێڵاوەکەی توند ببوو، بەپێکەنینەوە گوتی: «سی ساڵی ڕەبەقە بە هۆیەوە نەچەماومەتەوە.»

ڕۆژێکیان لەگەڵ یاریدەدەرەکانی سەردانێکی کۆمیتەی ئاهەنگێڕانی بەبۆنەی ساڵرۆژی دەهەمی سەربەخۆیی ئیسرائیل کرد.

پرسی: «ئەرێ نوسینگەی کۆمیتەکە لەکامە نهۆمە.»

«لەنهۆمی چوارەم.»

«دە ئێوە بە ئەسانسێر بڕۆن، ئەزیش بەپێیان سەردەکەوم.»

کاتێک گەیشتنە نهۆمی چوارەم یاریدەرێکی پێیگوت کەوا کارمەندی ئەسانسێرەکە بێئومێد بوو چونکە دەرفەتی نەبوو بە ئامێرەکە جەنابی بنگۆریۆن بگەیەنێتە نهۆمی مەبەست.

«باشە، کاتێ گەڕاینەوە، من بە ئەساسنێر دادەبەزم.»

کاتێک تەمەنی گەیشتە حەفتاو سێ ساڵ هەمو ڕۆژێک سەر لەبەیانی و ئێواران شەش کیلۆمەتر بە پێ دەڕۆیشت.

کەم سەرەک دەوڵەت وەک بنگۆریۆن دەرەقەتی گوشارگەلێکی وەک هەفتە سەرەتاییەکانی ساڵی ١٩٥٧دا دەهاتن.

دژی خواستەکانی یەکێتی شۆرەوی، وڵاتە یەکگرتووەکانی ئامریکا، نەتەوە یەکگرتووەکان و پارتی کۆمۆنیستی خودی ئیسرائیل بەردەوام بوو لە سەر داگیرکردنی سەربازییانەی شەقامەکانی غەززە. ئەو گەمەیەکی ئاستبەرزی وازی دەکرد، هەرچەندە چەکی دیپلۆماتیانەی لەبەردەستتدا نەبوون، هیچ هاوپەیمانی (ڕەنگبێ بێجگە لەفەڕەنسا) نەبوون، هیچ شتێکی پێنەبوو گەفی پێوەبکا، تەنانەت دەرفەتی داڕسانیشی نەبوو.

وەک ڕابەری گەلێکی کەمتر لە دوو ملیۆن کەس بەردەوام شێلگیرانە داکۆکی لە هەڵوێستەکەی خۆی لەبەرامبەر نوێنەرانی ٢٧٣,٠٠٠,٠٠٠دا دەکرد. ئەو تەنانەت داڕسایە نەتەوە یەکگرتووەکانیش کە ژیانیان بەبەر ئیسرائیلدا کرد. بەڵام بەدەر لەو کۆمەڵە کۆمۆنیستەی نێوخۆ، گەلەکەی لەیەکنەترازا، بە یەکگرتوویی و متمانەی تەواوە لەپاڵپشتی بوون بەوەی کە لەسەر هەق بوو.

لەوانەبوو بەتێپەڕبوونی ڕۆژگار خۆی بەدەستەوەدابا، بەڵام خۆڕسکیانە دەیزانی کەوا باشترە دەماری شەڕ هەڵنەستێنێ و بە نزمی ڕایبگرێ و تاپێی دەکرێ لەسەر بەردەوام بێ، چونکە دەرفەتی ئەوەی دەبێ بڕوا بە جیهان بێنێ کە ئیسرائیل تاکە نەتەوەیە لەجیهان کە بۆی نیە نۆکەندی سوئێس بەکاربهێنێ؛ هەرچۆنێک بێ ئەو مافەی هەبوو کە کەڵک لە بەندەری خۆی ئیلات لەسەر دەریای سور بۆ کەشتیرانی

وڵاتەکەی وەربگرێ و ڕێگەش لە مسرییەکان بگرێ بۆ ئەوەی غەززە وەک بنکەیەکی پەلامارە ناپاکەکانی فیدائییەکان بەکاربهێنێ.
لە ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکاندا شەش بڕیار دەرچوون، تیایدا داوایان لەئیسرائیل دەکرد ناوچە داگیرکراوەکان جێبهێڵێ.
سەرەک ئایزنهاوەریش شەش نامەی توندی ناردن. ئەو پشویەکی خۆشی کورت کردەوە هەر بۆ ئەوەی بگەڕێتەوە واشنتن و بەهۆی رادیۆوە هۆشداری بداتە ئیسرائیل لەوەی گەرهاتو لەسەر سەرکێشیەکەی بەردەوام بێ ئەوا دەرهاوێشتیەی نەخوازراوی دەبێ.
ئابا ئیبان و خانم گۆلدا مایەر بەردەوام لەنێوان ئۆرشەلیم، نیویۆرک و واشنتندا دەهاتن و دەچوون.
هەندێک جاران لەرۆژێکدا سێ کۆبوونەوەی کابینەی حکوومەت دەبەستران.
بۆ یەکەمین جار دوای هێرشەکەی سەر سینا، بڕیارەکانی ئەنجومەنی وەزیران بە کۆدەنگی دەرنەدەچوون.
وتووێژەکان بەبنبەست گەیشتن، بەڵام لە فێبرایەردا گۆڕانی تێکەوت. ئەوەش کاتێک بوو کە دەللەس دوای وتووێژیکی سێ کاژێری لەگەڵ ئابا ئیباندا رایگەیاند، وڵاتە یەکگرتووەکانی ئامریکا بەوە قایلە کە کەرتی غەززە بکەوێتە ژێر سەرپەرشتی نەتەوە یەکگرتووەکان و کەنداوی عەقەبەش بۆ کەشتیگەلی ئیسرائیلی ئازاد بێ.
نوێنەرەکە بروسکەیەکی بۆ ئۆرشەلیم ناردو بنگۆریۆنیش دەستبەجێ فەرمانی کۆبوونەوەی کابینەی حکومەتەکەی دا. ڕێبەرو تەتەرە پۆلیسەکان بەماتۆڕەکانیان بەدوای سۆراخی وەزیرەکان کەوتن. وەزیرێکیان ئاگادارینامەکەی لە سەر شاشەی سینەمایەکەوە پێگەیشت.
بنگۆریۆن پێیگوتن: «هەمیشە ساتێک هەیە کە مرۆ ئەوپەڕی سودوقازانج لە بارودۆخێک وەرگرێ کەتیایدایە، بەڵام کاتێ ئەوساتە لەدەست مرۆ دەرچێ، ئەوا دەرفەتی گێڕانەوەی نامێنێ.»
کابینەکە تا کاژێر دووی نیوەشەو دەمەتەقێیان لەسەر رەوشەکە کرد. لەدوییدا دەنگدرا. چوار وەزیر پێدەچوو لەگەڵ رای سەرۆکەکەیان هاودەنگ نەبن، بەڵام ئەمە واینەکرد لە بڕیارەکەی پاشگەز ببێتەوە.
وەزیرەکان گەڕانەوە ماڵەوە. بنگۆریۆن هێشتا کاژێرێکی دیکەش لە نوسینگەکەی مایەوە، ڕێنمایی بۆ ئابا ئیبان و خانم مایەر دەردەکردن.
خانم گۆلدا مایەر هەمو رۆژەکەی لەواشنتندا هەر کۆنفرانسی دەگێڕان. کاتێک هاتە سەر ئەوە پڕۆژە دەقێک بنوسێ کە لە نەتەوە یەکگرتوەکاندا بیخوێنێتەوە، بە تێلگراف بۆ ئیسرائیلی رەوانەکرد. ئەو رۆژی هەینیە کابینەکە لە کاژێر سێی دوای نیوەڕۆ کۆبووەوە. دیسان گفتوگۆ و لەسەر مژارەکە کرایەوە. مشتومڕەکەیان تا ئەستێرەی شەو لە ئاسمان بەدەرکەوتن، بەردەوام بوو. ئەوەش نیشانەی ئەوبوو کە شابات دەستیپێکرد. دوو وەزیری نوێنەری پارتە ئەرسەدۆکسەکان دەبوایە بڕۆنەوە. ئەوان و چوار هاوپایەیان بەتوندی دژی سیاسەتە نوێیەکەی بنگۆریۆن ببونەوە.

بڕیارەکە بۆ خودی خۆشیان گران بوو، چونکە بنگۆریۆن بەخۆشی دەیزانی بڕیارەکە بۆ سێ کۆمەڵە دەبێتە تاڵاونۆشی، ئەو گروپانەش ئەوانە بوون کە زۆری پێیانەوە پابەند بوو: سەربازەکان، کۆچبەرەکان و دانیشتوانی نەقەب.
سەرەتا دەبووایە دنەی لێتێگەیشتنی بۆ تاکتیکەکەی لای سوپا بدابایە، هەر بۆیە داوای کۆنفرانسێکی بۆ دەستەی ژەنەڕاڵەکان کە لە حەفت ژەنەراڵ پێکهاتبوو، کرد. کاتێک کۆبوونەوەی کابینەکەی تەواوکرد ئەوان چاوەڕێان دەکرد.
بەچەند وشەیەک باسی بارودۆخەکەی بۆکردن کە گوشار لەهەمو لایەکەو کراوە ساتی بڕایاردان هاتووە.
لە یەک بەیەکیان پرسی ئاخۆ گەر ئەوان لەشوێنی سەرەک وەزیران بوونایە چیان دەکرد. بێگومان کۆبوونەوەکە بێئومێدی لێکەوتەوە بەڵام دژیشی نەوەستانەوە.
ئەو شەوە نەخشەیەکی بۆ گەشتێکی بە نشینگە سەرسنورییەکان دانا. گەشتێک بۆلای ئەوانەی کە یەکدوو مانگە کردەوەی فیدائیەکانیان لێدورکەوتۆتەوە، تا بۆیان رون بکاتەوە لەمەودوا چی دەقەومێ. (لە هەندێ شوێنی وەک سدیبۆکر کۆلۆنیستەکان لەدوایدا بەبێ چەک دەیانتوانی بچنە سەر ئیشی خۆیان).
شەوی پاشتر لە کاژێر هەشت و نیودا میلی رادیۆی خستەسەر ئێزگەی دەنگی ئیسرائیل کە کە کۆبوونەوەی دوێنێ رێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکانی پەخشدەکرد. گوێی لەدەنگی خانم گۆلدا مایەر راگرت، کە بەئارامی، بێ دراماتیکییانە رایگەیاند ئیسرائیل ئامادەیە لەسەر سێ شیمانە کە لەسەری رێککەوتوون خۆی بکێشێتەوە.( دەلەس لەسەر بەکارهێنانی وشەی مەرجەکان قایل نەببوو).
کەمێک دواتر هێنری کابۆت Henry Cabot نوێنەری وڵاتە یەکگرتووەکان وتەیەکی دا. وتەکەی شایانی سەرنجدان بوو. ئەو شێمانەی کە ناوچەی غەززە بخرێتە ژێر سەرپەرشتی رێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکانەوە، رەتکردەوە.
سەرەک وەزیران لەنێو جێگاکەی هاتەدەر. ئەوەش تەنگژەیەکی دیکە بوو. زەنگێکی بۆ وەزارەتی کاروباری دەرەوە لێدا، ئەوسا بۆ سکرتێرو یاریدەدەرە سەربازییەکەی.
رۆژەکەش شابات بوو، بەڵام دەبووایە کابینەکە هەر کۆ ببێتەوە. پەیک نێردرانە ماڵی دوو وەزیرە ئەرسەدۆکسەکە، چونکە لە ساباتدا نەدەبوایە تەلەفونیان کردبا. وەزیرەکانی دیکە بەتەلەفون ئاگادارکرانەوە. کۆبوونەوەکە سێ کاژێری کێشا.
بە نامەیەکی سەرەک ئایزنهاوەر کۆتایی بەو بارە چەقبەستوە هات. نامەکەش بیروڕای سەرۆک بوو، هیوا و چاوەڕوانییەکانی رونکردنەوەی خانم گۆلدا مایەری بەڕادەیەکی شایستە لەخۆگرتبوو.
لە دووشەممەشدا بنگۆریۆن فەرمانی بە ژەنەڕال مۆشێ دایان دا کە پەیوەندی بە فەرماندەی هێزی پۆلیسی نەتەوە یەکگرتووەکانەوە بکا، تا چۆنیەتی کشانەوەی هێزەکانیان لەگەڵدا رێکبخا.
هەڵمەتی سینا بەکۆتاهات.
ئیسرائیل چەکوتفاقێکی زۆری روسی بەدەستکەوت بۆ بەجێما، لەگەڵ دووجار

نمایشە شکستخواردوەکەی میسر لەسەر گۆڕەپانی جەنگدا، زامنبوونی بێلەمپەری دەریاوانی ئیسرائیل بۆ گەیشتن بەئیلات و دڵنیابوون لەوەی کە چیدی فیدائییەکان لە غەززەوە پەلاماری نشینگە جوەکان نادەن.

بنگۆریۆن لەناوەوەی وڵات نەیاری نوێی بۆ پەیدابوون کە پێیان وابوو دەبوایە تاسەر بەرگری نواندبا.

لە چاوی جیهانیش وەک دەوڵەتمەدارێکی کارامە کەدەقاودەق لەساتی خۆی «بەڵێ» دەڵێ «رەفتاری نواند.

لە راپرسییەکی رای گشتیدا لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئامریکادا کرا، ئەو بە یەکێک لە دە ناودارە زۆر رێزلێگیرا و بیچمە لەبەرچاوەکانی جیهان ژمێردرا، سەرسامانەتر لە نەهرۆ Nahru، لۆدگ Lodge، دەلەس Dulles و ئیدن Eden.

# بەشی
# (٢٨)

ئەو ڕۆژە لە ئۆرشەلیم ڕۆژێکی سارد شێدار بوو.

لەبەرئەوەی لەو ڕۆژەدا یەک ساڵ بەسەر دەستپێکی هەڵمەتی سینا و کوشتارگەکەی کفر قاسم بەسەر چووبوو، پۆلیس هێزی زیاتری نارده کەنیست.

لەو باڵاخانەیەی کە ڕوی کەوتبووە سەر ڕێگای شا جۆرجی پێنجەم پرسی سیاسەتی دەرەوە تاوتوێدەکرا. کاژێر ٦,١٥ ی ئێوارە لەسەر سەکۆی پەڕلەمان نۆرەقسەی نوێنەرێکی پارتێکی بچوک بوو. کاتێک ئەو پێنج ساڵ لەمەوبەر لەهەمان شوێن قسەیدەکرد، هۆڵی پەڕلەمان لە پەنجەرەکانیەوە بەردباران کرا و دوکەڵی گازی فرمێسکڕژێن هەناسەی پەڕلەمانتارانی تەنگ کرد و مشتومڕەکەیان لەسەر قەرەبوودانەوەی ئاڵمانەکان بۆ قوربانیانی هۆلۆکۆست پێڕاگرت. ئەمجارەشیان کاتێک کابرای گۆرین هەڵوێستەکەی خۆی ڕوندەکردەوە زۆر لە پەڕلەمانتاران هۆڵەکەیان جێهێشت و چوونە ژوری قاوەخواردنەوەکە.

ئەو هۆڵەی کەنیست لێیکۆببووەوە خڕ بوو. ئەندامەکان بەشێوە بازنەیەکەی شانۆ جێیانگرتبوو، لەنێوەڕاستدا کورسی و قەنەفەی بازنەیی و لەسەرەوەش لە بالکۆنەکەدا شوێنی جەماوەر و ڕۆژنامەوانان بوو. لەنێوەڕاستدا مێزێکی درێژی دەورەدراو بە کورسی هەبوو، لەسەر ئەو کورسیانەدا سەرەک وەزیران و هەر سیانزە وەزیرەکانی دادەنیشتن. لە مەودایەکی کەمێک لەوان دورتر شوێنی میوانە پایەبەرزەکان بوو.

لەو ئێوارەی سێشەممەدا دوو وەزیر لەبۆنەیەکدا بوون، یەکیان وەزیری کاروباری حکومەت چووبووە ئامریکا، ئەویدیکەشیان لەبەر هۆی تایبەتیانەی خۆی ئامادەی کۆبونەوەکە نەبوو، یەکێکیشیان لەژوری قاوەخواردنەوەکە بوو. ئێلاتی Elathی نوێنەریش کەلە شوێنی میوانە پایەبەرزەکان دانیشتبوو، دەرچووبوو.

سەرەک وەزیران لەسەر کورسیەکەی خۆی، خۆی گرمۆڵە کردبوو لە گژ هزران ڕاچووبوو. ئارگۆڤ ناحیمیای سکرتێرە سەربازیانەکەی ئەو ڕۆژە لەگەڵیدا نەبوو بەڵکو لە تەلئەبیب مابووەوە.

لەسەر بالکۆنەکە یەک دوو خوێندکار دانیشتبوون، تاکە گەشتیارێک و کارمەندێکی پاککەرەوەش کە ئیشی نەمابوو، هاتبوو سەیرێکی هۆڵەکە بکا.

دواندەرەکەی سەر سەکۆ بارە ئاڵۆز و تەنگەتاوییەکەی ئیسڕائیلی هەنوکە و ساڵێک لەمەوبەری بەبیر ئامادەبووان دەهێنایەوە. ئەوکات...

لەپڕ لاوێکی کورتەبنەی بەرینی سەر ڕەشی قەیتانی لوت باریکی چاو زەق کە لەسەر کورسیەکی پشتەوەی بالکۆنەکە دانیشتبوو، بازیدا و شتێکی بەرەو لای کورسی ئەندامانی کابینەکە فڕێدا. شتە فڕێدراوەکە بەدەقاودەقی بە تەنیشت سەری سەرەک وەزیران رەتبوو، سەرەیکرد و لە نێوان کورسیەکەی موشی شاپیرۆ وەزیری کاروباری ئایینی و وەزیری کاروباری کۆمەڵایەتی و قەنەفەکەی میوانە پایەبەرزەکەدا کەوتەخوار.

دواندەرەکە لە نیوەڕاستی پەیڤەکانیدا وەستا. ساتێک بێدەنگیەکی تەواو باڵی بەسەر هۆڵەکەدا کێشا. دەنگێک لە سەر بالکۆنەکە هاواریکرد:

«ئەوە چ لاساریەکە کە بەرد فڕێ دەدەدرێ!»

شاپیرۆی وەزیر دانوشتایەوە تا بزانێ ئاخۆ ئەو شتە چیبوو فڕێدرایە بەردەمی. ئیدی دەنگی تەقینەوەیەک هات. شاپیرۆ لەسەر کورسیەکەی بەپشتدا کەوت. خوێن لەسەر و جەستەیەوە هات.

گۆلدا مایری وەزیری کاروباری دەرەوەش کورتە قیژەیەکی کرد و بەهەردوو دەستەکانی لاقی خۆی داپۆشی.

سەرەک وەزیران کە سەری لەکاتی رەتبوونی شتە فڕێدراوەکەدا لادابوو، بە دەنگەفەرمانێکی سەربازییانە هاواریکرد :

«دانیشنەوە! کەستان لەشوێنی خۆی نەجولێ!»

ئەو خوێنەی بە لاقی گۆلدا مایەردا هاتەخوارەوە تەنورەکەی سورکرد و شانێکیشی خوێنی لێدەتکا.

دوکەڵێکی چڕی تیژ هۆڵەکەی پڕکرد.

لەسەر بالکۆنەکە لاوە سەر رەشەکە کە بەیەکێ لە دەروازەکاندا بەنیازی هەڵاتن بوو، لەلایەن پاسەوانەکەوە گیرا.

دوو ئەندامی پەرلەمان کە پیشەیان پزیشکیی بوو بەپەلە خۆیان گەیاندە بریندارەکان.

خولەکێک دواتر هۆڕنی ئۆتۆمبێلی فریادڕەسی خەستەخانە ریگای شا جۆرجی پێنجەمدا دەنگی دایەوە. شاپیرۆ راکێشرایە دەرەوە و گەیەنرایە نەخۆشخانەی هاداسا.

لاقە بریندارەکەی خانم مایەر بە دەستەسڕ پێچرایەوە. موشی کارمێل Moshe Carmel وەزیری ڕێگاوبان شانێکی شکا. وەزیری کاروباری تەندروستی گشتی و خانمە ئەندامێکی پەرلەمان بەسوکی بریندار ببوون.

هەرچەندە بنگۆریۆن چەند ساچمەیەکی لە قۆڵی راست و لاقی راستەیدا هەبوون، نەیویست لەکاتی چوونە لای ئۆتۆمبێلەکە بەمەبەستی گەیاندنە نەخۆشخانە، کەس بچێتە بنباڵیەوە. دوو تیمی نەشتەرگەری نەخۆشخانەی هاداسا خەریکبوون دەستبەجێ کارتی نەشتەرگەری بۆ شاپرۆ بکەن. ساچمەکان لە پێی خانم مایەر دەرهێنران و دواتر لەگەچیان گرت. شانە شکاوەکەی وەزیری ریگاوبانیش هەڵبەسترایەوە. بەهۆی تەمەنزۆری و ئەگەری هێدمەگرتن جارێ نەشتەرگەری بۆ بنگۆریۆن نەکرا، بەڵکو

تەنها دەرزی سڕکردنیان لێدا.
لە کەنیست دەستبەجێ دەست بە لێکۆڵینەوەی پۆلیسییانە کرا. شتە فڕێدراوەکە دیاربوو نارنجۆکێکی جۆری میل Mill بوو. گەر هاتباو لەسەر مێزەکەی سەرەک وەزیراندا تەقابایەوە، رەنگبایە خۆی و وەزیرەکانی بە ساغی دەرنەچووبان. نارنجۆکەکە چاڵێکی قوڵی کردبووە زەویەکە. بنمیچەکە نیشانەی تەقینەوەکەی پێوەدیاربوون. یەکێک لە ئامادەبووانی بالکۆنەکەش بریندار ببوو.
بکوژەکە ناوی مۆشی بن یاکۆڤ دویگ Moshe Ben Yaakov Duegی تەمەن ٢٥ ساڵان بوو. لە حەلەبی سوریاوە لەدایک ببوو. لە تەمەنی هەراشییەوە روداوێکی لەدەست قەومابوو بەهۆیەوە هەندێک تێکچووبوو. کەمێک پێش دامەزراندنی دەوڵەتی ئیسرائیل دێتە فەلەستین و لەوێش لە ئۆروگای لاواندا کەتنێکی دیکە دەکا. لێرەوە بەرپرسیارێتی قەوماندنەکەی دەخاتە سەر شانی ئاژانسی جولەکان و داوای قەرەبووکردنەوەیەک بەبڕی شەست و شەش هەزار دۆلار دەکا. کاتێکیش لەبەردەم داگادا داواکەی دۆڕاند، نامەی هەڕەشەئامێزی بۆ دادوەرەکە نارد. ئیدی گیرا بەڵام دادوەری دەرونی ئەوی بە نالێهاتو لەقەڵەمدا، بۆیە دۆسیەی پرسەکەی داخرا و نێردرایە لای دەزگای چاکسازیی. زۆریش نابێ لەوێ دەرچووە. دوو ساڵ لەمەوبەر هەوڵیداوە بە خۆڕایی سواری فڕۆکەیەک بێ تا بچێتە نیویۆرک. ئەو سەر بەهیچ پارتێکی سیاسی نەبوو.
کاتێکیش پەردە لەسەر ئەو زانیارییانە هەڵدرایەوە، هەمو ئیسرائیل پشێکی هاتەوەبەر. ئەوە هەر کردەیەکی ئاساییانە بوو، دوور بوولە رەوشی ئاڵۆزی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست. هەوڵی کابرای بەدبەخت هیچ سەرەداوێکی سیاسیانەی بەدواوە نەبوو. ئەو لەلایەن رێکخراوە تیرۆریستەکاندا هاننەدراوە. مرۆ ئەو ترسەی رەوایەوە کە جارێکی دیکە لەگەڵ عەرەباندا شەڕ هەڵبگیرسێتەوە یان هەڕەشەی دەرەکیان لەسەربێ.
نەخۆشخانەی هەداسا بۆماوەیەکی کاتی گوازرابووەوە باڵەخانەیەکی دیکە، بچوک بوو، ژوری تایبەتییانەی تێدا نەبوو، بەڵام ژوری پزیشکەکان لە نهۆمی دوهەم بۆ سەرەک وەزیران چۆڵکرا. ئاگرۆڤ کە لەکاتی بنگۆریۆن لەگیانەڵادا بوو لەوێ نەبوو، بۆیە بە شڵەژاوەیەوە لەتەلئەبیبەوە گەڕایەوە. لەگەڵ پاولادا ئێشکیان لە بنگۆریۆن دەگرت. ئەوان تەنها لە منداڵەکانیان، سەرۆک، ئەو کچە کۆچبەرەی کەناوی مازال Mazal بوو لەماڵەکەی ئۆرشەلیمی بنگۆریۆن کاتێک لەوێ نەدەبووبن کاری دەکرد، لەگەڵ پزیشکێک کەلە دروزەکان بوو رێگای چوونە ژورەوەیان دەدا. سەرەک وەزیران جارێک بە پزیشکە دروزەکەی گوت: «زۆر بەداخەوە تا ئێستا هیچ دکتۆرێکی یەمەنیتان نیە.»
رۆژی دواتر بنگۆریۆن پێی لەسەر ئەوەداگرت کە نەحێمیا ئارگۆڤ هەمو بروسکەکان و باقی پۆستە ئاساییەوەکەی وەزارەتی بۆی بێنێتە نەخۆشخانە.
یەکەمین نامەی لەخەستەخانە بۆ باوکی و دایکی ئەو کوڕە لاوە نوسی کەخەریک بوو بیکوژێ. نوسینەکە کارێکی ئاسان نەبوو، چونکە قۆڵ و دەستی راستەی بریندار ببوون. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بە خەتێکی جوان لەسەر کاخەزی پۆستی هاداسادا

نامەیەکی ڕێکوپێکی نوسی:

بۆ دایک و باوکی موشێ دێوگ:

ئەوە بۆمن ئاشکرایە کە ئێوە وەک هەمو دانیشتوانی ئیسرائیل سەبارەت بە کردەوەی بێواتا و قێزەونەکەی دوێنێی کوڕەکەتان نیگەرانن. ئێوە ئازادن. هەنوکە ئێوە لە ئیسرائیلدا دەژین، لەو شوێنەی کە دادپەورەری تیایدا باڵادەستە، هیوادارم خۆتان و ڕۆڵەکەشتان هیچتان بەسەر نەیەت. هیوادارم ئێوە لەوەدا سەربکەون ڕۆڵەکانی دیکەتان بەشێوەیەک پەروەردەبکەن کە کاری باش بکەن و ئیسرائیلییان خۆشبوێت.

داود بنگۆریۆن

لە زۆر وڵاتی عەرەبی بەهۆی روداوی لەم چەشنەدا دەستبەجێ تەواوی خانەوادەکە دەگیران. پێدەچوو هەر لەبەر ئەوەش بووبێ دایکوباوکەکە کە حەوت ساڵ بوو لە سوریاوەڕا هاتبوون بە ترسولەزرەوە لە گۆشەیەکی کۆڵێتێکی گوندێکی تەلئەبیب سەری خۆیان بەیەکەوە نابوو تا نامەکەیان بەدەستگەیشت.

لەبەر ئەوەی تەنها زمانی عەرەبییان دەزانی، ڕێبەرەکە نامەکەی لەبەر چرای لەمپا نەوتاوییەکە بۆ وەرگێڕان.

ئەو دوای نیوەوەڕۆیە وەزیری پیشەسازی و بازرگانی ویستی سەردانی سەرەک وەزیران بکا. کاتێک لە دەرگای نەخۆشەکە نزیک بووەوە پاولا ڕێگەی پێگرت و ڕەوانەی کردەوە، لێنەگەڕا بچێتە ژورەوە.

«نابێ تۆ بچیتە ژورەوە. ئەز تەنها ڕێگای پزیشکەکان دەدەم.»

کاتێک وەزیرەکە بەداوایلێبوردنەوە زمانی تەتەڵەدەکرد، پاولا ئەوەشێ لێزیادکرد و گوتی: «ئاسانە بەبەردەم پۆلیسەکانی خوارەوەدا ڕەت ببی، لێ ئەز ڕێگە بەکەس نادەم بچێتە ژورەوە!»

ئەو هەفتەیە سەدان جوی بەرچاوی ئامریکایی کە لە گەشتێکی لێکۆڵینەوەدابوون بۆ سیا CIA لەوێبوون. وەک لەبەرنامەدا بوو، دەبوایە سەرەک وەزیران ئەو ئێوارەیە بیدیتبان. بەڵام لەجیاتی بنگۆریۆن ژنەکەی پێشوازیلێکردن. دوای خوێندنەوەی وتارێکی دورودرێژی نوسراو بە پێکەنینەوە سوپاسی کردن و بە نوشتانەوەیەکیش لەگەڵ چەپڵەرێزانەوە گوتی: «ئێوەکارێکی باشتان ئەنجامداوە. بەردەوام بن!»

جارێکی دیکە دانیشتەوە.

نەحیمیا چوار ڕۆژەکەی یەکەم نزیکەی بێدابڕان لە نەخۆشخانەکە مایەوە. لە شەممەدا سەرەک وەزیران هاتبووە سەرخۆی؛ پزیشکەکان گوتیان دەکرێ بڕواتەوە ماڵەوە. ئارگۆڤ کاری پێویستی لە وەزارەتی بەرگری هەبوو، ئیدی سواری ئۆتۆمبێلەکەی بوو بۆ تەلئەبیب لێیخوڕی. لە گەڕانەوەیدا مێشولەیەک فڕیە نێوچاوی. بۆ ساتێک ئاگای لە لێخوڕییەکەی و ڕێگا نەما و گرم خۆی بە پایسکلسوارێکدا دا.

ئارگۆڤ ڕایگرت، پایسکلسوارە لەهۆشچووەکەی هەڵگرت و خستیە پشتەوەی ئۆتۆبێلەکەی. ئیدی پیاوەکەی گەیاندە نەخۆشخانەی ڕێهۆڤۆت Rehovoth. لەوێ

ڕەوشەکەیان بە خراپی هەڵسەنگاند، دکتۆرەکان گوتیان ڕەنگبێ هەڵنەستێتەوە و بمرێ. دوای ئەوەی زانرا کە قوربانیەکە کۆچبەرێکی مارۆکۆیی چل و چوار ساڵانەیە، خێزاندارە و چوار منداڵی هەن، ئارگۆڤ گەڕایەوە تەلئەبیب.

ئەو یەکشەممەیە کارمەندەکانی وەزارەت دەرگای ژوورەکەیان شکاند؛ دیتیان لەپشت نوسینگەکەی مردووە. بە دەمانچەکەی خۆی گوللەیەکی لەخۆیدابوو.

لەسەر مێزی نوسینگەکە دوو نامە دانرابوون. یەکیان بۆ بنگۆریۆن بوو ئەویدیکەش لەسەری نوسرابوو «بۆ برادەرە باشەکانم». لە نامەی دوهەمدا هاتبوو:

«ئەمڕۆ پایسکلسوارێکم شێلا... دەترسم چاک نەبێتەوە... من هەرگیزلەخۆم نابورم کەوا مالباتەکەیانم ئازارداوە... من دوای لێخۆشبوون لە ئەو و خێزانەکەی دەکەم.»

داوای کردبوو ئەو بڕە پارەیەی لەسەر کۆنتۆی پاشەکەوتی بانکەکەی و ئەو پارەیەش کەبەقەرز لای دوو برادەریەتی بڕەکەی ١٢١٢ دۆلاری ئامریکاییە بدرێتە بێوەژنی قوربانیەکە.

«برادە خۆشەویستەکانم... دوای ئەو شتەی قەوما، ناتوانم بژیم. داوای لێبوردن لەهەمو ئەو کەسانە دەکەم کە ڕەنگە قەزرباریان بم... لەو بڕوایەدام ئاسایی نیە لەسەر گۆڕی کەسێک بەدەستی خۆی خۆی کوشتبێ پەسن بدرێ. گەر هەڵە نەبم تکاتان لێدەکەم لەسەر ناشتنەکەم هیچ مەڵێن... با کەس بەمەرگی من ماتەمبار نەبێ... من ئەو بەهایەم نیە کەبۆم نیگەران بن.»

هەڵبەت هەواڵەکە گەیشتە ئۆرشەلیم، لەگەڵ دکتۆرەکان راوێژکرا. دوای نەشتەرگەرییەکە سەرەک وەزیران کەمێک پلەی گەرمی بەرزببووەوە. دکتۆرەکان ویستیان بەهەر نرخێک بێ لە هێدمەگرتندا بەدوریبخەنەوە. نەخشەیەک دانرا بۆئەوەی جارێ هەواڵەکە پەردەپۆشبکرێ. ئێزگەی دەنگی ئیسرائیل ئاگادارکرایەوە هەواڵەکە لە نوچەکەیدا پەخش نەکا، چونکە بنگۆریۆن بە بەردەوامی گوێی بۆ ڕادەهێشت. ئەوسا زەنگ بۆ هەمو رۆژنامە بەیانی و ئێوارەکان لێدرا. دەبووایە هەمویان سەرو دانەیەکی تایبەت بێ ناوهێنانی هەواڵی خۆکوشتنەکەی ئارگۆڤ چاپبکەن. ئیدی کابرای تەتەر دەستبەجێ دانە چاپکراوە تایبەتەکە دوای دەرچوونی لەنێو ڕۆژنامەکاندا دەربهێنا و گەیاندیە نەخۆشخانەکە.

بۆ شەوەکەی هەواڵنێرێک زەنگێکی بۆ نەخۆشخانەی رێهۆڤۆت لێدا. پایسکلسوارەکە لەمەترسی مردن دەرباز بوو.

لە نیویۆرک ئەڤرۆن، ئەو کەسەی پێشتر لەگەڵ ئارگۆڤدا ژیاوە و بەیەکەوە کاریانکردووە، لەسەروبەندی ئەو کاژێرەی کە کردەوەی خۆکوشتنەکەی ئەنجامداوە، پەیوەندی بەکارمەندێکی کۆنسولخانەکە کرد کە هێشتا هەر لە ئیسرائیل دەژیا و لە دەستەی یاریدەدەرانی بنگۆریۆن بوو. قسەکە دەربارەی ئارگۆڤ بوو، ئەڤروم گوتی کەوا سکرتێرە سەربازییانەکەی بنگۆریۆن جارێکیان پێیگوتبوو:

«ئەز لەخۆم دەپرسم، باشە گەر هێرشێک کرایە سەر پیرەمێرد و سەری تێدا چوو، چیبکەم. ڕۆژگارێکە بەو کێشەیە دەتلێمەوە، بەڵام هەنوکە بڕیاری خۆم بۆ

یەکلاکراوەتەوە و ئیدی ئارام بوومەتەوە. گەر هاتو ڕۆژێک لەڕۆژان شتێکی وا بقەومێ، ئەوا خۆم دەکوژم. (دەستیشی لە دەمانچەی بەرپشتی دەدا). کاتێک ئەوەم زانی هەستمکرد زۆر هێوربوومەتەوە.»

بیستوچوار کاژێر دوای ئەوەی کارمەندەکەی کونسولخانە ئەو قسانەی لە ئێڤرۆم بیستبوو، زەنگێکی بۆلێدا.

«ئەرێ گوێت لە ڕادیۆ بوو؟ هەواڵێک لە ڕادیۆ پەخشکرا گوایە نەحێمیا خۆی کوشتووە.»

برادەرە جۆربەجۆرەکانی سکرتێرە سەربازییەکەی سەرەک وەزیران ڕایانگەیاند کەوا ڕێڕۆیشتنی بیرۆکەی خۆکوشتنەکەی ئارگۆڤیان لاسەیر نەبووە. ئارگۆڤ لە ١٩٥٢دا کاتێک بنگۆریۆن لە کەنیستدا مەترسی مردنی لێدەکرا، ئامادەنەبوو. ئەمجارەشیان هەر لەوێنەبوو. ئەو هەستەی لا گەڵاڵەببوو کە نەوەک هەر لەئەرکەکەی دابڕاوە بەڵکو باشترین ساتی ئاسودەیی ژیانیشی لەدەستداوە. گەر سێشەممە لە کەنیست ئامادەبووایە، ئەوا بازی دەدا و خۆی بەسەر نارنجۆکەکەدا دەداو پاڵەوانانە دەمرد.

لە دوشەممەدا ئارگۆڤ بەوپەڕی شکۆی سەربازییانە نێژرا. شەش کۆلۆنێل(سەرهەنگ-عەقید) سندوقی دارەبازەکەیان هەڵگربوو. لاساریش بەرامبەر دوا خواستەکانی نەکرا. سەرۆکی دەستەی هێزەکان مۆشێ دایان لەلای گۆڕە کراوەکە گوتی:

«مردن بۆ ئێمە شتێکی نامۆ نیە. بەڵام مردنێکی بەو چەشنە بەڵێ نامۆیە. بەڕاستی لە مەرگی نەحێمیا ئارگۆڤ تێناگەم.»

دوای کەمێک بێدەنگی، سەرلەنوێ تێهەڵچووەوە:

«ئەو پیاوەیەی کە زۆر پێوەی پابەندبوو بوو، لێرە ئامادە نیە.»

پاولا لەو سەدان کەسە بوو کەدوا نیگای ڕێزیان تێبڕی. مێردەکەی بەئارمی لەناو جێگای نەخۆشی کەوتووە، دەخوێنێتەوە. ئاگای لەهیچ نیە.

ئەو سێشەممەیە بڕیاریاندا پێیبلێن. مۆشێ دایانیان ڕاسپارد هەواڵەکەی پێڕابگەیەنێ. دایان بەیاوەری پزیشکێکی نەخۆشخانەی هاداسا هاتە لای. کۆلێک Kollek، پاولا، شیمۆن پێرێز Simon Peres بەڕێوبەری گشتی وەزارەتی بەرگری و ناڤۆمیش لەوێبوون. ناڤۆم گەشتێکی بە خواروی ئامریکادا کردبوو تا پشک بۆ ئیسرائیل بفرۆشی، بەڵام دوای کردەی خۆکوشتنەکە فەرمانی پێدرا بەزوترین کات بگەڕێتەوە.

سەرەک وەزیران لەبارێکی کەیفخۆشیدا بوو. دەیتوانی لەماوەیەکی زودا نەخۆشخانە جێبهێڵێ. بەڵام لەدواییدا دایان پێیگوت:

«هەواڵێکی ناخۆشمان بۆت هەیە. نەحێمیا مرد.»

بنگۆریۆن ڕەنگی هەڵبزڕکا، قیت دانیشت و پرسی:

«چیت گوت؟»

دەنگی لەرزی.

مۆشی دایان بەکورتی ئەوەی ڕویداوە بۆ بنگۆریۆنی گێڕایەوە و نامە بەجێماوەکەی

نەحیٚمیاشی دایەدەست.
بە هیٚواشی زەرفەکەی هەڵپچڕی. لەوکاتەی نامەکەی دەخویٚندەوە ڕەنگی دەموچاوی تادەهات هەڵدەبزڕکا. بیٚدەنگیەکی کوشندە باڵی بەسەر ژورەکەدا کیٚشا. لەدووایدا پاش خویٚندنەوەی دوا لاپەڕە و واژۆکەی، پیاوە پیرە ریشسپییەکە بە زەحمەت وەرسوڕایە سەر جیٚگەی و پشتی لە ئامادەبووانی ژورەکە کرد.
پاشان یەکیٚک لە ئامادەبووان گوتی کەوا دیواری بیٚدەنگیەکە لەڕیٚی یەک وشەوە شکیٚنرا :
«نەحیٚمیا.»
بەگویٚرەی ئەوانی دیکە، پیرەمیٚردەکە هەرهیچی نەگوت.
بەڵام دوای چاوتروکانیٚک دەنگی هەنسکی نەرم هات. ئامادەبووان بەشەرمەوە تەماشای یەکدییان کرد. زۆرینەیان هەرگیز بەو بارە سۆزهەژیٚنەیان نەدیبووو، هەرچەندە یەک دووانیٚکیان بیریان هاتەوە کاتیٚک کە چۆن سالآنی رابردوو لەکاتی ناشتنی مامۆستادا چەند خەمبار بوو.
بەسەری پەنجان یەک لەدوای یەکیان چوونە دەرەوە.
لەدواییدا هەر بەتەنها بەخۆی و بارە هەڵنەگیرواە کۆستکەوتنەکەی مایەوە.
برینەکانی شان و پیٚی کە نەشتەرگەرەکان ساچمە بچوکەکانیان لیٚدەرهیٚنابوو، خەریکبوو لە پڕدا بکولیٚنەوە. بەڵام ئازاری دڵی زۆر لەوە زیاتر بوو، چونکە دەیزانی کەس جیٚگەی نەحیٚمیای بۆ پڕناکاتەوە. ئەوەش هەموان دەیانزانی. نەحیٚماش بەخۆی دەیزانی. هەر لەبەر ئەوەش بوو کە زەحمەت بوو لە کردەکەی نەحیٚمیا تیٚبگەن.
رۆژانی دواتر بنگۆریۆن نامەکەی نیشانی یەکیٚکیان دا. تیادا روننەکرابووە کەبۆچی دەستی چوبووە گیانی خۆی. سەبارەت بە تامپۆنەکە هیچی باسنەکردبوو. ئەو پیٚنج لاپەڕە دیٚڕ لەیەک نزیکانە سەرسامی و کارانگازی گەنجەکەی بەرامبەر پیرەمیٚردەکە بابەتی سەرەکی بوو. تیایدا سوپاسی بنگۆریۆنی بۆ برادەرایەتیە لەڕادەبەدەرەکەی کردبوو، بەگویٚرەی نامەکە خۆی بە شیاو دانەدەنا. ئەو دە ساڵەی رابردوو بەختیارترین ماوەی ژیانی بوو. بە رای ئەو سیٚ مەزنە پیاو لە هەمو رۆژگاردا هەبوون: موسا، شا داود و داود بنگۆریۆن.
«ئەز دەزانم کەوا رەفتارەکەم ئازارت دەدا، بەڵام لەوە زیاتر شتی دیکەم لەدەست نایەت.» پیٚی لەوەنابوو کە رەفتاری وەک کەسیٚک نەنواندوە کە هەست بەبەهیٚزی خۆی بکا. بنگۆریۆن بەهیٚز بوو، پیٚویستیشی بە کەسانی بەهیٚز هەبوو. بەڵام ئەو، نەحیٚمیا ئەو بڕستەی نەمابوو.
لەبەرئەوەی بنگۆریۆن بیٚباک بوو، نەیدەویست نە بخواو نە خواتەوە و نەلەگەڵ کەسیشدا بدویٚ، دکتۆرەکان پیٚیان باش بوو یەکیٚک دەربارەی خۆکوشتن لەگەڵیدا بدویٚ بەڵکو بەجاریٚک بکەویٚتە قسان. پاولا و منداڵەکان لەسەر ئەوە کۆک بوون کە یادیین ئەو کەسە بیٚ بیهیٚنیٚتە قسە.
لەوکاتەی یادین هاتە لای، ریٚنانای کچی لەلای نەخۆشەکە دانیشتبوو. جاریٚکی دیکە باوکەکەی روی خۆی کردەوە دیوارەکە. لە پڕیٚکەوە روی خۆی وەرگیٚرا، ئەوسا

یادینی دیت، کەیفی پێهات:

«ئەرێ لە هەڵکۆڵینەکانی هازۆر hazor بویتەوە؟

«بەڵێ.»

«دەباشە لەو بارەیەوە شتم بۆ باس بکە.»

یادین ماوەیەکی باش بوو دەربارەی زۆر لە نشینگەکانی سەدە کۆنەکانی بەرێی باسکرد کە هەڵیکەنببوون ئەوش هی سەردەمی یۆزۆوا بوو کە شاری پیرۆز گەورەترین شاری چاخی خۆی بوو. ئەو بۆ ئەو باسوخواسە نەهاتبوو. راستەوڕاست چاوی لەچاوە پڕ لەناسۆرەکانی بنگۆریۆن بڕی و گوتی:

«پێویستە دەربارەی نەحێمیا قسەبکەین.»

سەرەک وەزیران سەری راوەشاند.

یادین پێی لەسەرداگرت.

ئیدی بەنابەدڵی بنگۆریۆن ملی دایە. ئەو خوازیاربوو شتە ناوازەکان بزانێ. ئەوان تەنها پێیان گوتبووە کەوا خۆی کوشتووە. بەڵام بۆچی ئەو کارەی کردووە؟

کاژمێرێکی رەبەق قسەیان کرد.

لەگەڵ هەڵڕشتنی ئەو هەست و سۆزەشدا هێشتا کولوکۆڤانی هەرمابوو. چەندان هەفتە بنگۆریۆن کەسێکی دیکە بوو. بۆ یەکەمجار بوو لە دەیەیەکی دورودرێژدا هیچ شتی لەیاداشتەکەی خۆی تۆمار نەکرد.

لە نەخۆشخانەکەدا پەرستارەکان شەڕیان لەسەر خزمەتکردنی دەکرد. کاتێک ناڤۆن لەدەرەوە گەڕایەوە، پەرستارێک بەناوی ئەدنا Edna کە کچێکی پێست تاریک بوو خزمەتیدەکرد. ناڤۆم بە پەرستارەکەی گوت:

«تۆ نابێ هەرگیز لەو هزرەدابی کە خزمەتی سەرەک وەزیران دەکەی. تۆ نابێ رێگای پێبدەی فەرمانت بەسەردا بکا. تۆ دەبێ فەرمانی بەسەردا بکەی. هەروەک نەخۆشێکی ئاسایی رەفتاری لەگەڵدا بنوێنە.»

بنگۆریۆن گوێی لەدەمەتەقێکە بوو.

بنگۆریۆن گوتی: «بەڵام خۆ من چیدیکە نەخۆش نیم.»

ناڤۆن بە پەرستارەکەی گوت: «باشە، کەواتە وای هەڵسوکەوت لەگەڵدا بکە کە نەخۆشێکی ئاساییە، بەڵام هیچیشی نیە.»

لەهەمان هەفتەدا پاولا توشی پەسیوی ئاسیایی بوو. سەرەتا نەیدەویست لەسەر جێگا خۆی بخا. گەر هاتباو بەیانی و ئێواران سەری مێردەکەی نەدابایە، ئەوا بنگۆریۆن تەنگاو دەبوو. کاتێکیش رەوشەکەی پاولا خراپتر بووو، لەگەڵ پزیشکەکانی نەخۆشخانەی هاداسا گەیشتە رێکەوتنێک. ژورێکیان لە سەرەوە نزیک ژوری بنگۆریۆن دایە پاولا. هەمو بەیانی و ئێوارانیک هەڵدەستاو خۆی دەگۆڕی و شەپقەی لەسەردەنا و هەگبەیەکی بازاڕکردنی دەخستە بن هەنگڵ رۆژنامە و گۆڤارێکیشی لەدەست دەگرت و دەهاتە لای بنگۆریۆن؛ خۆی وا نیشان دەدا کە تازە لەماڵەوەڕا هاتووە.

لەسەرەوەش پەرستارەکان وەستابون، هەر بگەڕابایەوە جلەکانیان لەبەر دادەکەند

و لەسەر جێگەیان درێژدەکرد. بەهۆی ئەو رەفتارە نمایشئاسا شانۆییە نەخۆشیەکەی لە باری ئاسایی خۆی زیاتری خایاند، بەڵام هەرچۆنێک بێ سەرەک وەزیران خەمی نەخۆشیکەی هاوسەرەکەی نەخوارد، چونکە پێینەزانی.

دوای ئەوەی بنگۆریۆن بە کردە خۆکوژیەکەی ئارگۆڤ نەحیمیای زانی، ماوەی مانەوەی لە نەخۆشخانەدا درێژتر لە بارە ئاساییە چاوەڕوانکراوەکەی کێشا. دوای دوو هەفتە ئەوسا نەخۆشخانەکەی بەجێهێشت. تا بارەکەی تەواو ئاسایی بووەوە چەندان میوانی هاتن، یەکێکیان مارکوس سییف بوو، لە لەندەنەوە بەخۆی و ژنەکەی سەردانی ئیسرائیلی کردبوو. سیف لە ساڵە بەراییەکانی دامەزراندنی دەوڵەتدا خزمەتی زۆری کردبوو. لەوکاتەی دەڕۆیشتنەوە کوڕەلاوێک کە کراسێکی بێ بۆینباخی پۆشیبوو، بەسەر پەیژەکان بۆلای بنگۆریۆن سەرکەوت.

لەسەر شەقام گروپێک ئیسرائیلی وەستابوون. سییف رویکردەژنەکەی و پێیگوت:

«سەیرکە بنگۆریۆن چەند جەماوەری هەیە، خۆ دەبینی.»

ئەوسا بەخێرایی لێیزیادکرد:

«تۆبڵێی ئەو لاوە کیبۆتییە کێ بێ کەبۆلای بنگۆریۆن رۆیشت.»

هاوسەرەکەی گوتی: «ئەو گەنجە دانی کایە Danny Kaye بوو، لەگەڵ ب.گ دا دۆستی دێرینەن.»

دوای مەرگی ئارگۆڤ بنگۆریۆن پیاوێکی مەزاجی دەرچوو. رۆژێکیان بەچەندان کاژێر روی لەدیوار دەکرد و هیچی نەدەخوارد. ئێوارەکەی پەرستارەکەی پۆستی بۆ لەسەر مێزێکی بەردەم جێگاکەی دادەنا. بەتاسەوە سەیری دەکرد، تا گۆڤارێکی زانستیانەی ئامریکایی دۆزیەوە. خولەکێک دواتر لەنێو سەرینەکانیدا دانیشتبوو وتارێکی سەبارەت چۆنیەتی سەرهەڵدانی هەورەکان دەخوێندەوە. کاتێکیش پەرستارەکە گەڕایەوە، لێیپرسی:

«ئەرێ بۆچی هەمو رۆژەکە هیج خواردنتان بۆ نەهێناوم.»

دوای ئەوەی ژەمێکی قوڕسی خوارد، جارێکی دیکە گەڕایەوە سەر وتاری لەمەڕ هەورەکان. ناڤۆم هاتەلای و لێیپرسی ئایا ئامادەیە کابرایەکی ئامریکایی ببینێ، کە کتێبێکی لەبارەی ئەوەوە نوسیوە.

«بابێتە ژورەوە.»

کاتێک ئامریکاییەکە رونیکردەوە کە ئەو گۆی Goyیە(وشەیەکی عیبرییە، هەندێک جاران بۆ غەیرە جوش بەکاردێ) بنگۆریۆن رونکردنەوەیەکی ئیتیمۆلۆژیانە (زانستێکە بۆ لێکدانەوەی رەگوریشەی وشەکان-وەرگێڕ) بۆ پەیڤەکە کرد:

«گۆی لە بنەڕەتەوە واتای گەل دەدا. کەواتە ئەز دەتوانم بێژم کە هیوام وایە ئیسرائیل ببێتە گۆیەکی سەربەخۆو بەهێز.»

پەرستارەکە جامە ماستێکی بۆهێنا.

«ئەمەیان(مەبەستی خواردنی ماستە) لە تورکیا فێربووم. ئەوان پێیان وایە ئەوەی ماست بخوا تەمەنی دەگاتە سەد ساڵ.»

چاوەکانی پڕیشکی ژیانیان لێدەردەپەڕین. پرچە سپیەکەی بێکۆتایی قیت وەستابووەوە. کەسایەتیەکە هێزێکی دینامیکیانەی ڕەنگدەدایەوە کەلە هەمو ژورەکەدا هەستت پێدەکرد.

ئێستا تیشکە رامانە تیژەکەی خستۆتە سەر بابەتێک، ئەوسا مژارێکی دیکە.

میوانەکە زۆر نابێ لە گانا بووە. سەرەک وەزیران یەکێ لە کارامەترین دیپلۆماتەکانی بۆ ئەوێ رەوانەکردبوو. بەخۆیشی خوازیار بوو بچێتە گانا تا لە جەژنی سەربەخۆییاندا بەشداربێ، بەڵام قەیرانی سینا ڕێگەی پێنەدا. هەرچەندە ئیسرائیل وڵاتێکی هەژار بوو، بەڵام دەستی بە کۆمەکی گانا کردبوو. سەرەک وەزیران بەتاسەوە لەگەڵ میوانەکەی رەفتاری نواند:

«ئەرێ ئەوێ چۆنە؟ دەربارەی ئەوێ زیاترم شت پێبڵێ. ئەرێ چویتە کوماسی Kumasi شاری ئاشانتیس Ashanti؟ ئاوهەوای ئەوێ چۆنە، هەروەک ئیسرائیل گەرمە؟ ئەرێ باشە هەوای شێداری ئەوێ چۆنە؟»

سەرەک نکروما Nkrumah قاتێکی خۆجێی وڵاتەکەی بۆناردبوو کە بەدەست دروابوو، رەنگی ئاڵوواڵای نەخشینی تێدا بوو. بەڵام تۆ بڵێی ئەو قوماشە بۆ ئاوهەوای گەرم دەستبدا؟ ئایا ئاکرا Akkra لە هێڵی کەمەرەیی (ئیستیوا) چەند دورە؟ لەدواییدا ناڤۆن ئاماژەیەکی وایدا کە کاتی نوستنی سەرەک وەزیران هاتووە.

لە خواحافیزیدا کابرای ئامریکایی گوتی:

«گەر تۆ لەکاری سەرەک وەزیرانی وەڕەز بووی، پێویستە ببیە هەواڵنێر. من بۆ ئەوە هاتبووم پرسیارتان لێبکەم، کەچی تۆ لەبابەتێکدا پرسیارکوتت کردم.»

دەقاودەق سێ هەفتە دوای تەقینەوکەی پەرلەمان و شانزە رۆژیش پاش کردە خۆکوژیەکەی ئارگۆڤ نەحێمیا، سەرەک وەزیران کە هێشتا پێیەکی هەر لە باندێج پێچرابوو هاتە کەنیست، یەکەمین دوانی دوای چاکبوونەوەی بۆ ئیسرائیل دا. وەک داودێکی مۆدرێن بەدەنگێکی لاوانەوە دەستیپێکرد:

«مایەی کەسەرێکی گەورەمە کەمرۆ دو رۆژی رەبەق بەسوێترین کۆستی لەدەستچوونی نەحێمیایان لێشاردمەوە. ئەوەش مایەی خەفەتباریمە، بەڵام تورە نیم...»

«نزیکەی دە ساڵە  نەحیمیا و من بەیەکەوە کاردەکەین. ئەز لەخۆم دەپرسم تۆبڵێی لەنێوان دووو پیاودا هاوکارییەکی وا سەرهەڵبدا. من ناتوانم بڕیاربدەم ئاخۆ چ پشکێکی من لەدەستکەوتی ئەو دەساڵەدا هەبووبێ. من دەزانم کە نمایشێکی بەکۆمەڵ بووە، تیایدا دەیان، سەدان بگرە هەزاران هاوخەبات بوونە؛ کاری وا پاڵەوان ئاساییانە کراوە کە ناکرێ بە کردەوەیەکی مەزنی مێژوییمان نەنوسرێ، تەنانەت هەندێکیان لە تۆماری مێژوی گەلی جولەکەدا بیۆێنەن.»

«گەر پشکی من لەهەر دەستکەوتێکی بەدیهاتودا هەبێ، ئەوا چاکەکەی بۆ ئەو هەڤاڵێتیەی نێوان نەحێمیاو من دەگەڕێتەوە. هەڤاڵبەندییەک لەسەر بنەمای بەرپرسیارێتی دابەشکرابوو، تیایدا ژماردن هیچ رۆڵێکی تیدا نەدەبینی، تیایدا من من و تۆتۆ(منمنۆکێ) جێگای نەدەبووەوە.»

«نەحێمیاش وەک من فراژی (کامل) نەبوو. هیچ پیاوێکی کامل لەسەر گۆی زەویدا نیە. تەنانەت لە بایبلیشدا پیاوی تـەواو کاملی تێدا نیە کە خەوشێک، لاوازییەکی تێدا نەبێ. هەمو مرۆڤێک خەسڵەتی چاکە و خراپەی تێدا هەیە، تەنانەت زۆرینەی چاکەکانیشیان تەواو کامڵ نین.»

«بێوێنەیی نەحێمیا لەوەدابوو کە بۆ یەک پنت میهرەبان و بڕوادار مایەوە، ڕەنگبێ ئەو دلۆڤانییەی بۆ یەک کەس بێ، بەڵام لە گەوهەردا بە پرسێکی دووانەیی متمانەدار مایەوە... بە دەوڵەت و بە لەشکر. نەحێمیا بەهرەیەکی گرانبەها و دانسقەی هەبوو، بەهرەی خۆشەویستییێکی مەزن. لە ئەودا ئاگری یەزدانی داگیرسابوو، لەو ئاگرەشدا خۆشەویستی و خەمی دەچەشت.

«لێرە لەگەڵمدا، با ساتێک بێدەنگی بۆ ڕێزگرتن لە یادەوەریەکەی ئەو بەپێوە بوەستین.»

## دوابەش

# بەشی

# (٢٩)

هەنوکە ئیسرائیل دە ساڵە دامەزراوە، بنگۆریۆنیش ئەو پیاوەیە کە سوکانی کەشتی دەوڵەتەکەی شێلگیرانە بە هەردوو دەستەکانی راگرتووە و لێدەخوڕێ.

ئەو نارەزایەی گوایە دژی ئاهەنگی یادکردنەوەکان بووە، ئەمجارەیان وا نەهاتەوە، بەڵکو ساڵەکە بە خۆ ئامادەکردن بۆ ئاهەنگێران دەستیپێکرد؛ دەستەی نمایشکار، دەماکدارەکان، موزیک و شایی، کیبەرکێی وەرزشیانە، کێرسمێس و بۆنەشکۆی پەسندانی وایزمەن، نۆژەنکردنەوەی بەندەری ئیلاتی دێرین دوای ئەو هەمو سەدانەی بەسەرچوون، گەشتە نمایشکارێک بەنێو ئەو دەیەیەی مێژوی نزیکی ئیسرائیل ئەوسا قوڵبوونەوە بەنێو دیرۆکە دورودرێژەکەی گەلی جولەکەدا کە بۆ چوار هەزار ساڵ دەگەڕێتەوە کە تیایدا گەلی جولەکە لە خەبات و تێکۆشانیدا بووە.

ئەو پەرەشوتوانانەی لە هەڵمەتی سینادا بەشدارییان کردبوو، نمایشی خۆیان کرد، هێزی ئاسمانی و مارینزیش مەشقەنمایشەکانی خۆیان ئەنجامدا، ئەوەش هەموی لە وڵاتێکدا کرا کە بە دوژمن تەنرابوو، دەیانەویست لەناوی بەرن.

سەرنجڕاکێشترین نمایش پێواژۆی ئاشتیانەکەیان بوو کە لە دەقێکی کتێبی یەسیا Jesaja بناوانی گرتبوو:

«ئەوان ئیدی کردەی جەنگاوەرییانە فێر نابن.»

لەو ملیۆن وشەیەی سەرکردەی ئیسرائیل لە ژیانی خۆیدا بۆگەلی جولەکەی نوسیبوو، تەنها ئەو کورتە رستانەیان هەڵبژارد کە بە بێژمار لەهەمو شوێنێکدا سەریان هەڵدەدا:

«دەوڵەت لەڕێی جاڕنامەی سەربەخۆبوونەوە دانامەزرێ، بەڵکو بەڕۆژ و شەو بنیاتدەنرێ و ساڵانێکی دورو درێژ دەخایەنێ، بەڵێ بەچەندان نەوە دەبێ رەنجی بۆ بدەن.»

لە هەفتەی یەکەمی ئەپریلدا ئەو گەڕیدانەی دەیانەویست نمایشی ڤیستیڤاڵەکان ببینن، بەلێشاو دەهاتن. ئەوان لەهەمو سوچێکی دنیاوە هاتن. کەشتی «Queen Mary» گەشتی تایبەتی بەهێنانی گەڕیدەکان بۆ ئیسرائیل تەرخانکرد.

لەهەندێک شەودا ئیسرائیل هەر لە دان Danەوە بۆ بیئر سەبعە نە جێیوبالینگان، نە میوانخانەیەک نە دۆشەکێک نەدەما کە پڕنەکرابێتەوە. تەنانەت میوانخانە نوێیە دورەکەی ئیلاتیش کە نیو ملیۆن دۆلاری تێچووبوو، بەرۆژو شەو گیرابوو.

لەگەڵ گەشتیار و گەڕیدەکاندا هەواڵنێران، پەیامنێران، وێنەگران، فیلمسازان، رادیۆکاران و تەلەفزیۆنمەندان و رۆژنامەوانان کە دەیانەویست وتاری تایبەت لەسەر سەرەک وەزیران بنوسن، هاتبوون.
لەهەندێک رۆژدا بنگۆریۆن بەتەواوی خۆی بۆ ئەرکی نوێنەرایتیکردن تەرخاندەکرد. ئەو بەجۆش و ئامادەی هاوکاریکردن بوو. بەرسڤی هەزاران پرسی دایەوە، بەسەدان وێنەی گیران، نارەزایی لە ئامادەبوون لەبەردەم کامێرای تەلەفزیۆنەکاندا نیشان نەدا. چەندان جار لێیدوپاتکرایەوە ئاخۆ ئامادەیە چاوی بە ناسر بکەوێ.
وەڵامەکەشی ئەوەبوو: «گەر ئەو داوام لێبکا، ئەوا بەخۆم دەچمە قاهیرە. من هەمیشە ئامادەم بە خۆم دانوستانی لەگەڵدا بکەم.»
کاتێکیش سوریا و میسر یەکێتیی کۆماری عەرەبییان پێکهێنا، هەواڵنێرێکی رادیۆی قاهیرە گوتی واباشە مرۆ داوا لە ئیسرائیلیش بکا بێتە نێو یەکێتییەکە؛ بنگۆریۆن لەبەرامبەردا گوتی:
«گەر داواکە بەڕاستی بێ، ئەزیش بەڕاستی بیری لێدەکەمەوە. خۆ هەمومان ماڵمان هەر لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاستدایە. «
بنگۆریۆن لەکاتی چاوپێکەوتنەکانی لەگەڵ رۆژنامەنوساندا حەزیلێبوو بەزمانی ژمارە قسەبکا، نەخاسمە لە ماوەی ئەو دە ساڵەی سەربەخۆیدا، تا بیسەلمێنێ ئاخۆ کە ئیسرائیل چەند بەرەو پێشەوە رۆیشتووە: نزیکەی یەک ملیۆن کۆچبەر هاتوونەتە وڵات. هەنوکە ژمارەی دانیشتوان خۆی لە دوو ملیۆن دەدا. ئاخر چ وڵاتێک لەدنیادا هەیە لەماوەی تەنها دەساڵدا ژمارەی سەرنشینانی دووقات ببێتەوە. لەو کۆچبەرانەی هاتونەتە وڵات تەنها دووسەد کەسیان لە کاروباری کشتیارییان دەزانی و ژمارەیەکی زۆر کەمیشیان لە فابریکەکاندا کاریان کردبوو، بەڵام ئێستا زۆرینەیان جوتیارن یان کرێکاری کەرتی پیشەسازین. سەرلەنوێ بوژانەوەی گەلی جولەکە دەستیپێکردەوە.
ئەو کۆچبەرانە لە حەفتا وڵاتی دنیادا هاتوون و بەهەمو زمانەکان دەدوان تەنانەت بە زمانی یابانیش. وەلێ لەگەڵ هاتنیاندا زو زمانی زگماکیان فێربوون. نزیکەی پێنجسەد گوند و نشینگە دامەزرێنران. یەک چارەگە ملیۆن خانوبەرە دروستکران.
هەنوکە ئیسرائیل سێچارەکی خواردنی پێویستی خۆی بەرهەم دەهێنێ. تەلئەبیب بۆتە شارێکی گەورە. ئیلات لە کۆڵێتیکەوە گەورە بووە بۆتە شارۆچکەیەکی چوارهەزار کەسی. لە ئاکرای Akkraی هەرە کۆنیشدا کارگەی ئاسن و پۆڵا و لە بیئر سەبعەی بیابانیش کارگەی خشت و فەخفوری دامەزراوە. تەنانەت لەبواری هونەر و زانستیشەوە پێشکەوتنی بەرچاوی بەخۆیوە بینیوە. لەچاو ژمارەی دانیشتوانەکانیدا ئیسرائیل دوهەمین نەتەوەدەوڵەتی جیهانە کە کتێبی نوێی تیایدا دەربچێ. شەش ئۆرکێست و سەد کۆراڵی جێگری هەن. پەیمانگایەکی زانستییانە بۆ لێکۆڵینەوە هەیە. چەندان شانۆ، گەڕەکی هونەرمەندان، شاعیر و گۆرانیبێژی هەن.
کاتێکیش تازە دەوڵەت دامەزرا، قوتابخانەکان سەدهەزار قوتابییان نەبوون، کەچی هەنوکە نیو ملیۆنی هەن.
لەسەر مێزی نوسینگەی سەرەک وەزیراندا راپۆرتی هەمو وەزارەتەکان هەبوون،

تیایاندا نمایشی ئەو دەستکەوتە سەرسوڕهێنەرانەی ئیسرائیلیان لەماوەی ئەو دەساڵەدا نیشاندەدا.

ئەو پیاوە دەوڵەتمەدارە سەرسپییە کە هەرگیز تێنوێتی بە دەستکەوتە بەدیهاتووەکان نەدەشکا، لەمیانەی ساڵیادەکەدا زیاتر لەهەمو شتێک باسی ئایندەی دەکرد. لەو رۆژگارەدا هەمو کەسێک بەشانوباڵای دەستکەوتاکانیان هەڵدەدا، لەمەشیاندا لەسەرهەقبوون، بەڵام بنگۆریۆن خوازیاربوو رامانێک ئافەریدە بکا تا سەرنج و ئاگاهی بخاتە سەر ئامانجی نوێ. وا لە گەلەکەی بکا لە ئایندە وردببێتەوە.

لە ماوەی دەساڵی دیکەشدا دەبوایە یەک ملیۆن کۆچبەری دیکە بهاتبایە وڵات. ئەو کۆمەڵەیەی لە کێڵگە و کشتارییدا کاریاندەکرد، دەبووایە دووقات ببوونایە. دەبووایە بەدڵنیاییەوە ریژەیەکی خۆژیێنی (الاكتفاءُ الذاتي) بەدەستهاتبا. ئیسرائیل دەبووا ببایە هێزێکی گرنگی کەشتیوانیی. رەنگبێ نیو ملیۆن دەستپێک بەرەو بیابان بکشێن.

لەوانەبوو بەشێکی روسیا، ئامریکا و دەوڵەتانی عەرەب گرەویان لەسەر بەدیهاتنی خەونەکە کردبێ، بەڵام تا ئەو لەژیاندا بێ، تا ئیسرائیل ئەوی وەک سەرکردەیەک خۆش بوێ، تا ئەو کاتەی ئەو لەسەر خەونبینین بە ئایندەوە بەردەوام بێ، ئەوا گەلەکەی وەک هەمیشە لەسۆراخکردنی نمایشێکی نوێ ناکەوێ، هێشتا ئەو تێکەڵەیەکی ماتریالی و گیانییە، هێشتا خاوەن ئەندێشەیە و پیاوێکی کردارە و دژی زێدەڕۆیی و لەخۆباییبونی بە سەرکەوتنە و شکێنەری بێئومێدیش دەمێنێتەوە.

ئەو کێبەرکێیەی بەبۆنەی ساڵرۆژی سەربەخۆبوون لای بنگۆریۆن «لەهەمویان گرنگتر بوو»، کێبەرکێیەکە زانیاریی هەڵقوڵانێکی نێودەوڵەتییانەی بایبل بوو، بەوەی سەرجەم کێبەرکێکارەکان لەهەمو دنیاوە دەهاتن و لە ئۆرشەلیم کۆدەبوونەوە.

لە رۆژێکی گەرمی ئاگوستسدا گەورەترین هۆڵی ئۆرشەلیم لە کێبەرکێکارەکان جمەیان دەهات، کە براوەی نیشتمانیانەیان بۆ ئیسرائیل هەڵدەبژارد. لەو هەزاران جێیە هیچی بە بەتاڵی نەمایەوە. سەرەک وەزیران چوار کاژێری رەبەق گوێی لە پرس و وەڵامەکان کەلە رادیۆدا بڵاوکرانەوە، گرت. بەتاسەوە وەک منداڵێک لە نمایشێکی سێرکدا دانیشتبێ، وابوو. کاتێکیش زانی نزیکەی نیو ملیۆن ئیسرائیلی بەچەشنی ئەو گوێیان لەڕادیۆو راگرتبوو، دەستەکانی بەشادمانی لەیەکدان و گوتی:

«ئەوەش ئەوە دەسەلمێنێ کە پەرۆشیبوون بۆ بایبل لە ئیسرائیلدا زیندووە. بەڕاستی شتێکی جوانە.»

کەسە براوەکە ئامۆس هاخام Amos Hacham کەم ئەندامی سی ساڵە بوو. هەر لەمنداڵییەوە روداوێکی بەسەرهاتبوو، باسکەکەی سەقەت ببوو، دەمیشی خوار ببوو، نەیدەتوانی وشەکان بەتەواوی دەرببڕێ و بە زەحمەت قسەی پێدەکرا. بەڵام هاخمانی گەنج نزیکەی هەمو پرسەکانی وەڵامدانەوە و بەپێش هەمو کێبەرکێکارەکان کەوتەوە.

رۆژی پاشتر زەنگێک بۆ قوتانخانەی نابینایان لێدرا، کە هاخام تیایدا وەک کارمەندێکی کارگێڕیی کاریدەکرد: «سەرەک وەزیران حەز دەکا بەزوترین کات بتبینێ.»

گەنجەکە قاتێک و کراسێکی سپی لە برادەرێک وەرگرت بەپەلە بەرەو لای سەرەک وەزیران ڕۆیشت. بنگۆریۆن زۆر بەگەرمیەوە پێشوازیلێکرد :

«ئامۆس، دەبێ پێت بڵێم بەڕاستی کاتێ گوێم لە رادیۆ و وەڵامەکانی تۆ گرت، چێژم لێوەرگرت، لەو بڕوایەشدام هەمو نەتەوەکە هەمان هەستی منیان هەبووە. کارێکی باشت بۆ ئیسرائیل ئەنجامدا. ئامۆس، ئێمە هەمومان شانازیت پێوە دەکەین.»

بە گەنجەکەی گوت کە خەمی زەحمەتی قسەکردنی نەخوا.

« ئەزیش دەرسی قسەکردنم وەرگرتووە. ئەمەیان شتی لەگەڵ دەکرێ.»

بنگۆریۆن قسەی لەگەڵ فیلدنکرایس کرد کە دەرس بدتە ئامۆس هاخام. ئیدی هەردوکیان بەیەکەوە ماوەیەکی زۆر دەربارەی مژارێک دوان کە خۆشەویستی هەردوولایان بوو، ئەویش بایبل بوو.

سەرەک وەزیران پێیگوت: «باشترین پرسی دوێنی شەو لای من ئەوە بوو کە دەبوایە پێیان بڵێی ئاخۆ شا یەرۆبۆم Jerobom و ئارۆن Aronی قەشە لەچیدا هاوبەش بوون تا گۆلکێکی زێڕین دروست بکەن.»

هاخام پێکەنی، چونکە بەرسڤەکەی دەزانی.

«هەردووکیان دوو کوڕی هاوتەمەنیان هەبوون. کوڕەکانی ئارۆن ناویان ناداڤ Nadav و ئاڤیهوم Avihum بوو، هی یەریبۆمیش ناداڤ و ئاڤیا Aviya بوو.»

دواتر بنگۆریۆن هەندێ پرسی لە براوەکە کرد ئاخۆ نایخاتە نێو داوی هەندێ وردە هەڵەوە. یەکێ لە پرسەکان ئەوەبوو:

«ئایا ئەو بچمە بایبلییە کێ بوو کە وێنای ژیانی یەکێکی دیکەی کردووە؟»

هاخام وەڵامی دایەوە: «ئەوە پێغەمبەر یەسیا Jesaja بوو، وێنای ژیانی شا ئوزیا Uzziaی کردبوو.»

بنگۆریۆن لەگەڵ هاخامدا باسی پێغەمبەرە مێژووییەکەی کرد کەزۆر پێیەوە کارانگازە. «ئەرێ ئامۆس، ئایا تۆ ئەوە دەزانی کە ئوزیا لە نەقەبی داکوتا ونشینگەی تیاهەڵدا. ڕەنگبێ لەبەرامبەر ئەو کارەیدا ڕێزدارتر بێ لەوەی وەسفی ژیانی لەلایەن یەکێ لە گەورەترین پێغەمبەرەکانی ئیسرائیلدا کرابێ.»

پاشان بنگۆریۆن پرسێکی وردی تەکنیکییانەی لە بایبلەوە لێکرد: ئەرێ ئاسمان و زەوی سەرەتا ئافەریدەکران و پاشان روناکی یاخود بەپێچەوانەوە؟»

گفتوگۆکانیان زیاتر لەیەک کاژێری خایاند، ئەوسا بنگۆریۆن تێگەیشت کە پیاوە گەنجەکە لەهەمو دانیشتوانی وڵاتی بایبل زانیاری لەسەر بایبل زیاترە، کەچی لە بڕوانامەیەکی قوتابخانەیەکی ناوەندی زیاتری نیە و لەبڕوانامەکەشدا لە وانەی زانیاری بایبلدا تەنها نمرەی کیماتۆڤ kimat tovی(واتە نیمچە باشە)ی هێناوە.

هەفتەیەک دواتر هەر چواردە سەرکەوتوەکەی دیکە هاتن: مامۆستایەکی باتیزمی شارۆچکەی بوفۆرد Bufordی جۆرجیا، داپیرەیەکی چل ونۆ ساڵی، پیاوێکی سەر بە کڵێسایەکی بەرازیلی، گەنجێکی کاسۆلیکی رۆمی لە ماڵتا کەپاستۆرەکەی خۆیشی لەگەڵ خۆیدا هێنا بوو، کیژێکی ئیتالیایی کە پاپاوە لێیفرێسمی بوو(موبارەکبادی کردبوو)، پرۆتستانێکی هەڵگەڕاوەی ماکسیکی، نوێنەران لە باشوری ئافریکا،

ئەرجەنتین، کۆلۆمبیا، فینلاند، لوکسمبورگ، هۆڵەند، سوئێد و ئوراگوای تێدا بوون.
پرسیارەکان سەر لە بەیانییەکی زو دەستیان پێکرد و نیوەشەویش داهاتبوو، تەواو نەببوون. دوا چوار کاژێرەکان لە رادیۆدا پەخشکران. نزیکەی هەمو ئیسرائیلییەکان لەبەری دانیشتن. پاداشتەکە بەر دەستەی تەلەفزیۆنێکی ئامریکای کەوت، کە گوڵدانێکی کەسکباوی دوو هەزارساڵ کۆن بوو. لە گۆڕێکی بێت شیرم Beth Shearim دۆزرابووەووە. بەهاکەی بەپارە زۆر نەبوو، بەڵام جۆشوخرۆشەکەی لە ئیسرائیلدا زۆر بوو. بنگۆریۆنیش وەک هاونیشتمانییەکانی خواخوای بوو بزانێ ئاخۆ کێبەرکێیکە چۆن کۆتایی پێدێ.
پرسەکان ئاسان نەبوون.
(نمونەیەک: شەوانی ئێشکگرتن لە ئیسرائیلی کۆندا دابەشکرابوون. چۆن ئێمە بزانین کە کۆمەڵە شەوەئێشکگرتووەکان ژمارەی تاک بوون؟ وەڵام: لە ریختەرن ٧:١٩دا باسی «ناوەڕاستی شەوە ئێشکگرتووەکان کراوە».»
ئامۆس هاخام بەپلەیەکی زۆر لە پێش ئەوانی دیکە بوو، دووهەمین کەس مامۆستایەکی باپتیستی کالیفۆرنیایی بوو، سێهەمیشیان پیاوەکەی لەمەڕ کڵێسای Zevnde Dags Adventidtی بەرازیل بوو.
لەرۆژی دواییدا بنگۆریۆن رایگەیاند کە چەند شانازی بەدەرەنجامەکانەوە دەکا.
یەکێ لە دارەبازهەڵگرانی نەحمییا ئارگۆڤ کۆلۆنێل حایم بن داود Chaim Ben–David بو. بن داودی ڤیەننایی سالانێک بوو دۆستی کۆچکردو بوو. بن داود لە تەمەنی بیست ساڵیدا هاتۆتە فەلەستین و پلەشی لە نێو هاگانادا تا دەهات بەرزتر دەبووە و تا لە هەڵمەتی سینادا بووە ئەندامی دەستەی ئەفسەرانی بەرەی باکور. لە مانگە بەراییەکانی ١٩٥٨دا لە جێگای کۆچکردوودا بووە سەرۆکی دەستەی هێزی پاسەوان. ئەو زۆری بیر لە جێی کۆچکردوو کردەوە دواتر لیستێکی سێ کەسی پێشکەشکرد. چەند رۆژێک دواتر لەوکاتەی لەخۆی دەپرسێ ئاخۆ کێ لە بەربژارەکانی پەسەندکرابن؛ هەواڵێکی لە ئۆرشەلیمەوە بۆهات تا لەبەردەم سەرەک وەزیران ئامادە بێ.
بنگۆریۆن دۆستانە بەخێریهێنا. سەرەتا دەربارەی نەحمیا ئارگۆڤ قسەیان کرد. ئەوسا سەرەک وەزیران لە پڕێکەوە لێیپرسی:
«چۆنی دەبینی گەر جێگای نەحێمیام بۆ بگریەوە؟»
بن داود بەبیری هێنایەوە کە ژنی هێناوەو سێ منداڵی هەن.
بنگۆریۆن لەوەڵامدا گوتی: «دەمەوێ ئەمجارەیان لەگەڵ یەکێکی خێزاندار هەولبدەم.»
چوار رۆژ دواتر ئەفسەرە گەنجە چاو قاوەییەکە، ئەرکە نوێیکەی پەژراند. ئەو هێشتا نەگەیشتبووە تەمەنی چل ساڵی و زۆریش لە سەرۆکەکەی بالا بەرزتر نەبوو، لاوێکی ئایدیالیستی خاوەن تێگەیشتنێکی تیژبین بوو. یەکەمین ئەرکی سازدانی گۆشەیەک بوولە نوسینگەگەیەکی پڕ کتێب کۆچکردوەکەی پێشخۆی لەدوای خۆی بەجێهێشتبوون. ئەوەش بیرۆکەی بنگۆریۆن بوو کە یادەوەری برادەرەکەی بە کتێبان

بەرزو گران رابگرێ. هەر زوش بە «گۆشەی نەحیمیا» ناسرا.
تاکە هەڵەی گەورەی یاریدەدەرە نوێکە ئەوەبوو کە مێزی نوسینگە و دۆسیگرە و هەواگۆڕکییکەی کە بۆ تەلاریکی وەزارەتی بەرگری لە تەلئەبیب دەگەڕایەوە بە هی نوێ بگۆڕێ.
سەرەک وەزیران لەکاتی خۆی بەسەردا ڕاگەیشت تا ئەو ئۆپەراسیۆنە سەربازییانە رابگرێ. ئەو پێویستی بە هەواگۆڕکێی نوێ نەبوو، کۆنەکەی بەس بوو. ئەو لەشتە کۆنەکاندا یادەوەری هەبوون.
ڕۆژێکیان بنگۆریۆن بە بن داودی گوت:
«ئەرێ چەندان زمان دەزانی؟»
«عیبری، ئاڵمانی، جدیشی، لاتینی؛ بە دوودڵیش گوتی ئینگلیزی.»
سەرۆک وەزیران بڕیاریدا یاریدەدەرەکەی بۆ چەند مانگێک بنێریتە ئۆکسۆرد تا ئینگلیزیەکەی بەهێزتر بکا. کاتێکیش گەیشتە ئۆکسفۆرد کۆرسی وانەکانی پرۆفیسۆرێکی لوبنانی بەناوبانگی دەربارەی «ناشیۆنالیزمی عەرەبی» و «سیاسەتی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئامریکای لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا» وەرگرت.
ساڵی ١٩٥٨ کۆمەڵێ روداوگەلی لەگەڵ خۆدا هێنان. خراپترینیان قەیرانی کابیمەی حکومەتەکەی بوو. حکومەت بەنهێنییەوە دانوستانی لەگەڵ  دەوڵەتی ئاڵمانی ڕۆژئاوا بۆ کڕینی چەک سازدابوو. پرسەکەی دزەی کربوو، بنگۆریۆنیش دوو وەزیری دوو پارتی بچوکی بە بەرپرسیار دەزانی. نامەی دەستلەکارکێشانەوەکەی پێشکەشکرد، بەڵام راشیگەیاند کە ئاڵمانی ڕۆژئاوا تاکە دەوڵەتی دنیایە کە ئیسرائیل بتوانێ کەلوپەلی پێویستی لێبکڕێ و ئەوەندەشی لێزیادکرد کە بڵێ:
«گەر ئێوە سەرپشکم بکەن لە نێوان هەمو بەها ئایدیالەکانی جیهاندا کە چەند بەرزن لەگەڵ  ئاسایشپاراستنی ئیسرائیلدا، ئەز ئەوەی دواییان لێهەڵدەگرم.»
هەرگیز نەیارەکانی یاخود خودی خۆی وا ڕاشکاوانە هەڵوێستەکەی دانەڕشتبوو. بێگومان ئەوەش خولیاکەی بوو. ئەوەش  لەیەکترازانەکەی لەگەڵ شارێت بەهۆی هەڵمەتی سینا روندەکردەوە، کە هەمو شتێکی لە پێناو ئاسایشپارێزی ئیسرائیلدا دەکرد.
هیچ شتێک لە خەون گرنگتر نەبوو. لەسۆنگەی یارمەتی ئیگال ئالۆن  Yigal Allonدا هاوپەیمانێتییەکە پارێزرا و لە تەنگژەکەش دەربازبوون.
لە نیوەی ١٩٥٨دا تەنگژەکانی نێوخۆ بوونە سێبەری قەیرانی ڕۆژهەڵاتی ناوین. کودەتاکەی عێراق پێشهاتە بەدواهێنەکانی خۆی بۆ ڕۆژئاوا  ساتێکی سەختی دەگەیاند و بۆ ئیسرائیلیش سەردەمێکی دیکە بوو کە بوونی دەوڵەتەکەیان کەوتە بەر گەف.
گوشارەکانی کۆمۆنیزم دەکرا ببێتەی مایەی دارمانێکی تەواو و پشتگیریە کەمەی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئامریکاش بەوەی چەکی زیاتری بۆ دەوڵەتە عارەبییە دراوسێکان دەنارد، کە هەمیشە لەسەر هەڵوێستێک کۆکبوون بەوی بەردەوام لەباری شەڕدان لەگەڵ ئیسرائیل، ئەوهش لەبەرچاو بوو هەرشتێک رویدابا ئەوا ئیسرائیل نەیدەتوانی بەئارامی ڕەوتی پێشکەوتنی خۆی پەرەپێبدا.

لەو قەیرانە نوێیەدا بنگۆریۆن لەجاران زیاتر وەک دەوڵەتمەدارێکی بەئەزموون هەڵسوکەوتی وایدەکرد کە ڕێبگرێ لە لەیەکترازانی سەربەخۆیی وڵاتە بچوکەکەی و بە دەنگە نەرمەکەشی هەستوسۆزی گەلەکەی دابمرکێنێتەوە.

هەمو ساڵێک هاداسا بۆ بیرهێنانەوەی بنیاتنەرەکەی خەڵاتێکی دەدایە شیاوترین پیاو یان ژنی دنیا. ئێلینۆر ڕۆزڤێلت و دادوەر ویلیەم دۆگلاس Wiliam O.Doglas لەنێو خەڵاتکراوەکاندا بوون. لە١٩٥٨دا خەڵاتی «کارە ناوازەکانی مرۆڤایەتی» بەخشرایە داود بنگۆریۆن. هاداسا وێنای کەسایەتی بنگۆریۆنی بەو شێوەیەک کردبوو کە لەڕاستیدا هیچ وشەیەکی لێزیاد نیە :

«وەک پیاوێکی بەکردار و پیاوێکی روحانی ژیانی خۆی بۆ ڕاژەی جولەکە وەک نەتەوە و ڕۆنانی دەوڵەتی ئیسڕائیل و مافەکانی مرۆڤ لە هەمو دنیادا تەرخانکردووە.

بەڕامانە ئاوەزییانەکەی، لەگەڵ کۆڵنەدان و مەردایەتیی بناوانگرتوو لە ئەندێشەی پێغەمبەرییانە کە هێشتا کتێبی پیرۆزی وەک ڕێبەر، چەمکە ڕەوشتییەکانی سەدە کۆنەکانی کێشایە نێو ڕابەرایەتییەکی دیمۆکراسییانەی مرۆڤدۆستانە بەشێوەیەک پێگەیەکی ناوازەی لەنێو مێژوی خەباتی مرۆڤایەتی بۆ ئازادی بەخشیە ئیسڕائیل.»

# ناوی سەرەک وەزیران وکابینەی حکومەتەکانی ئیسڕائیل
# لە ١٩٤٨ەوە تا ئێستا

| ز | سەرەک وەزیران | کابینەی حکومەت | لە | پارت |
|---|---|---|---|---|
| ١ | داود بنگۆریۆن (١٨٨٦-١٩٧٣) | ١-٤ | ١٩٤٨/٠٥/١٤ | ماپای |
| ٢ | موشێ شارێت (١٨٩٤-١٩٦٥) | ٥-٦ | ١٩٥٤ /٠٢/٢٦ | ماپای |
| ٣ | داود بنگۆریۆن | ٧-١٠ | ١٩٥٥/١١/٠٣ | ماپای |
| ٤ | لیڤی ئەشکۆل (١٨٩٥-١٩٦٩) | ١١-١٣ | ١٩٦٣/٠٦/٢٦ | ماپای |
| ٥ | ئیگال ئاللۆن (١٩١٨-١٩٨٠) | ١٣ | ١٩٦٩/٠٢/٢٦ | هاوپەیمانیی |
| ٧ | گۆلدا مایەر (١٨٩٨-١٩٧٨) | ١٤-١٦ | ١٩٦٩/٠٣/١٧ | هاوپەیمانیی |
| ٧ | ئیسحاق رابین (١٩٢٢- ١٩٩٥ | ١٧ | ١٩٧٤/٠٦/٠٣ | هاوپەیمانیی |
| ٨ | شیمون پێرێز (١٩٢٣-...) | ١٧ | ١٩٧٧/٠٤/٠٧ | هاوپەیمانیی |
| ٩ | مناحیم بێگن (١٩١٣-١٩٩٢) | ١٨-١٩ | ١٩٧٧/٠٦/٢٠ | لیکود |
| ١٠ | ئیسحاق شامێر (١٩١٥-...) | ٢٠ | ١٩٨٣/١٠/١٠ | لیکود |
| ١١ | شیمون پێرێز | ٢١ | ١٩٨٤/٠٩/١٣ | ئاڤۆدا |
| ١٢ | ئیسحاق شامێر | ٢٢-٢٤ | ١٩٨٦/١٠/٢٠ | لیکود |
| ١٣ | ئیسحاق رابین | ٢٥ | ١٩٩٢ /٠٧/١٣ | ئاڤۆدا |
| ١٤ | شیمون پێرێز | ٢٥ | ١٩٩٥ /١١/٥ | ئاڤۆدا |
| ١٥ | شیمون پێرێز | ٢٦ | ١٩٩٥ /١١/ ٢٢ | ئاڤۆدا |
| ١٦ | بنیامین ناتانیاهو (١٩٤٩-...) | ٢٧ | ١٩٩٦ /٠٦/١٨ | لیکود |
| ١٧ | ئیهود باراک ١٩٤٢-...) | ٢٨ | ١٩٩٩ /٠٦/٠٦ | یەک ئیسڕائیل |
| ١٨ | ئارییێل شارۆن ١٩٢٨-...) | ٢٩-٣٠ | ٢٠٠١/٠٣/٠٧ | لیکود |
| ١٩ | ئارییێل شارۆن | ٣٠ | ٢٠٠٧ /١١/ ٢١ | کادیما |
| ٢٠ | ئێهود ئۆلمەرت (١٩٤٥-...) | ٣٠ | ٢٠٠٦ /٠٢/٠٤ | کادیما |
| ٢١ | ئێهود ئۆلمەرت | ٣٠ | ١١ /٠٤/ ٢٠٠٦ | کادیما |
| ٢٢ | ئێهود ئۆلمەرت | ٣١ | ٢٠٠٦ /٠٥/٠٤ | کادیما |
| ٢٣ | بنیامین ناتانیاهو | ٣٢ | ٢٠٠٩ /٠٣/٣١ | لیکود |

# دەقی جاڕنامەی سەربەخۆیی دەوڵەتی ئیسرائیل

وڵاتی ئیسرائیل لانکەی گەلی جولەکە بووە. لێرەدا گیان، دیین و کەسایەتییە نەتەوایەتیەکەی داڕێـژراوە. لێرەوە سەربەخۆیی خۆی وەرگرتووە و کلتورێکی نیشتمانییانەی واتا جیهانیی ئافەریدەکردووە. لێرەوە بایبل نوسراوەتەوە ئەوسا دراوەتە جیهان.

چ لە تاراوگەبوون و دوورخستنەوەیان لە فەلەستیندا گەلی جولەکە لەهەمو وڵاتانی دنیادا بە وڵاتەکەی متمانەدار و دڵسۆز مایەوە و هەرگیزیش لە نوێژ و هیوابوون بەگەڕانەوە و گێڕانەوەی یەکێتیە نەتەوایەتیەکان نەوەستاوە. بەهۆی ئەو هیوایەوە بەدرێژایی سەدەکان جوەکان لەسەر ئارەزوی گەڕانەویان بۆ وڵاتی بابوباپیرانیان مکوڕبوون تا دەوڵەتی خۆیان دابمەزرێنن. لەو دە ساڵە کەمەدا بە کۆمەڵ خەڵکی گەڕاونەتەوە. ئەوان ژیانیان بەبەر بیاباندا هێنایەوە؛ زمانەکەیان بوژاندەنەوە، شار و گودەکانیان بنیاتنایەوە و بەشێوەیەک گەشەیانکرد، بوونەتە کۆمەڵگایەکی پەرەسەندووی خاوەن ئابوری و کلتوری خۆیان.

ئەوان حەزیان لە ئاشتییە، بەڵام هێشتاش ئامادەن بەرگری لەخۆیان بکەن. ئەوان هەمو دانیشتوانی وڵاتەکەیان خستەسەر رەوتی پەرەسەندن. لە ١٨٩٧دا یەکەمین کۆنگرەی زایۆنیزمەکان بە دەنەدانی تیۆدۆر هێرزل بڕیاری دەروستکردنی دەوڵەتی سەربەخۆیان دا.

ئەو مافەش لەلایەن راگەیاندننامەی بلفۆر لە ٢ی نۆڤێمبەری ١٩١٧دا ددانپێدانرا و مانداتی کۆمەڵەی نەتەوەکانیش پشتڕاستیکردەوە. ئەو بەیەکەوە گرێدراوییە مێژوییەنەی گەلی جولەکە لەگەڵ فەلەستیندا ناسێنرا و ئەو مافەشی پێدرا کە ماڵی نیشتمانییانەی خۆی ببوژێنێتەوە.

دۆزەخی نازیزم کەبە ملیۆنان جولەکەی ئاوڕوپایی سەریان تێداچوو، جارێکی دیکە پێویستێتی سەرلەنوێ دروستکردنەوی دەوڵەوتێکی جولەکەیی دووپاتکردەوە، بەوەی کێشەی بێماڵوحاڵی جولەکەکان چارەسەردەکا، هەروەها دەرگاکانی لەسەر تەواوی جولەکەکان بکاتەوە و بەوەش گەلی جولەکە لەگەڵ کۆمەڵگای پێکەوەژیانی گەلان هاوشان بکا.

پاشماوە رزگاربووەکانی کارەساتی ئاوڕوپا وەک جوەکانی وڵاتانی دیکە داوای مافی ژیانێکی شیاو، ئازاد رێزلێگیراویان دەکرد، ئەوان لەگەڵ ئەوهەمو ژان و ناسۆری

و ئەو هەمو زەحمەتی و دژبەرییەدا هەوڵیاندا بێنەوە فەلەستین.
لە جەنگی جیهانیی دوهەمدا گەلی جولەکە لە فەلەستیندا بەهەمو توانایەوە بەشداری خەباتی ئازادی گەلانی دژی نازیزم بووەوە. قوربانیی سەرباز و هێزی بازوی کرێکارەکانی ئەو مافەیان پێدا لەیەک سەنگەر و ریزی گەلان کە دواتر نەتەوە یەکگرتووەکانیان پێکهێنا، بوەستن.
لە ٢٩ی فێبرایری ١٩٤٧دا کۆمەڵەی گشتی نەتەوە یەکگرتووەکان سەرلەنوێ بڕیاری دامەزراندنی دەوڵەتێکی سەربەخۆی جولەکانی لە فەلەستیندا دا و داوای لە دانیشتوانی وڵاتەکە کرد هەنگاوەکانیان بەو ئاراستەیە هەڵبهێنن و ئەوی پێویستیش بێ بۆ بەدیهێنانی بڕیارەکە پشتگیرییان دەکا. ئەو ددانپێدانانەی نەتەوە یەکگرتووەکان بە مافی گەلی جولەکە بۆ رۆنانی دەوڵەتێکی سەربەخۆ، ناکرێ هەڵبوەشێنرێتەوە. سەرەڕای ئەوەش مافێکی حاشاهەڵنەگرە کە گەلی جولەکە وەک هەمو گەلانی دیکە دەوڵەتێکی سەرداری خۆی دابمەزرێنێ.
لەبەرئەوە ئێمە ئەندامانی ئەنجومەنی نوێنەرانی گەلی جولەکە لە فەلەستین و بزوتنەوەی زایۆنیزمی لەسەرتاسەری جیهاندا لە بۆنەیەکی شکۆداردا کۆبووینەوە، ئیدی لەسۆنگەی مافی سروشتی و مێژوییماندا و لەسەر بنەمای بڕیاری کۆمەڵەی گشتی نەتەوە یەکگرتووەکاندا، دەوڵەتی جولەکە لە فەلستین کەناوی ئیسرائیل دەبێ، رادەگەیەنین.

ئێمە لێرەوە رایدەگەیەنین کە هەر لەو ساتەی ماندات لە نیوە شەوی شابات(شەممە) ٦ی ئیژار Ijarی ٥٧٠٨ (ساڵنامەی جولەکە-وەرگێڕ) کەدەکاتە پانزەی ئایاری ١٩٤٨ تا ئەو کاتەی حکومەتێکی ئاسایی بەپێی دەستور کە لە یەکی ئۆکتۆبەری ١٩٤٨داتێپەڕ نەکا هەڵدەبژێردرێ؛ ئەنجومەنی نوێنەرانی گەل جارێ بەشێوەیەکی کاتیانە وەک ئۆرگانێکی کارگێڕی هەڵسوڕاندنی کاروبارەکانی گەل و وەک حکومەتێکی کاتی دەوڵەتی ئیسرائیل پێکدێ.
دەوڵەتی ئیسرائیل بۆ کۆچبەرە جوەکان و بۆ کۆکردنەوەی خەڵکانی تاراوگەمان سازو ئامادەیە؛ دەبێ وڵاتەکەی لەبەرژەوەندی دانیشتوانەکەی پەرەپێبدا، دەبێ لەسەر بنەمای ئازادی، دادپەروەری و رێکەوتنەکانی ئاشتی و سروش و رامانەکانی پێغەمبەرە ئیسرائیلییەکان دابمەزرێ. دەبێ تەواوی ماف و یەکسانییە کۆمەڵایەتی و سیاسییەکانی هاوڵاتییان بەبێ جیاوازی باوەڕ، رەگەز، توخم پەرەپێبدا. دەبێ تەواوی ئازادییەکانی ویژدان، ئۆل، فێربوون و پەروەردە دەستەبەربکا. دەبێ رێزی تەواوی پیرۆزی تەواوی شوێن ومەزارە پیرۆزەکانی هەمو دیینەکان بگرێ. هەروەها دەبێ بنەماکانی بڕوانامەی نەتەوە یەکگرتووەکان بەرزرابگرێ.
ئێمە داوا لە نەتەوەیەکگرتووەکان دەکەین یارمەتی گەلی جولەکە لە رۆنانی دەوڵەتیەکەیان بدەن و داواشیان لێدەکەین دەرگای بەیەکەوە ژیانی گەلانمان

لێبکەنەوە. لەنێو ئەو دوژمنکاریە بەئەنقەستیەشدا داوا لە دانیشتوانە عەرەبەکانی ئیسرائیل دەکەین بگەڕێنەوە سەر ئاشتی و پشکی خۆیان لە پەرەپێدانی دەوڵەتدا لەژێر باری هاوتایی هاوڵاتیبووندا هەبێ و مافی یەکسانی نوێنەرایەتیشیان لەنێو دامو دەزگاکانی حکومەتدا هەبێ.

ئێمە ئاشتی و دۆستایەتی پێشکەشی هەمو وڵات و گەلە دروانسێکانمان دەکەین داوای هاوکاری خۆشگوزەرانی گشتییان لێدەکەین. دەوڵەتی ئیسرائیل ئامادەیە هەمو توانای خۆی بۆ بەرەوپێشبردنی ئاشتی و بنیاتنانەوەی رۆژهەڵاتی نزیک بەکاربهێنێ.

داوا لە گەلی جولەکە لەسەرتاسەری دنیا دەکەین پاڵپشتمان بێ بۆ پرسی کۆچبەران و پێشکەوتن و پشتگیریمان بکا لەو خەباتە گەورەیەی بەدیهێنانی خەونە دێرینەکەمان: ئەویش بوژاندنەوەی ئیسرائیلە.

هەنوکە ئێمەی گەواهیدەر لەسەر بڕوابوون بە گاشەبەردەکانی ئیسرائیل، واژۆی خۆمان دەخەینە سەر ئەو جاڕنامەیەی حکومەتی کاتی، کە لەسەر زەوی بابوباپیرانمان لە شاری تەلئەبیب کۆبووەوە، ئەوەش رۆژێک پێش شابات واتە رۆژی پێنجەمین، مانگی ئاژاری ٥٧٠٨ (جولەکەیی) کە دەکاتە هەینی ١٤ی ئایاری ١٩٤٨.

# دەقی بەڵێننامەی بلفۆر

جەنگی جیهانیی یەکەم واتای چارەنوسسازی بۆ زایۆنیزم گەیاند، لەسەردەمی شەڕەکەدا زایۆنیزمەکان هەرچەندە لەنێو جوەکاندا کەمایەتیش بوون بەڵام بە رابەرایەتی حایم وایزمەن (١٨٤٧-١٩٥٢)و ناحوم سۆکۆلۆو(١٨٥٩-١٩٣٦) Nachum Sokolow سەردەمی گەشەکردنیان بوو.

بەرزترین خاڵی وەرچەرخانی ڕێکخراوی زایۆنیزمی جیهانیی لە ٢ی نۆڤێمبەری ١٩١٧دابـوو، کاتێ بلـفۆر(١٨٤٨-١٩٣٠)ی وەزیـری کاروباری دەرەوەی بەریتانیا ڕاگەیاندننامەیەکی بڵاوکردەوە کە بەڵێنی ماڵێکی نیشتمانیی بۆ گەلی جولەکە لەفەلەستیندا تێدبوو.

ڕاگەیاندنەکە لەشێوەی نامەیەک بوو ئاراساتەی لۆرد ڕۆتشیلد(١٨٦٨-١٩٣٧) Lord Rothshild کرابوو.

ئەمەی خوارەوە دەقەکەیەتی:

>وەزارەتی کاروباری دەرەوە

٢ی نۆڤێمبەر ١٩١٧

لۆرد ڕۆتشیلدی بەڕێز،

مایەی خۆشحاڵیمە بەناوی حکومەتی شاژنی خاوەنشکۆوە ڕاگەیاندروایێتان بە لەخۆگرتنی ئامانجەکانی زانیۆنیزم، کەلەلایەن کابینەی حکومەتە خوێندراوەتەوە و پەسەند کراوە پێڕابگەیەنم:

«حکومەتی شاژنی خاوەنشکۆمان لەبەرامبەر دامەزراندنی ماڵێکی نیشتمانیی بۆ گەلی جولەکە لە فەلەستیندا ئامادەیە و باشترین تواناشی بۆ ئاسانکردنی بەدیهێنانی ئەو ئامانجە بەکاردەهێنێ، تیاشیدا ڕاشکاوانە ڕایدەگەیەنێ کە نابێ ڕاگەیاندنامەکە وا لێکبدرێتەوە کە زیان بە مافە مەدەنی و ئۆلییەکانی کۆمەڵگەی غەیرە جوەکان لە فەلەستیندا بگەیەنێ یان زیان بەماف و پێگە سیاسییانەکەی جوان لەهەر وڵاتێکدا هەبن بگەیەنێ.»

من سوپاست دەکەم کە ڕاگەیاندنەکە بگەیەنیتە فیدراسیۆنی زایۆنیزم.

ڕێز،

ئارسەر جێمس بلفۆر

«Arther james Balfor

## سوپاس و پێزانینی وەرگێڕ:

• هاوسەری خۆشەویستم کنێر جەمیل خەیلانی کە لەماوەی وەرگێڕانی ئەم کتێبەدا (زستانی ٢٠٠٩) نەک هەر ڕۆڵی دایکانەی خۆی، بەڵکو ڕۆڵی باوکانەی منیشی بەرامبەر بە جگەرگۆشەکەمان کاکە-ڕا-گێڕا و دەرفەتی تەواوی بۆ ڕەخساندم، بگرە گوشاری ئەوەشی دەخستمە سەر کە تەواو سەرقاڵی وەرگێڕانەکە ببم و هەرچی زووە تەواوی بکەم.

• حەیدەری حاجی خدری برام کە بە زمان و ڕێنوسی وەرگێڕانەکەدا چۆتەوە.

• فەرهاد جەمیل کە هاندەر و مشۆرخۆری لەچاپدانی کتێبەکە بوو.

## چاپکراوەکانی وەرگێڕ:

١. نهێنییەکانی مۆساد، نوسینی گۆردن تۆماس، وەرگێڕان لە هۆڵەندییەوە، ٢٠٠٨، چاپخانەی هێڤی.
٢. مادلین ئۆلبرایت، سیاسەتی ئەمریکا و رۆژهەڵاتی ناوەڕاست، وەرگێڕان لە هۆڵەندییەوە، سەنتەری نما ٢٠٠٩.

## بەرهەمی ئامادەکراوی وەرگێڕ بۆ چاپ:

١. دەوڵەتی قانون، نوسین.
٢. دەروازەیەک لەسەر دەستور و دەوڵەت، نوسین.
٣. ٩٩ دیاردەنەریتی کۆمەڵگای هۆڵەندی، وەرگێڕان.